ئەندازیار عوسمان محەممەد رەشید

# ژیانەوە

DIGGING IN: FRANCE'S FRACTIOUS FARMERS

Newsweek

Doomsday
Science

هاتن و رووداني قيامەت لەهەم
شت نزیکترە



ئەمینە ئەو بانگخوازە ئەمریکیە
هەزاران کەسی موسڵمان کردوو

چاپی چوارەم

# بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب : ژیانەوە
- بەرگی : ١-٨
- نووسەر: ئەندازیار عوسمان محەممەد رەشید
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٦ز -١٤٢٧ ك
- چاپی : سێیەم .



- لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ٣٥٤ ساڵی ٢٠٠٥ دراوەتێ .

بسم الله الرحمن الرحيم

**أومن كان ميتا *فأحييناه* وجعلنا له نورا يمشى به فى الناس كمن مثله فى الظلمات ليس بخارج منها كذلك زين للكافرين ماكانوا يعملون / ١٢٢ الأنعام**

**واته : ئايا ئەو كەسەی كەمردوو ( بێبڕوا ) بێت و ( بەهۆی ئیمانەوە ) *بیژێنینەوە* و نورێكی بدەینیْ كە ( قورئان ) ە بەناو خەڵكیدا رێی پێدەركات وەك ئەوە وایە كە لەناو تاریكستانێكدا بێت كە بەهیچ جۆرێك لێی دەرنەچێت ، بەو شێوە رازێنراوەتەوە بۆ بێبڕوایان ئەو كردەوە ( خراپانە ) ی دەیان كرد .**

# پێشەكی

سەبارەت بە سەدەكانی ڕابردوو ئەڵێن :

-حەڤدە ، سەدەی ئەقڵ گەرایی بوو .. هەژدە ، ڕۆشنگەرایی لە برەودا بوو .. نۆزدەش ، ئیلحاد لەوپەڕی گەشەدا بوو .. ئەندرێ مالرۆی فەیلەسوفی فەرەنسیش ئەڵێت:

– سەددەی بیست ، سەددەی زانست بوو ، بەڵام بیست و یەك ڕۆح پەرە دەسێنێت ...

جەوهەری ئایینیش ڕۆحە .. ئەو لایەنە ڕۆحیەی كەمایەی بزوتنی مرۆڤە .. كەمایەی زیندوویەتی هەست و ویژدان و فیترەتی مرۆڤایەتیە و كۆی جوانیەكانی مرۆڤی تێدان ..

مرۆڤ چەندە لە ناواخنی ڕاستەقینەی ئایین دووربكەوێتەوە ئەوەندە لە مانای ئاسوودەیی ڕۆح و هێمنی ژیان و چێژی ئەمری و تخوبی جوانی ڕەها دووردەكەوێتەوە .. چونكە خوای جوانكار و ئاسوودەبەخش و ئافەریدەی ژیان و بوون هەرخۆی داهێنەری ئایین و بەخشەری سكونەكانی دڵ و گیانە .. فەسوەتی قەلب بەزكری پەروەردگار لادەچێ .. ژەنگی دڵ بەنزای سەربەماڵ و بەگریانی بەكوڵی سەبای ساڵحان و بەدڵی پڕلەعیشق و ئەوین و فیداكاری بۆ خوای جیهانیان هەڵدەوەرێت .. هەموو ئەو چەمكانەش لەدەرەوەی ئاییندا مانای خۆیان ونەكەن ..

هەربۆیە لەدووریی ئەم كەژاوەی ئایینەوە .. دەبینین چەندین مرۆڤ لەسەرشەقامی ئەم ژیانەدا لاڕێ كەوتوون و بێسەرو شوێن بوون و بێهوودەیی بووەتە ماكی ژیانیان ..

ژیان .. پێناسەكردنت سەخت لەسەرمێژوو كەوتووە ، نابێت لەژێلەمۆبەسۆكانی مێژوو ، لەمەشخەڵە خامۆش نەبووەكانەوە ، بەشوناست بگەین ، چونكە مێژووی زاخ و دیرۆكی گڕێ و فەرهەنگی زوخاڵ مەشهەد چنێكی بەلاپەڕەكانی تەمەن سپاردووە ، ئەوەی وردی سەرزمانی ﴿ حسبي الله ونعم الوكيل ﴾ نەبووبێت ، مەحاڵە ئیبراهیم ئاسا " سەلامی خوای لەسەر " توانیبێتی لەو تەلبەندی زام و نسكۆیە بێ ئارەق دەرچێت .. لەبەر ئەوە لێرەو لەوێ ، ئەوەی لەگوڵەوەچنیدا دەست ئەكەوێ ، ئەوەندەی فوتیلەچرای سەرەڕێی كاروانی تەمەنە ، چراخانی ڕازی فرەنهێنی ژین نییە ، ئەوەندەی رووبینای دیدەی پیرێكە ، ڕاستیەكی بەڵگە نەویست نییە ، ئەوەندەی بەری ئەزموون و ئەندێشەی بەشێكە ، وشەدانی گەورەو بچوكی زیندەگی نییە ، ئەوەندەی كەف و كۆی ڕەنجێكە ، گەنجینەی مرواری قوڵایی دەریای مەعریفە نییە .. هەیە تائێستاش لەئەزموونی حەقیقەت ئەگەڕێ ، نازانێ ژیان لوغزی تیایە ، لەپێناوی ئەوەدا "ئیمان"بەهای خۆی وون ئەكات ، گەورەیی ژیان بەستراوە بەو باگراوندەی كەبووەتە بەشێكی سەرەكی پێكهاتەی و ڕازی خۆی بەكەنارەكانی خلود بەخشیووە .

لێرەوە دەبێت ڕامانەكانمان لەتەنیشت ئەو مەعریفەیەوە بچنینەوە كەكلتووری هەرگەورەی مێژوو ژیاری مرۆڤایەتی سەبارەت بەئەو یاداشتی كردووە ، شوێن هەڵگرتنی ئەویش بەمەنفاكانی ئائومێدیمان ئاشنا ناكات و شوناسی ڕاستیەكانمان بەسلبی ناداتە دەست .. بەڵام ئەم ڕوانگە گریەش ڕەنجی گەنجی ئەوێت و وەك چۆن نیشانە پێكان چەندین مەرجی هەیە و هەمووشیان كاریگەرن ، بەڵام ئەگەر مەبەست نەپێكان بێت مەرجی پێناوێت ، ئەمەش ئەچوێنرێت بەپێگەیاندنی گوڵ ، چونكە وەكو وتراوە : گوڵ بەئاگاداری و دڕك بە پشتگوێخستن شین دەبێ .. مرۆڤیش ئەگەر بیەوێت ڕوانگەی ڕێ بدۆزێتەوە ڕەنجی ئەوێ ، ئەگین ئەگەر مەبەست هیچگەرایی و بێهوودەیی بێ ئەمەرج و ئەرەنجی پێناوێ .. مرۆڤ ئەگەر بیەوێت لەنێو ڕاستی ئایین و لەباوەشی ئیسلام و

لەنامێزی داد و ئاسوودەییەوە لەدایك ببێتەوە .. جارێکی تر بژیێتەوە رەنجی ئەویٚ .. تینی ئەویٚ .. چاورۆشنی باشی ئەویٚ .. ئەزموون و ئاوەزی ئەویٚ .. پاکی و چاکی و مەردی ئەویٚ ، دڵی دامەزراوی ئەویٚ .. دونیا نەویستی ئەویٚ .. وەك مامۆستا موفتی زادە ئەڵیٚ :

خەڵکیٚ دنیابیٚ ، لەحەسێویانا بزەیەك بەلاش نایەتە لێویانا

جوڵەو نوکەیان هەربۆدنیایە چاوەچاویانە چی بێتە کایە؟!

دنیا دۆس ، دڵی بۆکەس ناناڵیٚ مەگەر بەحەساو هێزیٚ ، یاماڵیٚ

نەك ئەوانەی کە بۆ مەبەست و ئاکامێکی باشتر کەرەستەی دەستیان دنیایە .. بەڵکو ئەوانەی بەتوندی سەرگەرمی دنیان لەم بەیتانە تێناگەن ، لەژیانەوەی سەرلەنویٚ و لەنویٚ بوونەوە لەنێو رۆحی ئاپین تێناگەن .. ژیانەوە.. کۆی ئەو هەوڵ و کۆششەیە کە دەدرێت بۆ رازاندنەوەی کەژاوەی زێرینی ئیسلام ..لەهەموو زەمانە جیاوازەکاندا ، هەرچەندە لێرەو لەویٚ قوربانی و گیان فیدایی لێبکەوێتەوە ، بەلاٚم لە ئاکامدا ژیانەوەی هەتاهەتایی بەرهەم دێنێت..

ژیانەوە ..ئەو هەناسەیەیە کە جارێکی تر مرۆڤ لەناو قولاٚیی ئیسلامدا هەستی پێدەکاتەوە و تێدەگا تا ئەمێستاش هێشتا ژیانی ئاسوودەیی و دوور لە دڵەڕاوکیٚ بەپایان نەگەیشتووەو هێشتا دەرفەتیٚ بۆ ژیان ماوە .. هێشتا ئاخێزیٚ بۆ بزاوتن ماوە ..

هێشتا هیوایەك بۆ تەمەن ماوە کە جێگای دڵخۆشی بێت ..

هێشتا بیانوویەك ماوە تا خوا لێمان خۆشبێت ..

ژیانەوە .. هەنگاوێکە بەرەو دۆستایەتی خوا ،

رێگایەکە بۆ چەشتنی شیرینی ئیمان ،

بەرماڵێکە بۆ نزاو پاڕانەوە،

پەنجەرەیەکە بەسەر چەند ئایەت و باسێکی ئیمانیدا ..

ژیانەوە .. باس لەو بیانووانە دەکات کەکەسی بانگخواز دەتوانێت لەهەر کاتێکدا بیاندۆزێتەوە تابانگی خوا زۆر بەهێمنی بلاٚوبکاتەوە، لە نێو ئەم دنیا پرش و بلاٚوەدا مرۆڤەکان بۆ خوا جارێکی تر کۆبکاتەوە ، ناڵەی دەروێش و جۆشی تەلەبەو رێگای پیران و زانکۆی لاوان هەموو پێکەوە گرێبداتەوە و بۆ بانگی خوا هەریەك دەنگی خۆی تافیکاتەوە ..

عادل شاسواری

٢٠٠٦/٥/١١

# ناوەڕۆکی بەرگەکان

## پێشەکی

سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درووددوسەلامیش لەسەر پێشەوای پێغەمبەران ویارو یاوەرو شوێنکەوتوان..

ڕۆژێك خاتوو عائیشەی دایکی بڕواداران ، ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوەو دەگریا (فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ) (الطــور٢٧) واتە : بەهەشتیەکان دەڵێن: خوای میهرەبان چاکەی لەگەڵ کردین و لەسزای دۆزەخی پڕئێش پاراستینی..

بەڕاستی چاکی تێگەیشتووە ، ئای لەو خۆشیەی کە مرۆڤ سەرفراز بێت وبۆ هەتا هەتا لە بەهەشتا بێت . کێ لە ئێمە دڵخۆش ناکات بە دەسکەوتێکی دنیای کاتی کەچەندساڵێکەو دەبڕێتەوە؟ ئەی دەبێ خۆشی ئەوسەرفرازی ودەستکەوتە یەکجاریەیە چۆن بێت ؟؟ دیارە خاتوو عائیشەی دایکمان ، ئاواتێتی وخۆزگەی پێدەخوازێ وهۆن هۆن فرمێسکی بۆ دەڕێژێ..

بەڕاستی هەروایە، هەرچی لەدۆزەخ ترازاو سزا نەدرا سەرفرازە، سەرکەوتووە ، خواپێداوە(كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ) (آل عمران:١٨٥) واتە/ هەموو کەسێك دەبێت مردن بچێژێت ، ڕۆژی قیامەت بەتەواوی پاداشتی کردەوەکانتان وەردەگرن ، ئەو کاتەی ئەوەی لە دۆزەخ ترازاو ڕزگاری بوو، خرایە بەهەشتەوە ، ئەوە بەڕاستی سەرفرازە و ژیانی دنیاش بێجگە لەوەی کە خۆشیەو ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە هیچی تر نییە !

( ژیانەوە ) هەوڵێکە بۆ ڕەزامەندی خواو جێ بەجێکردنی ئەرکی سەرشان ، سابەڵکو سەرفرازیی دنیاو قیامەت بەدەست بێنین..

( ژیانەوە ) بەکۆمەڵێ بابەتی ئیمانیەوە دێتە خزمەت هۆگرانی ( بەهاری دڵان وفەرهەنگی بانگخوازان وبەرچاو ڕوونی وبەرەو پەروەردەی ئیسلامیەوڕامان لەقورئان ولە خزمەت قورئاندا ) بۆ ئەوەی هەندێ ڕاستی ویەقینیاتی تر بۆ خەرمانی ئیمان وبڕوایان زیاد بێ لە گەشتێکی پڕ خێردا ، بەرەو شارەزابوونی زیاتر لەبەرنامەی خواو، بوون

بەبانگخوازی زرنگی چالاك كە شەوو ڕۆژ باتە دەم یەك وشوێن پێی بانگخوازانی بەهیممەت وماندوو نەناسی پێش خۆی هەڵگرێت...

**هەوڵ وتێكۆشان ژیانەوەیە**

جیهادو هەوڵ وتێكۆشان بەهەموو جۆرەكانی‌یەوە لە هەموو كات و شوێنێكدا مایەی ژیانەوەیە هەرچەند ڕەنگە سەروماڵ تیابچن

لەڕاستیدا ئەوسەروماڵە هەر تیادەچن ونامێنن, ئەمرۆ بێت یان سبەی , بۆیە مانەوەی ڕاستی و ژیانەوەی ڕاستی و ژیانی ڕاستەقینە ژیانی ئاخیرەتەو، دنیا وەك خەوێك وایەو كورتەو تەواو دەبێت قورئانی پیرۆز بە موسڵمانان دەفەرموێت : (یاأیها الذین أمنوا استجیبوا لله وللرّسول إذا دعاكم لما یُحییكمْ واعلَمُوا أنّ اللهَ یَحُولُ بین المرء وقلبه وأنَّهُ إلیه تُحْشرون)٢٤ الانفال واتە :ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە , بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن كاتێك بانگتان دەكەن بۆبەرنامەو ڕێبازێك كە دەتانژێنێتەوە و ژیان بەخشە , چاك بزانن بەڕاستی خوا زۆر بەئاسانی دەتوانێت دڵتان لێ بسێنێ و دڵتان بە جۆرێك بگۆڕێ كەخۆشتان نەزانن سەرلەكوێوە دەردەكەن , ئنجا گەڕانەوەشتان بۆلای پەروەردگارەو لێتان دەپرسێتەوە

هەوڵ دان بۆدینی خوا ژیانەوەیە , بۆیە ئەوانەی كە هەوڵ دەدەن خوای گەورە ڕێنماییان دەكات و لەم ژیانە كورتە دا گیرناخۆن (والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سُبُلنا )٦٩ العنكبوت , هەروەها دڵشادو بەرچاو ڕوون و سەربەرزن بەوەی كە دۆست و(انصار)ی خوان , قورئان داوا لەبرواداران دەكات كە هەروەك هاوەڵانی حەزرەتی عیسا دۆستی‌بەرنامەی خواو (انصاری خوا)بن (یاأیها الذین أمنوا كونوا أنصار الله كما قال عیسی بن مریم للحواریین : مَن أنصاريِ إلی الله ؟ قال الحواریون نحن أنصارُ الله ، فآمنت طائفة من بني اسرائیل وكفرت طائفة فأیدنا الذین امنوا علی عدوهم فأصبحوا ظاهرین ) الصف ١٤ واتە :ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ببنە پشتیوانی ئایینی خواو ، ببنە دۆستی خوا , هەروەكو عیسای كوڕی مەریەم بەحەواری‌یەكانی هاوەڵی فەرموو كێ پشتیوان و یاوەرمە بۆ ڕێبازی خوا , حەواری یەكان وتیان ئێمە ئامادەین ببینە پشتیوان ودۆست و لایەنگری خوا , ئەوسائیتر كۆمەڵێ لەبەنی ئیسرائیل موسڵمان بوون

و کۆمەڵێکیش بێباوەڕبوون , ئێمەش بڕوادارانمان سەرخست بەسەر دوژمنەکانیاندا و زاڵ بوون ..

(ص)هانمان دەدات لەسەر جیهادو هەوڵ و تێکۆشان و، لەسەر ئەوەی کەخەمی چوونە بەهەشتمان بێت لەیەکێ لەدەرگاکانی‌یەوە (عليكم بالجهاد في سبيل الله ، فإنّه بابُ من أبواب الجنة ، يُذهِبُ الله بِهِ الغَمَّ والهَّم)واته/ هەوڵ و خەبات بکەن لەڕێی خوادا , چونکە ئەوە دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت و بەوهەوڵ و کۆششە دەرگاکەتان بۆدەکرێتەوە و بە بەهەشت شاد دەبن , هەروەها جیهادکردن خوای گەورە دەیکاتە لابەری خەم و خەفەت و نارەحەتیتان , چونکە مرۆڤ کە بەهیممەتی بەرزەوە خەریکی هەوڵ و خەبات بوو , لاناکاتەوە بەلای شتی سووك و بێبایەخدا وشەیتان کەمتر پێ‌ی دەوێرێت , زانایان دەڵێن : ئەوکەسەی هیممەتی بەرز بێت وەك هەڵۆیەکی بەرزە فڕوایە , تابەرزتر بفڕێت , زیاتر دوور دەبێت لە گوللەوتیری ڕاوچیان ..

بەڕاستی بانگخواز و خەباتگێڕی موسڵمان لەهەوڵەکەیدا هەموو خۆشیەکەی دێتە سەر هیدایەتی خەڵکی و بۆئەومەبەستە هەموو شتێکی دنیایی دەخاتە لاوەو قورئانیش ئاماژە بۆئەمە دەکات و دەفەرموێت (قَاتِلُوهُم يُعَذِّبهُمُ اللهُ بأيديكم ويُخزِهِم ويَنصُرْكُم عليهم ويَشْفِ صُدُورَ قومٍ مؤمنين ، ويُذهِبْ غيظ قلوبهم ، ويتوب الله على مَن يــشاء ، والله عليم حكيم )التوبة ١٥ واتە: ئەی ئیمانداران بجەنگن دژی بێباوەڕان , ( ئەو بێباوەڕانەی ڕێ دەگرن لە دانی بانگی خوا بەگوێی خەڵکیدا , چونکە دەبێت بانگی خوا ئازادبێت و تاقە دین لای خوا ئیسلامە , ئنجا کەئازاد بوو , خەڵکی هیچ زۆریان لێناکرێت , بڕوادەهێنن یان نایهێنن ( فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر) هەروەك قورئان لەشوێنی تردا ئاماژەی بۆکردووە ) .

خوا بەدەستی ئێوە سزای کافران دەدات و سەرشۆڕو خەجاڵەتیان دەکات و ئێوە بەسەریاندا سەردەخات و , سینەی ئیماندارانیش ئاسوودە دەکات و دڵ و دەروونیان ساڕێژ دەکات و خەمیان ناهێڵێ , خوای گەورەش تەوبەو پەشیمانی لەو کەسە وەردەگرێت کە شایستەیە , خوا زاناو دانایە .

## نرخی تۆ بەهەشتە خۆت تالان فرۆش مەکە !

زانای پایەبەرز حەسەنی بەصری دەڵێت :( نەفسی تۆ بەنرخە , بە بەهەشت نەبێ مەیفرۆشە , هەرچەند هەندێ کەس خۆی تالان فرۆش دەکات ) .. بەڕاستی هەروایە , خوای گەورە سەروماڵی داوێنێتی و بەفەزڵی خۆی بەبەهەشتیش لێمان دەکڕێتەوە , قورئان دەفەرموێت (إِنَّ الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأنَّ لهُم الجنَّةَ ، يُقاتِلون في سبيل الله فَيَقْتُلُونَ ويُقْتَلون وعداً عليه حَقّاً في التوراة والآنجيل والقرأن ، ومَنْ أوفى بِعَهْدِه مِنَّ الله ، فاستبْشِراوا ببيعكُمُ الذى بَايَعْتُمْ بِهِ وذلك هوا الفوزُ العظيم ) ١١١ التوبة واتە : بەڕاستی خوا , گیان وماڵی لەئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆئەوانە , ئەوانە دەجەنگن لەپێناوی خوادا , دوژمنانی ئاینی خوا دەکوژن کە (دژایەتی ئەم بەرنامەیە دەکەن),یان دەکوژرێن و شەهید دەبن , ئەوپاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایە و باسکراوە لەتەورات و ئینجیل و قورئاندا , جاکێ هەیە لەخوا بە وەفاتربێت لەپەیمانەکانیدا , کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەومامەڵەیەی کە ئەنجامتانداوە و بەو کڕین و فرۆشتنەی کە لەسەری ڕێکەوتوون و، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوەو بێ سنوور ..

کاتێك پێغەمبەر (ص)پەیمانی بەست لەگەڵ (انصار)ەکاندا داوای لێکردن سەروماڵیان بەخت بکەن بۆخوا بەرامبەر بە بەهەشت ,(ئەنصارەکان)وتیان (ربِحَ البيع ،ربح البيع ).. ( کڕین و فرۆشتنێکی قازانجدارە ، کڕین و فرۆشتنێکی قازانجدارە )...بەڕاستیش هەروایە دنیایەکی پێنج ودووڕۆژێك لەکوێ و بەهەشتی هەتاهەتایی لەکوێ ؟! دەی باشە سەروماڵ نافرۆشی بەخوا , بۆکوێی دەبەیت و چی لێ دەکەی ؟!

جائەوانەی کە باوەڕناهێنن , ئەوانە بەڕاستی خۆیان خەسار کردووە و خۆیان فرۆشتووە بەشتێکی خراپ (بئسما اشتَرَوا بهِ أَنْفُسَهُمْ أن يَكفُرُوا بما أنزلَ اللهُ بغياً أن يُنزِلَ اللهُ مِن فضلهِ على مَن يشاءُ مِن عباده ، فباؤا بغضب على غَضَب وللكافرين عذاب مهين )٩٠ البقرة . واتە : ئەو جولەکانە خۆیان بەشتێکی ناپەسەند فرۆشت . کاتێك کافربوون بەو قورئانەی خوا ناردوویەتی , لەحەسوودی سەرسەختیدا وتیان :

**بۆچی خوای گەورە دەرگای فەزڵ و ڕەحمەت دەکاتەوە لەهەرکەسێك کەبیەوێت لە بەندەکانی, ئەوسائیتر دووچاری یەك لەدوای یەکی رق وخەشمی خوا بوون , بۆکافروخوانەناسان سزایەکی ڕیسواکەر ئامادەیە ..**

**جائەوانەی خۆیان نافرۆشن بەخواو, کفر دەکەن لەجیاتی ئەوەی ئیمان بێنن ئەوانە تەنها زیان لەخۆیان دەدەن و خوای گەورە زیانی لێناکەوێت و ئاتاجی بە کەس نیە** (إِنَّ الذين اشْتَرَوا الكفر بالايمان لَن يَضُرّوا الله شيئاً ولهم عذاب ألــيم)١٧٥ أل عمــران / **بەڕاستی ئەوانەی کفریان هەڵبژارد لەجیاتی ئیمان و , بێباوەڕییان کڕی لەجیاتی باوەڕ , بەهیچ جۆرێك زیان بەخوا ناگەیەنن بەڵکو سزای ئازاراوی چاوەڕێیانە ..**

## دووڕووەکان خۆیان دەخەڵەتێنن

**هەندێ کەس کە تووشی نەخۆشی دووڕوویی بوون , بەڕووکەش و بەزمان هیچیان نەهێشتۆتەوە , کەچی لەڕاستی دا خۆیان دەخەڵەتێنن و خوا ئاگای لەدڵیانە کە ڕاست ناکەن , قورئان لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە دەفەرموێت** (ومِنَ الناسِ مَن يُعْجِبُك قَوْلُــهُ في الحياة الدُنيا ويُشْهِدُ اللهَ على مافي قلبِه وهوَ أَلَدُّ الخِصام ، وإذا تَــوَلّى سَــعى فــي الأرضِ ليُــفْســدَ فيها ويُهْلِكَ الحَرْثَ والنَّسْلَ والله لايُحبُ الفَساد ، وإذا قيلَ له اتَّقِ اللهَ أَخَذَتْهُ العِزَّةُ بالإثمْ فَحَسْبُهُ جَهنَم ولبئس المِهاد )٢٠٦ البقرة / **واتە :هەندێ کەس هەیە قسەودەم و زمانی لە بارەی ژیانی دنیاوە سەرسامت دەکات , خواش بەشایەت دەگرێت و دەڵێت : دڵ و زمانم یەکن , لەکاتێکدا ئەو سەرسەختترین کەسە لەهەموو جۆرە دوژمنایەتیەکدا . هەرکاتێك ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکردو دەسەڵاتی پەیدا کرد , هەوڵ وکۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشووب بەرپابکات وخراپە بڕوێنێت و کشتوکاڵ لەناوببات و خەڵکی قڕبکات , بێگومان خوا فەسادو خراپەو تاوانی خۆش ناوێت ..**

**خۆنەگەر پێی بووترێت : لەخوا بترسە , غەڕرا دەبێت و شانازی بەگوناهیەوە دەکات و سووردەبێت لەسەری ، جائەوە دۆزەخی بەسە , سوێند بەخوا ئەو دۆزەخە شوێن و جێگەیەکی نالەبارو ناخۆشە..**

**بەرامبەر بەم دەستەیە , دەستەیەکی ترهەن کەخواناسی ڕاستەقینەن** (ومِنَ النّاس مَنْ يَشْري نَفْسَهُ ابتِغاءَ مرضاتِ الله ، واللهُ رؤوف بالعِباد)البقرة ٢٠٧

واتـه :هەنـدێ کەسـیش هـەن بەپێـچەوانەی ئەوانـەی باسـکران , خۆیـان دەفرۆشـن بـۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا , خوای گەورەش بەسۆز و میهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆرە بەندانەی . هەروەها قورئان دەفەرموێ (الذين خسروا أنفسهم فهم لايؤمنون ) الانعام ١٢

واته: ئەوانەی کەخۆیان دۆڕاندو خۆیان خەسارکرد ئەوانەن کەباوەڕیان نەهێنا.

## گەورەیی و نرخی مرۆڤ لەئیمانەکەی دایە

(جولەیبیب )هاوەڵێکی هەژاری بێکەس وبێدەری حەزرەت بوو (ص), ڕۆژێك پێغەمبەر (ص)پـێی فـەرموو (ئـەی جولـەیبیب)ژن نـاهێنی ؟! ئـەویش وتـی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ص)جاکێ ژن دەدات بەمن ؟! نەماڵم هەیەو نە بنەماڵەوعەشرەت ؟! .. جارێکی تـر هـەمان شـتی پێفـەرموو ئـەویش هـەمان شـتی وەڵام دایـەوە , سـێیەم جـاریش هـەمان شـتی پێفـەرموو ئـەویش هـەمان شتی وەڵام دایـەوە .. ئنجا حـەزرەت (ص)پـێی فـەرموو : بـڕۆ بۆلای فلانە ماڵی (ئەنصار)وپێیان بڵێ : پێغەمبەری خوا سەلامتان لێ دەکات و داواتـان لێ دەکات کە کچەکەتانم بدەنێ !

(جولەیبیب)یش چـوو بۆلایـان و ئەمـەی پـێ ڕایگەیانـدن , (ئەنصار)ەکە وتـی : سـەلام لەپێغەمبەری خوا بێت , چۆن کچەکەمت بدەمێ , نەماڵت هەیـەو نـە بنەماڵـەو عەشرەت ؟! لـەم قسانەدا بـوون ، کـچەکە بەمەسـەلەکەی زانـی و بـەدایك و بـاوکی وت : چـۆن داوای پێغەمبەری خوا (ص)ئەدەنە دواوە ؟! نەبەخوا هەرگیز شتی وا نابێت !

بەڵێ .. لەسـەر شـەرعی خـوا شـووی پێکـردو مـاڵ و خێزانیـان پێکـەوەنا , لەغەزایەکدا جولـەیبیب شـەهید کـرا پـاش ئـەوەی حـەوت کـافری کوشـت ... کەغەزاکـە تـەواو بـوو , پێغەمبەر (ص)هـاوەڵانی بەسەرکردەوە , کـێ مـاوەو کـێ شـەهید بـووە , پـاش باسـکردنی چـەند هـاوەڵێ , حـەزرەت (ص)فـەرمووی : مـن جولـەیبیب نـابینم .. کـە سـەیریان کـرد لـەنێوان حـەوت کـافردا شـەهید بـووە , حـەزرەت (ص)تـۆزو خـۆڵی سـەر دەم وچـاوی پـاکردەوەو سـەری لەسـەر قۆڵی موبـارەکی دانـاو فـەرمووی : ( تۆلـە منـی و مـن لـە تـۆم , تۆلەمنی ومن لە تۆم , تۆ لەمنی و من لە تۆم ) ..

بەڵێ ئەمەیە دەستی ڕێـزو ئەمەیـە پاداشـت کەحـەزرەت (ص)ئەیـدا بـەهاوەڵی هـەژار و بێکەسی ؟! ئاوا ئیمان و بڕوا نرخ و قیمەت پەیدا دەکات بۆکەسێك کەخوابناسێ و خـۆی بفرۆشـێ بـەخوا ..پاشـان حـەزرەت هاوسـەرەکەی بینـی و زۆر دوعـای خێـری بـۆکرد .

هـاوەڵان دەڵـێن , خـوای گـەورە بەرەکـەتی خـستە مـاڵ و حاڵیانـەوەو لەهـەموو ئافرەتـە بێوەژنەکان زیاتر بەرەکەتدارو خێرەومەند بوو .. ل ٤٣٤ (لاتحزن ، د . عائض القرني )

**ئەوانەی لەحەوزی کەوسەر ناخۆنەوە ! ؟**

/ [illegible] (ص)دەفـەرموێ (إنِّي فرَطُكُمْ على الحوضِ مَنْ مرَّ عليَّ شَرِبَ , ومَنْ شَرِبَ لم يظمأ أبداً ، لَيَرِدَنَّ عليَّ أقوامُ أعْرِفُهُمْ ويَعْرِفُونَني ثُمَّ يُحالُ بيني وبيـــنَهُمْ ، فـــأقول : إنَّهم منِّي ، فيُقال : إنَّك لاتَدْري ما أحْدَثوا بَعْدَك ، فأقول : سُحْقاً لَمنْ غيَرَ بَعْدي .. )

واتـە : لەقیامــەت دا لەســەرحەوزی کەوســەر دەبم و هەرچــی بەلامــدا تێپــەڕێت ئـاو دەخواتـەوەو هـەر کەسـیش لـەو ئـاوە بخواتـەوە هـەرگیز تینـووی نابێـت , کەسـانێك دێـن دەیانناسم و ئەمناسن , کەچی ناهێڵرێت ئاویان بدەمێ و دوور دەخرێنـەوە لـێم , دەڵـێم : ئەوانە لەمنن و , سەربەمنن , دەوترێ : تۆنازانی چییان کردووە دوای تـۆ ، منـیش دەڵـێم : دە کەواتە لەوە لەولاترچێ , لەوە لەولاترچێ , کەسێك کە دوای مـن بگـۆڕدرێ و لابـدات .. (بوخاری).

بەڕاستی ئەوەیە ڕەنجەڕۆیی و بەدبەختی , خـەریك بیت بگەیتە لای حـەزرەت (ص)و , بەدەسـتی موبـارەکی ئـاوی کەوسـەرت بـداتێ , بتگێڕنـەوەو پێـت بڵـێن : تۆشایـستەی ئەوەنیت لەوئاوە بخۆیتەوە , حەزرەتیش (ص)دەستی بگێڕێتەوەو بفەرموێ : بابڕوا لـەوە لەولاترچێت ! کەسێك حەزرەت (ص)لێ ی زویربێت و خۆی نەکات بەخاوەنی , ئەی دەبێ چی بکات و سەری خۆی بۆکوێ هەڵگرێت ؟ !

**لەئێمەنی یە**

پێغەمبەر (ص)لەهەندێ فەرموودەدا ئاگاداری کردوینەتـەوە لەهەنـدێ کـاروکردەوە کـە مایـەی خەسـارەتمەندیی‌یەو دەفـەرموێ : هەرکـەس ئـەوکارەبکات لـە ئێمـە نیـیـە !؟! .. بۆنموونە :

١) مَن غَشَنا فليس منا (مسلم): واتە : هەرکەس غەش و فڕوفێڵمان لێبکات لە ئێمە نیە.

٢) مَنْ حمل علينا السلاح فليس منـــا (مـسلم): واتـە : هەرکـەس چـەك دژی موسـڵمانان هەڵگرێ و ئاژاوە بنێتەوە لە ئێمە نیە ..

٣) ليس منا من لطم الخدود وشق الجيوب أو دعا بدعوى الجاهلية .

(ئەحمەد/ ٤١٣١ )واتە : لەئێمەنیە کەسێك بە ڕوومەتی خۆیابکێشێ و جلی دابدڕێ لە موسیبەتدا , یان بانگەواز بکات بۆشتی سەردەمی نەفامی و جاهیلیەت ..

٤) لیس منا من لَمْ یُوَقِرِ الکبیرویَرحَم الصغیر ویأمُر بالمعروفِ وینهی عــن المُنکــر (ئەحمەد٢٢١٤) واتە : لەئێمە نیە کەسێك ڕێز لەگەورە نەگرێت و بەزەیی بە بچووکدا نەیەتەوەو فەرمان نەدا بەچاکەو جڵەوگیری نەکا لەخراپە .

**بۆئەوەی شایانی هیدایەت بین**

خوای پەروەردگار هەمووخەڵکی بانگکردووە بۆسەر هەق وڕاستی و زیاتر لەسەدو بیست وچوار هەزار پێغەمبەری بۆناردوون (سەلامی خوایان لێبێ ), ئەمە بانگەوازی گشتیە , لەگەڵ ئەو بانگەوازە گشتیەدا ، هەرچی نیەتی گۆڕان بێنێ و هەنگاوبنێ خوای گەورە بەفەزڵی خۆی هیدایەتی تایبەتی دەدات (واللە یدعُوا الی دار السلام ویهدي من یشاء إلی صراط مستقیم) یونس /٢٥واتە: خوای گەورە بانگ دەکات بۆبەهەشتی پڕخێروخۆشی کە هەمووی ئاشتی و ئاسایشە، هیدایەتی ئەوانەش دەدات بەفەزڵی خۆی کە دەیانەوێت و شایستەن بۆ ڕێگای ڕاست ..

ئەو هیدایەتە زۆر گرنگە بۆیە ڕۆژی بەلای کەمەوە حەڤدە جار داوای هیدایەت دەکەین لە نوێژە فەرزەکانماندا ودەڵێین : (إهدنا الصراط المستقیم)..

بەڵێ وەك لەپێشتردا وتمان ئەوانەی کە تێدەکۆشن و ، نیەتیان گەیشتنە بەهەق و ڕاستی وهەوڵ دەدەن بۆ ڕێنمایی خەڵکی ،خوای گەورە هیدایەتیان دەدات و دەرگایان لێدەکاتەوە ( والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سُبلنا ) ..

بۆئەوەی بەتەواوی هیدایەت بدرێین , باهەمیشە لەخوا بپاڕێینەوەو ئەو ڕێگایانە بگرینەبەر کە دەبنە مایەی دڵنیایی و هیدایەتی زیاترو , ئەگەر هیدایەتیش دراین بامنەت بەسەر کەسدا نەکەین ،چونکە خوا بە فەزڵی خۆی هیدایەتی داوین , ئەگینا ئێمەیەکی داماو چین لەم دنیا جەنجاڵەدا , (ومن لم یجعلِ اللە لە نوراً فما لە من نور)کەسێ خوا نووری نەداتێ نووری لەکوێ بوو؟؟.. جابۆئەوەی زیاتر دڵنیا بین و یەقینمان هەبێ و باشتر بانگەواز بکەین باسی چەند لایەنێکی ئیعجازی قورئان و سوننەت و هەوڵی نەبڕاوەی ئەو بانگخوازانە دەکەین کە خوا کردوونی بە سەرمەشق و پێشەوا (وجعلنــا منهم أئمة یهدون بأمرنا لَما صَبَروا وکانوا بآیاتنا یوقنون ) السجدة / ٢٤ ..

## ئەوانەی هەنگ ئاسا کاردەکەن

بانگخواز وەك هەنگ وایە لە هەولّ وکۆشش و دلّسۆزیدا وخەریکی بەرهەمهێنانی هەنگوینێکە کە شیفایە ولەپاراستنی شانەکەشی دا گیان فیدایە پێغەمبەر (ص) بڕوادار دەشوبهێنێ بەهەنگ و دەفەرموێ : (انَّ الله يُبْغِض الفُحش والتَفَحش والذى نفس محمد بيده لا تقوم الساعةحتى يُخَوَّنَ الأمينُ ويُؤتمنَ الخائن ، حتى يَظهرَ الفُحشُ والتفحش وقطيعة الأرحام وسوءُ الجوار ، والذى نفس محمد بيده إن مثلَ المؤمن كمثل القطعة من الذهب نَفَخ عليها صاحبها فلم تَغيَّر ولم تَنقُصْ) واتە : بەڕاستی خوا ڕقی لە کاروکردەوەی خراپ وزیادە ڕەوی‌یە ، بەو خوایەی گیانی محمدی بەدەستە قیامەت نایەت هەتا دەست پاك بەناپاك دانەنرێ ومتمانە بەناپاك نەکرێ ، تاوەکو کاروکردەوەی خراپ وزیادە ڕەوی دەرنەکەوێت ، لەگەلّ نەمانی پەیوەندی خزمایەتی وسیلەی ڕەحم و خراپی لەگەلّ دراوسێدا...

بەو خوایەی گیانی محمدی بەدەستە بڕوادار وەك پارچە ئالّتونە کەئەگەر خاوەنەکەی لە موشەدەمەش دا دایبنێ‌و بیخاتە ئاگرەوە ناگۆڕێ وکەم ناکات ، چونکە خلّتەو پیسی تیا نیە وئالّتونی تێزابەو عەیار (٢٤)ە ..

ئینجا پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت ( والذى نفسُ محمد بيده إنَّ مثلَ المؤمن لَكَمَثلِ النَحلة أكلت طيّباً ووضعَتْ طيّباً ووقعَتْ فلم تُكسَر ولم تَفْسُد) بەو خوایەی کە گیانی محمدی بەدەستە , نموونەی بڕوادار وەك هەنگ وایە شتی پاك وچاك دەخوات وشتی پاك وچاکیش پێشکەش دەکات و, کاتێك دەکەوێت هیچی لێنایەت و هیچ خراپ ناکات وزیانی بۆ کەس نیە.. ئینجا پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت: (ألا إنَّ لي حوضًا مابين ناحيتيه كما بين أيكة الى مكّة أو صنعاء الى المدينة ، وان فيه من الأباريق مثل الكواكب هو أشدُ بياضاً من اللبنِ وأحلى من العسل مَنْ شَربَ منه لم يظمأ بعدها أبداً) أحمد (٦٥٧٧)..

واتە / ئاگاداربن من حەوزێکم هەیە کەماوەی نێوان دوولای بەهێندەی دووری نێوان (ئەیکە) و(مەککە) یان (صنعاء)و(مەدینە) دەبێت و, بەهێندەی ئەستێرەی ئاسمان (پەرداخ) ی تایبەتی لێ دانراوە بۆ سوود وەرگرتن لە ئاوەکەو خواردنەوەی , ئاوی

حەوزەکـە سـپی تـرە لەشـیرو شـیرینترە لەهـەنگوین , هەرکـەس لێـی خـواردەوە هـەرگیز تینووی نابێت..

٠ ⁄ [redacted] (ص) لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت ( ئارام بگرن تا بەمن دەگەنەوە لەسـەر حـەوزی کەوسـەر ), جـا لێـرەدا کەباسـی حـەوزی کەوسـەردەکات بـۆ هاندانـە لەسـەر ئارامگرتن , چونکە بڕواداران تووشی زەحمەت وناڕەحەتی زۆر دەبن لە ژیانی دنیادا..

ژنێکی (صحابی) لـەکاتی کۆچکردندا بۆ مەدینـە زۆر تینـووی بـوو , وەك کەرامـەتێك , لەسـەر سـەریەوە شـتێکی بۆ ڕاگیرا ئـاوی تیـابوو لێـی خـواردەوە , ئیتر هـەرگیز تینـووی نەبوو ..

مامۆستا (نشأة غفور) بۆی گێڕامەوە کە لە کەرکووك لە ساڵی پەنجاکاندا پیاوێکی خواناسی موسڵمان لە دائیرەی پۆستەو گەیاندن لە خەودا ئاوی کەوسەری ئەدەنێ , ئیتر دوای ئەو خەوە هەرگیز تینووی نەبووە !(ئەمە لە دنیادا، ئەبێ لە قیامەتدا چۆن بێت ! ).

**پێشەوا عەلی وئامۆژگارییەك**

؛ پێـشەوا عـەلی (خ.ر) ئامۆژگـاری بـڕواداران دەکـات کـەوەك هـەنگ وابـن ودەڵێـت ( كونوا فی الناس كالنحلة فی الطَير، انه ليس من الطير شیء الا وهو يستَضْعِفُها ولو يَعلمُ الطير مافی اجوافها من البَركَة لم يفعلوا ذلك بهـا ، خـالطوا النـاس بألـسنتكم وأجسادكم وزايِلُوُهُم بأعمالكم وقلوبكم فإن للمرء ما اكتسب وهو يوم القيامة مـع مَـنْ أحبَّ) دارمی ٣١٤/ واتە : لەناو خـەڵکی دا وەك هـەنگ بن لـەناو باڵندەکانـدا , بەڕاسـتی هیچ باڵندەیەك نیە هەنگ نەچەوسێنێتەوە ونـەیخوات, جا ئەگـەر باڵـندەکان بیانزانیایـە چ بەرەکەتێك لە سکیایەتی ئاوایان پێنەدەکرد !

تێکـەڵ بەخـەڵکی ببن بـەزمان وجەسـتەتان و جیـابن لێـان بـەکردەوەودڵتان , بەڕاسـتی مـرۆڤ هەرئـەوەی دەسـت دەکـەوێ کـە هـەوڵی بـۆداوەو, لەقیامـەتیش دا لەگـەڵ خۆشەویستانیدا حەشر دەکرێت.

**بە پەروەردگارم ئەم ئاینە هەقە**

قورئانی پیرۆز زۆر گرنگی دەدات بە دامەزراندنی ئیمان و باوەڕ لە دڵ داو مەبەستێتی کـە گومـان ودوودڵـی نـەهێڵێ , تەنانـەت خـوای گـەورە داوا لەحـەزرەت (ص) دەکـات کـە سوێندیان بۆ بخوات بەپەروەردگاری کەئەم ئاینـەو هەرچی وادەو پـەیمانی تیایـە هەقە ..

هەروەك دەفەرموێت :(وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ) (يونس:٥٣) واتە: بێباوەڕان لێت دەپرسن , ئایا بەرپابوونی قیامەت ڕاستە , ئەم قورئانە ڕاستە ؟؟ پێیان بڵێ: بەڵێ , سوێند بەپەروەردگارم , بەڕاستی ئەوە هەقێکەو پێش دێت وئێوە ناتوانن خوادەستەوسان بکەن ولەدەستی دەرچن ..

(وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لافْتَدَتْ بِهِ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ، أَلا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَلا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ) (يونس:٥٥)

واتە/ ئەگەر هەرچی لەزەویدایە کەسێك کە ستەمی کردووە و (بڕوای نەهێناوە) خاوەنی بێت لەقیامەتدا , ئامادەیە هەر هەمووی بکاتە قوربانی خۆی و ببیەخشێت ( بەڵام دیارە وەرناگیرێت وسوودی نی‌یە) , ئەوانە پەشیمانی حاسڵ دەکەن کاتێك سزاو ئازاری چاوەڕوان نەکراو دەبینن , ئەوسا داوەری لە نێوانیاندا لەسەر بنچینەی هەق دەکرێت وئەوانە بەهیچ جۆرێك ستەمیان لێناکرێت.. خەڵکینە ئاگاداربن بەڵێنی خوا ڕاست ودروستە, هەرچەند زۆربەیان ئەم ڕاستیە نازانن.

(هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدىً وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ ، قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ) (يونس:٥٦ –٥٨)

واتە : هەر خوایە دەژێنێ و دەمرێنێ , هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە , ئەی خەڵکینە , بەڕاستی ئێوە ئامۆژگاری‌یەکی گەورە وگرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە قورئانە , شیفاو چارەسەرە بۆ نەخۆشی‌و دەردە کۆمەڵایەتیەکانیشتان وڕێ نیشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ بڕواداران ، ئەی محمد بەبڕواداران بڵێ : با دڵشادو شادمان بن بەفەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی ( کەقورئانە) , کەوابوو با هەر بەوە دڵخۆشبن , هەرئەوەش چاکترە بۆیان لەهەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوەو کەڵەکەی دەکەن (لەپارەو ماڵ و سامان ) .....

## خوا شایەتی بۆ ئەم قورئانە دەدات

دیارە گەورەترین شایەتی لەم بوونەوەرەدا شایەتی خوایەو هەرئەوە کە ئاگای لە هەموو شتێکەو کەس نیە لەو ڕاستگۆ تر بێت وقسەی تەواو تربێت (وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثاً؟!) (النساء:١٢٢) ....

جا خوای پەروەدگار بە پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت کە بە گەلەکەی بڵێت : (قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ أَإِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُلْ لا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ) (الأنعام:١٩)

واتە: بڵێ چ شتێك گەورەترو ڕاستترە لە شایەتیدا؟ هەر خۆت بڵێ : خوا ڕاسترین شایەتە, کەشایەتی نێوان من وئێوەیە , من ئەم قورئانەشم بە وەحی بۆهاتووە تا ئێوەو هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتوە ئاگادارو بێدار بکەم , ( لەگەڵ ئەم هەموو ڕوون کردنەوانەدا) ئایا ئێوە شایەتی دەدەن کە بەڕاستی لەگەڵ خوادا چەند خوایەکی تر هەبێت؟! بڵێ : من بەش بەحاڵی خۆم شایەتی ناهەق وناڕەوای وا نادەم وبڵێ: بەڕاستی ئەو خوایە زاتێکی تاك وتەنهایەومن بەڕاستی بەریم لەهەموو ئەوشتانەی کە ئێوە دەیانکەنە هاوەڵ و هاوتای ئەو زاتە..ئنجا دەفەرموێت (الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ) (الأنعام:٢٠)

واتە: ئەوانەی کتێبی ئاسمانیمان پێداون لەگاورو جوو, پێغەمبەر(ص) دەناسن هەروەك چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسن , بەڵام ئەوانەی کەخۆیان دۆڕاندو بڕوایان بە محمد (ص) نەهێناوە , ئەوە هەر باوەڕ ناهێنن .(وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ) (الأنعام:٢١)

واتە: جا کێ هەیە لەوە ستەمکارتر بێت , کە شتی نادروست و درۆ, بۆ خوا هەڵدەبەستێت؟ یان ئایەت وفەرمانەکانی خوا بەدرۆ دەزانێت ؟! چونکە بەڕاستی ئەو ستەمکارانە سەرفراز نابن..

بەڵێ... خوای گەورە لەمیهرەبانی وفەزڵی خۆیەتی دەیەوێت بەندەکانی دڵنیا بکات . تاسەرگەردان نەبن , نەکەونە داوی شەیتانەوە , بۆیە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ ( قـل

ای وربی انه لحــق) سویندیان بۆ بخۆو بلێ : سوێند بیێ بەپەروەردگارم ئەم ئایینە هەقە.. ئینجا خوا خۆی دەکات بەشایەت بەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی حەزرەتەوە (ص) ..

**موعجیزاتی پێغەمبەر (ص)**

هەرچەندە خوا شایەتی بۆ پێغەمبەرایەتی (محمد) (ص) دەدات , موعجیزاتی زۆریشی داوەتــی کــە هەمیشە وبەردەوام بەڵگەبن بۆ ڕاستێتی بەرنامەکەی , قورئان گەورەترین موعجیزەیەوئایەت وبەڵگەکانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەردەکەون (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِــي الْآفَــاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقَّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَــى كُــلِّ شَــيْءٍ شَــهِيدٌ) (فــصلت:٥٣) واتە: ئایەتەکانی خۆمان وبەڵگەی زۆریان پیشان دەدەین لەبوونەوەرو دەروونی خۆیاندا تا بۆیان دەربکەوێ وبۆیان بسەلمێت کەئەم قورئانە هەقە, ئایا ئەوە بەس نییە کە خوا ئاگادارو شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە و هیچی لێ ون نابێت وغافڵ نابێت...

جا [پێغەمبەر] (ص) هەرچی فەرمووە لەخواوەیە (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُــوَ إِلَّــا وَحْيٌ يُوحَى ،عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى) (لــنجم:٣- ٥) واتە / (محمد) (ص) هەرچی دەڵێ لە هەواو ئارەزووەوە نیە, بەڵکو وەحی خوایە بۆی و جوبرائیلی خاوەن هێزو توانا بۆی هێناوە..

**ڕووبار لە نیوە دوورگەی عەرەب دا**

پێغەمبەر (ص) لە فەرموودەیەکی (صحیحیمسلیم) دا دەفەرموێ ( لن تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجا وأنهارا) واتە : قیامەت نایەت هەتاوەکو نیوە دوورگەی عەرەب نەبێتەوە بەباخ وبێستان وسەوزایی وڕووبار هەروەك جاران..

ئەم فەرموودەیە هەواڵ دانە بەوەی کە لە ڕابردوویەکی دووردا نیوە دوورگەی عەرەب ڕووباری تیابووەو ئاوەدان بووە , وەقیامەتیش نایەت تاوای لێنەیەتەوە .. زانستی سەردەم وزانایانی جیۆلۆجی ئەم ڕاستییەیان سەلماند، کە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی (محمد) (ص) ..

نیوە دوورگەی عەرەب (أرض العرب) , پشتێنە بیابانێکی تیایەو دەکەوێتە نێوان هێڵی درێژی (٥١) و(٣٠)ی سەرووی هێڵی ئیستیواو خوارووی هێڵی ئیستیواوە..

هەندێ شوێنی وەك (الربع الخالی) ناوچەیەکی بێبارانەو شوێنی وای هەیە بەپەنجا ساڵ جارێکیش بارانی تیا نابارێت .. حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێت بێ وشکوبرنگی وبێ سەوزایی مەککە دەکات لەچەند هەزار ساڵ لەمەو بەرەوەو دەفەرموێت (رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ ) ابراهیم: 37)

واتە: پەروەردگارا من ژن ومناڵم نیشتەجێ کردووە لەدۆڵێکی بێسەوزاییو وشك لەلای ماڵەکەی تۆدا کە (بیت الحرام) کەعبەی پیرۆزە .

کەواتە لەچەند هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە ناوچەکە بیابان بووە , دەی چۆن (ص) زانی کە لە ڕابردوودا نیوە دوورگەی عەرەب ڕووبارو ئاوەدانی زۆر بووەو، قیامەت نایەت تا لەداهاتوودا وای لێ نەیەتەوە..

زانایانی جیۆلۆجی باس لەچاخە سەهۆڵینەکان دەکەن کە هاتوون بەسەر زەویداو سەهۆڵ وبەفرو سەرمای زۆر هەبووەو نزیکەی دە هەزار ساڵ لەمەوبەر تەواو بووەو فەترەیەکی گەرمی هاتووە بەسەر زەوی داو ئێستاش بەرەو ئەوچاخە سەهۆڵیە دەچینەوە.. لەچاخە سەهۆڵیەکەدا بارانی زۆر باریوە لەنیوە دوورگەی عەرەب داو ڕووبارو ئاوەدانی زۆری تیا بووەو لە فەترەی گەرمیەکەشدا وشکی وبێبارانی وبیابان هاتووە بەسەر ناوچەکەدا..

زانای جیۆلۆجی ئەمریکی ( هال ماکلور) لەنامەی دکتۆراکەی دا کەلەبارەی (الربع الخالی) یەوەیە دەڵێت ( دەریاچەی زۆر هەبووە لەنیوە دوورگەی عەرەبدا لەچاخە سەهۆڵینەکاندا , کە دووجاریش دەرکەوتووە , یەکێکیان لەپێش (37) هەزار ساڵ بۆ (17) هەزار ساڵ و, دووەمیش لەپێش دە هەزار ساڵ بۆ (5) هەزار ساڵ پێش ئێستا)..

## وێنەکانی کەشتی یەئاسمانی یەکان

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستداو لەم ساڵانەی دواییدا توانرا زۆر کار ئاسانی بۆ شوێنەوارناسان بکرێت , ئەویش بە هۆی وێنەگرتن وکەشف کردنی ژێر زەوییەوە بۆ چەندەها مەتر..

بۆ نموونە لەساڵی(1981) دا دیراسەی بیابانی میسری کراو زانایانی ئەمریکی بۆیان دەرکەوت کە لەجێی نیلی ئێستا ڕووبارێکی تری گەورە هەبووەو لەئەنجامی گۆڕانی

جیۆلۆجی‌یەوە نەماوەو (نیل) جێی گرتۆتەوە . بەمەش بۆیان دەرکەوت کەچەند هەزار ساڵێك لەمەوبەر بیابانی میسرو سۆدان ئاوەدانی ورووباری تیابووە.. بەهەمان شێوەش دیراسەی نیوە دوورگەی عەرەب کرا لە کەشتیە ئاسمانی‌یەکان ومانگە دەستکردەکانەوە , دەرکەوت کە ڕووبارێکی گەورە هەبووە لەڕۆژئاوای نیوە دوورگەی عەرەبەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕووەو کوێت ڕۆیشتووە, هەرچەندە ئێستا وشك بووەو لم داپیۆشیوە... پاشان بۆیان دەرکەوت کە ڕووبەرێکی فراوانی باکوری خۆرئاوای کوێت دەلتای ئەو ڕووبارە گەورەیە بووە...

دکتۆر (فاروق الباز) دەڵێت : ڕەنگە ئاوێکی زۆری ژێر زەوی هەبێت لە چینەکانی ژێرەوەی زەوی ئەو ڕێڕەوی ڕووبارەداو دیارە شوێنەواری ئادەمیزادیش هەیە لەقەراخ ڕووبارەکەدا کە هی چەند هەزار ساڵ لەمەوبەرە.. ( هەندێ زانای تر دەڵێن کە ئەو ئاوی ژێر زەوی‌یەی ئێستا وڵاتی سعودیە سوودی لێوەردەگرێت , هی سی هەزار ساڵ لەمەوبەرە کەلەژێر زەویدا کۆبۆتەوە)...

## شوێنەواری گەلی ثمود

لە قورئاندا باسی گەلانی دێرین کراوە کە خوای گەورە چۆن لەناوی بردوون وشوێنەواری هەندێکیان دیارەو ماوە , وەك شوێنەواری گەلی سەمود لەناوچەی (حجر)دا , کەلەسەر ڕێی کۆنی نێوان (مەدینە)و (تەبوك)ە..

مەبەست لە (حجر) ئەو شوێنەی گەلی سەمودە کە چواردەوریان بە شاخ گیراوەو لەو شاخانەش خانوویان بۆ خۆیان هەڵکۆڵیبوو , هەروەها بەردیشیان هێنابوو لەدۆڵەکەدا پایەی جوان و بینای جوانیان دروست کردبوو..

(وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً آمِنِينَ) (الحجر:82) ,(وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ)(الفجر :9) واتە :گەلی سەمود کەبەردیان هێنا بۆ ناو دۆڵەکەو بینایان پێ‌دروستکرد ..

کاتێك پێغەمبەر (ص) چوو بۆ غەزای تەبوك بەلای ئەوشوێنەدا تێپەڕین وبەهاوەڵانی فەرموو کە لێی لانەدەن ولەئاوەکەی نەخۆنەوە وپەندی لێوەرگرن.. جا قورئان سەرگوزەشتەی ئەو گەلە لەگەڵ(صالح) پێغەمبەردا باس دەکات وموعجیزەکانی وبانگەوازی ئەو زاتە بەجوانی تۆمار دەکات وسەرەنجامی گەلەکەش کە خوا چۆن لەناوی

بردوون دەخاتە ڕوو , تاگەلانی دواتر خۆیان لەو بەڵای تیاچوون وسزایە بپارێزن وپشت نەکەنە بەرنامەی خوا...

## شوێنەواری گەلی عاد

لە (٢٥) شوێن زیاتردا قورئان باسی گەلی (عاد) دەکات, بەڵام هیچ لەبارەیانەوە نەزانرابوو , چونکە بە ڕەشەبای لم لەناوچوون وشوێنەواریان لم دایپۆشیبوو...

نزیکەی دووسەد ساڵ لەمەوبەر باڵوێزی فەڕەنسی لە قاهیرە قورئانی وەرگێڕایە سەر زمانی فەڕەنسی و پیاوێکی ئینگلیزیش بەناوی (سەیل) لە فەڕەنسیەکەوە وەری گێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی ..

(سەیل) پێشەکیەکی هەشتاو پێنج لاپەڕەیی بۆ قورئانەکە نووسی:خوڵاسەی باسەکەی ئەوەیە کە دەیەوێت گومان دروست بکات لەدڵی ئەو کەسەی کە ئەو قورئانە وەرگێڕاوە دەخوێنێتەوە , بۆ ئەوەی بڕوا نەهێنێت , ناوبراو لە باسەکەیدا دەڵێت: ئەگەر خوا بەڕەحم ومیهرەبانە وەك دەڵێن وقورئان بەو ناوەوە دەست پێدەکەن ( بسم الله الرحمان الرحيم) ئەی چۆن ئەوخوایە ئەو گەلانەی لەناو برد, ئەگەر وایە ولەناوی بردوون کوا شوێنەوارەکانیان ؟؟.

## دۆزینەوەی قەڵایەك

لەساڵی ١٨٣٤ ز دا قەڵایەك لە نزیك شاری (عدن) دۆزرایەوە بەناوی ( حصن الغُراب) , کەلمێکی زۆر دایپۆشیبوو, زۆر شتیان دۆزیەوە , لەوانە پارچەیەك مەڕمەڕ بوو کە ئەمەی لەسەر هەڵکەنرابوو: ( ئێمە ڕۆژگارێکی دوورودرێژی خۆشمان لەم شوێنەدا بەسەربرد , دوور لەناڕەحەتی وناخۆشی وتەنگانە , ئاوی دەریامان لێنزیك بوو , سوودمان لەهەڵکشان وداکشانی وەرگرتو , ڕووبارەکانیشمان ئاوی چاکی تیابوو , لەناو ئەو دارخورما بەرزانەدا , باخەوانەکانمان دارخورمای تریان لەقەراخ جۆگەو شوێنە پێچاوپێچەکاندا دەناشت... ئێمە ڕاومان دەکردو لەقوڵایی دەریاش ماسیمان دەگرت ..ئێمە بەنازەوە پێمان دەنا بەسەر زەویداو جلوبەرگی ئاوریشم وسوندوسمان دەپۆشی... پاشاکانمان پیاوانەو دوور لەنەفس نزمی فەرمانڕەواییان دەکردین وتوندوتیژ بوون بەرامبەر خەڵکانی فڕوفێڵاوی وساختەچی و, شەریعەتێکیان بۆ هەڵبژاردبووین کە لە ئاینی«هود)ەوە وەرگیرابوو, ئێمە بڕوامان بەموعجیزات وزیندوو بوونەوەو قیامەت هەبوو).

دەرکـەوت کەئـەم شـارە پاشمـاوەو شـوێنەواری گـەلی عـادی دووەمـن , واتـە ئـەوەی ئەوانەی کە لەگەڵ (هود) دا ڕزگاریان بوو..

ڕەنگە لەبەر ئەوەش بێت کە قورئان دەفەرموێت (وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عَاداً الْأُولَى، وَثَمُودَ فَمَا أَبْقَى) (لنجم:٥١) واتە: خوا گەلی عادی یەکەمی لەناو برد , کەواتە کە عادی یەکەم هەبێ دووەمیش هەیە, ئەوەش ئەوەبوو کە دۆزرایەوە..

## شوێنەواری گەلی عادی یەکەم

کاتێـک هـود ئامۆژگـاری گەلەکـەی دەکـردو باسـی پاداشـتی بەهەشـتی بۆدەکردن , پاشاکەیان وتی: بەهەشت چیە , منیش دەتوانم لە سەر زەویدا بەهەشتێك دروست بکەم ...ئنجا هەرچی توانای دەسەلاتی هەبوو خستیە کارو , وەستای چاك و پسپۆڕی بینای لەهەموو لایەکەوە خڕکردەوە و پارەی زۆری خستە بەردەستیان , پاش چەند ساڵێك کە شاری (إرم) یان بۆ دروستکردو لەوەدا بوو بگوێزنەوە ناوی , خوای گەورە بە ڕەشەبای لم لەناوی بردن ..بەلام ئاخۆ شوێنەکەیان لەکوێدا بووبێت ؟!

گەڕان بەدوای شوێنەواری (عاد)دا خولیای زۆر کەس بوو , (لورانس العرب)خەوی ئەدی بەدۆزینەوەی ئەم شارەوەو ناوی نابوو (اطلنتس الصحراء)، کەئەمەش ناوێکی ئەفسانەییە, (لورانس)مردو ئاواتەکەی بردە گڵەوە !..

کۆمەڵێ زانای تری شوێنەواریش لەساڵی (١٩٤٧) تا(١٩٥٣)کەوتنە گەڕان , وەك (برترام تۆماس)ی بەریتانی , کە شوێن قسەی بیابان نشینەکان دەکەوت و سەرەنجام ئەمیش هیچی بەهیچ نەکردو ئەم هەوڵانەشی لەیادەوەرییەکانیدا تۆمارکرد ..

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ ز دا ئاسەواری (مەملەکەتی ئیبیلا ) دۆزرایەوە لە سەرووی خۆرئاوای سوریادا , کە دەگەڕێتەوە بۆ دووهەزارو چوارسەد ساڵ پێش زایین ، لەو پاشماوە دێرینانەی کە تیابوو , چەند لەوحێکی قوڕی سورەوکراو بوو کەباسی گەلی عادو شارستانیەکەیانی لەسەر هەڵکەندرابوو..

(نیقولاس کلاپ) دەرهێنەری فیلمی وثائقی ئەمریکی خولیای دۆزینەوەی شوێنەواری عاد بوو...ناوبراو یادەوەریەکانی (برترام تۆماس)ی خوێندەوەو پاش گەڕانێکی زۆر نەخشەیەکی دەستکەوت کە جوگرافیازان و زانای فەلەکی و بیرکاری یۆنانی (کلوديوس بطليموس)کێشابووی لەسەدەی دووەمی پێش زاییندا , کاتێك کە ئەمین مەکتەبەی

ئەسکەندەری یە بوو , وە تیایا ئاماژەی بۆ (ربع الخالي)کردبوو گوایە گەلی عاد لەوێدا ژیاون.. (ئەم خەریتەیە لەمەکتەبەی هنتنگتون دەستی کەوت)..

(کلاپ)لیژنەیەکی پێکهێناو یەکێکیان کەمافناس بوو کردی بە لێپرسراوی پروپاگەندەکردن بۆکارەکەو پارە کۆکردنەوە بۆیان ..

پرۆفیسۆر (زەغلول النجار) دەڵێت : کاتێك ناوی لێکۆڵەرەوەو شوێنەوار ناسەکان ڕاگەیەندراو , زانیم کەهەموو ئەندامەکانی تیمەکە کە (سی)کەس بوون , جوولەکەن .. داوام کرد لەحکومەتی سعودی کە ڕێیان پێ نەدا لەخاکی سعودیەوە داخڵ ببن .. چونکە بەڕاستی جوولەکە ئەمین نین و هەروەك چۆن کەلامیخوایان گۆڕی و پێغەمبەرانیان شەهید کرد , ئاواش ئەو دۆزینەوانە دەگۆڕن و لە بەرژەوەندی خۆیاندا بەکاری دەهێنن , کەمەملەکەتی ئیبیلا شیان دۆزیەوە جوولەکە دەستی بەسەر دۆزینەوەکەدا گرت و لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوو چیویست ئەوەی بڵاوکردەوە..جاحکومەتی سعودی ڕێی نەدان و ئەوانیش چوون لەڕێ ی سەڵتەنەی عومانەوە داخڵ بوون و(سوڵتان قابوس ) یان ڕازی کرد کە ڕێیان بدات وهاوکاریان بکات , ئەویش خۆی وبانقی عومان و کۆمپانیای نەوت زۆرهاوکاریان کردن ..

(کلاپ)لەساڵی ١٩٨٤ دا داوای لەوەکالەتی ناسای ئەمریکی کرد, کە بەهۆی ڕاداری سەرمەکوکە فەزاییەکانەوە وێنەی نیوە دوورگەی عەرەب و (ربع الخالی)بۆبگرن .. ئەوانیش بەهۆی (چالنجر) و مانگە دەستکردەکانەوە دیراسەی ناوچەکەیان بۆکردو وێنەکانیان دایە, کەڕێگای کاروانچیان و شوێنەواری ڕووبارو دۆڵی تیابوو , کەهەندێ شوێنی بە (١٨٣)م لم داپۆشرابوو..

ئەم زانیاریانە هەمووی (کلاپ)سودی لێوەرگرتن و لەساڵی (١٩٩٠)زدا لەڕێی (عومان)ەوە داخڵی (ربع الخالی)بوون و لەبەرئەوەی ناوچەکە زۆر گەرم و ترسناك بوو بەهۆی ئەو لمە ئیسفەنجیەوە کە ڕەشەبا دەیگواستەوە , نەیانتوانی بەردەوام بن و لەم لاشەوە شەڕی عێراق -کوەیت هەڵگیرسا و گەڕانەوەو کارەکە دواکەوت ..

لەساڵی(١٩٩١)ز دا دەستیان کردەوە بەگەڕان لە شوێنی یەکتر برینی ڕێی کاروانچیەکاندا .. پاش شەش ساڵ هەوڵ وزەحمەت وماندووبوون , شاری (إرم)یان دۆزیەوە و ناویان نا (ئوبار), لەپاشماوەی شارەکەشدا پایەی درێژی نۆمەتریان

دۆزیـەوەو بۆیـان دەرکـەوت کـە بەرەشـەبای لم لەناوچـوون وخـاوەنی دەسـەلآت و توانـاو شارستانیەتییەکی گەورە بوون ..

(مرکز دفع النفاث)ی ئەمریکی کەسەر بەوەکالەتی (ناسا)یە ,راپۆرتێکی بلآوکردەوە لەسەر ئەو دۆزینەوەیەو لەسەری راپۆرتەکەدا ئەم ئایەتەیان نووسی (ألم ترکیـف فعـل ربك بعاد ، ارم ذات العماد التی لم یُخلَق مثلها فی البلاد ) (الفجر)پاشان راپۆرتی تر بلآوکرایەوە نەسەری لە :

*گۆڤاری (طیران العُمان)

*گۆڤاری (التایم)

*گۆڤـاری ( لـوس ئـەنجلوس تـایم ) و هـەروەها کۆمپانیـای ئـارامکۆ فلیمێکـی وثائقی لەسەر دەرکرد ..

بەڵێ دەرکەوت :

*ئـەو ناوچـەیە لەکۆنـدا دووڕووبـاری تیـابووە و دەریاچـەیەکی هـەبووە کەتیرەکـەی چەندکیلۆمەترێك بووە ..

*تەختەو زێڕ و زیویان ناردوّتە دەرەوەو .

*پایـەی نۆمـەتریان دروسـت کـردووەو لەسەرپایەکانیـشەوە بینایـان کـردووە , دیـارە ئەمـەش ڕاسـتی قورئـانی سـەلماند.. بەڵی قورئـان پـێش هـەزار و چوارسـەد سـاڵ باسـی پایەکانیان و هۆی تیاچوونیان و شارستانیەتی و دەسەلآتەکەیانی کردووە بە وە سفێکی زۆر کـورت و، زانـستی سـەردەمیش هـەمووی سـەلماند ..(ل ٣٢ گۆڤـاری الاعجـاز /٦ )و (وتارێکی د.زغلول النجار )..( فلیمی دۆبلاژکراوی دەرئەنجامی گەلان / ئارا ) .

**سەرکەوتنی رۆم بەسەر فارسەکاندا**

**گرنگی پێشبینیەکەی قورئان :**

پێـشبینیەکانی قورئـان لایـەنێکی دیـاری ئیعجـازی قورئـانن , کـە خـوای گـەورە بۆپشتگیری پێغەمبەرەکەی هێناویەو , مرۆڤ لە ئاستیانا سەرسام دەبێ ..

ئەو باروزروفەی کە قورئان ئەمەی تیا ڕاگەیاند بێگومان موعجیزە بوو چونکە :

أ-بارو زرووف و ڕووداوەکان بەهیچ جۆرێك ئـەوەی لێنەدەخوێنرایـەوە کـە ئـەو پێـشبینیە دێتەدی ..

ب-دیاری کردنی ماوەی (٣)تا (٩)ساڵ بۆ هەستانەوەی گەلێکی ژێرکەوتووی شپرزی بێ دەسەلاتی وەك ڕۆمەکان لەو سەردەمەدا بەعەقڵی کەسدا نەدەچوو .

بەلام دیارە دنیا هەروا بەگۆترە ناڕوات بەڕێوەو، پەروەردگار دەستی لێ بەرنەداوەو فەرمان هەرفەرمانی ئەوەو چی بوێت لە بوونەوەرەکەیدا ئەوە دەکات و هیچ شتێك نیە بتوانێ دەستەوسانی بکات ..

لەو ڕۆژەدا ڕۆمەکان لەپەلەقاژێی مەرگ وگیانەلادابوون بەدەست فارسە ئاگر پەرستەکانەوە و پەنجا هەزاریان لێ بەدیل گیرابوو لە دوایەمین جەنگیاندا.

دەنگ وباسی سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆمدا گەیشتە مەککەوکافرانی مەککە کەوتنە پڕوپاگەندە ولاف وگەزاف لێدان وتانووتدان لە موسڵمانان , گوایە خۆ فارسەکان بەلای ئێوەوە ئاگر پەرستن و ڕۆمەکانیش ئەهلی کیتابن , ئەی بۆچی فارسەکان سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا ، کەواتە ئێمەش سەردەکەوین بەسەر ئێوەدا , هەرچەندە ئێوە خۆتان بەڕاست دەزانن وخۆتان بەخاوەنی کتێبی ئاسمانی دەزانن ..

ئالەم کاتەدا قورئان هاتە خوارەوەو فەرمووی :( ألم ،غُلِبَتِ الروم ، في أدنى الأرض ، وهُمْ مِن بعدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُون في بِضْعِ سنين ، للهِ الأمرُ مِن قبل ومن بعد ويومئذٍ يفرحُ المؤمنون بنصرِ اللهِ ، ينصرُ مَنْ يشاء وهو العزيز الرحيم ، وعدَالله لايُخْلِفُ اللهُ وَعْدَهُ ولكن أكثر الناسِ لايعلمون ، يعلمون ظاهراً من الحياة الدنيا وهم عن الآخِرَة هم غافلون)الروم ٧ واتە : ئەلیف لام میم ، ڕۆمەکان بەدەستی فارسەکان تێکشکێنران , لەنزیکترین و نزمترین ولاتیاندا , بەلام لە ئایندەدا،نۆرەیان دێتەوەو ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە , لەچەند ساڵێکدا (٣تا ٩)ساڵ ,هەموو کارو فرمانێك تەنها بەدەست خوایە , لەوەو پێش و لەوەو دوایش و لەهەموو کات وشوێنێکدا .. جائەو ڕۆژە بڕواداران خۆشحاڵ و شادمان دەبن , بەسەرکەوتنی خوا کە بەخشی بە بڕواداران , ( کەلەبەدردا سەری خستن ), هەرکەسێك یان هەردەستەیەك ئەوزاتە بیەوێت سەری دەخات , هەرئەو خوایەش خاوەنی دەسەلاتی بێ سنوورە و زۆریش میهرەبانە . بێگومان ئەوە بەڵێنی خوا خۆیەتی کە کێی بوێت سەری دەخات , خوا بەڵێنی خۆی دەباتە سەر, هەرچەند زۆربەی خەڵکی تەنها ڕواڵەت لەدنیا دەزانن وعەقڵیان لەچاویاندایە

, ئەوانە بێئاگاو بێخەبەرن لەڕۆژی دوایی وقیامەت . ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دنیا بەدی دەکەن , لەبەرامبەر قیامەتیشەوە بێئاگان ..

**بارو زرووفی ئەو ڕۆژگارە :**

لەپەڕاوی (انحطاط وسقوط الامبراطورية الرومية)دا مێژوونووسی ئینگلیزی ناسراو (إیدورد جیبون)باسی ئەو سەردەمە دەکات , کە چەندە ڕۆمەکان لاوازو شپرزو بێ دەسەلات بوون : (لەو ڕۆژگارەدا کسری اپرویز (خسرو)لەساڵی ٦٠٣ ی زاییندا هێرشی کردەسەر دەوڵەتی ڕۆم وتوانی قەلاکانی ڕۆمەکان داگیر بکات ولە ڕووباری فورات بپەڕێتەوەو بەرەو شام بکەوێتە ڕێ وحەلەب داگیر بکاو پاشان (أنطاكيـــه) ش بگرێ ، کەپایتەختی بەشی ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی بیزنطی بوو .. ئنجا دیمەشقیان گرت وپاشان خلیل و ڕۆژهەلاتی ئەردەن و، کەنیسەکانیان سوتاندن و هەرچی ماڵی وەقفی تیابوو کە لە سێ سەدەدا کۆکرابوونەوە هەرهەموویان بەتالان برد .. تەنانەت خاچی ئەسڵی (TRUE CROSS)یشیان برد بۆ ئێران و نزیکەی نەوەد هەزار گاوریان کوشت.

ئنجا فارسەکان چوون بەرەو میسرو داگیریان کردو سنووری فارسەکان گەیشتە حەبەشەو تەرابلوسی ڕۆژئاواو بەمەش دەستیان گرت بەسەر زۆر ناوچەی ئەفریقیادا..

**هۆی هێرشی فارسەکان بۆسەر ڕۆمەکان :**

کاتی خۆی کیسرا ابرویز خەسرەو کوڕی هرمزی کوڕی ئەنوشیروان , ڕای کرد لەدەست (بهرام جور), کە هرمزی باوکی لەسەرتەخت هێنایە خوارەوە و, چوو بۆلای ڕۆمەکان و پاشای ڕۆمەکانی ئەوکاتە(موریقس)ڕێزێکی شاهانەی لێگرت و تەنانەت دەڵێن کچی خۆشی دایەو ,پاشان سوپاشی لەگەڵ نارد بە سەرکردایەتیجەنراڵ (نارشز ) و تەختی پاشایی باوو باپیریان بۆسەندەوە لەساڵی (٥٩٠)ی زاییندا .. ئەمەش وای لەخەسرەوشا کرد کە هەمیشە وەك باوکێك سەیری (موریقس)بکات و هەردەم خۆی بەمنەتباری بزانێت . لەساڵی (٦٠٢)زاییندا (منوقس)کەیەکێ بوو لەجەنراڵاتی سوپای ڕۆم شۆڕشی کرد دژی (موریقس)و کوشتی و ماڵ ومناڵی لەناوبردو لەسەر تەختی پاشایەتی (قسطنطينية)دانیشت .. ئنجا سەفیری خۆی نارد بۆلای ئێرانیەکان .

کاتێ کیسرا خەسرەو شا بەمەی زانی زۆر نارەحەت بوو ؛ دانی نەنا بەم حکومەتە تازەیەداو ویستی تۆڵەی (موریقس)بکاتەوە , بۆیە ساڵی ٦٠٣ ی زایینی هێرشی کردە

ســەر دەوڵــەتی ڕۆم (کەئەمــەش حــەوت ســاڵ پــێش هەڵبــژاردنی حــەزرەت (ص)بــوو بۆپێغەمبەرایەتی ..).

**شۆڕشی هرقل :**

لــەو ڕۆژگــارەدا کــە دەوڵــەتی ڕۆم لــە گیانــەڵادا بــوو , هرقــل کــە حــاکمی ئــەفریقیابوو شۆڕشــی کــرد دژی (فــوقس)و لەســاڵی (٦١٠)ز دا ســەرکەوت بەســەریاو کوشــتی , هەرئەوەندە کاروباری گرتە دەست , هەواڵی داگیرکردنــی (انطاکیة) ی پێگەیشت لەلایەن فارسەکانەوە . فارسەکان کۆڵیان نەداو بەردەوام بوون لەسەر داگیر کردن و پەلاماردان وگوێیان بەم گۆڕانکاریانە نەدا , تاساڵی ٦١٦ی زایینی کە ڕۆمەکان تەواو شکان و زۆر وڵاتیان لەدەست داو ئەورووپاش پشێوی و نائارامی زۆر ڕووی تێکرد ..

**برسێتی ڕووی کردە پایتەخت :**

لەساڵی (٣٠٢)ی زایینەوە لەمیسرەوە خواردن و دانەوێڵە دەهات بۆ ( قسطنطینیة)ی پایتەختی ڕۆمەکان و دابەش دەکرا بەسەرخەڵکدا , بۆ ئەوەی خۆش گوزەران بن و لەپایتەختدا بمێننەوەو جێگیر بن , کەچی کەئەو باروزرووفە هاتە پێشێ ومیسر لەلایەن فارسەکانەوە داگیرکرا , بۆیەکەمجار لەساڵی (٦١٨) زایینیدا , ئەو دانەوێڵەو خواردنەی میسر بڕاو نەهات , کە ئەمەش بووە هۆی برسیەتی و تێکچوونی باری گوزەرانی خەڵك لەپایتەختدا ..

**هرقل وگۆڕانێکی سەیر :**

مێژوونووسەکان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە(هرقل) لەگەڵ ئەوهەموو دەست درێژیەی فارسەکاندا بۆسەر وڵاتەکەی , کابرایەکی ساردوسڕو بەندەی هەواو ئارەزووی بوو , هەروەهاخەریکی خورافات و شتانێك بوو کە دوورن لە ڕەوشتی پاشایەکی مەزنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەو بەرفراوان...

ئالەو شەوەزەنگەی ڕۆمەکاندا لەساڵی ٦١٦ی زایینیدا قورئان دابەزییە سەر پێغەمبەری نەخوێندەواری ناو چوار دیواری ماڵێکیقوڕین لەمککەداو پێی فەرموو(غُلِبَتِ الروم في ادنى الارض وهم مِن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبون)..

( جیبون )ی مێژوونووس دەڵێت ( محمد(ص) ئەم هەواڵەی دا لە کاتێکدا کە فتوحاتی ئێرانی و فارسی لەوپەڕی بەهێزیدابوو, لەکاتێکدا کە هەستانەوەی ڕۆمەکان بەعەقڵی

کەسدا نەدەچوو(بگرە هەر ئەستەم بوو)، چونکە دوانزە ساڵی یەکەمی حوکمی هرقل ئەوەی لێدەخوێنرایەوە ، کەباری دەوڵەتەکە ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبێت )ج ٣ ل ٣٠٢ (انحطاط وسقوط الامبراطورية الرومية) ..

لە گەرمەی ئەو هەموو ناهەمواریەی دەوڵەتی ڕۆمەکاندا ، هرقل ویستی (قسطنطينية)بەجێ بهێڵێ و بچێ بۆشاری (قرطاجنه)لەنزیك(تونس)و بیکاتە پایتەختی خۆی .. کەلوپەل و ئاڵتون وهەرچی هەبوو لە کۆشکی پاشایەتیدا سواری کەشتی کران و لەوەدا بوون بڕۆن ، یەکێ لەپیاوە ئایینیەکان زۆر هانی داو وەرەی بەرز کردەوە کەبجەنگێ و پایتەخت بەجێ نەهێڵێ ..

(هرقل)قەناعەتی کردو چووبۆکەنیسەی (st-sophia) وسوێندی بۆخواردن کەژیان و مردنی لەگەڵ ڕەعیەتەکەیدا بێت و بەجێیان نەهێڵێ .

بەڵێ .. گۆڕانێکی گەورە بەسەر (هرقل)دا هات و شەوگاری تاریکی تەمومژاوی گۆڕدرا بەڕۆژی ڕوناك و بووە پاڵەوان و سوارچاکی مەیدان و، هێزەکانی کۆکردەوە لە ( کەنداوی ئەسکەندەرۆنە)وبە بۆنەی لابردنی پەردەش لەسەر پەیکەری (عیسا)، وتارێکی ئاگرینی بۆخەڵکەکە داو ، داوای لێکردن کە تۆڵە بکەنەوە لە فارسە ئاگرپەرستەکان ..

هرقل کەوتە هێرش کردنە سەرفارسەکان و سەرکەوتنی باشی بەدەست هێناو، توانی بچێتە ناوئێرانەوەو دیلە ڕۆمەکان ئازاد بکات و، لە هەڵمەتەکانیدا کارێکی وای بەفارس کرد ، خەریك بوو بەیەکجاری تەفروتوونایان بکات .. هرقل توانی ئاڵای ڕۆمەکان لەسەردڵی فارسەکان لەئێراندا بچەقێنێ و بەسەریانەوە بشەکێتەوە ..

ئەم سەرکەوتنە مەزنەش لەساڵی (٦٢٥) ی زایینیدا بوو کەبەرامبەر ساڵی دووی کۆچی یە (کەموسڵمانان تیایا لەشەڕی بەدردا سەرکەوتن) ..

مێژوونووسان سەرسامن لە گورج بوونەوەو گۆڕانی (هرقل)و دەڵێن : دەستی قەدەر هرقلی برد بەرەو ئەو کارە کە لەخەیاڵی کەسدا نەبوو ، پاشان (هرقل) گەڕایەوە سەرحاڵی جارانی وخەیاڵی دایە کچەجوانەکەی برازای کەناوی (مارتینا)بوو ، هەروەك جارانی کەوتەوە سەر ئەو بیرەی کە نابێت ژیانی پاشاو کاربەدەستان هەر لە گۆڕەپانی جەنگدابێت،ئەم حاڵەش درێژەی کێشا تاڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ سوپای ئیسلامدا .

**موعجیزەكانی ئەو پێشبینییە :**

١ ئایەتەكە دەفەرموێت ڕۆمەكان ژێركەوتن لەنزمترین و نزیكترین ناوچەدا كەئەمەش ڕاستەو, ڕۆمەكان لای دەریای مردوو ژێركەوتن كەنزمترین ناوچەیە لەجیهاندا (في ادنى الأرض)..

٢ ئایەتەكە هەواڵی دا كە لە (بضع سنين)دا سەردەكەونەوە , بۆیە ئەبوبەكر گرەوی كرد لەگەڵ كافرانی مەككەدا و... (ص)پێی فەرموو لە (سێ تا نۆ)ساڵ دیاری بكە .. هەرواش دەرچوو لە نۆ ساڵەكەدا ڕۆمەكان هەستانەوەو سەركەوتن كەهیچ تەفسیرێكی نیە مەگەر ئەوەی كەئیرادەی خوا بوو هەستنەوە , ئەگینا بەهەموو حساباتێكی دنیایی نەدەكرا لەوماوە كەمەدا هەستنەوە , بەتایبەت كەئەوە حاڵی (هرقل)یش بوو ..

٣)ئایەتەكە هەواڵی سەركەوتنی موسڵمانان دەدات شان بەشانی سەركەوتنی ڕۆمەكان , كەدیارە ئەمەش هەرشتێكی سەیرو ئەستەم بوو لەو كاتەدا كەموسڵمانان چەوساوە بوون لەمەككەداو كافران لەوپەڕی دەسەلأت و تواناادا بوون , ئەوەبوو لەو ساڵەدا كە ڕۆمەكان سەركەوتن و هەواڵەكە گەیشتە موسڵمانان , ئەمانیش دڵخۆش بوون بەسەركەوتنیان لەجەنگی بەدردا كەخۆی لەخۆیدا موعجیزەو سەراسیمە بوو , وە لەعەقڵی كەسدانەبوو ..

(ويومئذ يفرح المؤمنون بنصر الله ، ينصر من يشاء وهو العزيز الحكيم وعدالله لايُخلف الله وعده ولكن اكثر الناس لايعلمون )الروم ..

**سەرچاوە** /المدخل الى الدراسات القرانية /ابى الحسن الندوي /ط ٢٠٠٢ ل٨٧

**قسەی كەشتیەوانێكی ئاسمانی !**

**قورئانی پیرۆز دەفەرموێت** (ولو فَتحنا عليهم باباً مِن السَّماءِ فَظلُّوا فيه يَعْرُجُون لقالوا إنَّما سُكِرَت أبصارُنا بل نحن قومٌ مسحورون )الحجر ١٥ **واتە: ئەو بێباوەڕانە ئەگەر دەروازەیەكمان لەئاسماندا بۆبكردنایەتەوە تا پیایدا سەربكەون , ئەوە دەیانووت : بێگومان ئێمە چاوبەستمان لێكراوە وچاومان داخراوە , یاخود ئێمە كەسانێكی جادوو لێكراوین . موعجیزەكانی ئەم ئایەتە :**

١)لەپێنج شوێندا باسی (العروج)كراوە , واتە سەركەوتن بەئاسماندا بەچەماوەیی وبەلاری نەك بەهێڵی ڕاست ، كە ئەمەش لەسەدەی بیستەمدا زانرا , كاتێ مرۆڤ بیری كردەوە لەچوونە دەرەوە لەزەوی و چوونە سەر ئەستێرەكان ..

ئەمەش ئایەتەکانی ترە لەو بارەیەوە :

ا-تَعْرُجُ الملائكة والرُّوحُ إليه في يوم كان مِقدارُهُ خمسينَ ألفَ سنَةَ /المعارج ٤ **واتە : فریشتەکان و جوبرەئیل بەرزدەبنەوە بۆلای پەروەردگار لە ڕۆژێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە بەحسابی ئادەمیزاد (یاخود ڕەنگە مەبەست درێژی ڕۆژی قیامەت بێت کەپەنجا هەزار ساڵ دەخایەنێت بەنیسبەت خوانەناسانەوە) ..**

ب-يُدَبِّرُ الأمْرَ مِنَ السماء إلى الارضِ ثمَّ يَعْرُجُ إليه في يومٍ كان مقدارُهُ ألف سنَةٍ ممّا تَعُدونَ /السجدة ٥ **واتە: ئەو خوایە لەژوور ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێك دەخات و سەرپەرشتی دەکات , لەوەو دوا ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان و کاروکردەوەی بەندەکان دەگەڕێتەوە بۆلای , لە ڕۆژێکدا کە بەرامبەر هەزار ساڵە بەو حسابەی کەئێوە دەیکەن ..**

ج-يَعْلَمُ مايَلِجُ في الارض وما يَخْرُجُ منها ومايَنْزِلُ مِن السَّماءِ ومايَعْرُجُ فيهـا وهـو الرحيم الغفور / السبأ ٢/

**واتە : خواوەند دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویداو چیشی لێ دێتە دەرەوە و , چی لەئاسمان دێتە خوارەوەوچیش پیایدا بەرزدەبێتەوە , بەڕاستی ئەو خوایە میهرەبان و لێخۆش بووە...**

د-يَعْلَمُ مايَلِجُ في الارض ومايَخْرُجُ منها ومايَنزِلُ من السماءِ وما يَعْرُجُ فيها وهو معكم أينما كنتم والله بما تعلمون بصير /الحديد ٤

**واتە :خواوەند دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویدا و چیشی لێ دێتە دەرەوە , چی لە ئاسمان دێتە خوارەوەو چی پیادا سەردەکەوێت ,جالەهەر شوێنێکدا بن ئەوزاتە لەگەڵتاندایەو پێتان دەزانێت , دڵنیا بن کەخوا بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە ..**

**لەهەرپێنج جێگاکەدا قورئان وشەی (یعرج)بەکاردەهێنێت بۆچوون بۆئاسمان , کە ئەمەش بۆخۆی حیکمەتی خوای گەورە دەردەخات کەئەو وشەیەی بەکارهێناوەو تازە زانستی سەردەم تێی دەگات ..**

**٢) ئایا کردنەوەی دەرگا هەروا لە بۆشاییدا دەبێت ؟! دیارە نابێت ! کەواتە کەجاران وادەزانرا ئاسمان بۆشاییە و هیچی تیانیە وانیە , بەڵکو ئاسمان بیناکراوەو ماددەی**

تیایه (والسماءَ بناءً) وئەو دەرگایە لەوئاسمانە بیناکراوەدا دەکرێتەوە کەرێی ڕۆیشتن و دەرچوونی مرۆڤە بۆئاسمان ..

٣ دەفەرموێت (فظلوا فیه یعرجون)واتە گەشتەکەیان لەڕۆژدا بێت , جا هەرچەند ڕۆژەو سەردەکەون کەچی پاش دەرچوون لەوچینە گازیەی ئاسمان کە دەوری زەوی داوە ئیتر تاریکی دەست پێدەکات , واتە گەشتەکە لەشەودانیە , تا وابزانن بەهۆی شەوەوەیە کە ئاسمانەکانیان لێ تاریك بووە .

٣ جاکاتێ مرۆڤ بەرز دەبێتەوە بۆ زیاتر لە (٢٠٠کم)لەئاسماندا و چینی گازی دەوری زەوی دەبڕێت , لەپڕ هەروەك چاوی دابخرێ هیچ نابینێ و تاریکی یە , تەنانەت خۆر وەك بازنەیەکی شین دەبینێ , جائەو ڕوناکی‌یەی ئێمە دەیبینین لەسەر زەوی بەهۆی ئەو تیشکی خۆرەوەیە کە لەچینی گازی‌دا بەهۆی گەردی تۆزو خۆڵ و شتی ترەوە شکانەوە ڕوودەدات و ئابەو جۆرەی لێ دێ کە سەرزەوی ڕوناك بکاتەوە..

قورئان دەفەرموێت (لقالوا إنما سُکِّرَتْ أبصارُنا بل نحن قوم مسحورون).. واتە: ئەگەر بەرەو ئاسمان دەرچن ئەوا دەڵێن بێگومان چاومان داخراوە و جادوومان لێکراوە ..

ئەوەی سەیرە و جێی سەرنجە , یەکەم کەشتیەوان کەچووە ئاسمان و ئەو تاریکی‌یەی دی , چەند قسەیەکی کرد لە وەسفی ئەو حاڵەتەدا کە ئەگەر وەری بگێڕین ئەمە ماناکەیەتی : (من کەچوومە ئاسمان چاوم لەدەست داو هیچم نەبینی هەروەکو ئەوەی جادوو سیحرم لێکرابێت ؟!)..

ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوکەسە بیانی‌یەو بە هیچ جۆرێك ئاگاداری ئەم فەرموودەیەی قورئان نەبووە و سەد دەرسەد قسەکەشی وەك فەرموودەکەی قورئانە (پرۆفیسۆر زغلول النجار) ..

٤) قورئان باسی ڕۆژێك دەکات کە هەزار یان پەنجا هەزار ساڵی ئێمەیە ئەمەش هەر موعجیزەیەو ئێستا زانراوە کە تەنها لەسەر زەویدا ڕۆژێك ٢٤ سەعاتە ولەئەستێرەکانی ترو بوونەوەردا بەجۆرێکی ترە و دیارە کە ئەمە قسەی کەسێکی سەر زەوی نیە کەتەنها شەووڕۆژی ٢٤ سەعاتی دیوە ..

**شتێكمان فێركردویت كه نه‌تده‌زانی !**

**خوای په‌روه‌ردگار به‌ سه‌حابه‌ی** (ص)ده‌فه‌رموێت (ولو لا فضل الله عليك ورَحْمته لَهَمَتْ طائفة منهم أنْ يُضلُّك وما يُضلُّونَ إلاّ أنفُسَهُمْ وما يضُرُونَكَ مِن شئ ، وأنزل الله عليك الكتابَ والحِكْمَةَ وعَلَّمكَ مالَمْ تكُنْ تَعْلَمْ ، وكان فضلُ الله عليك عظيمــا)النــساء ١١٣ **واته: ئه‌گه‌ر فه‌زڵ و ڕه‌حمه‌تی خوا نه‌بوایه‌ به‌سه‌رته‌وه‌ خه‌ریك بوو هه‌ندێكیان سه‌رت لێ بشێوێنن , بێگومان ئه‌وان به‌و كاره‌یان هه‌ر سه‌ر له‌خۆیان ده‌شێوێنن , دڵنیابه‌ كه‌ ناتوانن له‌ هیچ شتێكدا زیانت پێبگه‌یه‌نن , خوای گه‌وره‌ش قورئان و حیكمه‌تی بۆ دابه‌زاندوویت و فێری ئه‌و شتانه‌ی كردوویت كه‌جاران نه‌تده‌زانی , به‌رده‌وامیش فه‌زڵ وڕێزی خوا له‌سه‌ر تۆ ئه‌ی (محمد ) زۆرو فراوان و ئاشكرا و دیاره‌ ..**

**هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت** (وماكُنتَ تَرْجُوا أنْ يُلقي إليكَ الكتابُ إلا رحمةً من ربكَ فــلا تكونَنَّ ظهيراً للكافرين)القصص٨٦ **واته : ئه‌ی (محمد)تۆ به‌ته‌ما نه‌بوویت قورئانت بۆ ڕه‌وانه‌ بكرێت , جگه‌ له‌ میهره‌بانیه‌ك نه‌بێت له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارته‌وه‌ , كه‌واته‌ هاوكارو پشتیوانی كافران مه‌به‌ ..**

**به‌ڵێ..خوای گه‌وره‌ به‌نده‌كانی خۆی چاك ده‌ناسێ , بۆیه‌ بۆهه‌موو مرۆڤ , هه‌رله‌ (١٤)سه‌ده‌ له‌مه‌وبه‌ره‌وه‌ تاڕۆژی قیامه‌ت یه‌ك كه‌سی هه‌ڵبژارد ئه‌ویش حه‌زره‌ت بوو(ص)..**

**ئه‌وزاته‌ هه‌رگیز به‌ته‌مای پێغه‌مبه‌رایه‌تی نه‌بوو , خوای گه‌وره‌ هه‌ڵی بژاردو شتانێكی فێركرد كه‌ نه‌یده‌زانی وخه‌ڵكی ده‌سته‌وسان بوون به‌رامبه‌ری ..**

**موسڵمان بوونی پزیشكێك**

**پێغه‌مبه‌ری خوا (ص)هه‌واڵی به‌هه‌ندێ شتی پزیشكی داوه‌, كه‌ له‌و زه‌مانه‌ی خۆیدا , كه‌س نه‌یزانیوه‌ و زانستی نوێش ڕاستیه‌كه‌ی ده‌سه‌لمێنێت .. عبدالله‌ی كوڕی عه‌مری كوڕی عاص لاوێكی وریاوزرنگ بوو , له‌ماوه‌یه‌كی كه‌مدا فێری سریانی و قبطـــی و ڕۆمانی بوو , حه‌زره‌ت (ص) ڕێی پێدا كه‌ فه‌رمووده‌ بنووسێته‌وه‌ و , ئه‌وه‌ی كه‌ نووسیه‌وه‌ پێی ده‌وترا :** (الـصحيفة الـصادقة)**,كه‌زۆر فه‌رمووده‌ی ڕاست و دروستی حه‌زره‌تی تیا تۆمار كردووه‌و نوسخه‌ی ئه‌سڵیشی له‌شاری (ستوكهولم) ه‌ له‌سوید كه‌ له‌سه‌ر ڕووبه‌ڕێكی فراوان ڕانوێنراوه‌و (عـــرض)كراوه‌ .. له‌و صحیفه‌یه‌ دا هاتووه‌ كه‌پزیشكێكی ناودار كه‌خه‌ڵكی نه‌جران و ناوی ( شه‌مه‌رده‌ل كوڕی قه‌باسی كه‌عبی ) بوو**

. لەشارەزایی ودانایییدا ڕۆم وفارسەکان دەیانبرد وچارەسەری نەخۆشی بۆ دەکردن , کاتێك بیستی کەحەزرەت (ص)هەڵبژێردراوە , چوو بۆلای لە نیوەڕۆوە تاعەسر لەخزمەتیا مایەوەو پرسیاری زۆری لێکردوحەزرەت (ص) وەڵامی هەمووی دایەوە, پاشان حەزرەت کەوتە پرسیار کردن لێی , هەرچی لێ دەپرسی لەوەڵاما دەیووت :نازانم .. ئنجا کە (شەمەردەل)دڵنیا بوو ئەوەی حەزرەت (ص)دەیزانێ لەخواوەیەو بە وەحی بۆی هاتووە بڕوای پێهێنا ..

[redacted] (ص) یەکەم کەسە کە فەرموویەتی ئەگەر لەناوچەیەکدا (تاعون)بلأوبۆوە , نەکەس بچێتە ئەو ناوچەیەوەو نەکەسیشی لێ دەرچێت کە ئەمەش ئەمڕۆ لەلای پسپۆڕان پێی دەوترێ ( الحجر الصحی)و تائێستاش کاری پێدەکرێت ..

هەروەها پێغەمبەر (ص)لە سەدوبیست فەرموودەدا باسی (الطب التشریحی)دەکات کەهەندێکی تازە دۆزراونەتەوە ، بۆنموونە : کەحەزرەت (ص)دەفەرموێت لەلاشەی مرۆڤدا سێ‌سەدو شەست جومگە هەیەو هەقە بەجوڵانی هەریەکەیان مرۆڤ خێرێك بکات . ئاخر ئەگەر پێغەمبەری خوا نەبێ چووزانێ ئەو ژمارەجومگەیە هەیە لە لەشی مرۆڤدا .. کە تاساڵی ۱۹۹۷ زایینی لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەی زانستی پزیشکی‌دا تەنها (۳٤۰)جومگە دۆزرابۆوە , تازانایەکی ئەڵمانی بواری گوێ ولووت و قوڕگ بەناوی (شین)جومگەیەکی ئاوێتەی لەگوێی ناوەڕاستدا دۆزیەوە کەپێك هاتووە لەدەجومگەی بچوك بەمەش ژمارەکە تەواو بوو ، (۳٤۰)لەگەڵ بیست جومگەی هەردوو گوێچکە , دەکاتە (۳٦۰)جومگە هەروەك پێغەمبەر (ص)هەواڵی داوە , کە ئەمەیان بەزانا ئەڵمانیەکە وت لەکۆتایی حەجی ساڵی (۲۰۰۲)دا موسڵمان بوو (وە سەردانی هەیئەی اعجازی عیلمی قورئان و فەرموودەی کرد)...

(کیث مور)یش پرۆفیسۆرێکی کەنەدی‌یەو یەکێکە لەو دوانزە پرۆفیسۆرەی کە بۆ هەر باسێك لە مەسەلەی کۆرپەلەزانیدا پرس بەوان دەکرێت , ویستی بەخەیاڵی خۆی پێغەمبەر (ص)بەدرۆبخاتەوە , لەو فەرموودەیەی دا کە دەفەرموێت کۆرپەلە پاش چل و دووشەو لەڕەحم دا دیاری دەبێت کە نێرە یان مێیە .. زۆر بەوردی دیراسەی کردو بەپێشکەوتوترین ئامێر چاودێری کۆرپەلەی کرد لەڕەحم دا , لە شەوی دەیەم و بیستەم وسی‌یەم وچل و،چل شەوو یەك سەعات و دووسەعات و ... هتد ، تابۆی سەلما کە

تاچل و دوو شەوەکە تەواو نەبێت , ڕەگەزی کۆرپەلەکە دیاری نابێت , لە ئەنجامی ئەمەوە ئەمیش موسڵمان بوو .. لە تەلەفیزیۆنی کەنەدی چەند وتارێکی لەسەر ئەم مەسەلەیە پێشکەش کردو چەندەها قوتابیشی موسڵمان بوون .. لێیان پرسی چۆن دەگونجێ تۆ بڕوات بەحەزرەتی عیسا هەیە و بڕوا بە (محمد) بهێنیێ , ئەویش وتی : (عیسا)و (محمد)سەلامی خوایان لێ بێ لەیەك قوتابخانەوە هاتوون !

## شاژنی بەریتانیاو حیجامە

(ص) پێش زیاتر لەچوارده سەدە دەفەرموێت : (عليكم بالحجامة)نسائی ، واتە : سوود لە کەڵەشاخ گرتن وەربگرن ..

هەروەها چەند جار (حجامە)کراوە بۆ پێغەمبەر (ص)و هەقی داوە بەوکەسەی کەحجامەکەی بۆکردووە (هەروەك لەبوخاری و مسلم)دا هاتووە وهەروەك ابن عباس ڕیوایەتی کردووە (أنَّ النبي (ص)احتجمَ وأعطى الحجَّامَ أجْرَهُ)..

زانایان و پسپۆڕان لەئەمریکا و ئەڵمانیاو چین وسوریاو زۆر وڵاتی تردا گرنگیان داوە بەخوێن گرتن لەپشت و زۆر سوودی لێبینراوە ..

شاژنی بەریتانیا(اليزابيث) تووشی نەخۆشی (هيموفيليا)بوو , کەخوێن بەربوو ناگیرسێتەوەو لەزانستی پزیشکیدا دەرمانی بۆنەدۆزراوەتەوە ، بۆیە لەسوریاوە پزیشکی پسپۆڕیان بۆبردو بە (حجامە)چاك بوو ..

لەوەش سەیر تر ئەوەیە کە لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە دەفەرموێت (عليكم بالحجامة في جوزة القمحدوة فإنها شفاء من اثنين وسبعين داءً ) ل ٣٤ الطب النبوى /واتە : (حجامە) بکەن لەو چاڵیەی کۆتایی کاسەی سەردا کە دەنووسێ بەملەوەو دەکەوێتە ژێر(غودەی نوخامیە)وە , بۆ حەفتا ودوو نەخۆشی شیفایە.. ..

زانایەکی ئەڵمانی لە شتۆتگارد لە ئەڵمانیا دیراسەی ئەم فەرموودەیەی کردو بۆی دەرکەوت کە ئەو غودەیە هەفتاو دوو هۆرمۆن دەردەکات , بەهەر گیرانێك لەو ناوچەیەدا کە ڕوویدات و هۆرمۆنەکان کاری خۆیان نەکەن ئەوکەسە تووشی نەخۆشیەك دەبێت , بۆیە ئەگەر گیران لە دەمارەکاندا ڕوویان دا لەو ناوچەیەدا بەو خوێن لێگرتنە بەردەبێت و چارەسەرە بۆ حەفتاو دوو نەخۆشی .. شایانی باسیشە ئەو زانایە ساڵی پار (٢٠٠٢ ) لە وڵاتی سعودیە موسڵمان بوو ..

## گرنگی دان بەتەندروستی

قورئان و فەرمووده زۆر گرنگیان داوه به لەش ساغی , تەنانەت حەزرەت داوامان لێدەکات که دوعا بکەین و بلێین (اللهم انا نسألك العفو والعافية في الدنيا والآخرة) واتە/پەروەردگارا ئێمە داوای لێخۆش بوون و لەش ساغیت لێ دەکەین لە دونیا و ئاخیرەت دا .. هەروەها پێغەمبەر (ص)دەفەرموێت (لِكلِّ داءٍ دواءُ ، فإذا أصابَ دواءُ الدَّاءَ ، بَرأ باذن الله عزوجل) نسائی واتە : بۆهەر نەخۆشی ودەردێك دەرمانێك هەیە , ئەگەر دەرمانەکە بەکارهێنرا بۆنەخۆشی‌یەکە , بەئیزنی خوا چاك دەبێتەوە .. رۆژێك دەشتەکی‌یەك هاتەلای حەزرەت (ص)وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە دەرمان بەکاربهێنین و بگەرێین بەدوای چارەسەردا (يارسول الله أنَتَداوى ؟ فقال : ياعباد الله تَداوَوْ ، فان اللهَ عزوجلَ لم يَضَعْ داء إلاّ وَضَعَ لَه شَفاءً غير داءٍ واحدٍ ، قالوا :ماهو ؟ قال : الهرم ) ئەحمەد،حەزرەتیش (ص)لە وەلأميا فەرمووی : بەلێ ئەی بەندەکانی خوا , بگەرێن بە دوای چارەسەرداو داوودەرمان بەکاربهێنن , چونکە بەراستی خوا هیچ دەردونەخۆشی‌یەکی دانەناوە ئیللا چارەسەریشی بۆداناوە , تەنها یەك نەخۆشی ودەرد نەبێت ، وتیان : ئەو دەردە چی‌یە ؟؟ فەرمووی :پیری‌یە .. هەروەها دەفەرموێت (إنّ الله تعالى لم يُنْزِلْ داء ، إلاّ أنزل لَهُ دواء :عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ ،وجَهِلَه مَنْ جَهِلَه) حاکم ،واتە : بەراستی خوا هیچ دەردو نەخۆشی‌یەکی نەناردووە ئیللا دەرمانیشی بۆ ناردووە , ئیتر هەرکەس بزانێ دەزانێ و هەرکەسیش نەزانێ ئەوا نازانێ و نایگاتێ ..

ئەمانە هەمووی رێنمایی زۆر گەورەی پزیشکین کەهەقە بە ئاوی ئاڵتون بنوسرێنەوەو بەژوور سەردا هەڵواسرێن , هەرچەند بەداخەوە غەیری ئێمە باشتر قەدری ئەو فەرموودانە دەزانن , تەنانەت لە نەخۆشخانەیەکی گەورەی ئەڵمانیا ئەو فەرموودەیەی حەزرەت وەك حیکمەتێك هەڵواسراوە کە دەفەرموێ :

(ماملأ ادمیُ وِعاء شراً من بطن ، بحسب ابن آدمَ لُقَيمات يُقِمْنَ صُلْبَهُ ، فإنْ كان لا محالة ، فثلث لطعامه ، وثلث لشرابه ،وثلث لِنَفَسِهِ) الترمذي ،واتە: خراپترین شتێ کە مرۆڤ پری بکات گەدەیەتی و ورگێتی , مرۆڤ چەند پاروویەکی بەسە کەپشتی راست بکاتەوە , ئەگەر هەر دەشخوات و چارنیە , ئەوا بایەك لەسەر سێی گەدەی بۆ خواردن و

**یەك لەسەرسێی بۆ خواردنەوەو یەك لەسەر سێشی بە بەتاڵی بمێنێتەوە بۆ هەناسە ..ئەم فەرموودەیە مەگەر هەر لەدەمی پیرۆزی حەزرەت (ص)بێتە دەرەوە , کە بنەمایەکی مەزن و مەسەلەیەکی گرنگە لە تەندروستیدا . ئەوەشمان باسکرد لە پەڕاوی(بەهاری دڵان) دا کەیەك لەسەرسێ ی بۆهەناسە موعجیزەیە و تازە دۆزراوەتەوە ، گەدە کە بەتاڵ بوو , هەوای تێچوو لێیەوە ئۆکسجین دەچێ بۆ خانەکان و وەك هەناسە وایەو زۆر گرنگە ..**

**هەروەها چوار ساڵ لەمەوبەر واتە ساڵی ١٩٩٩ ز لەئەمریکا لێکۆڵینەوە کرا لەسەر ئەوەی کەمرۆڤ چەند خواردنی پێویستە بۆ لاشەی کە تەندروستیەکی باشی بداتێ , بۆیان دەرکەوت کەمرۆڤ تەنها بەیەك لەسەرسێی پڕکردنی گەدەی دەژی و سەرو زیادێتی .. (دکتۆر سمیر الحلو / بەرنامەی** الشريعة والحياة/ ٢٠٠٣)..

## ئاشکرا کردنی فاحیشە و سزای خوا

**حەزرەت (ص)دەفەرموێت** : (يا معشر المهاجرين : خمس إذا ابتليتم بهن ، وأعــوذ بالله أنْ تُدركهن ، لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يُعْلِنوا بها إلا فشا فيهم الطــاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مضوا ، ولم ينقصوا المكيال والميزان إلا أُخِذوا بالسنين وشدة المؤنة وجور السلطان عليهم ، ولم يمنعوا زكــاة أمــوالِهِمْ إلا مُنِعوا القَطر ولولا البَهائم لم يمطروا ، ولم ينقضوا عهد الله وعهد رسوله إلا سلط الله عليهم عدواً من غيرهم فأخذوا بعض مافي ايديهم ، ومالم تحكم أئمتهم بكتاب الله جعل بأسهم بينهم) ابن ماجه وابونعيم . **واتە : ئەی گرۆهی کۆچەرییەکان : پێنج شت هەیە ئەگەر گیرۆدەیان بن , پەنادەگرم بەخوا لەوەی کە تووشیان بن , شەڕواڵ پیسی لەناو هەر کۆمەڵێکا پەیدا ببێ بەجۆرێ کە بەئاشکراو بەبێ شەرم پێ ی هەستن , دەردودرم وئێش و ئازاری ئەوتۆیان تیا بڵاودەبێتەوە کە لەناو پێشینەکانیاندا نەبوون و ، هەرکۆمەڵێ تەرازووبازیان کردو کەمیان دا بەخەڵك وخەڵەتانیانن , تووشی گرانی و نەهاتی و نارەحەتی و ستەمی کاربەدەستیان دێن و , هەرکۆمەڵێ دەستیان بەسەر زەکاتدا گرت و نەیان دا بەوانەی کە موستەحەقن , بارانیان لێ دەگیرێتەوەو , لەبەر چوارپێ وبێ زمانان نەبێت دڵۆپێ بارانیان بۆ نابارێت ..هەر کۆمەڵێك پەیمانی خواو پەیمانی پێغەمبەری خوایان هەڵوەشاندەوە , خوا دوژمنی دەرەوەیان بەسەردا زاڵ دەکات و چیان لەژێر دەستا بێت ئەیبات و , هەرکۆمەڵێك کاربەدەستەکانی بەپێ ی**

فەرمانی خوا فەرمانڕەواییان نەکرد خوا بەریان دەداتە گیانی یەکتری و ئاژاوەو پشێوی بەرپادەبێت ..

بەڵێ .. ئەو ڕۆژەی کەحەزرەت (ص)ئەمەی فەرمووە , کێ توانیویەتی شتی وا بڵێت و , ئەمڕۆش پاش هەزارو چوارسەد ساڵ زیاتر لەئەنجامی ئاشکرا کردنی بەدڕەوشتی و پڕوپاگەندەکردن بۆی و هەوڵ دان بۆبەیاسایی کردنی , دەبینین کە فەرموودەکە لەسەدا سەد ڕاستەو نەخۆشی وا هاتۆتە کایەوە کە لە باوباپیرانی پێشیندا نەبووە , وەك ئایدز کە زۆر لە وڵاتانی گرتۆتەوە , بۆنموونە لەئەفریقیا دێی واهەیە هەموویان بەئایدز قڕبوون و هێشتا حکومەت نەیزانیوە , هەروەها ئۆکرانیاش دەڵێن بەرمیلێك تەقەمەنی تەوقیت کراوە بە ئایدزو کەی تەقیەوە تەفروتوونا دەبن ..

جیهازی بەرگری لەشی ئادەمیزاد نیشانەی دەسەڵاتی خوایە , ئەوخانانەی بەرگری دەکەن دێنە لای ملەوەو لەلای غودەی (ثیموس)شفرەی سی هەزار خانەیان دەردرێتێ کە لەلاشەی ئەو کەسەدا هەیە , تابیان ناسێتەوەو هەرکاتێك میکرۆبێ یان ڤایرۆسێکی بێگانە بێتە ناوەوە پەلاماری دەدەن و لەناوی دەبەن , کەچی کە ئەو میکرۆبانە لەئەنجامی نەخۆشی جنسیەوە بن , ئەوا خانەکانی بەرگری , بەرگری لێ ناکەن , هەروەك خوای گەورە ئاگاداری کردبن کە دەیەوێ سزای بدات لەئەنجامی سەرپێچی کردنیەوە ..

ئەمە لەجیهانی ئادەمیزادا کەچی لەجیهانی ئاژەڵدا لەبەر بەرژەوەندی مرۆڤ تاوەکو زاوزێ زۆر بێت ومرۆڤ سوودیان لێوەربگرێ , بەقەدەری خوا لەگەڵ ئەوەدا کە نێرێك دەچێتە لای چەند مێ و هەموو شتێك لەبارە کەئایدزو نەخۆشی تر بڵاوبێتەوە کەچی بڵاونابێتەوە , ئەمەش حیکمەتێکی گەورەیە و هەقە مرۆڤ سەرنجی بدات .. دیارە ئاژەڵان لەسەر ئەو بەرنامەیەن کەبۆیان دیاری کراوە و هەڵبژاردنیان نیەو لادانیان نیە.

**خورما و سوودەکانی**

حەزرەت (ص)لەبارەی خورماوە دەفەرموێت (خيرُ تمراتكم البَرْنيّ يُذهِبُ الداء)حـــاكم ریوایەتی کردووەو لە صحيح الجامع الالباني /٣٢٩٨

واتە /چاکترین خورماتان جۆری (البَرْنـــيّ)یە( کە خورمایەکیخڕو زەردە )و نەخۆشی ناهێڵێ . یان دەفەرموێت (مَنْ تَصبَّحَ بسبع تمرات عجوة لم يضره ذلك اليوم سُـــمَ و لا

سحر) واتە:کێ بەیانیان حەوت خورمای (عجوه)بخوات ئەو ڕۆژە نە ژەهرو نەسیحر کاری تێناکەن ..

زانستی نوێ دەڵێت خورما ڤیتامین ( ا )و (ب) تیایە کە دەبنە مایەی بەهێزی (ئەعصاب)و دژی نەخۆشییەکانی جگەرن , هەروەها فسفۆری زۆریشی تیایە کە سوودی هەیە بۆ بیرکەوتنەوەو گرنگترین سوود بەخانەکانی مێشك دەگەیەنن .. ئەمە بێجگە لەوەی کە ئاسنی تیایە وسوودی هەیە بۆ خوێن و .. هتد .. بۆیە حەزرەتیش (ص)داوا دەکات لە ڕۆژووەوان کە بەخورما ڕۆژووەکەی بشکێنێ ئەگەر دەستیکەوت و ئەگەر نەبوو ئەوا با بە ئاو بیشکێنێ :(مَنْ وَجَدَ تمراً فليفطر عليه ، ومَن لايجد فليفطر علـــى الماء )أبو داود / ٢٣٥٥ .[١]

**تاقیکردنەوەیەکی سەیر :**

دکتۆر عبدالباسط محمد السيد کەمامۆستای (الكيمياء الحيوية)یە لەمرکزی قەومی بۆ لێکۆڵینەوە لەمیسر , لەسەر ئەم فەرموودەیە هەڵوێستەی کردو وتی:(حەزرەت حەوت دەنك خورمای دیاری کردووە کە لە بەیانیانا بخورێت و بۆ ژەهراوی بوون وسیحر باشە

دیارە دووجۆرە ژەهراوی بوون هەیە دەرەکی و ناوەکی , ئەوەی دەرەوە وەك پێوەدانی دوپشك ومار , ئەوەی ناوەوەش وەك ژەهراوی بوون بەهۆی خواردنی پیسەوە ...

لەبواری پزیشکیدا زانراوە کەیەکێك لەکارەکانی جگەر هەستانە بە دەردانی ماددەی دژە ژەهر ، کە ئەمەش گرنگترین کاری جگەرە لەکاتێکدا کە بە (٢٥) کاروچالاکی هەڵدەستێ و , ئەگەر جگەرنەبێ ڕۆژانە لەش تووشی ژەهراوی بوون دەبێت بەهۆی پیسبوونی کەش و هەوای شارە گەورەکانەوە , بۆنموونە دانیشتوانی شاری قاهیرە , تووشی ژەهراوی بوون دەبن و، ئینزیمێك کەجگەر دەری دەدات بەناوی (جاماجيتی)لە لەشدا ڕێژەکەی زیاد دەبێت .. پزیشکەکانیش (کۆرتیزۆن )دەدەن بە نەخۆشەکە تالەو ژەهراوی بوونە ڕزگاری ببێت .. ئێمەش هاتین دەیان کەس کە ژەهراوی بوو بوون خستماننە ژێر تاقیکردنەوە , بەوەی کە ڕۆژانە یەکی حەوت دەنك خورما بخۆن ، پاش یەك دوو هەفتە ڕێژەی ئەو ئەنزیمە لە سێ قاتەوە دابەزی بۆ ڕێژەی ئاسایی .. ئیتر لەوەوە هەرنەخۆشێك لەوبابەتە بهاتایە هیچ دەرمانم بۆ نەدەنووسی تەنها پێم دەووت کە

بۆ پانزە ڕۆژ هەموو بەیانیەك تەنها حەوت دەنك خورمابخوات .. دواتر بۆمان دەرکەوت کە هەموو نەخۆشیەکی جگەر ئەوخورما خواردنە سوودی پێدەگەیەنێت ..

لەلایەکی ترەوە خورما لاوێتیخانەکانی لەش دەپارێزێ و دەبێتە هۆی دواخستنی پیری .. بۆپێوەدانی ماروودوپشکیش لێکۆڵینەوە بەردەوامە بۆ دەرهێنانی ماددەیەك لەخورما کەچارەسەری بکات , هیواردارم ئەنجامی چاك بەدەست بهێنرێت )..

بۆمەسەلەی سیحریش کە زیاتر شتێکی مەعنەوییەو حەزرەت جلەو گیری لێکردووەو فەرموویەتی هەرکەس سیحربکات ئەوا بێباوەڕ دەبێت( مَنْ سَحَرَ فقد كفـر ) ابوداود ٣٩٠٤ .

پسپۆڕان دەڵێن :کە هەموو کەسێك لەلاشەیەوە شەپۆلی گەرمی دەردەچێت و ئێستا بە ئامێری تایبەت دەپێورێت .. زانای سویدی (روبرت کانزی)توانی بیسەلمێنێ کە هەر مرۆڤێك ڕەنگی ئەو شەپۆلە گەرمیانەی کە لە لاشەی دەردەچێت سیوحەوت ملیۆن ڕەنگەو، کەتێکەڵ دەبن حەوت ڕەنگەکەی شەبەنگ دروست دەکەن (الأطياف السبعة)..

( روبرت کانزی ) لە کۆمەڵگای ئەوروپی خۆی دا ڕێی لە هەرچی دەکەوت بڕێك دوودڵی و ناڕەحەتی هەبوو لەو کۆمەڵگا شێواوەدا ، بۆیە زۆربەیان تێکەڵ بوونی ڕەنگەکانیان هاوسەنگ نەبوون وهەندێك ڕەنگیان زاڵ بووبوون بەسەر ڕەنگەکانی تردا , تاڕۆژێك تاقیکردنەوەی کرد لەسەر موسڵمانێك و دیراسەی ئەو شەپۆلە گەرمی وڕەنگانەی کرد کە لەجەستەی دەردەچێت , بۆی دەرکەوت کە ڕەنگەکان هاوسەنگی تیایە , کە ئەمەش بەڵگەی دڵنیایی و ئارامی موسڵمانەکە بوو، کابرای زانا سەری سوڕما کە موسڵمانەکە پێی وت : پەلە مەکە بادەستنوێژێك بشۆم ئەوسا دەبینی زیاتر ڕەنگەکان ڕێك دەکەون وهاوسەنگ دەبن و زیاتر ئارامی وئاسایشم پێوە دەبینی , کاتێك دەستنوێژی شت و بەئامێری تایبەت فەحسی کرد بینی ئەو (٣٧)ملیۆن ڕەنگەی کە لە شەپۆلە گەرمیەکانی لەشیەوە دەردەچێت ڕێکوپێك و گونجاووتەواون .. کە ئەم ئەنجامەی دەست کەوت موسڵمانەکە ئەم فەرموودەیەی پێ ووت : (مَـنْ تَوضـأ فقـد خرجت ذنوبه من بين عينيه ، ومن بين اذنيه ، ومن بين يديه ، ومن بين رجليه ، فإذا قعد قعد مغفوراً له)احمد ٣٤٩ واتە: هەرکەس دەستنوێژ بشوات گوناهەکانی لەچاوو

گوێ و دەست وقاچی یەوە لێ دەبێتەوەو کەدانیشت وادادەنیشێ کەخوا لەگوناهەکانی خۆش بووە ..

جارێکی تر ( روبرت کانزی ) ئەو شەپۆلە گەرمیانەی کە لەچاوو گوێ و دەست و قاچیموسڵمانەکەوە دەردەچوو پێوایی و بۆی دەرکەوت کە زۆر گونجاوو تەواوو هاوسەنگن ..

هەندێك کەس شەپۆلە گەرمی یەکەی لەخۆی جیانابێتەوە و دوورناکەوێتەوە , لەکاتێکدا هەندێ کەسی تر ماوەیەکی زۆر ئەو شەپۆلە گەرمیانەی دەڕوات .. ( روبرت کانزی ) دیراسەی شەپۆلە گەرمییەکانی (ئەحمەد دیدات)ی کرد لەکاتی (مناظرة)دا لەئەمریکا , بۆی دەرکەوت کە تا دووری زۆر دەڕوات .. سەرەنجامی ئەم دیراساتانە ، ( روبرت کانزی ) بۆی دەرکەوت ئیسلام ئاینێکی هەقەولەخواوە هاتووەوموسڵمان بوو. لەلایەکی ترەوە لێکۆڵینەوەکان دەریان خست کە سیحر کاردەکاتە سەر ئەوشەپۆلە گەرمیانەو دەیشێوێنێ، بەوەش حاڵی ئەوکەسەی کەجادووی لێکراوە تێك دەچێت .. ئنجا هەندێ خواردنیش کاردەکاتە سەرئەو شەپۆلە گەرمیانە , بەمەش لەنهێنیئەوە تێدەگەین کەبۆچی خورما کاریگەری سیحر بەتاڵ دەکاتەوە ..

هەنێ لەوانەی کەخەریکی پاراسایکۆلۆجین لەیابان بۆ دیراسەی ئەم فەرموودەیە خورمایان لە بۆتەیەکی تاقیکردنەوەی شوشەدا داناو تیشکیان لێدا ، بۆیان دەرکەوت کە هەندێ تیشك دەگێڕێتەوە.. ل٥٢ (معجزات الاستشفاء بالغذاء /مجدي الشهاوي)..

**خورما نەخۆشی ناگوێزێتەوە**

حەزرەت (ص)دەفەرموێ (خيرُ تمراتكم البَرْني يُذهِب الداء ، ولاداء فيه) (الطبراني)واتە: چاکترین جۆری خورماتان (البرنی)ەو نەخۆشی چارەسەر دەکات و نەخۆشیشی تیانیە .. لەعێراق بەهاوکاری پسپۆڕانی (منظمة الصحة العالمية ) , تاقیکردنەوەیان کرد لەسەر خورما و لە ئەنجامدا (معهد البكترولوجي العراقي)بەهاوکاری (دكتور أوسكار فيلزنفليد)کە پسپۆڕە لە (منظمة الصحة العالمية)ڕایان گەیاند کە ئەگەر خورما پیس بکرێت بە (جراثيم)ی نەخۆشی کولێرا , پاش سێ ڕۆژ ئەو (جراثيم)انە لەناودەچن وخورما نابێتە ناوەندێك بۆ گواستنەوەی ئەو

نەخۆشی‌یە و ئەم ڕاستیەشیان لەساڵی (١٩٦٦)دا ڕاگەیاندو، ئاشکراشیان کرد کەخورما سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ دەرهێنانی دەرمانی (پەنسلین و ئورومایسین و زۆر لە موضاداتی حیوی و ڤیتامین ١٢ و، هەندێ هۆرمونات ودەرمانی (دیوستولنس)یشی لێ دەردەهێنرێ کە بۆنەخۆشی ڕۆماتیزم و نەخۆشی چاو بەکاردەهێنرێ )...

ئلاعجاز العلمی فی السنة النبویه /د.صالح بن أحمد رضا /ل٢٨٩ جلدی یەکەم

**گرنگی سیواك**

حەزرەت (ص) لە فەرموودەیکی (صحیح )دا دەفەرموێ (السواك مَطْهَرَةٌ للفم مرضاة للرب)... واتە : سیواك دەم و دان پاك دەکاتەوەو مایەی ڕەزامەندی خوایە ... پاش هەزارو چوارسەد ساڵ زیاتر دیراسات کرا لەسەر سیواك و بۆزانایان دەرکەوت کە سیواك

ا-موادی تیایە بۆ چارەسەری ئیلتهابی پووك .

ب-دکتۆر (رودات)بەڕێوەبەری پەیمانگای زانستی (جــــراثیم والأوبئـــــة)لەزانکۆی (روستوك)ی ئەڵمانی ماددەی تیادۆزیەوە کەدژی بۆن کردنی ناو دەمە ..

ج-هەروەها دکتۆر (کینیث کیودیل)ماددەیەکی تیا دۆزیەوە کە نایەڵێ دان کلۆر ببێت .. ئەمانە و زۆرشتی تریش کە ڕەنگە لە داهاتوودا بدۆزرێنەوە ڕەنگە لەپشت گرنگی پێدانی حەزرەتەوە بێت (ص)، بەتایبەت کەفەرموویەتی : (لولا ان أشق على أمتــي لأمــرتهم بالسواك عندِ كل صلاة)احمد واتە : ئەگەر گران و ناڕەحەت نەبوایە لەسەر ئومەتم , ئەوا فەرمانم پێدەدان کە لە کاتی هەموو نوێژەکاندا سیواك بکەن .. ل٥١٠ سەرچاوەی پێشوو

**تاعون ناچێتە مەککەو مەدینەوە** ١

حەزرەت (ص)دەفەرموێت (المدينة ومكة محفوفتان بالملائكة على كل نقب منهـا ملــك لايدخلها الدجال و لاالطاعون)الطبراني.

واتـە /مەککـە و مەدینـە مەلائیکـەت دەوریـان داون و لەهـەموو لایەکـەوە دەیپارێزن , نەدەجاڵ و نە تاعون ناچێتە ناویانەوە .. دکتۆر محمد علی البار دەڵێت( تاعون دەردێکی کۆنەو میسریە کۆنەکان لەسەر پەڕەی (البردی)شتیان لەسەر نوسیوەو باسیان کردووە , لەساڵی ٥٤٢ پێش زایین تاعون لە سەرووی ئەفریقیاو ئەوروپاو ئاسیادا بلاوبۆتەوە و، پەنجا ساڵ لەم ولاتەوە بۆئەو ولات دەگوێزرایەوەو نزیکەی سەد ملیۆن کەسی لەناوبرد ,

بۆیه حەزرەت دەفەرموێ (إن هذا الطاعون رجز على مَن كان قبلكم) واتە: ئەم تاعونە سزایەك بووە لەسەر گەلەكانی پێش ئێوە .. ئنجا تاعون ناوبەناو دەركەوتووە , تەنانەت لەزەمانی حەزرەتی عومەردا لە شاری (عمواس)تاعون بڵاوبۆوە و لەسەدەی چواردەی میلادیش دا ئەوروپا و ئاسیای گرتەوەو تەنها لە ئەوروپادا بیست و پێنج ملیۆن كەسی كوشت كەیەك لەسەر چواری دانیشتوانی هەموو ئەوروپا بوون و ناونرا (المـــوت الأسود).. تائێستاش ناوبەناو بڵاودەبێتەوە لەهیندو وڵاتانی تردا , تەنها دووشوێنێك كە تائێستاو تاقیامەت تیایا بڵاونەبێتەوە مەككەو مەدینەیە كەئەوەش یەكێكە لەموعجیزەكانی حەزرەت (ص)كەخوای گەورە فێری كردووە .. ل ٥٥٠ الاعجاز العلمی في السنة النبوية /مج ١ .

## دیاریكردنی قیبلە

یەكێك لەموعجیزەكانی حەزرەت (ص)دیاری كردنی قیبلەیە لە (قوبـــاء)و (مەدینـــە)ڕووەو (قـــودس)لەســـەرەتاداو دواتـــریش ڕووەو كەعبـــە , دیـــارە پێغەمبـــەر (ص)نەخوێندەوار بووەو هیچی لە زانستی جوگرافیاو فەلەك نەخوێندووە و هیچ ئامێرێك نەبووە كە ئەو كارەی پێبكات , دیارە ئەو دیاری كردنە كە تائێستا ماوەو لەسەدا سەدیش تەواوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەخوا فێری كردووە ..

پاشای فارس فەرمانی دا بە (باذان)كەحاكمی یەمەن بوو (محمد) ی بۆ قۆڵ بەست بكاو بینێرێت , ئەویش دووسەربازی خۆی ناردو لەمەدینە هاتنە مزگەوتەكەی حەزرەت (ص)وتیان ئێمە بەفەرمانی باذان كەئەویش (كسری)فەرمانی پێداوە هاتووین تۆ بەرین , ئەویش فەرمووی : بڕۆن سبەینێ وەرنەوە ..

بۆسبەینێ كەهاتنەوە حەزرەت (ص)پێی فەرموون ( إنَّ ربِّی قتل ربكم الليلة )واتە : ئەمشەو پەروەردگاری من گەورەكەی ئێوەی كوشت (بەدەستی كوڕەكەی‌خۆی ).. ئەوانیش ئەم هەواڵەیان بردەوە بۆ (باذان)، ئەویش كابرایەكی ژیر بوو وتی ئەگەر هەواڵمان بگاتێ و ڕاست دەرچێ , مانای وایە : (محمد)پێغەمبەرە , چونكە كێ توانی هەواڵی بداتێ كە ئەوە ڕوویداوە لە فارس ..پاش مانگێك هەواڵ گەیشتە باذان كە لەو شەوەدا كەحەزرەت (ص)فەرمووبووی كوڕی كیسرا باوكی خۆی كووشتووە ...ئیتر

(بذان) موسڵمان بوو، نوێنەری خۆی ناردەوە بۆلای حەزرەت (ص)و داوای لێکرد کەلە نوێژدا ڕووبکەنە کوێ ؟

حەزرەتیش (ص)بەبێ ئەوەی یەمەنی دیبێ , فەرمووی : بۆ نوێژ ڕووبکەنە فلان شاخ نەوە قیبلەتانە .. شارەزایان دەڵێن تەواوترین قیبلە لەیەمەندا ئەو قیبلەیەیە کەحەزرەت ص)دیاری کردووەو تائێستاش زانراوەو ماوە ..

## پشت بەستن بەخوا

لە بەشەکانی پێشوودا باسی گرنگی دان بەتەندروستی و چوونە لای پزیشك ودەرمان بەکارهێنانمان کرد , دیارە ئەمەش لە شەرعدا فەرمانی پێدراوە و گرتنی هۆکارەکانە کە نابێ فەرامۆش بکرێن ...

بەلاّم ئەبێ ئەوەمان بیرنەچێت کەخوا (شیفا)ئەدات , بۆیە لەفەرموودەکەش دا دەفەرموویێ (فإذا اصاب دواءُ الدّاء ، بَرأ بإذنِ الله عزوجل)نسائي وابن ماجة/ جاموسڵمانی تەواو وتێگەیشتوو ئەوەیە کە هەوڵی بەکارهێنانی داوودەرمان دەدات و ئنجا لەدڵیشەوە دەزانێت بەئیزنی خوا چاك دەبێت و هەمیشە دوعادەکات ولەڕەحمی خوا بێ هیوا نابێت ودەزانێت هەرچی بۆپێش بێت , إن شاء الله خێرە بۆی .. جاری وا هەیە خوای گەورە کەسێك چاك دەکاتەوە لە کاتێکدا پزیشکەکان چاوەڕێی مردنی ئەوکەسەن , یان لەکاتێدا هیچ دەستی بەدکتۆر و دەرماندا نەگەیشتووە و بەهەموو حسابێك دەبێ بمرێت ..

بۆنموونە :

١)کاك ڕەجا محمد علی کەخەڵکی هەڵەبجەیە دەڵێت : باوکم لەشەستەکاندا تووشی نەخۆشی قورحەی دوانزەگرێ بوو , هەرجارێك کەڵێ ی هەڵئەدایەوە , خوێنێکی زۆری لەبەر دەڕۆیشت وناچار پزیشك یەك دوو بوتڵ خوێنیتێدەکرد ... ئەمە درێژەی کێشا تاجارێکیان لە ڕەمەزاندا کە کەوتبووە چلەی زستانەوە , ئازارەکەی لێ هەڵدەداتەوەو کاتێ دەچێتە لای دکتۆر , دەڵێت دەبێ بەزووترین کات نەشتەرگەریت بۆبکەین ئەگینا دەتکوژێت ومەوعیدی سبەینێ ی بۆ دائەنێت ، باوکیشم زۆر لەو نەشتەرگەری یە دەترسا چونکە وەك ئێستا نەبوو , زۆر ئەگەری ئەوە هەبوو کە نەشتەرگەرییەکە سەرنەکەوێت و بەوە بمرێت ..

شەویٚ دەچێتەوە ماڵی خزمێکی لەسلێمانی و بەدەم ئازارەوە خەوی لیٚ دەکەوێت ، لەخەویا لەژووری نەشتەرگەری دایەو سیٚ کەس دێنە ژوورسەری‌و نەشتەرگەری بۆدەکەن و یەکێکیان لە ناوسکی گۆشتپارەیەکی بچووکی ڕەشی لیٚ دەردەهێنیٚ و پیشانی دوانەکەی تری دەدات و دەڵێت : ئەوە نیوەی نەخۆشی یەکەیمان چارەسەر کرد ، ئەوەی ماوە (ان شاء الله)بۆ جارێکی تر ..

کاتێك باوکم خەبەری بۆوە دەستی برد بۆسکی ، وەیزانی بەڕاستی نەشتەرگەری بۆکراوە ، دوایی زانی کەخەوە .. لەدوای ئەمەوە ئیتر نەخۆشی‌یەکە نەماو ، هەربۆ سبەینیٚ چووەوە لای دکتۆرەکەی و ئەویش کەفەحسی کرد سەری سوڕماو وتی : باشەچۆن تۆ نەخۆشەکەی دوێنیٚ ی ؟! ٤

٢)کاك (ظاهیر باهر)تەمەنی چل ساڵ زیاترەو خەڵکی کەرکوکەو ، کە لەئیدارەی لقی یەکگرتووی‌چەمچەماڵ بوو ساڵی دووهەزار بۆی گێڕامەوە و وتی : (چەند ساڵێك لەمەوبەر تووشی ئازاری گورچیلە بووم ، لە کاتێکدا کە سەربازبووم لەبەغدا ، شەوێکیان ئازارەکە زۆری بۆهێنام ومنیش دانم بەخۆمدا گرت و نەمتوانی هیچ بخۆم ، سەعات دوانزەی شەو بەدەم دوعا کردنەوە خەوم لێکەوت و لە پڕ خەبەرم بۆوە ژوورەکە زۆر ڕووناك بوو، سیٚ کەس بەجلی سپیەوە لەسەرسەرم بوون ، هۆشم نەما ، کاتێك بەیانی هاتمەوە هۆش خۆم ، بینیم کە فانیلەکەم بەپێستەکەمەوە نووساوەو چەند دڵۆپ خوێنێکی پێوەیە ، فانیلەکەم لێکردەوە بینیم (١٣)تەقەڵی پێوەیە و دیارە ، بەفەزڵی خوا نەشتەرگەریەکەم بۆکرا بوو ، ئیتر ئازارم نەما .. کاتێك گەڕامەوە ماڵی باوکم لە کاتی (ئیجازە)کەمدا پیشانم دان و کەوتمە گلەیی و وتم ئێوە لێم ناپرسنەوە و ئەوەتا نەشتەرگەریم کردووە لەبەغداو شوێنەکەشم پیشان دان ، ئیتر ئەوانیش خەمیانخواردو ، کەوتنە گلەیی کە بۆهەواڵت نەداوینەتیٚ بێین بۆلات !

٣)مەسەلەی دوعا قبووڵ بوون زۆر گرنگە تیٚ‌ی بگەین و پاشان بێزارنەبین لەدوعا و بە عیبادەت و واجبێکی عەبدایەتی بزانین و هەوڵبدەین لەو کەسانە بین کە دوعایان قبووڵە

حاجی مەلا جەلالی مزگەوتی قامیشان خوا لێی خۆش بێت ، لەحەج دەبێت لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا ، لەویٚ مەلایەك نەخۆش دەکەوێت و برادەرێك بەمامۆستامەلاجەلال دەڵیٚ : ئەوا فلانە کەس خەریکە دەمریٚ و وەزعی زۆر خراپە ، بەڵکو بیٚ‌ی بەلایەوە ،

ماموستاش دەڵێ : هیچ نیە گوێ مەدەرێ , پاش ماوەیەکی تر هانا دەباتەوە بۆماموستاو دەڵێ : چیبکەین وادەمرێ وەرە بەلایەوە ! ماموستاش بە نەخۆشەکە دەڵێ : هەستە هەستە بەخوا ئەو پیاوە نیت لێرە بمریت و حەزرەت شەفاعەتت بۆ بکات .. قسەکەی ماموستا وادەردەچێ و مەلاکە چاك دەبێتەوە !

جامنیش دەڵێم بەداخەوە هێشتا فێری خواناسی و دوعاکردن نەبووین , هێشتا لەخۆمان بەد گومانین لەدوعا کردن دا ونەبووین بەوپیاوەی دوعامان قبووڵ بێت ..

دۆستێك کەساڵی ٢٠٠١ چوو بوو بۆحەج لەئێرانەوە , وتی : لە فڕۆکەخانە بووین و ناوەکان خوێنرایەوەو پەساپۆرتەکان وەرگیرانەوە و کۆمەڵێکمان بەفڕۆکە ڕۆیشتن , ئێمەش ماینەوە لەسەر ژنێك ناویان خوێندبۆوەو لە فارسەکان تێنەگەیشتبوو , کابراش پەساپۆرتەکەی خستبووە گیرفانیەوەو ڕۆیشتبووەوە , هەموو پەکمان کەوتبوو لەسەر ئەو ژنەو کاتیش کاتی حەجەودرەنگە و خواخوای دەقیقەیەکمانە زووتر بچین .. لەم لاشەوە ژنە خۆی دابوو بەزەویداو دەگریاو دەپاڕایەوە و دەیووت: چارەم بکەن ،فریام بکەون ! دۆستەکەم دەڵێ : زۆر وەزعمان ناخۆش بوو، لە نێوان خۆم و خوادا کەوتمە دوعاکردن : خوایە گیان تۆ کارت هەیە دەڵێن , (بین المغرب والعشاء يفعل الله مايشاء)ئەمە سەعاتێ زیاتری دەوێت , ئێمە پەلەمانەو بە (کن فیکون) هکەی خۆت فریامان کەوە یا دوانەکەوین و زووبڕۆین .. خوا ئاگادارە ئەوەندەی نەبرد کابرای ئێرانی پەیدا بوو ناوی پەساپۆرتەکەی خوێندەوەو دامانەوە بەژنەکە , هەرلەوێدا یەکسەر لەسەر ئەرزی فڕۆکەخانەکە سوجدەم برد بۆخوا , زانیم کە تەنها خوایە ئاوا دەمودەست هات بەدەنگمانەوە و ڕزگاری کردین !

دوعای ڕاست و تەواوئەوەیە کە بە یەقین و بەکوڵ ودڵ بکرێت نەك بەغافڵی و ساردو سڕی یەوە کە لە ژوور سەر بستێك بەرز نابێتەوە !

پرۆفیسۆر (ئەنیس الراوی )کەخەڵکی بەغدایە و پسپۆڕە لەفیزیای نەوەوی دا دەڵێت : لەساڵی (١٩٧٦)دا لە لەندەن ماوەیەکی زۆر باران نەباری و زۆر شپرزو پێویست بوون بۆ بارانێکی چاك , هەرچی هەوڵیان دا , تەنانەت بارانی دەستکردیشیان تاقی کردەوە سوودی نەبوو , داوایان لەموسڵمانان کرد کەنوێژی باران بارین بکەن و ئەمەش زۆر گرنگ بوو بۆئێمەو وەکو تەحەددایەکیش بوو , شەوو ڕۆژێك دوعامان کردو پاڕاینەوە

ونوێژی باران بارینیشمان کرد , خوا کردی باران باری و (BBC) لەهەواڵەکانیدا وتی (المسلمون یمطرون السماء!) (بەرنامەی ایات وحوار / قناة اقرا)

## شێوازی بانگەوازکردن

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا داوامان لێدەکات کە بەچاکی بانگەوازبکەین (ادع الی سبیل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتی هی أحسن) واتە /بانگەواز بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و ئامۆژگاری جوان و بە چاکترین شێوەش موجادەلەیان لە گەڵدا بکەن .

**چەند نموونەیەك لەسەر شێوازی بانگەوازکردن :**

**یەکەم: ئیمامی مەرکەزی ئیسلامی یابان :**

شێخ نعمة الله خلیـل ابـراهیم کە ئیمامی‌مەرکەزی ئیسلامیِ یابانە لەبارەی ژیانی خۆیەوە دەڵێت : تەمەنم حەفتاو دووساڵە و , خەڵکی (تورکیا)م , لە تەمەنی لاویتیم دا هەرچەند پارەشم نەبوو , خوای گەورە بۆی ڕەخساندم چووم بۆ حەج , ئەوەندە بەلامەوە خۆش بوو لە ڕێگا زۆر گریام , زۆر کەس لەو گرو عەشق و سۆزەی من نەدەگەیشت بۆخواوپێغەمبەرو وایان دەزانی (شێت)بووم!!

لەمەدینە هەندێ زانام ناسی وپاشان جاری تر سەرداني‌مەککەو مەدینەم کردەوەو لەخزمەت زانایاندا زۆر سوودم وەرگرت و ، وتاری زۆریشم دا بۆجالیاتی ئەوێ ..

ویستم بچم بۆ یابان بۆ بانگەوازکردن , زانایەك پێی وتم : تۆ زمان دەزانیت؟ , وتم : نەخێر ! وتی : ئێمە زمان زانمان ناردووەوهیچی پێنەکراوە , ئاخۆ تۆچیت بۆدەکرێ ؟!

گوێم بەوەنەداو چووم , دیارە نیەتی من تەنها بۆ خوا بوو , بۆگەیاندنی بانگی خوابوو .. هەر کە گەیشتمە یابان , کابرایەکی یابانی موسڵمان هات بۆلام و وتی : من لەمیسر فێری عەرەبی بووم و لەبەرخوا دەبمە وەرگێڕ بۆت ..

ڕۆژێك داوام کرد کە هەندێك خەڵکی یابانم بۆ کۆبکەنەوە , وتیان : خەڵکی هەمووی سەرقاڵی کارن و کەس تاقەتی نیە گوێ بگرێت .. وتم : هەرچۆنێك بێت کۆیان بکەنەوە ومنیش باسی ماددیاتیان بۆدەکەم ..

کاتێك کۆمەڵێکیان بۆکۆکردمەوە پێم وتن : من لەجیهانی ئیسلامی‌یەوە ناردویانم تاسوپاستان بکەم لەسەر ئەو هەمووئامێرە چاکانەی کەبۆتان ناردوین , بەڕاستی ئێمە

زۆر سودمان لیٚ بینیون و ژیانی دنیای ئیٚمەتان خۆش و ئاسان کردووە , جا بۆیە ئیٚمەش دیارییەکمان پیٚیە بۆتان و بانگتان دەکەین بۆدنیایەکی فراوانتر و خۆشتر .. هەموو بەخۆشحاڵیەوە وتیان : زۆرچاکە کوا بەچ پەساپۆرت وفیزەیەك بچین و لەکویٚ یە ؟ منیش وتم : ئیٚمە بۆ بەهەشتی هەتا هەتایی ونەبڕاوە و پڕکامەرانی بانگتان دەکەین و پەساپۆرت وفیزەکەش (لا إلا الله محمد رسول الله )یە ..

پاشان وتم : ئیٚوە لە ئەنجامی ڕیٚز گرتنتانەوە , دەچەمیٚنەوە و دەچنە ڕکوعەوە , کە ئەوەش نیوەی نویٚژەکەی ئیٚمەیە وزۆری ناویٚت بگەن بە ئیٚمە..

بەڵیٚ بەم شیٚوازە نەرم و ناسکە وبە هەوڵی زۆری خواناسان بیست ساڵ لەمەوبەر دوومزگەوت لەیاباندا هەبوو , ئیٚستا بۆتە سیٚ سەد مزگەوت ..

جاریٚك چووم بۆ کۆریا ولەلای مزگەوتیٚك بانگم داو زۆر گریام بۆغەریبی ئیسلام لەو ناوچەیەو بیٚ ئاگایی خەڵکی لەم ئاینە بەرزە پیرۆزە .. چوار لاو هاتن بۆلام , خیٚرا فرمیٚسکەکانم سڕی و بە ڕوویەکی خۆشەوە کەوتمە قسەکردن لەگەڵیاندا ، هەرچەند ئەوەش دەچوو سەرخۆش بن من هانم دان موسڵمان ببن و بڵیٚن : لا إلـــه إلا الله محمـــد رسول الله, ئەوانیش وتیان و پاشان پیٚم وتن : تۆناوت ئەبوبەکرە و ئەویترتان عومەر و سیٚیەمتان عوسمانە و چوارەمتان عەلی ..

پاش دوانزە ساڵ لەمەدینە یەکیٚکیان منی ناسیەوەو هات بۆلام و وتی : من عومەرم کە تۆناوت نام لە کۆریا و ئیٚستا هاتووم کە شەریعەت بخویٚنم لیٚرە ، مەگەر خوابزانیٚ چەند دڵم خۆش بوو , ئاخر چی لەوە خۆشترە بەری ڕەنج و ماندووبوونی خۆت ببینی وخەڵك لەسەر دەستا موسڵمان ببیٚت ..

لەو وڵاتانەش کەموسڵمانی غافڵم دەدی لەعەرەب و لە تورك ، قسەم بۆدەکردن و دەمووت : سەلامتان لیٚ بیٚت ڕۆڵەکانی تیٚکۆشەران (مجاهدين ) , باوك و باپیرتان موسڵمان بوون و ڕەنگە هەموو پارەیان دابیٚ تالەم شویٚنانە ئەم مز گەوتانە دروست کراون , بۆئیٚوە لە دین تەوەلا بوون , بۆناگەڕیٚنەوە سەر ڕیٚبازی سەربەرزی و سەرفرازی ، من دەگریام و ئەوانیش دەکەوتنە گریان ..

پیٚم دەڵیٚن تۆ حەفتا ساڵی و چۆن ناسرەویٚیت وماندوونابیت ؟ , دەڵیٚم : برایینە ئەگەر من دانیشم ماندوودەبم , خۆشی من لەوەدایە کەسیٚك زیاتر موسڵمان ببیٚت ..

بەهاوسەرەکەشمیان دەووت : تۆچۆن بەرگەی ئەوهەمووگەڕان و هات وچۆیە دەگریت ، دەیووت : من بەختەوەرم بەم کارە و خۆمان نەزرکردووە بۆخوا ...
ڕەحمەتی خوای لێ بێت ڕەمەزانی پێشوو وەفاتی کردو دنیای فانی بەجێهێشت (بەرنامەی (صفحات من حیاتی) کەناڵی المجد ) ...

**دووەم: ( سۆزی مظهر )**

ناوبراو بیست ساڵە بانگخوازە بۆئەم دینەو باسی هیدایەتی خۆی دەکات لەسەر دەستی ئافرەتێکی فەرەنسی داو دەڵێت : من لەگەڵ نەنکما دەژیام کەدایکی هونەرمەندی میسری (احمد مظهر) ەو، ناوبراو ماممە ، بەشی ڕوژنامەگەریم تەواو کرد لەکولێژی ئاداب و، زۆر بەخۆما دەنازیم و بە شەقامەکانی گەڕەکی زەمالیك و یانەکان دا دەگەڕام بەوپەڕی شۆخ و شەنگی وخۆنواندنەوەو خەڵکی هەموو چاویان تێدەبڕیم ، نەباوك و نەدایك و نەنەنکم دەرەقەتم نەدەهاتن وچاری منیان بۆنەدەکرا .. بەڕاستی من دووروبێئاگا بووم لە ئیسلام .. هەرچەند لە دەروونما ترسێك هەبوو کەخوای گەورە بمسووتێنێ بەغاز یان بەکارەبا لە ئەنجامی ئەو دووریەیەم لەخواوە ...

من دەمووت : باشە نەنکم واپیرەو بە نەخۆشیش نوێژەکانی دەکات ، باشە چۆن ڕزگارم بێ لە سزای خوا ؟ خێرا لەم خەیاڵاتانە خۆم ڕزگار دەکرد بەوەی دەچووم دەنووستم یان دەچووم بۆ یانەکان ..

کاتێ شووم کرد، لەگەڵ مێردەکەمدا بۆ (شهر العسل)چووین بۆ ئەوروپا ..ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام جارێك سەردانی (فاتیکان)مان کرد لە ڕۆماو ، ویستمان بچین سەردانی مۆزەخانەی پاپا بکەین ، لەبەر دەرگا وتیان دەبێ پاڵتۆ یان چەرمێکی ڕەش لەبەربکەی .. لام سەیر بوو ئەوان ئاوا ڕێز لە ئاینە تەحریف کراوەکەیان دەگرن ، لەدڵی خۆمدا وتم : باشە ئێمە چیمانە ؟ بۆچی ڕێز لە ئاینەکەی خۆمان ناگرین !

لەچڵەپۆپەی خۆشی دنیام دا ڕۆژێك بەمێردەکەم وت : دەمەوێت بچم نوێژێك بکەم بۆخواو سوپاسی بکەم .. ئەویش وتی : تۆسەربەستیت ، چیت پێخۆشە وابکە .. منیش جلێکی سەرتاپام لەبەرکردو چووم بۆمزگەوتی گەورەی پاریس ونوێژێکم کرد . کە هاتمە دەرەوە لەناو دەرگاکەدا ، لەچکەکەم وجلە درێژەکەم کە کردبووم بەسەر جلەکانی

تردا لام بردن, خەریك بووم بیانخەمە جانتاكەمەوە , ئالێرە دا بووخاڵی وەرچەخانم بەرەو خێر !

ئافرەتێكی فەرەنسی چاوشین كە هەرگیز لەیادم ناچێت , جلی سەرتاپای پۆشیبوو , دەستێكی بەنەرمی خستە سەرشانم و بەسووكی پێی وتم : بۆچی سەرپۆشەكەت لائەبەی ؟ نازانی ئەوە فەرمانی خوایە ؟

داوای لێكردم بۆچەند خوولەكێك بچمە مزگەوتەكەوە لەگەڵیا , من دەمویست لەدەستی قوتاربم , بەڵام بەشێوزای جوانی و ڕەوشتی بەرزی ناچاری كردم بچمەوە ناومزگەوت و گفتوگۆ بكەین .

پێی وتم : تۆ شایەتی دەدەیت كە تەنها خوا شایانی پەرستنە ؟ئایا تۆ ماناكەی تێدەگەیت ؟ تۆدەزانی ئەو وتنی : (لا إله إلا الله) یە چەند وشەیەك نیە بووترێ و بەس , بەڵكو دەبێ بە كردەوە ئەوە بسەلمێنیو پابەندی فەرمانەكانی خوا بیت ..

بەڕاستی قسەكانی گەورەترین پەندو ئامۆژگاری بوون بۆم و , دڵی هەژاندم و هێنامیە لەرزە !

ئنجا تەوقەی لەگەڵ كردم و وتی : خوشكم ئەم دینە سەربخە ! بەڵێ .. لەمزگەوت هاتمە دەرەوە و نەم ئەزانی چی وا لە دەوروبەرم , هەرئەو ڕۆژەش بوو كەمێردەكەم بردمی بۆ ئاهەنگێكی شەو كەپیاوان وئافرەتان سەمایان دەكردو جل و بەرگێكی كەمیان لەبەردا بوو , شتی وایان دەكرد ئاژەڵ بە ئاژەڵی خۆیەوە نایكات ! زۆر ڕقم هەستا , خۆم لەبەرچاو كەوت كە لە شوێنی ئاوادام , داوام لەمێردەكەم كرد كە بچینە دەرەوە تاهەوایەك هەڵمژم و هەناسەیەك بدەم .. پاش ئەوە بەخێرایی گەڕامەوە قاهیرەو یەكەم هەنگاوم نابەرەو ئیمان و ئیسلامەتی ..

هەرچەند من لەماددیاتدا نقوم بووبووم و هەرچی دڵم بیویستایە لەخۆشی دنیا لەبەر دەستما بوو , بەڵام تامی هیچم نەدەكرد وخۆشیم لێ نەدەبینی .. تالە قورئان و ئیسلامەتیدا ونبووی خۆمم دۆزیەوەو بەختەوەربووم .. وازم هێنا لەیانەكان و ژیانی جاهیلیەت و نەفامی و كەوتمە هاوەڵی كردنی دەستە خوشكە ئیماندارەكانم..

هەرچەند لەسەرەتاوە مێردەكەم بالاٌ پۆشیەكەمی پێ ئاسایی نەبوو ، هەندێ كێشەمان بۆ دروست بوو , تاخەریك بوو لەیەك جیا ببینەوە , بەڵام خوا بەڕەحمی

خـۆی هیدایـەتی ئەویـشی داو لانـەی لێ نەشـێوانین وئێـستا ئـەو زۆر لـەمن باشـترە و بـانگخوازەو هــەوڵ دەدات بۆئــەم دینــە .. جاهەرچــەند تووشــی بەڵاوموســیبەت و نەخۆشیبووین , بەڵام هەربەختیارین و ئارامگرین و دەڵێین : سوپاس بۆخوا کە بەڵاو موسیبەتەکەمان لەدنیاکەماندایەو لە دینەکەماندا نیە ! ل٥٦ العائدون الـى الله –علـى عبد العال ...

**سێیەم / هەڵبژاردنی باسێك :**

ساڵی (٢٠٠٢ ز)لـە (٢٧) ی رەمەزانـدا , لەچـەند مزگـەوتێك کـە موسـڵمانان تاشـەو درەنگ دەمانەوە , وتارمدا .. پێش ئەوەی کە وتارەکە بدەم بیرم کردەوە چی باس بکەم لەم شـەوەدا کەخـەڵکی بـەڕۆژ بـەڕۆژوو بـوون ومانـدوون , ئنجا وا سـەعات دە ویـانزەی شـەوە , چـی بێـت لـەلای ئـەو موسـڵمانانە خـۆش بێـت و بیریـان نەچـێتەوەو سـوودی لێوەرگرن .. بۆیـە کـاتێ کەوتمـە وتـاردان پـاش سـوپاس وستایـشی خـوای پـەروەردگار ودروودو سـەلام لەسـەرگیانی حـەزرەت و یـاوەران وتم : بەڕێزینــە دەمــەوێ باســی مارو پەیـژەی دینـداریتان بـۆ بکـەم .. هـەمووتان دەزانـن کەمارو پەیـژە هەیـەو یاری یەکـەو یـەکێ زار هەڵئــەداو ئنجـا لەســەر خـشتەکە چـەند خانەیـەك پـێش دەکـەوێت ، یـان سـەردەکەوێ بەپەیـژەدا یـان مارێـك قـووتی دەدات ودێتـەوە خـوارێ ..لەدینـداریش دا بەهەمان شێوەیە , هەندێ کارو کردەوە وەك مارو ئەژدەها کردەوەکان پووچەڵ دەکەنـەوە و لەناوی دەبەن , وەك هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن وخراپی لەگەڵ دایك و باوك و. .هتد هەنـدێ کـردەوەی چاکەش مـرۆڤ بـەرز دەکاتـەوە وەك دەسـتنوێژ و نوێـژەکان کـە ڕۆژانـە گونـاه پـاك دەکەنەوەو ، نوێـژی هـەینی کـەگوناهی هەفتـە دەبـات و عـومرە کـردن و حـەج کـردن کەگوناهـەکانی پێـشین هـەمووی دەسـڕنەوەو شـەهادەتیش کـە لەیەکـەوە دەتباتـە سەدو دەچیتە بەهەشتەوە ...

باسەکە ئامانجی خۆی پێکاو لە سایەی خواوە لە هەموو مزگەوتـەکان مایـەی خۆشـی و ڕەزامەندی ئامادەبووان بوو .. بەڕاستـی ئـەم ئیسلامە دەوڵەمەندەو چواردەسـەدە زیـاترە شـتی لەسـەر دەنووسـرێ , حەیفـە پـەکمان بکـەوێ لـەباس و خواسـی چـاك و گونجـاو لـە شوێن وکاتی پێویستدا ..

ئـای چـەند خـەم دەخـۆم کـە بەهـەزاران کـەس هەفتانـە دەچـنە بەردەسـتی وتاربێژێك لەڕۆژی هەینیدا , کەچی شتێکیان پێنالێ کەسوودی لێ ببینن ..

برادەرێکم ڕۆژێـك قسەیەکی جوانی کرد وتـی : خیتـابی ئیسلامی ئێستا خیتـابێکی تووڕەیـەو زۆر لەماموستاکان لەسـەر مینبـەر خۆیـان تـووڕە دەکـەن بـەبێ ئـەوەی خۆشـی بزانـێ بۆچـی تـووڕە بـووە ؟!! منـیش دەڵـێم بـەخوا هـی واشمـان هەیـە ئـەڵێی ئـاو لای داوەوئەوەنـدە ساردوسـڕە خـەوت لێدەکـەوێت ، یـان وتارەکـەی چـوارکەلیمەیەو لەسـەر وەرەقە دەیخوێنێتەوە خواخواتە زوو تەواوی بکات ..

دکتۆر هومام سعید کە وتاربێژێکی ئەردەنی یە دەڵێت : بۆ هـەر وتارێك پێشتر سەدان لاپەڕە دەخوێنمەوەو هەوڵدەدەم کە هەموو ئامادەبووان سوود وەرگرن ، دوای وتارەکەشم سەیردەکەم ئەگەر ئەو منالأنەی لەگەڵ باوکیان هاتوون بۆ مزگەوت بەزۆر دەستی باوکیان ڕاکێشا بۆئـەوەی بڕۆن بـۆلام تـەعارف بکـەین ئـەڵێم : بـەخوا ڕەنگـە وتارەکـەم کاریگـەری لەسەر هەمووان بووبێت ..

دکتۆر (ئەحمەد شەرباصی) ش کەچەندەها پەڕاوی نووسیوە دەڵێت : کەدەچمە سەر مینبەر یەك هەفتە خۆم ئامادە دەکەم و ئنجا زۆردەترسم کە نەتوانم هـەقی مینبەرەکەی (رسول الله ) بدەم ...

**چوارەم / دکتۆرەیەکی بیانی موسڵمان دەبێت :**

دکتۆرێکی کوردی خۆمان کە لە دەرەوەی ولأتە دەڵێت : دکتۆرەیـەکی ئافرەتی بیـانی دراوسێمان بوو , بۆماوەی دووسـاڵ لـە بۆنەکانـدا دیـاری و پـەڕاوی ئیسلامیم دەدایـەو دڵیمان ڕادەگرت , بەڵکو خوابکا موسڵمان ببێت ..

ڕۆژێك ژنەکەم هەواڵی دامێ کەموسڵمان بووە , زۆرم پێخۆش بوو , وتم ڕەنگە بەهۆی منەوە بووبێ ! کەچی کە بینیم و پیرۆزبایی موسڵمان بوونەکەم لێکردو پرسیارم لێکرد چـی کـاری تێکـردووە .. لـە وەڵامـە کەیـەوە تێگەیـشتم کـە خێزانەکـەم کاریگـەری هـەبووە لەسـەری ، بـەوەی کـەخواردنی خۆشـی لێنـاوە بـۆی نـاردووەو فێـری چێـشت لێنـانی کردووە ..

ڕاستە کتێبەکان ڕەنگە بەشێکی مەسەلەکەبن , بەلأم هـی وا هەیـە لەڕێی (گەدە)یـەوە دەتوانی کاری لەسەربکەیت , ( بیریشمان نەچێ کەجوولەکە لـەزۆر لەولأتـە ئەفریقیـەکان لـەڕێی چێشت لێنەرەکانەوە کار لەسـەر ئـەو سـەرۆکانە دەکـەن و ئەگـەر خـەتی سووریان

بەزاند دەرمان خواردیان دەکەن   ئەمە بێجگە لەوەی کە دەزگای مۆساد دەستیان هەیە لەزۆر لەو وڵاتانەدا , مەبەستمان ئەوەیە کە دوژمنان هەموو هۆکارێك بەکاردەهێنن بۆکاری خۆیان   )

**پێنجەم / پێغەمبەرەکەتان زۆر شارستانی بووە :**

عەمر خالید دەڵێت :ساڵی ١٩٨٨ کۆلێژی بازرگانی قاهیرەم تەواوکردو بۆساڵێك لەگەڵ چەند برادەرێکدا لە بەریتانیا کارمان کرد ، ئافرەتێکی ئینگلیزمان لەگەڵدا بوو ، برادەرەکانم کەخۆیان دەبوون بە عەرەبی قسەیان دەکردو ، کە ئەو ئافرەتەش لەوێدا بوایە بەئینگلیزی قسەیان دەکرد بۆئەوەی ئەویش تێبگات و دڵی شتێك نەکات   ئافرەتەکەش پاش ماوەیەك هەستی بەمە کردو لەم بارەیەوە پرسیاری لێکردن

ئەوانیش وتیان   پێغەمبەر (د.خ ) فەرمانی پێداوین کە لە شوێنێکدا دووکەس چرپە لەگەڵ یەکدا نەکەن و نەبنە مایەی بێزاری کەسی سێیەم

ئافرەتەکە ئەم ڕەفتارەی زۆر پێ جوان بوو وتی   بەڕاستی پێغەمبەرەکەتان زۆر شارستانی بووە

پاش شەش مانگ ئافرەتەکە موسڵمان بوو ، لەبارەی هۆی موسڵمان بوونەکەشیەوە وتی   یەکەم شتێك کاریتێکردم لەم دینەدا ڕەفتاری جوان ومامەڵەی شارستانی بوو لەگەڵ خەڵکیدا کە موسڵمانانی لەسەر پەروەردە دەکات ( الصبر و الذوق _عمرو خالد )

**خزمەتکردنی خەڵکی هۆکارێکی گرنگە لە بانگەوازدا**

**پێغەمبەر (ص)دەفەرموێت**

*أحـــبُّ النـــاسِ الـــى الله أنْفَعُهُـــمْ للنـــاس ....**خۆشەویسترین کەس بەلای خواوە سوودمەنترینیانە بۆئەوانی تر**

*وأحبُ الاعمالِ الى الله عزوجل سرور تدْخُلُهُ على مُسلم..

**خۆشەویسترین کردار لای خوای گەورە خۆشییەکە بیخەیتە دڵی موسڵمانێکەوە**

*أو تَكشف عنه كُرْبَةً   **یان خەم و خەفەتێکی لەسەر لابەریت**

*أو تَقْضيِ عنه دَيْناً   **یان قەرزێکی بۆ بدەیتەوە**

*أو تطْرُدَ عنه جُوعاً   **یان لەبرسێتییەك ڕزگاری بکەی**

*ولأن أمْشِيَ مع أخي المسلم في حاجةٍ أحَبُّ إليَّ مِنْ أن أعْتَكِفَ في هذا المسجدِ شهراً .. ئەگەر لەگەڵ براکەمدا بڕۆم بۆپێویستی‌یەکی لام خۆشترە لەوەی یەك مانگ لەم مزگەوتە دا ئیعتیکاف بکەم ..

*ومَنْ كَفَّ غَضَبَهُ سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ .. هەرکەسێك تووڕەیی خۆی بگرێتەوە خوای گەورە ناتەواوی‌یەکانی دادەپۆشێت .

*ومَنْ كَظَمَ غَيْظاً ولوشاء أنْ يُمْضِيَهُ أمضاهُ ، ملأَ اللهُ قَلْبَهُ رِضاً يومَ القيامَةِ .. هەرکەسێك ڕقی خۆی بخواتەوە ( لە کاتێکدا کە بتوانێ ڕقی خۆی برێژێ بەوکەسەی کە دەیەوێت ) ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دڵی پڕ دەکات لە ڕەزامەندی ..

*وَمَنْ مشى مع أخيه المُسْلِم في حاجَةٍ حتّى يُثْبِتَها لَهُ أثْبَتَ اللهُ تعالى قَدَمَهُ يومَ تَزولُ الأقدام .. هەرکەسێك لەگەڵ برایەکی موسڵمانی بڕوات بۆجێ بەجێ کردنی پێویستی‌یەکی خوای گەورە پێیەکانی دامەزراو دەکات لەڕۆژێکدا کەپێیەکان هەڵدەخزێن ..

*وأن سُوءَ الخُلُقِ لَيُفْسِدُ العمَلَ كما يُفْسد الخَلُّ العَسَلَ ..ڕەوشتی ناشیرینیش کردەوەکار تێك دەدات هەروەك چۆن سرکە هەنگوین خراپ دەکات (صحيح الجامع للألباني١٧٦) ..

**داواکردنی شەهیدی**

منداڵ کە لە دایك دەبێت (معقم)ە و پاش ماوەیەکی کەم میکرۆب و ڤایرۆس دێنەسەر پێستی و دەچنە لەشیەوە .. ئەمانە کاری خۆیان دەکەن بەپێی ئەو بەرنامەیەی کەخوا بۆی داناون , کە دەشمرێت ئەو کەسە هەڵدەوەشێنن .

پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ لا شەیان تێك ناچێ و خوا لاشەیانی حەرامکردووە لەسەرخاك و، ڤایرۆس وجەراثیم و میکرۆب ناچێ بەلایانا , هەندێ جاریش هەندێ شەهید خوای گەورە لاشەیان حەرام دەکات لەسەر زەوی , تاخەڵکی لەپلەی بەرزی شەهادەت تێبگەن و هەوڵی بۆ بدەن ..

١- لەزەمانی حەزرەتی عومەردا لاشەی ئەو منداڵەی اصحابی (اخدود)دۆزرایەوە , (کە بە پاشاکەی وت: تیرەکەی خۆمم تێبگرە و بڵێ بەناوی خوای ئەم منداڵە , ئنجا دەتوانی من

بکوژیت , ئەویش لەتاو ئەوەی لەومناڵە بانگخوازە ڕزگاری بێت کە بەهیچ بۆی نەدەکوژرا , خەڵکی کۆکردەوەو مناڵەیان بەستەوەو , پاشا بەتیروکەوانی مناڵەکە تیرێکی گرتە مناڵەکەو وتی : (بسم الله رب هذا الغلام)ومناڵەکە کە حەوت هەشت ساڵێك تەمەنی بوو شەهید بوو , خەڵکەکەش کە ئەمەیان لەپاشا بیست هەموو وتیان بڕوامان هێنا بەخوای ئەو مناڵە .. ئەمەش وای لەپاشا کرد کە لەچاڵێکی گەورەدا ئاگرێکی گەورەبکاتەوەو هەرچی پەشیمان نەبێتەوە فڕێی بدەنە ناوی .. هەروەك لە سوورەتی ( البروج )دا باسکراوە ) ئنجا لەگەڵ ئەوەدا کەدەیەها ساڵ بەسەر شەهید بوونیا تێپەڕ بووبوو لاشەکەی هیچیلێ نەهاتبوو ..

٢-ئیمام مالیك دەڵێ : عەمری کوڕی جەموح وصحابەیەك بەیەکەوە نێژرابوون , پاش ئەوەی کە لەغەزای ئوحودا شەهیدکران , پاش (٤٦)ساڵ لاشەکانیان گواستنەوە هیچیان لێنەهاتبوو , تەنانەت دەستیان لەسەر برینەکەیان بوو .

٣-جابری کوڕی عبدالله دەڵێ : باوکم لەجەنگی ئوحودا شەهید کراو لەگەڵ هاوەڵێکی تردا نێژرا , پاش شەش مانگ باوکم دەرهێنایەوە وەك خۆی بوو .

٤-لەزەمانی معاویەش دا لاشەی شەهیدەکانی ئوحودیان دەرهێنایەوە کە نزیکەی پەنجا ساڵ بوو شەهید بووبون , لاشەی حەمزە وەك خۆی بوو..

٥-محمد محمود صواف بۆ دکتۆر طارق سوەیدانی گێڕاوەتەوە کە: لەئەنجامی دەرکەوتنی قەبرەکانی شەهیدەکانی ئوحود جارێکی ترلەم ساڵانەی دواییدا گواسترانەوە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك زاناو کەسایەتی ومنیش بانگکرابووم بۆ ئەو مەراسیمە , لاشەی حەمزەم بینی وەك خۆی بوو ئەتووت ئەو سەعاتە شەهید کراوە ..

٦-(محمد أبو زید)لە کەتائبی قەسام شەهید کراو ناشتیان , پاش شەش مانگ براکەشی شەهید کرا , کاتێك لەلایەوە قەبریان بۆ هەڵکەند لایەکی قەبرەکەی محمد داڕما , بینیان لاشەکەی تێك نەچووە ..

بەڵی شەهیدی ئەودەرەجە گەورەیەیە , بۆیە حەزرەت (ص)هانمان دەدا لەسەری و دەفەرموێت : هەرکەس بەڕاستی و لە دڵەوە داوای شەهیدی بکات , پەروەردگار پلەی شەهیدی ئەداتێ ئەگەر شەهیدیش نەبێ و لەسەرجێی خۆی بمرێ ..قورئان دەفەرموێت ( ويتخذ منكم شهداء ) واتە : خوا بۆ خۆی شەهید هەڵدەبژێرێت ..

**٧-ژنی عەبدولاّ عەزام دەڵێ : میردەکەم ئەوەندە ئاواتی شەهیدی بوو دوعای بۆدەکرد , وای لەمنیش کرد کەدوعای شەهیدی بۆبکەم .. ئەوەبوو خۆی و دووکوڕەکەی دەچوون بۆنوێژی جومعە لەئوتومبیلەکەیاندا شەهید کران ..**

**٨-کاتێ بڕیاری لە سێدارەدانی (سيد قطب)دەرچوو , خوشك و براکانی هاتن بۆلای , باوەشی پیاکردن و وتی : دوعام بۆکردوون هەموو شەهید بین , ڕازین ؟؟!, وتیان : بەڵێ ڕازین . ئنجا سەید وتی (سوپاس بۆخوا پانزە ساڵە هەوڵ ئەدەم تاشەهادەتم دەست کەوت )..**

## عومەری کوڕی خەتاب و داواکردنی شەهیدی

**عومەر دووەم خەلیفەی ئیسلامەو حەزرەت (ص)دوعای کرد کەخوا هیدایەتی بدات ،خوای گەورەش عومەری هیدایەت داو بووە مایەی عیززەتی بڕواداران و تۆقینی کافران .. کاتێ موسڵمان بوو , وتی : کێ لەهەموو کەس دەم شڕ ترە , وتیان : فلاّنە کەس , چوو بۆلای و وتی : شتێکت پێ دەڵێم بە کەس نەڵێی , وتی : چیە ؟ وتی : موسڵمان بووم .. کابرا ڕای کردو هاواری دەکرد عومەر لەدین وەرگەڕاوە , عومەریش بەدوایدا دەیووت : نا لە دین وەرنەگەڕاوم ، موسڵمان بووم .. تاخەڵکی مەککە هەموو زانیان ..**

**خەوی حەزرەت بەعومەرەوە :**

**ا-حەزرەت (ص)دەفەرموێ** (بينا أنا نائم رأيت الناس يُعرَضون عليَّ وعليهم قُمصُ ، منها مايبلغ الثدي ، ومنها ما دون ذلك ، وعُرِضَ عليَّ عمر بن الخطاب وعليه قميص يجُرهُ ) ،قالوا : فما أوّلتَ ذلك يارسول الله ؟ قال : الدين .(بخاری ومسلم)

**واتە: نووستبووم لەخەوما ئەو خەڵکەم نیشان دەدران , هەموو سەرو کراسیان لەبەردابوو , هەیان بوو کراسەکەی دەگەیشتە سەر مەمکی و هەیان بوو لەوە زیاتر یان کەمتر بوو , بەلاّم کەعومەر تێپەڕی بە بەردەمما تەماشام کرد کراسێکی ئاودامانی لەبەردابوو بەدوایا دەخشا , هاوەلاّن پرسیاریان کرد : ئەی پێغەمبەری خوا , ئەوەت بەچی لێکدایەوە ؟ فەرمووی : بەئایین ..**

ب-قال (ص) (بينا أنا نائم إذ رأيت قدحاً أتيت به فيه لبن ، فشربت منه حتى إني لأرى الريَّ يجرى في أظفاري ، ثمَّ أعطيت فضلي عمر بن الخطّاب ، قالوا : فما أوّلتَ ذلك يارسول الله ؟ قال : العلم .. (بخاری مسلم)

واتـە: نووسـتبووم , لەخـەوما کـاتێکم زانـی پیالـەیێ شـیریان بۆهێنـام , جـاخۆم لـێم خواردەوە هـەتا تـەواو پـاراو بـووم و شیر لەسـەری نینۆکەکانمـەوە سـەری کـرد و ئنجا ئەوەی مابۆوە دام بەعومەر , وتیان : بەچی لێکی دەدەیتەوە ؟ فەرمووی : بەزانین وعیلم

ج-قال (ص) : بينا أنا نائم رأيتني في الجنَّة فإذا امرأةُ تتوضأ إلى جانب قصر ، فقلت : لمن هذا القصر ؟ قالوا :لعمر ، فذكرت غيرته فولَّيت ، فبكى عمر وقـال : أعليـك أغارُ يارسول الله . (بخاري ومسلم)..

واتـە :خـەوتبووم , لەخـەوما لـە بەهەشـتدا بـووم , ئـافرەتێکم بینـی لـەپاڵ کۆشـکێکا دەسـتنوێژی دەگـرت , پرسـیم : ئـەم کۆشـك و تـەلارە هـی کێـیە ؟ وتیـان : هـی عومـەرە , (ویستم بچمە ناوی و سەیری بکەم), غیرەتی عومەرم بیرکەوتەوە , ئیتر گەڕامەوە , عومەر گریاو وتی : چۆن غیرە لە تۆدەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ..

د-قال (ص):(رايت الناس مجتمعين في صعيد ، فقام أبوبكر فنزع ذنوباً أو ذنـوبين ، وفي بعض نزعه ضعف ، والله يغفرله ، ثم أخذها عمر فاستحالت بيده غربـاً ، فلـم أرى عبقرياً في الناس يفري فريه ،حتى ضرب الناس بعطن) بخاري ..

واتە :لەخەومدا بینیم خـەڵکی لەشوێنێکدا کۆبوونـەوە , ئەبوبەکر یەك دوو دۆڵچەنە ئاوی هەڵگۆزت , لە بەشێك لە هەڵگۆزینەکەیدا لاوازی تیابوو ,خوا لێی خۆش دەبێت , پاشـان عومـەر لـە دەسـتی وەرگـرت , بە دۆڵـچەنەیەکی گەورەتر ئـاوی هـەڵگۆزت , کەسم نەدیوە لەخەڵکیدا وەك ئەو بلیمەت و(عبقری)بێت و شان بدات لەشانی , بەجۆرێك ئـاوی دەرهێنا کەنەك مرۆڤەکان بەڵکو مەڕوماڵات و ئاژەڵیشی تێر ئاوکرد ..

بـەڵێ .. عومـەر لـە قوتابخانـەی ئیسلامدا بـوو بـەو عومـەرەی کـە دادپەروەرییەکـەی لـەدنیادا دەنگـی دایـەوەو ، تـوانی دینـی خـوا بەچـاکی بـچەسپێنێ و، لـەدوا ڕۆژەکـانی تەمەنیـشیدا دوعـای کـردو فـەرمووی : خوایـە شـەهادەت بکـەی بەنـسیبم لـە شـارەکەی پێغەمبەرەکەتدا .. حفصەی کچی پـێی وت :ئاخر چۆن دەبـێ , ئەگەر دەتـەوێ شەهید ببی بچۆ بۆ بەرەکانی جەنگ ..

عومەر وتی : ئەوە دوعایەکەو من کردومەو (إن شاء الله)دەبێت ..

باشه عومەر ئەو هەموو مەدحەی کراوە لەلایەن حەزرەتەوە و مژدەی بەهەشتیشی دراوەتێ , چی داوە لە شەهیدی ؟! دیارە هیممەتی بەرز وایە , دەیەوێ گیانی بکاتە فیدای ئیسلام و لەگەڵ شەهیداندا حەشرکرێ و بەبێ لێپرسینەوە بچێتە بەهەشتەوە ..

(نەك هەرئەوەندە بەڵكو زۆر لەهاوەڵان ئەگریان بۆئەوەی کەتەنها یەك رۆحیان هەیەو یەك جار دەتوانن بیکەن بەقوربانی بەرنامەکەی خوا و، ئاواتیان بوو پاش شەهیدی چەند جار زیندوو بکرێنەوەو شەهید ببنەوە ! دیارە ئەمەش ئاواتی ماموستاو سەرمەشقی موسڵمانان , دوا پێغەمبەری مرۆڤایەتی بوو کە دەیفەرموو (والذي نفس محمد بيده ،لوددت أن أغزو في سبيل الله فأُقتل ، ثم أغزو فأُقتل ، ثمّ أغـزو فأقتـل ) بخاري ومسلم/ واتە :بەوخوایەی گیانی محمدی بەدەستە , حەزدەکەم کەبجەنگم لەرێ ی خواداو شەهید بم , پاشان زیندوو ببمەوەو بجەنگم و شەهید ببمەوە ! ،پاشان زیندوو ببمەوەو بجەنگم و شەهید ببمەوە !)

بەڵێ .. خوا دڵی عومەری نەشکاندو دوعاکەی لێوەرگرت و ئەبو (لؤلؤة)ی مەجوسی شەهیدی کرد لە نوێژی بەیانیدا , لەوکاتەدا کەعومەر سوورەتی یوسف ی دەخوێندو گەیشتبووە ئایەتی (وأبيضت عيناه من الحُزن فهو كظيم)يوسف ٨٤ / عومەر دەگریاو موسڵمانانیش دەگریان ..

عومەر بە بریندراری کەوت و عبدالرحمان ی کوڕی عوف نوێژەکەی بۆ موسڵمانان تەواو کرد .. کەس نەیدەزانی مەسەلە چی یە , بۆ دەنگی عومەر گۆڕا بەدەنگێکی تر ! دواتر عومەر بەتەنها پاش چەند جار بورانەوەو هاتنەوە هۆش خۆی نوێژەکەی بە بەرگی خوێناویەوە تەواو کرد ..

**عومەر لەسەرەمەرگدا :**

عومەریان بردەوە ماڵەوە , گەنجێك سەری لێ دا , کەعومەر بینی جلەکانی زۆر درێژە پێی فەرموو : بەڵكو جلەکەت هەڵكێشی , پاك تردەبێ و خواشت لێ رازی دەبێت .. (سەیرە فەرمان بەچاکەدان و جڵەو گیری لەخراپە لەسەرە مەرگیش دا ؟!!.. ئاخر ئەوان ئاوا تێ ی گەیشتبوون بۆیە بوونە سەردارو پێشەوای عالەم ..)

عومەر داوای کرد کەپرسیار بکەن لەخاتوو عائیشە کە ئاخۆ رێی دەدات لای سەرداری پێغەمبەران و هاوەڵی ئازیزی ئەبوبەکرەوە بنێژرێ , عائیشەش دڵی نەشکاندو وتی :

حەزم دەکرد بۆخۆم بێت بەڵام باوی عومەر ئەدەم بەسەر حەزی خۆمداو باپیرۆزی ئەوبێت ! ئیبن عەبباس دەڵێ : عومەر وەفاتی کردو لەسەر دارە مەیتێك دایان ناو موسڵمانان نوێژیان لەسەر دەکردو بۆی دەپاڕانەوە , ئیمامی عەلی هات وشانی گرتم و بۆحەزرەتی عومەر پاڕایەوەو وتی : کارێکی مەردانەی وات کردووە , کە کەس نیە وەکو تۆ حەزبکەم چاوی‌لێ بکەم و کردەوەکانی بکەم و, حەزبکەم بەهاوشێوەی کردەوەکانیەوە بگەمەوە بەخوا .. بەڕاستی هیوام وایە کە خوا بتگەیەنێ بە دووهاوەڵەکەت , چونکە گەلێ جار گوێم لەحەزرەت بووە کە دەیفەرموو : من و ئەبوبەکرو عومەر ڕۆیشتین ،من و ئەبوبەکرو عومەر هاتین، من و ئەبوبەکرو عومەر دەرچووین .. (بخاری ومسلم)

*سەلامی خوات لێ بێ عومەر ئەوکاتەی کە نزای حەزرەتت بۆگیرابوو ..

*سەلامی خوات لێ بێ عومەر ئەوکاتەی کەموسڵمان بوویت ..

*سەلامی خوات لێ بێ ئەوکاتەی کەحەزرەت ئەهاتە ناوهاوەڵانەوەو هەمووان سەریان دادەخست ، تەنها تۆو ئەبوبەکر نەبێ کەسەیرتان دەکردو زەردەخەنەتان لەسەر لێو بوو بۆی و ئەویش زەردەخەنەی لەسەر لێو بوو بۆتان (ترمذی گێڕاویەتیەوە)..

*سەلامی خوات لێ بێ ئەو ڕۆژەی هاتی بۆماڵی حەزرەت (ص)و بینیت خەمبارە ووتت : ئێستا قسەیەك دەکەم کەپێبکەنێ ، قسەیەکت کردو حەزرەتت هێنایە پێکەنین ..

*سەلامی خوات لێ بێ ئەو ڕۆژەی کە شەهید بوویت و گەیشتیتە کاروانی شەهیدانی بەرنامەی خوا , ئەی ئەو کەسەی کەپێغەمبەر (ص)بەوەزیری خۆی دەزانیت و جارێکیش فەرمووی : ئەبوبەکر و عومەر وەك چاووگوێ وان بۆم ! (ترمـــذی گێڕاویەتیەوە)(سەیری التاج الجامع للاصول بکە بەرگی پێنجەم / وەرگێڕانی مامۆستا نوری فارس)ل ١٥ .

## گۆڕ یەکەم مەنزڵی قیامەتە !

قورئان دەفەرموێت (ألهاكم التكاثر حتى زرتم المقـــابر).. سەرقاڵن بەزۆرکردنەوە , کۆشکێك , دووکۆشك ؟؟! نا , سەدان کۆشکیش چاوتان تێرناکات , ملیۆنێ , دووملیۆن ؟؟! نا , ملیارەهاش چاوتان پڕناکات و, بەڕاستی هەر گڵە کەچاوی مرۆڤ تێرکات ..

مرۆڤی واهەیە شەوێك جێی لێدەگۆڕدرێت خەوی دەزڕێت ! خۆزگە ئەم شوێنەی ئەم شەوی چاکتربێ لەماڵەکەی خۆشی , کەچی جێی لێگۆڕدراوەو خەوی لێناکەوێت , باشە .. جێگۆڕینێ لەم ماڵ و حاڵە خۆشەوە بۆقەبری تەنگ و تاریك ئەبێ چۆن بێ ؟

**پیاوباشان لەبەردەم ئەم ڕاستیە تاڵەدا هەڵوێستەیان کردووەو ، عوسمانی کوڕی عەفان کەجەنازەیەکیان دەبرد بۆ ناشتن ، لەسەر قەبران زۆر دەگریاو فرمێسك کوڵم و ڕیشی تەڕدەکرد ، دەیانووت :چی بووە ، بۆچی وا بەکوڵ دەگریت ؟! دەیووت : لەحەزرەتم بیستووە کە دەیفەرموو** (القبـــر أول منـــازل الاخـــرة) **قەبر یەکەم مەنزڵی ئاخیرەتە ! ...**

**مردن گەنجی و پیری نازانێ ، کەی هات بە ئەمری خوا دێت ، خەلیفە (معتصم)فەرمانیدا بە بەندکردنی (ئەحمەدی کوڕی حنبل)و سزادانی ، وایدەزانی دنیا تاسەر بۆئەودەبێ ، جا دیارە وانیە ، هەرزوو مردن یەخەی گرت و ناوبراو لە سەرەمەرگدا فەرشەکەی لابردو ڕوومەتی خستە سەر زەوی و زۆر گریاو وتی : ئەی ئەوکەسەی کەموڵك و دەسەڵاتی ناوانابێت ، ڕەحم بکە بەکەسێك کەموڵك ودەسەڵاتی ناوابوو ، ئنجا وتی ئەگەر ئەمزانی بەگەنجی ئەمرم هەرگیز گوناهم نەدەکرد !**

**کاتێ هارونە ڕەشید کۆشکێکی خۆشی لەسەر دیجلە بۆخۆی دروست کرد ، خەڵکی هاتن بۆ پیرۆزبایی و یەکێ لەوانە (أبو العتاهیە)ی شاعیر بوو بەخەلیفەی وت :**

عش مابدا لك سالماً       في ظلّ شاهقة القصور

**واتە بژی چەند دەتوانی بەخۆشی لەم کۆشك و تەلارە بەرزە خۆشەدا ..**

يجري عليك بما اردت       من الغدوّ مع البكور

**واتە : هەرچیت بوێ خزمەتکاران دەیهێننە بەردەستت بەیانیان و ئێواران .. بەڵام بەداخەوە :**

فإذا النفوس تغرغَرَتْ       بزفير حَشْرَجةِ الصدور

فهناك تعلمُ موقـــناً       ماكنت إلا في غَرور !!

**واتە : بەداخەوە ئەم خێرو خۆشیە بەردەوام نابێ و کاتێ ڕۆح گەیشتە کونە لووتت ئەوسا چاك دەزانی کە تۆ لەغرورو سەرکەشیدا بوویت . هارونە ڕەشید .. وتی : بیڵێرەوە .. ئەویش بۆی وتەوە ..وتی : جارێکی تر بیڵێرەوە ، ئەویش بۆجاری سێیەم بۆی وتەوە .. ئنجا هارونە ڕەشید زۆر گریا و فەرمانیدا کە بگەڕێتەوە کۆشکە کۆنەکەی ومانگێکی نەبرد وەفاتیکرد ..**

بەڵێ .. ئەمە ئەو هارونە ڕەشیدەیە کەڕۆژی سەدرکعات نوێژی سوننەتی دەکردو، ساڵێ حەجی دەکردو ساڵێکیش غەزای دەکرد !

عبدالملك کوڕی مەڕوانیش فەرمانڕەوای لایەکی دنیابوو , لە سەرەمەرگدا لەسەر تەختی پاشایەتیەکەی دابەزی و گوێی لەجل شۆرێك بوو لە دەرەوەی کۆشکەکە جلی دەشت و بەدەنگی بەرز لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەووت , عبدالملك وتی :خۆزگە منیش جل شۆرێك بوومایەو هەرگیز نەهاتمایە بەلای خەلافەتدا , زۆری نەخایاند گیانی سپاردومرد. ..

سەعیدی کوڕی المُسَیِّب کە ئەم قسانەی خەلیفەیان بۆ گێڕایەوە وتی : سوپاس بۆئەوخوایەی کەوای لێکردوون لە سەرەمەرگدا ئاوات بەئێمەومانان بخوازن و ئێمە ئاوات بەوان نەخوازین .. ل ٨٥ (المسك و العنبر)

عومەری کوڕی عبدالعزیز لەپێش خەلافەتدا لەنازونیعمەتێکی زۆردابوو , کاتێ کردیان بەخەلیفە , لەترسی باری مەسئولیەت و , لەترسی قەبرو قیامەت خۆی گێڕایەوە لەهەموو نازونیعمەتێك و ،خۆیو ماڵ و منالی برسی دەکرد , تاسەرمەشق بن بۆخەڵك و، پارەو ماڵی کەس نەیەت بەلایاندا و، هەرچی فاطمە ی خێزانی لەباوك و براکانیەوە بۆی مابۆوە , کەهەموو کاربەدەست و دەسەلاتداربوون , پێی گێڕایەوە خەزێنەی دەوڵەت و (بیت المال)..

ئەو ڕۆژەی ڕایانگەیاند کەبووە بەخەلیفە , هەرچۆنێ بوو چووەسەر مینبەرو بەدەم گریان و لەرزەوە وتی : خەڵکینە بەیعەتی خۆتان بۆخۆتان و ئێوە ئازادن کێتان دەوێ هەڵیبژێرن , من نامەوێ ببمە خەلیفەتان , خەڵکی هەموو گریان و وتیان : تەنها تۆمان دەوێت .. ئنجا کەوتە باسی مردن و گەیشتن بەخواو لەناوچوونی گەلانی پێشوو , بەجۆرێك کە (رجاء )کوڕی (حیوة) دەڵێت : بەخوا سەیری دیوارەکانی مزگەوتم دەکردو دەموت بزانم دیوارەکانیش دەگرین لەگەڵماندا !!

بەم جۆرە توانی لە دووساڵدا خەڵکی تێربکات و، زەکاتیان دەبرد بۆ ئەفریقیاو دەگەڕان بەدوای یەکێکدا موحتاج بێت و وەری بگرێت ..

ڕۆژێك زانایەك بەناوی (زیاد)هاتەلای و بینی ڕەنگ و ڕووی گۆڕاوەو زەردو لاوازە , وتی : ئەمیری بڕواداران ، کوان ئەو کۆشکانەی تیایدا دائەنیشتی , کوا ئەوجلە

سپۆرتانەی دەتپۆشین , کوائەو نازونیعمەتە زۆرەی کە تیابوویت ؟ عومەر وتی : لەوە دەچیٚ لەبەرچاوت گۆڕابم ؟ وتی : ئەریٚ بەخوا گۆڕاویت !

وتی : ئای زیاد , جاریٚ چیٚت دیوە ؟! ئەگەر دەمبینی پاش سیٚ ڕۆژ لەقەبرەکەمدا چیم لیٚ دیٚت , کفنم پیٚوە نامیٚنیٚ و مارومیٚرو گیانم دەخۆن , ئەوسا دەبینی گۆڕان چۆنە ؟ ل ٩٤ /سەرچاوەی پیٚشوو ..

## هەرکەسەو ئەجەلی خۆی

قورئان دەفەرمویٚت (وماكان لنفس أن تموت إلاَّ بأذن الله كتاباً مـؤجلا)أل عمـران ١٤٥واتە هیچ کەسیٚك نامریٚت مەگەر بەویستی خوانەبیٚت , لەکات وساتی دیاری کراودا.

بەڕاستی ئەم ئایەتە هاندەرە بۆبڕواداران کە لەمەرگ نەترسن و کۆڵنەدەربن بۆسەر خستنی بەرنامەی خواو جیهادکردن , کەسی واهەیە لەسەر کورسییەك دەکەویٚتە خوارەوە بەبیٚ ئەوەی هیچی بیٚت دەمریٚت و هی واش هەیە لە کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە یان وەرگەڕانی زۆر خراپی ئوتومبیل ڕزگاری دەبیٚت ونامریٚت .. بۆیە ئەبوبکر دەیفەرموو بەخالید (اطلب الموت توهب لك الحياة) واتە : سووربە لە سەر مردن زیاتر دەژیت و ژیانت پیٚدەبەخشریٚت , ئاشکراشە هەموو ڕۆژیٚکی ترسنۆك مردنیٚکەومرۆڤی ئازاو چاونەترسیش یەکجار دەمریٚت ..

ئەحمەد کوڕی سەعیدی کوڕی حزم باوکی (ئیبن حزم)وەزیر بوو , ڕۆژیٚك کە لەمەجلیسی سوڵتان (المنصور ابى عامر محمد بن أبي عامر)دا دانیشتبوو , کاغەزیٚکی ژنیٚکیان هیٚنا , کەتیایا دەپاڕایەوە کوڕە بەندکراوەکەی ئازاد بکەن . سوڵتانیش زۆر داخ لەدڵ بوو لەو کوڕەو لەبەر تاوانیٚك بەندی کردبوو , بۆیە زۆرتووڕە بوو , وتی : بەخوا باش بوو هیٚنایەوە بیرم , ئنجا قەڵەمیٚکی هەڵگرت و لەسەر وەرەقەیەك ویستی بنووسیٚ : لەسیٚدارەی بدەن .. کەچی بەبیٚ ئەوەی بەخۆی بزانیٚ نووسیبووی بەری بدەن .. فەرمانەکەی دایە دەست وەزیر , ئەویش بۆ بەڕیٚوەبەری پۆلیسی نووسی ئازادی بکەن , سوڵتان لەوەزیری پرسی : ئادەی بزانم چیت نووسی ؟ وتی: قوربان لەسەرفەرمانی جەنابتان بۆ بەڕیٚوەبەری پۆلیسم نووسی ئازاد بکریٚ ! وتی : چۆن شتی وادەبیٚت .. ئادەی وەرەقەکەی خۆم بدەنەوە ! کە دایەوە دەستیخەتیٚکی هیٚنا بەسەر ئەوی ترداو بەحساب بنووسیٚ لە سیٚدارە بدریٚ , کەچی بەقەدەری خوا نووسی : ئازاد

بکرێـت .. ئـەمجارەش وەزیـر پێـی وت قوربـان : ئەوەتـە نووسـیووتە ئـازاد بکرێـت .. بۆسێیەم جاریش بەهەمان شێوە .. بۆیە سوڵتان سەری سوڕماو وتی : بەڵێ بائازاد بێت , هەرکەس خوا بیەوێ ئازادی بکات من ناتوانم هیچی لێ بکەم ..

نموونە لەسەر ئەم مەسەلەیە زۆرە , ئەوەتا شێخ (عبدالفتاح أبو غدة )دەڵێت : سەربازی ڕاستگۆی دۆستم بۆی گێڕاوەمەتەوە کەلە شەڕی جیهانی یەکەمدا , سەربازەکانی سوپای عوسمـانی لەیـەکێ لـە شـەڕەکاندا , سـەنگەر لێـدەدەن بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی هێرشـی دوژمن , یەکێ لەسەرکردەکان دەگەڕێ بەسەریانداو یەکێ لە سەنگەرەکان دەبینـێ کەزۆر مەحکەم و چاکە , بەسەربازەکەی ناوی کەهەڵی کەندووە دەڵێت چۆڵی بکات و خزمێکی خۆی تیا دا دەنێت , سـەربازەکەش بـە نابـەدڵی بـەجێی دەهێڵـی , پاش ماوەیـەك شـەڕ هەڵدەگیرسـێ و تـۆپێکی دوژمن دێـت دەدات بەسـەر ئەوسـەنگەرەداو خزمـی سـەرکردەکە هەرزوو تیادەچێت , سەربازەکەی تریش سەلامەت دەبێت و چەندەهاساڵی تر دەژی .. ل ٣٧ زاد المتقین .

## پشکۆ بەدەستەکان

ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەسـەر دەسـتی رسول الله (ص) و هاوەڵاندا دامـەزراو گەیشتە ڕۆم و فـارس و شارسـتانێتیەکی جیهـانی دامەزرانـد کەنزیکـەی چـواردە سـەدە درێـژەی کێشا .. بەڵام لەئەنجامی غەفڵەتی موسڵمانان و پیلانی نەبراوەی دوژمنانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاواوە , ئـایین ودەوڵـەت لەیـەکتر جیابوونـەوەو هـەڵگرانی مەشخەڵی هـەق وڕاسـتی کەوتنە بەر چەرمەسەرێ و دەردەسەری و دەربەدەری و کوشتن وبڕین .. هەر لە سەرەتاوە حەزرەت (ص)پێشبینی ئەم ڕۆژەی کردووەو ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە کە دەست بگرن بەبەرنامەی خواوە وکۆڵ نەدەن لەهەوڵ و خەبات هـەروەك دەفـەرموێت :( یأتی علی الناس زمان الصابر فیهم علی دینه کالقابض علی الجمر) ترمذی /٢٢٦٠واتە ڕۆژێك دێت ئەوەی ئارام دەگرێت لەسەر دینداری وەکو کەسێکە کە پشکۆی بەدەستەوە بێت ، هەروەها دەفەرموێت(ألا إن رحی الاسلام دائرة ، فدوروا مع الکتاب حیث دار ، ألا إن الکتاب والسلطان سیفترقان ، فلاتفارقوا الکتاب ، ألا إنه سیکون علیکم أمراء یقـضون لأنفسهم مالا یقضون لکم ، ان عصیتموهم قتلوکم وإن أطعتمـوهم أضـلوکم.. قـالوا یارسول الله: کیف نصنع ؟؟ قال (ص)کماصنع اصحاب عیسی بن مـریم ، نُـشِروا

بالمناشير وحُمِلوا على الخشب ، موت في طاعة الله خير من حياة فـــي معـــصية الله )
المعجم الكبير /١٧٢/٩٠/٢٠..
**واتـه/ حـالّى ئيـسلام دەگـەڕێ , لەگـەڵ قورئانـدابن هەرچـۆن گـەڕا , ئاگـاداربن قورئـان و دەســەلأت لەيــەكترى جيادەبنــەوە , ئێــوە دەسـت لــەقورئان بەرمــەدەن , ئاگــاداربن كاربەدەستى واتـان دەبـێ ئـەوەى بۆخۆيـان دەوێ بۆئێوەيـان ناوێـت , ئەگـەر بـەگوێيان بكەن سەرگەردانتان دەكەن و , ئەگەر بە قسەشيان نەكەن دەتانكوژن .. وتيان : باشە ئەو ڕۆژە چـى بكـەين ئـەى پێغەمبـەرى خـوا ؟ فـەرمووى : وەكـو هـاوەڵانـى حـەزرەتى عيـساى كوڕى مەريەم بن , كە بەمشار دووكەرتيان دەكردن و بەدارا هـەڵيان دەواسين , ئـەوە واى لێ نەدەكردن لە ئاينەكەيان دووربكەونەوە , مردن لەسەر تاعەت وفەرمانبەرى خوا چاكترە لە ژيان لەگومڕايى و سەرپێچيدا ..**

**لە فەرموودەيەكى تريشدا دەفەرموێت** (بدأ الاسلام غريباً و سيعود غريباً كما بدأ ، فطوبى للغرباء . فقيل : ومن الغرباء؟؟ قال : الذين يُصلحون ماأفسده الناس مــن امتي والذين يحيون ماأماتوه من سنتي)مسلم
**واتـە : ئيسلام بەغـەريبى دەستى پێكـردو گەيشتە لوتكـەى دەسەلأت و جارێكـى تـريش غـەريب دەبێتـەوە هـەروەك كاتىدەستپێكردنى , خۆشبەختى بۆغەريبـەكان , وتـرا :كێن ئـەو غەريبانــە ؟ فــەرمووى : ئەوانــەن كەچـاكىدەكەن ئـەوەى كەخــەڵكانێك لــە ئومــەتم تێكىدەدەن و ئەوانـەى كـە زينـدووى دەكەنـەوە ئـەو سـوننەتانەى مـن كەمرێنـدراون ..لـە فەرموودەيەكى تريشدا وەسفى غەريبـەكان ئاوا دەكـات** (الغرباء ناس قليل صالحون بين ناس كثير، من يبغضهم في الخلق أكثر ممن يحبهم) أحمد ،**واتە: غەريبەكان ئەو خەڵكە چاكە كەمەن لـەناو خـەڵكانێكى زۆرى خراپـدا , ئەوانـەى ڕقيـان لێيانـەو دژايـەتيان دەكـەن زياترن لەوانەى كەخۆشيان دەوێن ..**

**داگيركردنى وڵاتە ئيسلامى يەكان**

**جوولەكـەو هاوكارانيـان بـەپيلانێكى مەحكـەم و وردوحساب بـۆكراو لـە دەيـان سـاڵدا كاريان كردو ماندووبوون و پارەى زۆريان خەرج كرد تاخەلافەتى ئيسلاميان ڕووخاند لە ئـەنجامى جـەنگى جيهـانى يەكەمــەوە , كەجوولەكـە دەسـتيان تيايـا بـوو , هــەروەك لــە**

(پرۆتۆکۆلاتی حکمـــاء صـــهیون)داهاتووه .. جوولەکە هەڵگیرسێنەری ئاگری شەڕن , قورئان ئەم ڕاستیەی چواردە سەدە لەمەوبەر تۆمارکردووە کە دەفەرموێت :

(کلما أوقدوا ناراً للحرب أطفأهـــا الله) واتە: هەرچەند ئاگری شەڕ هەڵگیرسێنن خوای گەورە دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت بەمەرامی گڵاویان بگەن .. ئنجا وڵاتە داگیرکەرەکان , میراتی دەوڵەتی عوسمانیان بەشکرد ، دیارە ئەمەشیان بۆ نەچووە سەر چونکە جیهاد لەسەر موسڵمانان فەرزە بۆ دەرکردنی داگیرکەران.

بەملیۆنەها قوربانی درا ، بەڵام کاتێك ڕۆیشتن کە دڵنیا بوون حوکم ناکەوێتە دەست موسڵمانی ڕاستەقینە .. کەسانێکیان دروست کرد کە لەسەر مەنهەجی ئەوان بێت و دین ودەوڵەتیان بۆ جیابکاتەوەو ڕۆژ بەڕۆژ غەریبی ئیسلام و موسڵمانان زیاد بکات ..

ڕۆژئاوا کەسانی زیرەك و بلیمەتیان لەجیهانی ئیسلامی‌یەوە دەقۆستەوە و لەڕێی (بعثات)ی زانستی و وەرگرتنی عیلم ومەعریفەت و بڕوانامەی باڵاوە ئاوی گوێیان دەدان و ئنجا هەر لەڕێی ئەوانەوە موسڵمانانیان لەئیسلام دەتۆراند .. کاتی خۆی (طـــه حسین)چوو بۆ فەڕەنساو لەوێ بیروباوەڕیان شێواندو ناردیانەوە بۆدژیەتی ئیسلام و بانگەواز کردن بۆشارستانیەتی خۆرئاوا . ئەمەش لەبەرئەوەی باش لەو ڕاستی‌یە تێگەیشتبوون کە دار پوازی لەخۆی نەبێت ناقڵیشێت !

بەڵێ.. دوژمنان بەپیلانێکی مەحکەم و هەمەلایەنە موسڵمانانیان دوورخستەوە لەئیسلام هەنگاو بەهەنگاوو پلە بەپلە ، لەسەرەتاوە حوکم و دەسەڵاتیان نەهێشتن بەوەی کە دەڵێن : دین و دەوڵەت دەبێت لەیەك جیا بکرێتەوە , باشە دینێك نەتوانێ حوکم بکات بۆچی باشە ؟؟چۆن دەبێ موسڵمان لەعیبادەتەکانی دا بەپێی ئیسلام بجوڵێتەوەو دینەکەی تەنها لەمزگەوتدا بێ و لەم لاشەوە بێ دین و خوانەناسەکان بەپێی بەرنامەی شەیتان و هەواو ئارەزووی خۆیان حوکمی بکەن ؟!

دوای نەهێشتنی حـــوکم وردە وردە عیبادەتەکانیشیان نەهێشت ، حـــەزرەت (ص)دەفەرموێت : ( لَيَنْقَضَنَّ عُرى الاسلامِ عُروةً عُروةً فكلّما انتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النّاسُ بالتي تَليها وأوّلُهُنَّ الحُكْمُ وآخِرُهُنَّ الصَّلاةُ)احمد / ٢١١٣٩

واتە : قوڵفەکانی ئیسلام یەك یەك دەپچڕێن ، هەرکاتێك یەکێکیان پچڕا خەڵکی دەست بەیەکێکی تریانەوە دەگرن ، لەسەرەتاوە حوکم نامێنێ ودواهەمینیش نوێژە ..

## دروستکردنی قاسم ئەمین

قاسم ئەمین لە میسر دەژیاو لە بنەچەدا تورکە و , زۆر زیرەك و بلیمەت بوو , ( لیسانسی حقوقی فرنسی) هێنا لە قاهیرە لە تەمەنی بیست ساڵی دا , لە کاتێکدا کە هاوتەمەنەکانی ئەو بەهەزار حاڵ بڕوانامەی سەرەتاییان دەهێنا ..

هەرزوو قۆستیانەوەو ناردیان بۆ فەرەنسا هەتامێشکی داشۆرن ودژی ئیسلام بەکاری‌بهێنن ..

· پێش ئەوەی بچێت بۆ فەرەنسا , نووسینی ڕۆژهەڵاتناسێکی خوێندەوە کە باس لە سووکایەتی کردنی ئیسلام دەکات بەئافرەت , زۆری پێناخۆش بوو ویستی وەڵامی بداتەوەو قسەکانی پووچ بکاتەوە , بەڵام کەچوو بۆ فەرەنسا و هاتەوە هەموو بیرو بۆچوونی گۆڕدرا ..

کاتێك چوو بۆ فەرەنسا , ئافرەتێکی فەرەنسی بووە هاوەڵی و ( لەوەدەچێ بۆی دانرابێ و بە بەرنامە بووبێ بۆئەوەی بیروبۆچوونی بگۆڕن )پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوانیاندا سەوز بوو .. (بەڵام وەك خۆی دەڵێ لەیادەوەریەکانیدا پەیوەندی‌یەکی (بریئ)بوو , واتە نەگەیشتبوو حاڵەتی (فاحیشە وزینا). بەهەرحاڵ ئەگەر بەلای ئەوەوە (بریئ)یش بێت بەلای شەرعەوە هەرناجائیزە !)ئەم ئافرەتە قاسم ی دەبرد بۆ سەردانی خێزانە فەرەنسی‌یەکان و ئەوانیش بەگەرمی پێشوازیان لێدەکرد ..

کاتێك گەڕایەوە میسر, کەوتە بانگکردن بۆ ئازادی ئافرەت و سفووری و فڕێدانی سەرپۆش و لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوا لەهەموو شتێکدا .. گوایە ئەوە ڕێگای پێشکەوتنە ... (دەیان ساڵ پێشتریش رفاعة طهطاوی هەر لەفەرەنسا ئاوی گوێیان داو هەمان بانگەوازی کرد , بەڵام بانگەوازەکەی (رفاعە)هەرزوو زیندەبەچاڵ کرا چونکە کۆمەڵگای میسری ئامادەنەکرابوو بۆ وەرگرتنی ئەوجۆرە بیروبۆچوونە , بەڵام زەمانی قاسم ئەمین , کەپاش نزیکەی پەنجا ساڵ لە داگیرکردنی بێگانە بوو بۆمیسر ،خەڵکی گۆڕابوون و ز یاتر ئامادە بووبوون بۆئەم جۆرە بیرو بۆچوونانە).

لە سەرەتاوە قاسم ئەمین پەڕاوی (تحریر المـــراة)ی نووسی , بەبێ ئەوەی دژایەتی ئیسلام بکات , ئەم پەڕاوە زۆر بەتوندی وەڵام درایەوە , بۆیە قاسم ئەمین ترساو کونجی قەناعەتی گرت لەماڵەوە , تائەوکاتەی (سعد زغلول) هانی داو پێی ڕاگەیاند کە

پارێزگاری لێدەکات .. ئنجا کەوتەوە کارکردن و پەڕاوی دوەمی نووسی (المرأة الجدیدة)، لەم پەڕاوەیدا ئیسلامی خستە لاوەو بەهەموو توانایەوە بانگی دەکرد بۆلاسایی ئافرەتانی فەرەنسی تاوەکو پێش بکەون ... لەسەرەتاوە باس لەوەدەکرا کە ئافرەت مافی هەبێ و هاوسەری خۆی هەڵبژێرێ , دواتر بوو بەوەی کە هەقی هەبێ هەست و سۆزیخۆی دەربڕێ , ئنجا بوو بەوەی کە ئازاد بێ خۆی ئەدا بەکێ بیداو چی دەکات بیکات!

هدی شعراویش کە کچی (محمـــد باشــــا ســـلطان) بوو , کە لەپاشاوات بوون , بەداپۆشراوی چوو بۆ فەرەنساو بەسفووری هاتەوە .. ژنانی لەدەوری خۆی کۆدەکردەوەو پیاوانی دەعوەت دەکرد لەماڵەوەو کۆمەڵێ نووسەر و قەڵەمیشی کڕی کە فوو بکەن بەمەسەلەی ئافرەت و چالاکییەکانی ناوبراودا ..

لەساڵی١٩١٩ دا ئینگلیز میسری داگیر کردبوو , خۆپیشان دانێک کرا لەمەیدانی قصر النیل (مەیدانی ئیسماعیلیە) , لەبەرامبەر مۆڵگەکانی سوپای ئینگلیز, ئەو سەردەمەبوو کەشۆڕشی میسری هەڵگیرسابوو , لەهەموو شەقامەکانی قاهیرە خۆپیشان دان هەبوو , ئینگلیزیش تەقەی لێدەکردن و هەرجارەو کۆمەڵێك پێوە دەبوون .

لە گەرمەی ئەم خۆپیشاندانانەدا , ژنی سەعد زەغلول و ئافرەتانی تر کە لە بەردەم ئینگلیزدا خۆپیشاندانیان دەکرد و هوتافیان دەکێشا بۆ چوونە دەرەوەی ئینگلیز لەمیسر , هەموو لەچکەکانیان داکەندو نەوتیان پیاکردو سوتانیان , بەحساب ئازاد بوون !

باشە خۆ زیاتر لەسیانزە سەدەبوو ئیسلام لەچکی فەرزکردبوو , باشە خۆمەسەلەی لەچك هیچ پەیوەندییەکی بەدەرچوونی ئینگلیز و ئازادی یەوە نەبوو, ئەی بۆچی لەچك فڕێ بدرێ و بسوتێنرێ , ئەمە لەڕاستیدا ئاواتی دوژمنانی ئیسلام بوو , بۆ غەریب کردنی ئیسلام لەلای موسڵمانان ..

بەڵێ لاسایی کردنەوەی کوێرانەی ڕۆژئاوا لەمەسەلەی ئافرەتدا دەیان ساڵی خایاندو هەوڵی زۆری بۆدرا و کەسانێك هەبوون چاویان بەشەوارە کەوتبوو لەبەرامبەر پێشکەوتنی ڕۆژئاواوە , بەڵام شیرازە پچڕنی کۆمەڵگای خۆرئاواو کەشف بوونی کەم وکوڕی و ناتەواوی یەکانیان لەلایەك و سەوزبوون و فراوان بوونی ڕابوونی ئیسلامیش

لەلایەکی ترەوە کارێکی کرد کەخەڵکی بەگشتی و ئافرەتان بەتایبەتی بێنەوە بەرەو ئیسلام .. تەنانەت قاسم ئەمین لە دوا ساتەکانی ژیانیدا دانی نا بەوەدا کە بانگەوازەکەی ناگونجێ بۆکۆمەڵگای ئیسلامی و پەشیمان بوو لە کارەکانی پێشووی .. ل٢٤٤ واقعنا المعاصر / محمد قطب .

## هەوڵ و کۆششی نەبڕاوە بۆئیسلام

بەردەوام ئوممەتی ئیسلام کەسانی لەخۆبردووی تیا هەڵکەوتووە کە بەهەوڵ و کۆششی نەبڕاوەیان گیانیان کردۆتەوە بەبەری کۆمەڵگای ئیسلامیدا ودژی دوژمنان وەستاون بۆنموونە :

**یەکەم /ئیمام ئەحمەد ..**

ناوبراو لە کۆتایی سەدەی دووەمی کۆچیدا لەدایك بووەو ، منداڵ بوو کە باوکی مردو ، دایکی ژنێکی ژیرو خواناس بوو ، لە دە ساڵیدا قورئانی پێ لەبەرکرد و، بەیانیان ئاوی بۆ گەرم دەکرد بۆ دەستنوێژو ، بەیەکەوە دەچوون بۆ نوێژی بەیانی هەرچەند مزگەوتەکەش دووربوو .. لە شانزە ساڵیدا هەندێ نان و پێویستی دایەو پێی وت : بڕۆ فەرموودەی پێغەمبەر کۆبکەرەوە وبزانە هەر شتێك بەخوا بسپێردرێت ، خوا دەیپارێزێت ، بۆیە منیش تۆ دەسپێرم بەخوا ..

ئیمام ئەحمەد بەغدا بەجێدەهێڵێت کە پایتەختی دنیابوو، خۆی دەڵێت :چووم بەرەو مەککەو لەڕێگا سێ جار وون بووم ، منیش خێرا دەپاڕامەوەو دەمووت : ( یا دلیل الحائرین دلنی ) ، دوای ئەم دوعایە یەکسەر ڕێی خۆمم دەدۆزیەوە ..

جارێکیش لەڕێی یەمەن هیچم پێنەما ناچار سێ ڕۆژ بە کرێ ئیشم کرد لە باخێکدا تابتوانم بگەمە جێ ..

دیارە ئەم هەموو هەوڵە جۆرێکە لەجۆرەکانی جیهادوئاشکراشە کە چی سزایان دا لەسەر مەسەلەی (خلق القران ) وچەند بەندیو قامچی خوارد ، کەچی لەکۆتایی ژیانیدا ولەسەرەمەرگدا سەیری قاچی کردو گریاو وتی : خۆزگە بەو قاچانەم جیهادم بکردایە بۆ خوا ..ئنجا گەردنی هەموو ئەوانەشی ئازاد کرد کە ئازاریان دابوو ..ل ٥٨١ / المسك والعنبر من خطب المنبر..

**دووەم/ ئەلب ئەرسەلان و جەنگی ملاذكرد :**

پـاش هەشـتا سـاڵ خۆئامـادەكردن , لـە سـاڵی ٤٦٢ كۆچـیدا پاشـای ڕۆم (ارمانوس)كەبەهێزترین كەسایەتی و دەسەڵات بوو لە ئەوروپادا , بەسوپایەكی گەورەوە كەوتەڕێ بۆ لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان ..

سوپاكەی (٣٥٠)قەشەی تیابوو كە هەریەكەیان (٢٠٠)سواریان لەدەور بوو , هەروەها پەنجا هەزار شەڕكەری تزئامادەبوون, ئەمە بێجگە لەسەدهەزار كرێكارو چاڵ هەڵكەن و كـەل وپـەلێكی بـێ ئەندازەیجـەنگ .. ویـستیان لەپێـشدا خۆراسـان وعێـراق بخەنـە ژێـر ڕكێفـی خۆیانـەوەو دوایـش وڵاتـی شـام بگـرن .. سـوپاكەیان گەیـشتە (ملاذكـــرد)كـە دەكەوێتە سەرووی بوحەیرەی وان لەئەرمینیا..

دەنـگ و باسـی ئـەم سـوپایە گەیـشتە سـوڵتان ئـەلب ئەرسـەلان (كەبـەناوبانگترین سوڵتانی سەلجوقی بوو , زۆر هەوڵیدا بۆئیسلام و زۆر شوێنی ئاسیای فەتح كردو دژی هێرشەكانی خاچ پەرستانیش وەستا )..

سـوڵتان لـەو كاتـەدا لەحەڵەبـەوە گـەڕابۆوە شـاری (خـوی)لەئـەزەربیجان , بەئاسـانی دەستی نەدەگەیشتە حەڵەب و فریای كۆكردنەوەی سوپای زۆر نەدەكەوت , بۆیـە خۆیو پانزە هەزار كەس ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوەو وتـی : من بۆخـوا دەجەنگم , ئەگـەر مـام ئـەوە نیعمـەتی خوایـە , ئەگـەر شـەهیدیش بـووم مەلیكشای كـوڕم وەلی عەهـدم بێـت .. هـەرزوو كەڕووبـەڕووی پێـشەنگی سـوپای ڕۆم بوونـەوەو سـەركەوتن بەسـەریاندا , بـەڵام لەبەرئـەوەی سـوپای ڕۆم ژمارەیـان بـێ ئەنـدازە بـوو , سـوڵتان داوای لەمـەلیكی ڕۆم كـرد بـەبێ جـەنگ ڕێ بكـەوین .. مـەلیكی ڕۆم ڕازی نـەبوو, وتـی : لەخۆراسـان ڕێـك دەكـەوین ..سوڵتان زۆر ناڕەحەت بوو , ڕاوێژی كرد لەگەڵ زانـا (ئـەبو نـصر محمـد كـوڕی عبـدالملك البخـاری الحنفـی)دا , نـاوبراو پێـی وت : تـۆ بـۆ ئاینێـك ئەجـەنگیت كـەخوا پـەیمانی داوە سـەری بخـات بەسـەرهەموو ڕێبازێكـدا , هیـوادارم خـوای گـەورە ئـەم فەتحـە لەسـەردەستی تۆدابكـات و پـێم باشـە لـە دوای نیـوەڕۆی جومعـە هێـرش بـەرین , چـونكە ووتاربێـژەكان لەسەردوانگەكانەوە دوعا بۆ موجاهیدەكان دەكەن و كاتەكەش كاتی دوعا قبوڵ بوونە ..

بـەڵێ .. لـەڕۆژی جومعـەدا سـوڵتان جومعـەی بـۆكردن و خـۆی گریـاو موسـڵمانانیش گریـان و زۆر پاڕانـەوە لـەخوا .. ئنجـا پێـی وتـن : كـێ دەیـەوێ بگـەڕێتـەوە بابگـەڕێتـەوەو

ئازاد بێت , وابزانن سوڵتانتان لەگەڵدا نیە کە فەرمانتان پێبدات وڕێتان لێبگرێت .
ئنجادوای نوێژەکە کفنی سپی پۆشی و وتی : ئەگەر شەهیدبووم بائەمە کفنم بێت .جەنگاوەرانیش هەموو وەك ئەویان کردو ئنجا سوڵتان لەئەسپەکەی دابەزیو لەسەرخۆڵەکە سوجدەی بردو زۆر گریاو زۆر دوعای تری کرد ..
شەڕ هەڵگیرساو ژمارەیەکی زۆر لەدوژمن کوژراو پاشاکەشیان بەدیل گیراو هێنایانە بەردەمی سوڵتان ..
سوڵتان پێی وت : نەمناردە لات کە ڕێ بکەوین , رازی نەبوویت !
ئەرمانوس وتی : واز لەسەرزەنشت بهێنەو چیت دەوێت وابکە ..
سوڵتان وتی : من دیل بوومایە لای تۆ چیت لێدەکردم ؟
ئەرمانوس وتی : هەرچی خراپە وام لێدەکردیت !
سوڵتان وتی : چی دێت بەخەیاڵتدا کە لێت بکەم ؟
ئەرمانوس وتی : یا دەمکوژی , یان شاربەدەرم دەکەی و دەمگێڕی بەوڵاتی ئیسلامدا , یان ئازادم دەکەی کە ئەمەش زۆر دوورەو بڕواناکەم ..
سوڵتان وتی : دە من نیازمە لێت خۆش بم و ئازادت بکەم !
ئیتر ئازادی کرد بەرامبەر ملیۆن و نیوێ دیناری ئەو ڕۆژەو مەرجی ئەوەشی لەسەردانا کە هەرچی دیلێکی موسڵمان هەیە ئازادی بکات وبەمەش بۆ پەنجا ساڵ ڕێکەوتن و ژمارەیەکی زۆر لە قەشەو سەربازەکانی بەردان و ناردنیەوە بۆ وڵاتی خۆیان بەئاڵایەکەوە کە لەسەری نووسرابوو (لا إله إلا الله محمد رسول الله) ئەم جەنگەش کەوتنی قودسی دواخست .. (**البدا یة والنهایة /ابن کثیر/ الکامل في التأریخ / ابن الأثیر**) ول٦٠ زاد المتقین

## سێیەم/شێخ ئەحمەد دیدات :

(دیدات) دەڵێت (من هەموو ژیانم بەخت کرد بۆگەیاندنی پەیامی خوا , داواتان لێدەکەم ئێوەش هەموو تواناتان بخەنەکار بۆئەومەبەستە بەرزە پیرۆزە).. هەروەهادەڵێت : بۆچی گاورەکان ئینجیل وەرگێڕن بۆ دووهەزار زمان و شەش ملیاری لێ چاپ بکەن تابەدنیادا بڵاوی بکەنەوەو ئێمەش کەمتەرخەم بین بەرامبەر بە قورئان ؟ شەرت بێ منیش هەوڵ بدەم , هەرهیچ نەبێ ملیۆنێك قورئانی وەرگێڕاو بۆزمانی ئینگلیزی چاپ بکەم و بڵاوی بکەمەوە.. بەڵێ : (دیدات)تاساڵی ١٩٩٦ کە تووشی شەلەل بوو , توانی

(٤٠٠ )هەزا ر قورئان چاپ بكات و بلاَوی بكاتەوە , ئنجا داوای لە ( ابراهيم جادات) كرد كە بەيارمەتی (بنكەی جيهانی بۆ بانگەوازی ئیسلامی )كارەكە تەواو بكات .. شايانی باسە , (ديدات)لەخەويا بينيبوی كەمليۆنێك نوسخەی قورئان بلاَودەكاتەوە , بۆيە خەمی‌بوو كەبەزووترين كات ئەو خەوە خێرە بهێنێتەدی , دەستی پێكردو فريای ئەوەندە كەوت , گرنگ ئەوەيە بەهۆی نيەتەكەيەوە (إن شـــاء الله) هەمووی‌بۆ نووسراوە ....المجتمع ١٥١٤

### رق لێ بوونی پێغەمبەر ( ص )مايەی دوا براوی يە

موسڵمان لەگەڵ موسڵماندا رەنگە كێشەی بۆ دروست ببێو دابڕان وشەڕيش ڕووبدات , ئەمەش چارەسەر دەكرێت بەسوڵح كردن و ئامۆژگاری كردن و پشتگرتنی ئەوەی كە لە سەر هەقە , قورئان لە سوورەتی الحجرات دا دەفەرموێت : ( وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما ، فإن بغت إحداهما على الاخرى فقاتلوا التي تبغي حتّى تفيءَ الى‌أمر الله ، فإن فاءت فأصلِحوا بينها بالعدلِ وأقسطوا ، إنّ الله يُحِب المقسطين ، إنما المؤمنون إخوة فأصلِحوا بين أَخَوَيكم واتقوا الله لعلكم تُرحمون )١٠ / واتە : ئەگەر دوو دەستەو تاقم لەموسڵمانان بوو بەشەڕيان , ئەوە دەستبەجێ هەوڵبدەن ڕێكيان بخەن و ئاشتيان بكەنەوە , خۆئەگەر لايەكيان هەر دەستدرێژی دەكردە سەر لاكەی تر , ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەياندا بچن كەستەم و دەستدرێژی دەكات , هەتا دەگەڕێتەوە بۆفەرمانی خوا ..

جائەگەر لايەنە سەركەشەكە بۆفەرمانی خوا سەری دانەواند , ئەوە ئێوە نابژيوانی‌يەكی دادگەرانە لەنێوانياندا بكەن ودادپەروەری ئەنجام بدەن , چونكە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت كە دادپەروەری ئەنجام دەدەن . لەڕاستيدا هەر ئيمانداران برای يەكن , كەواتە هەركاتێك لەنێوان دووبراتاندا ناكۆكی پەيدا بوو , ئێوە نێوانيان چاك بكەن و ئاشتيان بكەنەوە , هەميشە لەخوا بترسن و پارێزكاربن , بۆئەوەی ڕەحمەتان پێ‌بكرێت . ئەمە لە نێوان موسڵماناندا ڕوودەدات ، بەلاَم ڕق لێ بوونی پێغەمبەر (ص)و بەسووك سەيركردنی مايەی خەسارەتمەندی دنياو ئاخيرەتە چونكە پەيوەندی بە بەرنامەكەوە هەيە , هەروەك قورئان دەفەرموێ ( إنا أعطيناك الكوثر، فصّل لربِّك وانحر، إنّ شانئك هو الابتر)الكوثر واتە : بەڕاستی ئێمە خێرو چاكە وخۆشی هەردوو جيهان و

ناوبانگی چاکەی تۆمان ئەی (محمد)بێ ئەندازەو بێ سنوور کردووە لەهەموو چەرخ و زەمانێکدا . کەواتە نوێژ تەنها بۆخواو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارت ئەنجام بدەو قوربانییش بکە ( هەربەوشێوەیە بۆبەدەستهێنانی رەزامەندی پەروەردگارت ) بێگومان هەردوژمنان و ناحەزانی تۆکە ڕقیان لێتە بێناونیشان و وەجاخ کوێرودوا براون( لە هەموو خێرو چاکەیەك لە هەردوو جیهاندا)..

عەللامە شێخ احمد محمد شاکر دەڵێت : (طه حسین) کە قوتابی بوو لەزانکۆی کۆنی میسری بڕیاردرا بنێردرێ بۆ ئەوروپا بۆ خوێندن و ,جەنابی سوڵتان حسین ویستی ڕێزی لێ بگرێت , بۆیە پێش وازیی‌یەکەی گەرمی لە کۆشکەکەی خۆی دا لێکردو پاشان هەموو لەنوێژی جومعەش دا ئامادەبوون و ، وتاربێژێکی قسەزان وتاریدا و ویستی مەدحی سوڵتان حسین بکات و , لەناو : وتارەکەیدا وتی : (جاءه الاعمی ، فماعبس وجهه وماتولی)... واتە : جەنابی سوڵتان قوتابی‌یەکی کوێر هاتەلای و ڕێزی لێگرت و ڕووی لێ وەرنەگێڕاو پشتی تێنەکرد ... کابرای وتاربێژ کەوتە هەڵەیەکی گەورەوە ، قسەکەی مەدح بوو بۆسوڵتان کە ڕێزی لە (طه حسین)ی نابینا گرتبوو , بەڵام زەم بوو بۆحەزرەت (ص) هەروەك ئەوەی ئەم لە (ص)چاکتر بووبێ ! چونکە (ص)بە (ئیجتیهاد)ی خۆی دەیویست گەورە پیاوانی قوڕەیش بانگ بکات بۆ ئیسلام وسەرقاڵی ئەوان بوو ، کاتێ (ابن ام مکتوم)ی نابینا هات بۆلای حەزی نەکرد کاتی لێ بگرێ و ڕووی لێ وەرگێڕاو سارد بوو لەگەڵی دا , چونکە کاتی تر بۆئەم زۆرەو ئەو دەمە گونجاونەبوو .. خوایگەورەش بە ناسکی سەرزەنشتی‌کردو بۆچوونەکەی بۆڕاست کردەوەو فەرمووی (عبس وتولی أن جاءه الاعمی ، وما يدريك لعله يَزّكى او يذّكّر فتنفعه الذكرى ...)العبس ، یەکێ لەوانەی ئامادەی ئەو نوێژی جومعەیە بووبوون باوکم بوو (شێخ محمد شاکر)کەوەکیلی پێشووی زانکۆی ئەز هەربوو , هەستی بەهەڵەکەی وتارخوێن کردو دوای نوێژ هەستا بەدەنگی بەرز بەخەڵکەکەی وت : خەڵکینە نوێژەکانتان بکەنەوە , چونکە نوێژی ئیمامەکەتان بەتاڵەو هەڵەی گەورەی کردووە بەرامبەر پێغەمبەر (ص).. دواتر مەسەلەکە گەورەبوو کەسانێکی دەسەڵاتدار پشتی ناوبراویان گرت و دوایی هەرچەند کێشەکە کۆتایی پێهات بەڵام پاش چەند ساڵێك ئەو وتاربێژەم بینی , خوا ڕیسوای کردو لە وتاربێژی لابراو لەدەرگای مزگەوتێدا بووبوو

بەپاسەوانی پێڵاوی نوێژ خوێنان و هەرکەسەوخێری خۆیشتێکی دەدایە .. کە بەڕاستی ئەمەش پەندە بۆئەوەی کەس بێ ئەدەبیئەکا بەرامبەر پێغەمبەر (ص)..ل٢٤/ زاد المتقین .

بوخاری ومسلم ڕیوایەتیان کردووە ,کەپیاوێکی گاور موسڵمان بوو , فێری سورەتی (البقره)و (آل عمران)بوو , ماوەیەك بوو بە کاتبی پێغەمبەر (ص), پاشان لە دین وەرگەڕاو بووەوە بەگاورو , ڕای کرد بۆلای گاورو جوولەکەکان و ئەوانیش زۆر زلیان کردو فوویان کرد بە لووتیدا , جاناوبراو دژایەتی پێغەمبەری (ص)دەکردو دەیوت : محمد هیچی نەزانەیوە ئەوە نەبێ کەمن بۆم نووسیوە .. خوای گەورە پشتی شکاندو لەناوی برد , کاتێك ناشتیان , قەبر نەی گرتە خۆی و پاش ماوەیەك فڕێی دایەوە دەرێ, وتیان : ئەمە دیارە ئیشی موسڵمانانەو ئەوان وەك تۆڵەیەك دەریانهێناوەتەوە, جارێکی تر ناشتیانەوە , ئەمجارەش گۆڕ فڕێ ی دایەوە دەرێ ، بۆیە ئیتر لەو دەشت و دەرەدا وازیان لێهێنا قەلّ ودالّ بیخوات ! ڕەنگە کەسێك بڵێ : خۆ زۆر لەو خراپتر قەبر گرتوویەتیە خۆی , ئەوە ڕاستە بەلام خوای گەورە ویستی وابوو پەندی خەڵك دابات بەو ڕووداوە تا دەست بکێشنەوە لە دژایەتی و بوختان کردن بۆ پێغەمبەر... کاتێکیش موسڵمانان گەمارۆی قەلای ڕۆمەکانیان ئەدا لەشام و بۆیان نەدەگیرا , چاوەڕێیان دەکرد , تا کەسێکیان لەسەر شوورای قەلاکانەوە بەدەنگی بەرز دەکەوتنە بێ ئەدەبی بەرامبەر پێغەمبەر (ص), ئیتر زیاتر خوا غەزەبیلێدەگرتن ولەیەك دووڕۆژدا قەلاکە دەگیرا، ل٣٤ هەمان سەرچاوە.

**دواوتە**

کاروانی خێر بەڕێوەیەو هەرڕۆژەو قۆناغێکی ڕێی دووری دەبڕێ , دوژمنانیش لەبۆسەدان بۆی و دەیانەوێت ئاستەنگ بهێننە ڕێی .. یەکێك لەو ئاستەنگانە لەکۆن و نوێ دا سەرقالّ کردنی موسڵمانە بەموسڵمانەوە , کەتەنها چارەش ترسانە لەخواو ڕەچاوکردنی ئەدەبی خیلاف و ڕاجیاییە ..

کاتی خۆی پێش چەند سەدەیەك , (ئیبن تەیمیە) لەلایەن کۆمەڵێ زاناوە دژایەتی زۆر کرا , ڕۆژێکیان یەکێك لەسەرسەختترین ناحەزیدەمرێ و (ئیبن قەیم )ی قوتابی مژدەی بۆ دەهێنێ , وادەزانێ ئێستا دەست دەهێنێ بەدڵیاو زۆری پێخۆش دەبێت .. کەچی کە هەواڵەکەی دەداتێ لەجیاتی ئەوەی دڵخۆش بێ ، دەگری ودەڵێ : بەخوا من هەرگیز بە دوژمنم نەزانیوە و ئەوەی لە نێوانیشماندا ڕووی داوە ئیختیلافی عولەمایە ) ..

ئنجا چوو بۆ ماڵیمردووەکەوپێی وتن : من لەخزمەتاندام و هەرچیتان ویست داوابکەن ... ئەوانیش ئەم هەڵویستەیان بەرز نرخاند .. قوتابییەکی دەڵێ : خۆزگەئەوەندەی ئیبن تەیمیە بۆ دوژمنەکانی باش بوو ئێمە بمانتوانیایە بۆ دۆستەکانمان باش بین .

بەڵێ موسڵمانان دەتوانن یەکتری تەواو بکەن و بەژیری و برایانە سەیری کاری یەکتری بکەن .. پرسیارکرا لەپێشەوا بەننا لەکاتی وتاردانـدا کەجیاوازی نێوان (جمعیەی شەرعی)و (إخوان) چییە ؟ دیارە پرسیارکەر دەیوویست بەزم بنێتەوەو دووبەرەکی دروست بکات.. بەنناش وتی : جیاوازیمان ئەوەیە ئەوان لە گەڕەکی (المغربلین)ن و ئێمەش لە گەڕەکی (درب الاحمر)ین .. ئنجا پرسیاریان کرد : باشە ئەوان مزگەوت دروست دەکەن , بۆچی ئێوەش ئەوە ناکەن ؟ بەننا وتی : زۆر چاکە ئەوان لەسەریانە مزگەوت دروست بکەن و ئێمەش لەسەرمانە بەپیاوی خواناس ئاوەدانی بکەینەوە ! (المجتمع ١٥١٥)

جائەم ئاژاوە نانەوەیە , کە بەداخەوە هەندێ موسڵمان لەسادەیی و ناحاڵی بوونەوە تێی دەکەوێت , کاری شەیتان و دۆستانی شەیتانە (ص)دەفەرموێت (شەیتان بێ هیوا بووە کە بپەرسترێ لە نیوە دوورگەی عەرەبدا , بۆیە کاری هاتۆتە سەر تێکدانی پەیوەندی نێوان موسڵمانان ).. (إنّ الشيطانَ قد أيِسَ أنْ يَعْبُدَهُ المُصَلّونَ في جزيرة العربِ ولكِنْ في التَّحريش بينهم)مسلم (٥٠٣٠)هەروەها ( قد يَئِسَ الشيطانُ أن يَعْبُدَهُ المسلمون ولكن في التحريش بينهم )ئەحمەد (١٤٥٨٦)..

پیاوێك هات بۆ لای ئیمام جەعفەری صادق وجنێوی بە موسڵمانێك دا ، ئیمام جەعفەر پێی وت : ئایا جیهادی ڕۆمت کردووە ؟؟وتی : نەخێر .. وتی : ئایا جیهادی فارست کردووە ؟؟ وتی : نەخێر .. وتی : جیهادی کافرانت کردووە ؟؟ وتی : نەخێر ..

وتی :سبحان الله کافرو ڕۆم و فارس و جوولەکەو گاور لە دەستت سەلامەتن و موسڵمانان لە دەست ودەمت سەلامەت نابن ..؟؟!! باشە پێغەمبەر (د.خ ) نافەرموێت ( المسلمُ مَن سَلِم المسلمونَ مِن لسانه ويده ).

زۆر جار کەسێکی بەد ئەکەوێتە بەینەوەو هەوڵدەدات ئاژاوە بنێتەوە ، یەکێ لەو بەدانە دێت بۆ لای ئیمام شافیعی و لۆمەی دەکات ودەڵێت : بۆ هەر تۆ سەردانی ئیمام ئەحمەد

دەکەیت لەکاتێکدا تۆ لەو بەتەمەن تری ؟؟!ئیمام شافیعی قوڕی دا بەدەمیاو وتی : من هەرچی بکەم فەزڵ و چاکی هەر بۆئەوە و ئەم دوو دێڕ هۆنراوەیەی پێووت :

قالوا يزورك احمد وتزوره　　　　قلت الفضائل لا تغادر منزله

ان زارني فلفضله او زرته　　　　فلفضله فالفضل في الحالين له

(المسك والعنبر /٤٥٦)

**سەرچاوە**


١-مجلة الاعجاز / ٦

٢-المدخل الى الدراسات القرآنية /ابي الحسن الندوى /٢٠٠٢/ط١

٣-محاضرات د زغلول النجار

٤-معجزات الاستشفاء بالغذاء /مجدي الشهاوى

٥-الاعجاز العلمى فى السنة النبوية /د. صالح بن احمد رضا

٦-الطب النبوى /ابن القيم

٧-برنامج الشريعة والحياة /مقابلة مع د.سمير الحلو

٨-برنامج المواجهات /مقابلة مع د.عبدالباسط محمد السيد

٩-برنامج آيات وحوار / قناة اقرا /

١٠-برنامج صفحات من حياتي /قناة المجد

١١-العائدون الى الله /على عبد العال الطهطاوى

١٢- واقعنا المعاصر /محمد قطب

١٣- مجلةالمجتمع /١٥١٤،١٥٢١، ١٥١٥

١٤-زاد المتقين /ج ١ /الشريف ابراهيم الحازمى

١٥- المسك والعنبر في خطب المنبر / ولاتحزن /د. عائض القرنى


**ناوەڕۆك**

( پێشەکی )

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار و درووود و سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارویاوەران و شوێنکەوتوان ..

نیعمەتی ئیمان گەورەترین نیعمەتە کە مرۆڤ بەدەستی بهێنێت لە دنیادا ,( قل بفضل الله وبرحمته فبذلك فليفرحوا هو خير مما يجمعون)يونس/٥٨ , پێیان بڵێ ئەی (محمد) : بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا و بڕوابوون پێی دڵخۆش بکەن چونکە ئەوە خێرتر و چاکترە لە هەموو ئەو شتانەی کە لە دنیادا کۆی دەکەنەوە و دڵی پێخۆش دەکەن .

دەفەرموێ (من اصبح معافى في جسده ، عنده قوت يومه كأنما حيزت له الدنيا بحذافيرها ) , واتە : هەر بڕوادارێك ڕۆژی لێبۆوە و لەش ساغ بوو , خواردنی تاقە ڕۆژێکیشی هەبوو , ئەوا وەك ئەوەیە کە هەموو دنیا هی ئەو بێت .

زۆربەمان لەسایەی خواوە لەشمان ساغە وخواردنیش نەك هی ڕۆژێ هی چەند ساڵێکیشمان هەیە , ئەی بۆ چاوبرسین و وانازانین دنیا هەمووی هی ئێمەیە ؟؟..

ڕەنگە بۆئەوە بگەڕێتەوە کە ئەوەی هەمانە بە کەمی دەزانین و, قەدری ئەو ئیمانە نازانین کە خوای گەورە بە فەزڵی خۆی پێی بەخشیوین .

خوای گەورە کە دنیا هیچ نیە بەلایەوە دەیدات بە باوەڕدار و بێباوەڕو بەخششی خوا لە کەس قەدەغە نیە ( كلاً نُمِد هؤلاء وهؤلاء مِنْ عَطاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحَظُورا) الاسراء , بەڵام خوای گەورە ئیمان و بڕوا نادات مەگەر بە کەسێك شایستە بێت , چونکە بڕوابوون یانی ژیانی هەتاهەتایی و ناز و نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشت , ئەمە بێجگە لە خێر و خۆشی و بەختیاری دنیا کە بڕوادار لە دنیادا تامی دەکات .

ئەم بەرنامەیەی ئێمە بێ منەتە و تاقە پەڕاوە کە (لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي) البقرة/ ٢٥٦/تیایە.. واتە زۆر کردن نیە بۆ بڕواهێنان ، هەموو کەسێ سەرپشکە و ئازادە لەوەی کە چی دەوێت ئەوە هەڵبژێرێت ,چونکە پەروەردگار چاك و خراپی دیاریکردووە بۆ هەموو کەس و هەردووکی ڕوون و ئاشکرایە .

بڕوادار پێویستە ڕۆڵی خۆی ببینێ لەم ژیانەدا و ئەو هەق و ڕاستییەی لەلایەتی بیگەیەنێ و لەپێناوی ئەمەشدا هەوڵ و کۆششی بەردەوام بدات و لە مردن نەترسێت ، هەروەك دكتۆر محمد ئیقبال لە هۆنراوەیەك دا كە ئەمە ماناكەیەتی دەڵێت :

( بە ڕاستی سەیرە ئەی موسڵمان دنیات لەبەرچاو ڕوونە و زۆر شتت دۆزیوەتەوە ، كەچی نەفسی خۆتت لێ ون بووە ، تاكەی بەو نەزانی و بێئاگاییە دەمێنیتەوەو ، سەرگەردان و بێكار دادەنیشیت.. تۆ نوورێكی لە دێر زەمانەوە ، دەی شەوی تاریكی ئەموستە چاوی پێ ڕووناك بكەرەوە .. لە گیرفانتا دەستی سپی درەوشاوی موعجیزە هەیە ، دە كارەكەی حەزرەتی موسای پێبكە و ، سنوورە تەسكەكان بشكێنە ، تۆ پێشڕەوی .. ئایا لە مردن دەترسی ئەی ئادەمیزادی زیندووی هەتا هەتایی ؟ هەق وابوو مردن لە تۆ بترسایە و ، تۆ خۆت بۆ ئەو بنایاتەوەو بۆی لەكەمین دا بووایەی .

باش بزانە و دڵنیابە ، خوای كەریمی بەخشندەی دەوڵەمەند كە شتێكی بەخشی نایسێنێتەوە ، دەی كە خوا ڕۆحی پێبەخشیویت تازە نایباتەوە و نایسێنێتەوە و، مردنیش كەگیان دەرچوونە كۆتایی و تیاچوون نیە ، بەڵكو تیاچوون و كۆتایی لاوازی ئیمان و دانەمەزراوی و ڕاڕایییە) (روائع اقبال/الندوی/ص٩٨) .

## فراوانی دونیا و ئاخیرەت

ئاشكرایە ئیمپراتۆریەتی فارسی دەسەڵاتداری جیهان بوو ، شارستانێتیەكی هەزار ساڵی پێكەوە نابوو ، زۆر ناوچەشی داگیر كردبوو ..

كاتێك موسوڵمانان ڕووبەڕوویان بوونەوە لە شەڕی قادسیەدا ، ڕۆستەم داوای كرد لە موسڵمانان كە نوێنەرێكیان بنێرن بۆ گفتوگۆ ، سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصی سەركردەش سەربازێكی نارد كە ناوی ربعی كوڕی عامر بوو ، كاتێك ربعی هات بە خۆی و وولاخ و ڕمەكەیەوە ، داوایان لێكرد كە چەكەكەی دانێ ، ڕازی نەبوو ، ووتی: ئێوە ناردوتانە بە دواما ئەگەر وانەبێ دەگەڕێمەوە ، كە هاتیشە نزیكەوە فەرشی زۆر نایاب داخرابوو ڕۆستەمیش لەسەر تەختێكی گران بەها بەو بەپەڕی جاهو سەڵتەنەتەوە دانیشتبوو ، ربعی بۆئەوەی تێیان بگەیەنێ كە فەرش و ڕاخەر و دیكۆراتیان بێنرخە و كار لەم ناكەن و چاوی بەشەوارە ناخەن ، هەر هەنگاوێك دەهات ڕمەكەی دەچەقاند لە فەرشەكەی بەردەمی ، ئەمە وانەی یەكەم بوو كە دای‌دان ، كە چووە بەردەم ڕۆستەمیش ویستی

لایەوە دانیشیْ خێرا لێی ڕاست بوونەوەو نەیانهێشت , ئەمیش لای سەیر بوو , وتی: ئەمە عەقڵتانە , ئاوا جیاوازی هەیە لە نێوانتاندا و یەکتری دەپەرستن ..

ڕۆستەم ووتی: ئێوەیەکی ڕەش و ڕووت و برسی چیتانە بەسەرمانەوە , بگەڕێنەوە و شەڕمان لێ لادەن ، نانتان دەویْ دەتان دەینیْ و پۆشتەشتان دەکەینەوە , ربعی ووتی: ئێمە لەبرسا و , لە ڕووت و ڕەجاڵیدا نەهاتووین , بەڵکو (الله ابتعثنا لنُخرج مَن شاء مِن عبادة العباد إلى عبادة الله ، ومن ضيق الدنيا إلى سعتها ، ومن جور الأديان إلى عدل الاسلام ، فأرسلنا بدينه إلى خلقه لندعوهم إليه ، فمن قبل ذلك قبلنا منه ورجعنا عنه ، ومن أبى قاتلناه أبداً حتى نفضي إلى موعود الله ، قالوا: وما موعود الله ؟ قال: الجنة لمن مات على القتال من أبى والظفر لمن يبقـــى) , واتە: ئێمە خوا هەڵیبـژاردووین و ناردوینی تا هەرکەس ویستی دەری بهێنین لە ماددە پەرستی و مرۆڤ پەرستییەوە بەرەو خواپەرستی , لە تەنگەلأنی دنیاوە بەرەو فراوانی دنیا و لە زوڵم و ستەمی ئاینە دەستکاری کراوەکانەوە بەرەو دادپەروەری ئیسلام , ئێمەی بە ئاینەکەیەوە ناردووە بۆ لای بەندەکانی و دروستکراوەکانی تا بانگیان بکەین بەرەولای , هەرچی لێی وەرگرتین و لێی قبوولْ کردین , ئێمەش لێی قبولْ دەکەین و دەگەڕێینەوە , هەرچیش ڕازی نەبوو ڕێی لێگرتین دەجەنگێین لەگەڵیا تا ئەگەینە پەیمانی خوایی , وتیان :پەیمانی خوایی چییە ؟ وتی: بەهەشتە بۆ هەرکەسێکمان کە شەهید ببیْ لە جەنگدا و , سەرکەوتنیشە بۆئەوانەی کە دەمێننەوە .

بە ڕاستی ئەم گفتوگۆیە کە مێژوو تۆماری کردووە , بلیمەتی و شارەزایی موسوڵمانان پیشان دەدات لەو ڕۆژگارەدا , هەروەها دەری دەخات کە چۆن زۆر بەجوانی توانیویانە ڕاستیەکانی ئیسلام وئامانجی جیهادیان دەربڕن و هەقی خۆی بدەنیْ , ئەوەی زۆرتر سەرنج ڕاکێشە مەسەلەی دەرکردنە لە تەنگەلأنی دنیاوە بەرەو فراوانییەکەی .

باشە ئەبیْ دنیای ئیمبراتۆریەتی فارسی تەنگەلأنی و ناخۆشی بووبیْ ؟ ئەی بۆ ئەم سەربازە هەژارە ڕەش و ڕووتە ئاوا دەیبینیْ ؟

بەڵیْ .. بە ڕاستی چاکی تێگەیشتبوو , چونکە مرۆڤ کە خوای نەپەرست ، دار و بەرد یان مرۆڤەکان ، یان هەواو ئارەزوو , یان پارە و ماڵ دەپەرستیْ ! کە بەوانەش هەمووی

سەرگەردان دەبێت و ژیانی تاڵ دەبێت وئیرادە و جڵەوی خۆی لە دەست ئەدات (الا بذكر الله تطمئن القلوب) (الرعد).

لەو ڕۆژگارەدا لە کۆڕ وکۆبوونەوەکاندا ئەوەی جلەکانی بەری نرخی لەسەد هەزار کەمتربوایە تانە و تەشەری لێ دەدرا , ئەوەی کە جلەکانی بەری بایی (٥٠)هەزار بوایە , نیوەی ئەوانی پێشوو حسابی بۆ دەکراو ڕێزی لێ دەگیرا .

کاتێك ئیمبراتۆری فارس تێك شکاو مەدائنی پایتەخت گیرا , ڕای‌کردو, هەزار چێشت لێنەر و هەزار گۆرانی‌بێژ و هەزار بەخێوکەری هەڵۆ و پڵنگی لەگەڵ خۆیدا برد و دەیووت: من زۆر بێ‌بەختم کە ئەم ژمارە کەمەم لەگەڵ خۆم هێناوە لە خزمەتکار و دەست و پێوەند ، بە ڕاستی من جێی بەزەییم .

جا کاتێ لە ڕێگا لەماڵی پیرێژنێك لای‌دا و خواردنی بۆ دانا , بەزەیی پیاهاتەوە و زانی کە پادشا بووەو لێی قەوماوە .. پادشای فارس وتی: ناتوانم نانەکەم بخۆم و بە گەرووم دا ناچێتە خوارێ تا ئەمانە گۆرانیم بۆ نەڵێن ..

کاتێکیش (هرمزان)ی کاربەدەستی ئەهواز گیرا و هێنایان بۆ مەدینە و لە جامێکی گڵێنی زبردا ئاویان بۆ هێنا نەیتوانی بیخواتەوە تا جامێکی باشتریان بۆ هێنا .. بەڵێ .. ئەوانە دەژیان لە قەفەسێکدا , با قەفەسەکەش گەورە و ئاڵتونی بێت هەر قەفەسە و هەر کۆیلەیەتی‌یە .. ئیسلام هات مرۆڤ ئازاد کات و بە مرۆڤایەتی فەرموو ( أتعبدون ماتنحتون ) صافات/٩٥ , چۆن ئێوە شتێك دەپەرستن کە بەدەستی خۆتان دەیتاشن و دروستی دەکەن ؟! چۆن ئێوە یەکتری دەپەرستن , مەگەر هەموو وەك یەك نین لە ئادەمێتی‌دا , کێ زیاترە لەکێ ؟! .

ئەی دیاردە سروشتی‌یەکان دەپەرستن ؟ مەگەر ئەوانە هەموو بۆ خزمەتی ئێوە دروست نەکراون ؟!

ئەی پارە و سامان دەپەرستن و شپرزن بەدوایدا و هەر ئەوەندەش شتێکتان بەخۆتان شك برد لە خۆتان بایی دەبن و سنوور دەشکێنن؟؟ ( كَلا إن الانسانَ لَيَطغى أنْ رآه استغنى) العلق .

تەنگـەلآنی و ناخۆشـی دنیـای بێبڕواکـان لـە ئامارەکـانی ڕۆژئـاوادا بـە ئاشـکرا دەردەکـەوێت , لەگـەڵ ئـەو هـەموو خۆشـگوزەرانی و پێـشکەوتنە ماددیـیـەدا , کەچـی ڕێژەیەکی زۆر خۆکوژی و خوودانە مەی خواردن و ماددە بێهۆشکەرەکان هەیە ..
پێغەمبەر (ص) لە دوعاکانیدا پەنای گرتووە بە خوا لـەم تـەنگی و ناڕەحەتیـیـەی دونیا بە تایبەتی کە شەو لەخەو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ , دە جار (الله اکبر) و دە جار (لا الـه إلا الله)ی دەکرد و ئینجا دە جاریش دەیفەرموو : (اللهم إني أعوذ بك من ضـيق الـدنيا وضيق يوم القيامة).. ل ٣٩٣٩ في ظلال القرآن .

## کاری مەزنی ئوممەتی ئیسلام

ئوممەتی ئیسلام هێنراوەتە دنیایی بوونەوە , تا مایەی بەختیاری مرۆڤایەتی بێت و فەرمان بدا بە چاکە و جڵەوگیری بکات لە خراپە : (كنتم خيرَ امةٍ اخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهَونَ عَن المنكر وتؤمنون بالله) آل عمران ١١٠..
گەیاندنی ئەم پەیامەش هەوڵ و کۆشش و یەك بوونی دەوێ , هاوکاری یـەکتری دەوێـت , چونکە کافران بـە کوفری خۆشیانەوە هاوکـاری یـەکتری دەکـەن , بـەرگری لـە بەرنامـەی خۆیان دەکەن , ئەگەر بڕواداران کەم تەرخەم و پەرتەوازە بن ناگەنە هیچ و فەساد وخراپـە دنیا دەتـەنێت, قورئـان دەفەرموێت (والذين كفروا بعضهم أولياء بعض إلا تفعلوه تكـن فتنةٌ في الأرض وفسادٌ كبير) الانفال/٧٣ .

## ڕەوشت بەرزی بانگخوازان

ڕەوشت بەرزی و مامەڵەی جوانی بانگخوازان هۆکاری گرنگن بۆ گەیاندنی ئـەم پەیامـە , چونکە خەڵکی بە چاکی لە هەڵس و کەوت و مامەڵەیان وورد دەبنەوە و دەیانەوێ بزانن ئاخۆ ئەو بانگخوازانە ئـەوەی دەیـڵێن ڕەنگـی داوەتـەوە لـە خۆیانـدا یـان نـا .. کـاتی خـۆی پێش چەند سـەدەیەك ئیسلامەتی لـە هینـد و وولآتـە دوورەکـان بـە هـۆی ڕەفتـاری جوانـی بازرگانە موسڵمانەکانەوە بڵاوبۆتـەوە .. نموونـەی تریـشمان زۆرە لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە , کاتێـك بـانگخوازی پایـە بـەرز پێـشەوا ئەحمـەدی کـوری عیرفـانی شـەهید , لـە هینـدەوە بیشاوری گرت و سوپاکەی بۆ چەند هەفتەیـەك تیامانـەوە , ڕەفتـاری جوانیـان کاریگـەری زۆری هەبوو لەسەر دانیشتوان .

ڕۆژێك هاوڵاتیەك بەیەكێ لە موجاهیدانی ووت: ئایا چاوتان هیچی هەیە , ئاخۆ چاوتان ( قصر النظر)یێتی ؟ ئەویش وتی: نەخێر ، وتی : ئەی باشە ئێوە هەموو لاون و چەند ساڵە هیجرەتتان كردووە و لەگەڵ ئیمام دا خەریكی جیهاد كردنن , كەچی هیچتان سەیری ئافرەتان ناكەن , لەكاتێكدا كە سەرباز و سوپا هیچ شتێ نیە دەستیان بگرێ و هەرچی بكەن دەیكەن .. ئەویش وتی: برا ئێمە پەیڕەوی ئایەتی ( قل للمؤمنين يغـضوا من ابصارهم ويحفظوا فروجهم .. ) النور/٣٠/ دەكەین و ئیمامەكەمان ئاوا پەروەردەی كردووین .. } ل/٦٢٠ محاضرات اسلامية مجلد (١)/الندوي .

### بانگخواز مەبەستی ڕەزامەندی خوایە

یەكێكی تر لە هۆكارەكانی سەركەوتنی بانگەواز ئەوەیە كە بانگخواز تەنها مەبەستی خوا بێت و چاو نەبڕێتە ماڵی دنیا و پلەوپایە , بە ئیبن تەیمیە وترا : تۆ بۆ دەسەڵات و پادشایەتی وا دەكەیت ؟؟ ئەویش سەریسوڕما و بەو بەپەڕی هێزەوە وتی: من دەسەڵات و پادشاییم دەوێ ! بەخوا هەموو موڵك و دەسەڵاتی تەتەر لەلام درهەمێك ناهێنێ ..

هەروەها یەكێ لە بانگخوازەكانی هیندستان , كە خەڵكێكی زۆر لەسەر دەستیا بەهرەوەربوون , پادشای (دهلی) ویستی پارە و ماڵێكی زۆری بداتێ .. ئەویش وتی: نامەوێت.. پادشا وتی: هەردەبێ شتێك وەرگری لەوەی كە خوا پێی داوم .. ئەویش وتی: خوای پەروەردگار دەفەرموێ ( قلِ متاع الدنيا قليـل) النساء٧٧ , جا ئەگەر دنیا كەم بێت , دیارە كیشوەری ئاسیا بچوكترە لە دنیا و , هیندستانیش بچوكترە لە ئاسیا و (دهلی)ش بچوكترە لە هیندستان .. تۆش تەنها موڵكی (دهلی)ت بەدەستە , ئیتر من چۆن ببمە برابەشت لەو موڵك و ماڵە كەمەدا .

لە سەدەی ڕابردوودا لە دیمەشق , زانای بەناوبانگ شێخ سەعیدی حەڵەبی لە مزگەوتێك وانەی دەوتەوە و لەبەرئەوەی قاچی دەیەشا پاڵیدابۆوە بە دیواری میحرابەكەوە و قاچی درێژ كردبوو , لەو كاتەدا (ئیبراهیم پاشا)ی حاكمی گشتی سوریا كە پیاوێكی بەزەبر و زەنگ و دڵ ڕەق بوو هاتە مزگەوتەكەوە و شێخ سەعید خۆی تێك نەدا و قاچی هەڵنەكێشا , هەموو لەو بڕوایەدا بوون ئێستا لەسەری دەدات و خوێنی دەڕێژێ . كەچی ئیبراهیم پاشا گەڕایەوە و دوایی كیسەیەك پارەی بۆ نارد بەدیاری بە

خزمەتکارێکیدا ، ئەویش وتی: بۆی بەرەوە و پێی بڵێ :ئەوەی قاچی درێژ بکات دەست درێژ ناکات بۆ وەرگرتنی هیچ شتێك .. ( محاضرات اسلامية في الفكر والدعوة/الندوي مجلد/١) .

## بانگخواز هەموو هۆکارێکی ڕاگەیاندن بەکار دێنێت

ژیان بەردەوام لە پێشکەوتندایە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیش لە زیادبوون و بەرەوپێش چووندان , بۆیە بانگخوازی بە ئەمەك و وریا هەموو هۆکارێك بەکار دێنێت لە گەیاندنی پەیامەکەیدا , بۆ نموونە : لەم سەردەمەدا بانگخوازێکی وەك عەمر خالید ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە و توانیویەتی جێی خۆی بکاتەوە لەدڵی کەسانێکی زۆردا لەسەرتاسەری جیهاندا , یەکێ لە هۆکانی ئەم سەرکەوتنەش بێجگە لە ئیخلاص , بەکار هێنانی کەناڵە فەزاییەکان و ئینتەرنێت و وتاردان و پەڕاونوسینە.. کە بەمەش لە هەموو لایەکەوە پەیوەندی پێوە دەکرێت و سوودی لێ وەردەگیرێت .

### سارا لە ئوسترالیا وە تەوبەی کرد :

سارا کیژۆڵەیەکی لوبنانی باوك موسوڵمان و دایك مەسیحیە لە هەشتاکاندا کۆچ دەکەن بۆ ئوسترالیا , کێشە دەکەوێتە نێوان دایك و باوکیەوە و لەیەك جیا دەبنەوە , بە هەر حاڵێك دەبێت سارا خوێندن تەواو دەکات , ناوبراو لەبارەی تەوبە و هیدایەتیەوە دەڵێت : من هیچم لە ئیسلام نەدەزانی , وەك کچانی تری ئەو وولاتە سەرگەردان بووم و لە پێشبڕکێی شایجوانانداا بەشداریم کرد لە نیوزلەندا و بەیەکەم دەرچووم , بەڵام ئەو هەموو ڕابواردن و خۆشگوزەرانیە دەروونی تێراو نەدەکردم و, هەمیشە دڵەڕاوکێم بوو , هەستم بە بەختیاری نەدەکرد , تا ڕۆژێك ڕێم لە سایتی عەمر خالید کەوت و هۆگری وتار و قسەکانی بووم و چەند نامەم بۆ ناردو، بەمەش خوا هیدایەتی دام .. کاتێ کە بە تەواوی تەوبەشم کرد نامەم نارد بۆ مامۆستا و مژدەم دایە کە فێری دەستنوێژ و نوێژکردن بووم .. خوایە گیان هەزاران سوپاس و ستایش بۆ تۆ کە بەو سەرگەردانیە سەرم نەنایەوە .

بەڵێ .. سارا زۆری نەخایاند تووشی نەخۆشی بوو , کە پزیشکەکان پشکنینیان بۆ کرد دەرکەوت تووشی شێرپەنجەی مێشك بووە , هەرچەند ڕێژەی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکەی لەسەدا بیست بوو سارا ڕازی بوو کە بۆی بکەن و زۆر دڵخۆش بوو کە پێش ئەوەی بزانێ نەخۆشە تەوبەی کردبوو.. پێش ئەوەی کە ببرێ بۆ نەشتەرگەریەکەی

نامەیەکی نارد بۆ مامۆستا وپێی ڕاگەیاند کە بەهیچ جۆرێك نەیزانیوە نەخۆشە و بەتەمای نەخۆشی نەبووە کە تەوبەی کردووەو، داواشی کرد ئەگەر خوا بردیەوە دوعای خێری بۆ بکەن .. بەڵێ نەشتەرگەرییان بۆ کرد و بەداخەوە لێی دەرنەچوو ، بۆیە مامۆستا عەمر خالید فرمێسکی بۆ ڕشت و داوای لەهەموو ئەوانە کرد کە سەردانی سایتەکەی دەکەن نوێژی (غائب)ی لەسەر بکەن و دوعای خێری بۆ بکەن .. }ژمارە/٤٦٤ ، سالی دەیەم/ڕۆژنامەی یەکگرتوو .

## نەرم و نیانی بانگخوازان

نەرم و نیانیلەناو خێزان و کۆمەڵدا ، بەهرەی خوا و بەخشینێکی گەورەیە ئەگەر مرۆڤ لێی بەهرەوەر بێت ، پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت (إذا أراد الله بأهل بيت خيراً ، أدخل عليهم الرفق) .

واتە / ئەگەر خوا ئیرادەی خێری بە ماڵێك هەبێت ئەوا نەرم و نیانیان ئەداتێ .. بەڵێ .. نەرم و نیانی لەهەر شتێکدا بێت جوانی دەکات ، بە تایبەت لە بانگەوازدا ، (ص) تا دوا پلە نەرم و نیان بوو لەگەڵ خەڵکیدا ، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت ( فبما رحمةٍ من الله لنت لهم ، ولو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك) (آل عمران/١٥٩) .

واتە: بە هۆی ڕەحمەتی خواوەیە کە تۆ نەرم و نیانیت لەگەڵیاندا ، خۆ ئەگەر تووڕە و قسە ڕەق و بێبەزەیی بوویتایە ، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد ..

## چوار ئافرەت لە ئەرجەنتین

شێخ جاسم المطوع لە بەرنامەی ( بيوت الانبياء ) دا وتی :

چوار ئافرەتی پانتۆڵ لەپێ هاتنە مزگەوتی ئەرجەنتین بۆ نوێژکردن ، خەریك بوو ئیمامی مزگەوتەکە بیانکاتە دەرەوە ، بۆیە ساردم کردەوە و پێموت کە پێغەمبەر (ص) لە مزگەوتەکەیدا پیاوێکی دەشتەکی میزی کردو لێشی تووڕە نەبوو ، ئیتر تۆ بۆچی پێت سەیرە و پێت گرانە ئەمانە ڕوویان کردۆتە ماڵی خوا .. خوا ئاگادارە ئەم ئافرەتانە و

هاوشێوەکانیان کە هاتن بەرەو مزگەوت و بەنەرمی مامەڵەیان لەگەڵدا کرا بوونە بانگخواز و ئێستا ملیۆنێك موسوڵمان هەیە لە ئەرجەنتین دا .

**بانگخوازان گرنگی بە هەموو بوارێکی ژیان دەدەن**

موسوڵمانان گرنگیان بە هەموو لایەنێکی ژیان دەدا , بۆیە بوونە پێشەوا و سەرداری جیهان .. کاتێك زانای بەناوبانگ (الطبري) سی جڵد تەفسیری نووسی , زانای بەناوبانگ رازیش سی جڵدی لەسەر زانستی پزیشکی نووسی.

جا بانگخوازانیش بەوەی کە گرنگی بدەن بە هەموو بوارێکی زانست و هەموو لایەنێکی ژیان , دەتوانن جێی خۆیان بکەنەوە و رۆڵی خۆیان بەچاکی ببینن . زانای خواناسی هیندی (محمد ئیقبال) دەیان ساڵ لەمەوبەر لە رۆژئاوادا دکتۆرای هێنا و توانی لە بریق و باقی شارستانیەتی رۆژئاواش قوتار ببێت و هەردەم ئەوەی لەیادبوو کە بڕوادار بە بڕواکەی گەورەترە و لەپێشترە لە هەموو کەسێك کە بڕوای نەبێت , با هەرچی بێت و هەر پلەیەکی ببێت , مەگەر قورئان نافەرموێت (ولا تهنوا ولاتحزنوا وأنتم الأعلون إن كنتم مؤمنين) آل عمران ١٣٩ .

محمد ئیقبال لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت: من توانیم دەنکە گەنمی خۆم بەدەست بهێنم و نەشبم بەدوای ڕاوچییەوە , خوا دەزانێ من لەسەر ڕچەی حەزرەتی ئیبراهیم ڕۆیشتم و چوومە ئاگری شارستانیەتی رۆژئاواوە و متمانەم بە خۆم هەبوو , بە سەلامەتی لێی دەرچووم و شەخسیەتی خۆمم نەدۆڕاندو ،لە زستانی زۆر ساردی بەریتانیادا , کە هەوای ساردی وەك شمشێر کاریگەر بوو , نوێژ و شەونوێژم نەفەوتاند..( ل/١٣٧ محاضرات اسلامية ) ..

**بانگخواز و خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر**

ئاشکرایە دینەمۆی بانگخواز ئەو خۆشەویستیەیە کە لە دڵیا دەجۆشێ ،خۆشەویستی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و بڕواداران .. ئەگەر کەسانێك ماڵ و سامان , یان خۆیان , یان هەر شتێکیان تا دوا پلە خۆش بوێ ، بڕواداران و بانگخوازان لەوان زیاتر خوایان خۆش دەوێ ( والذين آمنوا أشد حباً لله ) البقرة ١٦٥.

خۆشەویـــستی پێغەمبـــەریش (ص) ,            خـــۆی ئامـــاژەی پێـــدەکات و دەفـەرموێت:کەسـتان بڕواداری تـەواو نیـە  هـەتا منـی لـەماڵ و منـاڵ و پـارە و سـامان و لەخۆشی خۆشتر نەوێت

**نموونەیەك لە کوردستانەوە**

حاجی شێخ محمدی شێخ سەعید کە لە گوندی بەردێی قەرەداغ لـە ئازاری ١٩٨٨ دا کۆچـی دوایـی کـردووە ، بـەردەوام لـە مزگـەوت بـانگی دەدا و کـە دەگەیـشتە (أشـــهد أن محمـــداً رســـول الله) کـەمێك دەوەسـتا و لـەژێر لێـوەوە دەیـووت (خـۆم و دایـك و بـاوکم بەقوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا) , ئینجا بۆ دووەم جار دەیووتـەوە (أشهد أن محمـــداً رسول الله) بەهەمان شێوەی جاری یەکەم لەژێر لێوەوە بە نزمـی دەیـووت (خـۆم و دایـك و بـاوکم بـەقوربانت بـین ئـەی پێغەمبـەری خـوا)    بـە ڕاسـتی ئەمـە جۆرێکـە لـەدەربڕینی خۆشەویستی کە ئەم پیاوە باشە لە دڵیا بووە

**نموونەیەك لە میسرەوە**

شێخ محمد حسان , وتاربێژێکی میسرییە و دەڵێ: کە لە وولاّتی سعودیە دەمخوێند و بۆ یەکـەم جـار بەشـەو گەیـشتمە مەدینـە , خێـرا چـووم زیـارەتی پێغەمبـەری خـوا بکـەم , بـەلاّم چـونکە بەشـەو مزگەوتەکـە دادەخـرا و کاتەکـەی منـیش درەنـگ بـوو , لەگـەڵ برادەرەکـانم گەیـشتمە بـەر دەرگایـەك و پاسـەوانێك هاتـە دەرەوە و دایخـست , خێـرا ڕام کـرد بـەرەو دەرگایـەکی تـر بـەڵکو فریابکـەوم و خێـرا هـەر ئەوشـەوە زیـارەتی خـۆم بکـەم و سـلاّو لـە حـەزرەت بکـەم , کـەچـی ئـەویش داخـرا بـە ڕوومـدا, دەرگایـەکی تـریش بەهـەمان شـێوە , بۆیـە دانیـشتم و زۆر دڵـم لـەخۆم دامـا و گریـام , لـەو کاتـەدا ئەفسـەرێك کـە لـەو دەرگایـە هاتـە دەرێ و بەحاڵەکـەی زانـی , دڵـی پـێم سـووتا و بردمـیيـە ژوورەوەو بـەتاقی تەنها لەبەر ئارامگای^پێغەمبەر^ دا (ص) وەستام و سلاّوم لێکردو دڵم ئاوی خواردەوە.

**بانگخوازو ئاگری جگەر**

بـانگخوازی بـە ئەمـەك و ڕاسـت , ئـاگری جگـەر هەڵیـدەگرێ و دەیبـات بـەرەو هـەوڵ و کۆشـش و خـەباتی بێوچـان و دەزانێـت کـە ئـەرکی سەرشـانی گرانـە    قـازی بهاءالـدین (ئیبن شیداد) لەبارەی (صلاح الدین)ی هاوڕێیەوە دەڵێت: (صلاح الدین تەوبەیەکی چاکی کـرد لـە هـەموو شـتێك کـە شـەرع یاسـاغی کردبـوو , هـەروەها وازی لـە هـەموو لـەززەت و

خۆشی‌یەك هێناو , هەستی كرد كە خوای گەورە بۆ كارێكی مەزن دروستی كردووە كە ناگونجێ لەگەڵ ڕابواردن و كەیف كردندا .. صلاح الدين خەمێكی ئەوەندە زۆری قودسی‌بوو كە شاخ بەرگەی نەدەگرت و, هەر دەتووت كوڕی جگەر گۆشەی ون كردووە , یان دەتووت ئافرەتێكی جەرگ سوتاوە و خۆشەویستێكی لەكیس چووە)ی ( ل/٢٣٤ محاضرات /الندوي – ل/١٥٥ النوادر السلطانية) .

## زانست بەرەو ئیمان دەچێتەوە

زۆر هەوڵ درا بۆ جیاكردنەوەی زانست و ئیمان , بە هۆی ئەو زوڵم و زۆرەی كە كەنیسە دەیكرد لە زانایان لەسەدەكانی ڕابردوودا لە ئەوروپا , ڕاستە پیاوانی كەنیسە زانایانیان دەسووتاند لەسەر هەندێ بیروڕای زانستی , بەڵام ئەمە پاكانە نیە بۆ جیاكردنەوەی ئیمان و زانست لەیەكتری و , هەر زوو زانایانی بە ویژدان بەبێ دەمارگیری وتیان زانست بەبێ ئیمان وەك باڵندەیەك وایە كە بیەوێ بەیەك باڵ بفڕێت كە دیارە ئەمەش ئەستەمە.

ئەو ڕۆژگارە ڕۆیشت و هەندێ لەوانەی كە چاویان بەشەوارە كەوتبوو بە پێشكەوتنی ڕۆژئاوا , ویستیان هەمان بەزم لە وڵاتە ئیسلامیەكاندا بنێنەوە , بەڵام زۆر بۆیان نەچووە سەر , چونكە ئیسلام هەرگیز دژی زانست نەبووەو , لەلایەكی تریشەوە ڕابوونی ئیسلامی زۆر بەهێزەوە سەری هەڵدایەوە و لە ڕۆژئاواش زانایان بەرەو ئیمان هاتنەوە و زانیان كە ژیان بەبێ ئیمان مانای نیە ..

### زانای بەناوبانگ باول دیفیز :

زانای فیزیای بەناوبانگ ( باول دیفیز) لەساڵی/١٩٩٥دا جائیزەی یەك ملیۆن دۆلاری وەرگرت لەسەر پەڕاوەكەی (الله والفيزياء الحديث) ( GOD AND THE NEW PHYSICS), كە تیایا دەیسەلمێنێ ڕاستیەكانی فیزیای نوێ لە نەفسی بەشەردا بڕوا بەخوا و ڕۆژی دوایی و غەیب دەچەسپێنێ.. (www.Tasabeeh.Com) .

### زانای پاكستانی محمد عبدالسلام :

زانای پاكستانی محمد عبدالسلام لەساڵی/١٩٧٩دا جائیزەی نۆبلی وەرگرت لە فیزیادا , بەوەی كە لێكۆڵینەوەی گرنگی كرد لە مەسەلەی (الجسيمات وقرائنها) وە توانی بیردۆزێ دابنێ كە تیایا دوو هێزی سەرەكی لەم بوونەوەرەدا بەیەكەوە ببەستێتەوە كە ئەوانیش (هێزی كهرومغناتیسی و هێزی ناوكی لاوازە) .

پاش ئەوەی جائیزەکەی وەرگرت , وتی: وورد بوونەوەم لە ئایەتی (ومن كل شيءٍ خلقنا زوجين) بووە هۆی ئەو لێکۆڵینەوانەم و گەیشتمە ئەو ئەنجامە گرنگانە . (پەڕاوی/آيات قرآنية في مشكاة العلم - د.يحيى المحجري) .

**پرۆفیسۆر الفريد كوروز :**

زانای بەناوبانگی جیۆلۆجیای جیهانی (پرۆفیسۆر الفريد كورون) ئامادەی کۆنفرانسی جیۆلۆجیا بوو لە کۆلێژی ( علوم الأرض ) لە زانکۆی مەلیك عبدالعزیز , شێخ عبدالمجید زندانی لێی پرسی : ئێوە وەك زانای بواری جیۆلۆجیا هیچ ڕاستی و زانستێکتان لایە لەسەر ئەوەی کە کاتی خۆی نیوە دورگەی عەرەب باخ و بێستان و ڕووبار بووە و دواتر بووە بە بیابان , وتی: بەڵێ ئەوە شتێکی زانراو و بەڵگە نەویستە لەلامان و ڕاستیەکە ناتوانین لێی ڕابکەین , شێخ عبدالمجید پێی وت: دە گوێ بگرە بزانە کێ هەواڵی داوە بە محمد (ص) کە ئەم فەرموودەیەی فەرمووە کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە (لاتقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجاً وأنهارا) ..

ئاخۆ کێ پێی ڕاگەیاندووە کە لە داهاتووش دا وای لێدێتەوە .. ئەویش بیری کردەوە و وتی: شتی بەرزی تیایە .. وتم: بینوسە بۆم , ئەویش بە دەستی خۆی نووسی ((بە ڕاستی سەرسامی کردم ئەو ڕاستیە زانستیانەی کە لە قورئان و سوننەت دا هەن , کە ئێمە لە ڕێی زانستی نوێوە لەم دواییەدا دۆزیومانەتەوە , کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ محمد (ص) نەگەیشتۆتە ئەم زانیاریيانە مەگەر لە ڕێی وەحیەوە))..

بەڵێ لە دوو سەعات و نیوی کۆنفرانسێك دا زانایەکی دوور لە دینی ئەڵمانی ئاوا کاری تێکرا و ڕاوبۆچوونی گۆڕدرا بەو جۆرەی کە ئاوا تەعبیری لێکرد و نووسی.. (العلم طريق الايمان/الزنداني) .

**موسوڵمانانی خوارووی ئەفریقیا :**

پرۆفیسۆر زەغلول النجار کە زانایەکی میسری و پسپۆڕە لە بواری جیۆلۆجیادا دەڵێ: ساڵی١٩٧٥ چووم بۆخوارووی ئەفریقیا , لەسەر داوای موسوڵمانەکان و ماوەیەك لەلایان مامەوە , ڕۆژی چەند وتارێکم بۆ دەدان لەچەند شوێنێکی جیاوازدا .. لەو وڵاتە جیاوازی هەبوو لەنێوان ڕەش پێست و سپی پێستەکاندا , شوێنی برینی بلیتی ڕەش و سپی جیابوو , چێشتخانە و پاصی ڕەش و سپی جیابوو , لەگەڵ ئەو هەموو ستەمەی کە دەکرا , موسوڵمانان زۆر پاك و تەمیز بوون و مزگەوتەکانیان پاك بوون , دەیانزانی کە

تەنها ئیسلامە جیاوازی ناکات لە نێوان کەس دا و فەزڵی کەس نادا بەسەر کەس دا مەگەر بەوەی کە یەکێکیان پارێزکارتر بێت.. لە زانکۆیەکی جوولەکە وتارم دا و دواتر گفتوگۆ دروست بوو , ژنێك هەستا زۆر بەڕەقی قسەی کرد و وتی: ئێوە دواکەوتوون , ئێوە ماف بە ئافرەت نادەن , ئێوە کار بەدەستەکانتان دیکتاتۆرن و ... هتد .

منیش بەنەرمی وەڵامم دایەوە , پاش دوو ساڵ هات بۆ کوەیت و موسوڵمان بوو پاش ئەوەی ڕاستیەکانی بۆ دەرکەوت .

لە دێیەکی دەوروبەری جوهانسبێرگ وتارم دا , دوای قسەکانی من ڕەش پێستێکی چوارشانە هەستاو ویستی قسە بکات , هەڵسوڕێنەرانی کۆڕەکە خەریك بوو نەهێڵن و ڕێی نەدەن , وتم: بۆچی ڕێی لێدەگرن؟ وتیان: ئەوە قەشەی دێکەیە و دەترسین بەزمێك بنێتەوە وهەڵە بکات بەرامبەرت , منیش وتم: قەیناکە ڕێی بدەن چی دەوێت بابیڵێ ! بەڵێ: ڕێیان دا و , پیاوەکە هاتە لای مایکرۆفۆنەکە و کەوتە قسەکردن و هەموو ئامادەبووانی خستەگریان , وتی: پێش وتارەکە کە هەموو بەیەکەوە نوێژی ئێوارەتان کرد بە کۆمەڵ و جیاوازی نەبوو لەنێوانتاندا و ڕەش و سپی و گەورە و بچووك شان بەشانی یەك وەستابوون , ئەو دیمەنە زۆر کاری تێکردم , بە ڕاستی من فێری گاورێتی بووم لەخوارووی ئەفریقیا و ئەوەتا قەشەم لەم ناوچەیەدا و ئەو جیاوازیە زۆرە دەبینم کە دەکرێت لە نێوان ومن و سپی پێستێك دا ئەگەر قەشەش بێت , بۆیە وا ساڵێکە بیردەکەمەوە و وێڵم بەدوای بەرنامەیەکدا کە بەیەك چاو سەیری هەموو ئادەمیزادێك بکات ، وا ئێستا لە ئیسلامدا دۆزیمەوەو , من زۆر گلەییم لە موسوڵمانانی ئەم دێیەی خۆمان هەیە کە بۆچی بەسنگێکی فراوانەوە ئەم ئیسلامە بەرزە پیرۆزە ناگەیەنن بە خەڵکی وێڵ و سەرگەردان تا سەرفرازبن ، وە من دەمەوێ موسوڵمان بیم ..

(زەغلول النجار) بەردەوام دەبێ لەسەر قسەکانی و دەڵێ: پێم وت: برا جارێ پەلەمەکە و باشتر لێکۆڵینەوە بکە لەسەر ئیسلام , تا قەناعەتت زیاتربێت , کەچی ڕازی نەبوو , وتی: دیراسەی تەواوم کردووە ولەهەموو دڵمەوە موسوڵمان بوونی خۆم ڕادەگەیەنم و (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) .. بەدوای ئەویشدا دەیان کەسی تر موسوڵمان بوون و ئەو دیمەنە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەریان و دڵ و دەروونیانی هەژاند .. ( بەرنامەی اسلام بلاحدود/کەناڵی محور) .

## بانگخوازی نموونەیی

**یەکەم / زەغلول النجار**

پرۆفیسۆر زەغلول النجار لەساڵی ١٩٣٣دا لە دێیەکی پارێزگای الغربیە لە میسر لەدایك بووە , هەر لەمناڵیەوە لەسەر دەستی باوکیا قورئانی لەبەر کردووەو , باوکی مودەڕیس بووەو زۆر خەمی بوو لەسەر ڕەوشت و خووی ئیسلامی مناڵەکانی پەروەردە بکات , بۆیە لەسەر هەموو کۆبوونەوەیەك بۆ نان خواردن وانەیەکی پەروەردەیی کورتی دایاون ..

زەغلول قۆناغەکانی خوێندنی بڕی تا گەیشتە کۆلێژی زانیاری زانکۆی قاهیرە و لەساڵی ١٩٥١ز دا بەکالوریۆسی لە جیولۆجیادا بەپلەی شەرف تەواو کرد و یەکەم بوو .

لەکاتی لاویدا شوێنی قوتابخانەی ڕابوونی ئیسلامی (برایان)کەوت و ئەمەش بووە مایەی بەربەرەکانێ کردنی میری بۆی و تەنگ پێ هەڵچنینی , لەبەرئەوەی لە برایان بوو لە زانکۆ نەکرا بە (معید) هەرچەندە یەکەمیش بوو , ناچار لەچەند بەڕێوەبەرایەتیەکی میسریدا کاری کرد و, پێنج مانگ لە کۆمپانیای (صحاری)ی نەوت و پێنج مانگیش لە (مرکزی قومی بحوث) و , دواتر پێنج ساڵ لەکانەکانی فۆسفات و, ناوبراو بە جۆرێك سەرکەوتوو بوو کە توانی کارێك بکات فۆسفات لەکانەکانی (ابو طرطور) لەماوەی شەش مانگدا بەرهەم بێت و بایی ملیارەها جونەیهی لێ بنێرێ بۆ دەرەوەی وڵات .

لە ئاهەنگی ناردنە دەرەوەی فۆسفات لەو کانانەوە , سەرۆکی یەکێتی کرێکاران وتی: ( بە ڕاستی کەسایەتیەکمان لایە کە توانیویەتی دڵی کرێکارەکان هەموو بکات بەیەك ) .. ئەوەی سەیرە لەجیاتی ئەوەی دەستی ڕێزی لێبنرێ و بەخشیشی چاکی بدرێتێ ، لەبەرئەوەی بانگخواز بوو لە کارەکەی دەرکرا !

زەغلول لەهیچ کارێکدا نەیان هێشتووە زۆر بمێنێتەوە , بۆ ساڵێك لە زانکۆی (عین الشمس) دانرا و دوایش لە زانکۆ دەریان کرد .. لەساڵی ١٩٥٩ز خوا دەرگای لەم زانا بانگخوازە بەناوبانگە کردەوە بەوەی بانگکرا لە زانکۆی (آل سعود)ەوە لە ( ریاض ) بۆ دامەزراندنی بەشی جیولۆجیا لەو زانکۆیە .. لە سعودیەوە توانی بچێ بۆ لندن وە لەوێ دکتۆرای هێنا لەساڵی ١٩٦٣ز دا , ئینجا زانکۆ هەڵیبژارد بۆئەوەی پلەیەکی بەرزتری بداتێ دوای دکتۆراکەی , کە ئەمەش بەیەك کەس نەدرا , ( ئیدارە ی بعثاتی میسر )ی ویستیان ئاستەنگ بهێننە ڕێی , کەچی مامۆستاکەی کە زاوای شاژنی بەریتانیا بوو

نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی نارد بۆ میسرییەکان و تی: (گومانی تیا نیە کە دکتۆر زەغلول النجار لە هەموو کەس زیاتر شایانی ئەوەیە کە ئەو پلە زانستییەی بدرێتێ , جا ئەگەر ڕێی لێبگرن ئەوا هیچ قوتابیەکی میسری لەمەودوا وەرناگرین) ئەوانیش ناچاربوون دەست نەهێننە ڕێی و بینێرن ..

**دەستی قەدەر :**

لەساڵی١٩٦١دا کە دکتۆر زەغلول ویستی لە میسرەوە بچێ بۆ لندن و هەموو معامەلەیەکی سەفەرەکەی کرد کەچی لە دوا ساتدا پێیان وت : تۆ ڕێنادرێیت سەفەر بکەیت و, کارەکەش لایبەڕێوەبەری (جوازات )ە لە پۆرسعید !

دکتور زەغلول و (محمد) ی برای بە پەلە چون بۆ ماڵی ئەفسەرەکە لەماڵ نەبوو , زانیان کە لە خەستەخانەیە و ژنەکەی لەسەر منال بوونە , خێرا چوون بۆ خەستەخانە بۆ لای و ئەویش پیاوانە فەرمانەکەی هەڵوەشاندەوە و وتی: مادام خوای گەورە ئەمڕۆ ژیانی بەخشیوە تەوە بە ژنەکەم و بەسەلامەتی هەستاوەتەوە , ئەبێ تۆش سەفەر بکەیت , جاچی دەبێت بابێت !) ..

جا لەبەرئەوەی سەفەرەکەی دکتور زەغلول بە کەشتیبوو , کەشتیەکەش جوولابوو , بۆیە ئەفسەرەکە بەلەمێکی بۆ دەرکرد و لەناوەڕاستی دەریادا زەغلولیان گەیاندە لای و پەیژەیان بۆ شۆڕکردەوە و بەو شەوە سەرکەوت و هەموو سەرنشینانی کەشتیەکە سەیریان دەکرد و لایان سەیر بوو .. دکتور لەم بارەیەوە دەڵێت: ( بە خەیاڵمدا نەهاتووە هیچ گەورەیی و بەرزییەك لەمە زیاتر لە ژیانمدا دەستم کەوتبێ) .

بەڵێ: ئاوا خوای گەورە لوتی دوژمنانی ڕابوونی ئیسلامی شکاند و فەرمانەکەیان هەڵوەشایەوەو دکتۆر چوو بۆ بەدەست هێنانی پلەی بەرزتر .. دکتۆریش لەبواری جیولۆجیادا چواردە بابەت و لێکۆڵینەوەی پێشکەش کرد و زانکۆش پلەی (زەمالە)ی بۆ لێکۆڵینەوەی دوای دکتۆرای دایە لە (١٩٦٣-١٩٦٧) ...

باس و لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر زانکۆ بلاوی کردونەتەوە و حەڤدە جار چاپ کراونەتەوە و نوسخەیەکیش بۆ یادگار کە شەش سەد لاپەڕەیە لە مەتحەف بەریتانیدا دانراوە ..

دکتۆر بەشداری کرد لە دامەزراندنی بەشی جیولۆجیادا لە زانکۆی کوەیت لەساڵی ١٩٦٧دا و لەساڵی ١٩٧٢دا پلەی ( استاذ )ی وەرگرت و بوو بە سەرۆکی بەشی

جیۆلۆجیا لەهەمان ساڵدا و.. بۆ ساڵێکیش لە (١٩٧٧)دا مامۆستای (زائر) بوو بۆ زانکۆی کالیفورنیا..

پاشان لە ( قطر) لەساڵی ١٩٧٨و١٩٧٩ کاری کرد ...شایانی باسە دکتۆر (٨٥) لێکۆڵینەوەی زانستی لەبواری جیۆلۆجیادا نوسیوە , وەك بابەتی (کوەیت پێش شەش سەد ملیۆن ساڵ) و (وزەی ژێر خاکی سعودی) ە و (نەوت لە سروشتدا).

لە بواری ئیسلامیش دا چل بابەتی زانستی پێشکەش کردووە وەك (التطور من منظور اسلامي) و (مفهوم علم الجيولوجيا في القرآن) و (قصة الحجر الأسود في الكعبة) و (حل الاسلام لكارثة التعليم) و .. هتد , دکتۆر دە پەڕاوی هەیە , لەوانە (الجبال في القرآن) و (صور من حياة ماقبل التأريخ) و (أزمة التعليم المعاصر) و ... هتد .

ئەمە بێجگە لەوەی کە سەرپەرشتیاری زیاتر لە سی نامەی ماجستێر و دکتۆرا بووە لەمیسر و وڵاتانی خليج داو , دکتۆر یەکەم نەخشەی جیۆلۆجی بۆ بنی دەریای باکور کێشا و چەند جاریش خەڵات کراوە ..

دکتۆر بەشداری کردووە لە دامەزراندنی بانقی (دبی) و بانقی (فيصل)ی میسری و بانقی (تقوی).. ئەمە بێجگە لەوەی کە لەدەستەی دامەزرێنەرانی دەزگای خەیری ئیسلامی کوەیتی بوو ..

دکتۆر ئەندامە بۆ دەرکردنی چەندەها گۆڤار لە نیویورك و پاریس و ڕاوێژکاری زانستی گۆڤاری ئیسلامی‌یە کە لە هیندستان دەردەچێ .. ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەندامە لەچەندەها کۆمەڵەی زانستی ناوخۆ و دەرەوەدا کە زۆر چالاکانە کارەکانی ڕادەپەڕێنێت تیایاندا ..

بەڵێ , د.زەغلول النجار لەرێی زانستەکەیەوە توانی خزمەتێکی باش بە بانگەوازی ئیسلامی بکات لەسەرتاسەری جیهاندا , لەکاتێکدا کە لە وڵاتی میسر برایان و دەنگی ڕابوونی ئیسلامی بەئاگر و ئاسن کپ دەکرا ئەم توانی ئەو دەنگە بگەیەنێتە وڵاتانی دەرەوە و لە ڕێی زانکۆکانەوە بانگەوازەکەی بڵاو بکاتەوە و لەبواری ئیعجازی زانستی قورئان و سووننەت دا خزمەتێکی باش پێشکەش بکات ..

ئێستاش سەرپەرشتیاری پەیمانگای خوێندنی باڵایە لە ئینگلتەرە بەناوی : ( Markfield Institute Of Higher Education ) کە ماجستێر و دکتۆرا دەدات لەبوارەکانی ئیسلامدا , وەك (ئابووری و مێژوو ,ئازادی ئافرەت و... هتد ) , شایانی

باسه دکتۆر لەساڵی١٩٨٦دا ژنی هێنا و خوا دوو کوڕی دایە و هەر زووش ئەمانەتەکەی لێ وەرگرتەوە و کوڕەکانی بە ڕەحمەتی خوا چوون .(اسلام اون لایت نت)

دووەم / ابو الاعلي المودودي :

باوکی ابو الاعلی پارێزەر بوو وازی لە کارەکەی هێنا لەترسی ئەوەی کە بەرگری لەناهەق بکات و ماڵی حەرام بێتە گیرفانیەوە ، لەچوار ساڵیەوە گرنگی دا بە کوڕەکەی و لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ نوێژی جەماعەت و قورئان و موطأ ی ئیمام مالیکی پێ لەبەر کرد و مێژووی ئیسلام و هیندستانیشی بۆباس دەکرد ابو الاعلی بەچواردە ساڵی دواناوەندی تەواو کردو بەچوارمانگ توانی بەچاکی فێری زمانی ئینگلیزی ببێت

ناوبراو بانگخوازێکی نموونەیی بوو ، لەگەڵ ئەوەدا کەهەژارو نەدار بوو ، بەتاقی تەنها گۆڤاری ترجمان القران ی دەردەکردو سەرپەرشتی چاپی دەکردو پاشان بە پاسکیل بلاویشی دەکردەوە

لە تەمەنی پڕ بەرەکەتیدا سەدوچل پەڕاوی نووسیو نزیکەی هەزار نامەشی ئاراستەی گەورە پیاوان و ناوداران کرد ، بۆیە ابوالحسن الندوی دەڵێت وانازانم کەس بەهێندەی ابو الاعلی کاریگەری هەبووبێ لەسەر نەوەی نوێ

لەساڵی ١٩٤١ دا کۆمەڵی ئیسلامی دامەزراندو چەندجار بەندکرا و چەند ساڵیکی لەبەندیخانەدا بردە سەر

لیوا محمود شیت خەتاب دەڵێ جارێك سەرۆکی عێراقی عبدالسلام عارف ناردمی کە لای حکومەتی پاکستانی هەوڵی بۆبدەم بەربێ ، کەچوومە لای مەودودی و پێم وت بۆکارێکی واهاتووم بەهیچ جۆرێك قایل نەبوو .، بەندیخانەی پێ باشتر بوو لەپاڕانەوە لە حکومەت

مەودودی ئەندامی دامەزرێنەری رابیتەی عالەمی ئیسلامی و زۆر ڕێکخراوی تر بوو ، توانی بەربەستێکی پۆلاین بێت لەبەردەم دوژمنانی ئیسلامدا

لەیەکێك لەوتە بەنرخەکانیدا بە بانگخوازان دەڵێت :چی کێشەو نارەحەتیتان هەیە ، بیبەستن بە بەردێکەوەو بیخەنە بنی دەریاوە تا سەرقاڵتان نەکات و دووربکەونەوە لەکاری بانگخوازی وخزمەت بە ئیسلام.--.بەرنامەی أوراق کەناڵی اقرأ

**ئاینێکی جیهانی بێ سنوور**

ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەتاهەتاییی‌یە و بۆ هەموو بەرەی ئادەمی‌یە و هیچ سنووریێك ناتوانێ رێی لێبگرێت و هەرکەس گوێی لە قورئان بووبێت , یان دڵی بۆ شتێکی ئەم ئایینە کردبێتەوە , بۆتە مایەی هیدایەتی .. ئافرەتێکی ئەمریکی دەچێ بۆ تایلاند بۆ هەڵگەران بەشاخ دا , گوێی لەبانگ دەبێ و ئەمەش بەرەو ئیسلامی دێنێ و موسوڵمان دەبێت , پرۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێ: ئەو ئافرەتە سەردانی کردم و باسی موسوڵمان بوونەکەی خۆی بۆ کردم ..

لە وولاتی بەحرەینیش بەهۆی بنکەی (التعریف بالاسلام)ەوە لەم سێ ساڵەی دواییدا نزیکەی هەزار بیانی موسوڵمان بوون . دیارە بانگەواز پێویستی بەهۆکاری تایبەتە , وەك زانینی زمانی بیانی و , وە رگێرانی قورئان و پەراوی تر بۆ سەر زمانە زیندووەکانی جیهان .

**وەرگێرانی قورئان بۆ سەر زمانی ئینگلیزی :**

لە دەیان ساڵ لەمەوبەردا لە وولاتی هیندستان بازرگانێکی موسوڵمان بەناوی (یوسف علی) خەو دەبینێ بە ژنەکەیەوە کە دووگیلن بووە , لە خەوەکەی‌دا کوڕێکی دەبێت و کوڕەکەش لەباوەشی پیغەمبەر دەبێت , پرسیار دەکات لەوانەی کە لەخەو دەزانن , پێی دەڵێن: کوڕێکت دەبێت و خزمەت بەپێغەمبەر (ص) و ئیسلام دەکات .. جا وەك خوا بیەوێ بەخەو ئیشارەتێکی بداتێ و رێنمایی بکات بۆ کارێکی مەزن .

بەڵێ ..پاش ماوەیەك کوڕێکیان بوو ناوی نا ( عبدالله ) ، یوسف عەلی زۆر گرنگی‌دا بە پەروەردەی منداڵەکەی و کەگەورە بوو خستیە بەر خوێندن و باشترین مامۆستای بۆ پەیدا دەکرد و ناردیشی بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە لە بەریتانیا و ئەویش بڕوانامەی هێنا و ئینگلیزی‌یەکی باش فێربوو , خۆی و هاوسەرەکەی خزمەتێکی‌باشی ئیسلامیان کرد و چەند پەراوێکی نووسی و زۆر خەمی‌بوو کە مانای ئایەتەکانی قورئان بە ئینگلیزی لێك بداتەوە , تا هەموو کەس تێی بگات وپاش سی ساڵ رەنج و شەونخونی توانیان بەو کارە هەستن و بێ بەیەکەم وەرگێرانی قورئان بۆ سەر زمانی ئینگلیزی کە لەلایەن موسوڵمانێکەوە کرابێت ..

**پرۆفیسۆر تی بی ئێرڤنگ :**

ناوبراو مامۆستای زانکۆی تێنسی ئەمریکی‌بوو , لە شەستەکاندا بەشداری کرد لە کۆنفرانسێکدا لەبارەی وەرگێرانی قورئانەوە .. دکتۆر زەغلول النجار دەڵێ: لەبەرئەوەی

کۆنفرانسەکە لەبارەی وەرگێڕانی قورئانەوە بوو منیش چووم , ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام وتارەکەی پرۆفیسۆر ئێرڤنگ بوو کە پیاوێکی بەتەمەنی بە ویقار بوو , بەهەست و سۆزێکی بەرزەوە باسی وەرگێڕانی قورئانی کرد کە زەحمەتە و وتی: من لەهەموو زمانی ئینگلیزیدا ناتوانم وشە بهێنم کە دەقاودەق مانای( يأأيها الذين آمنو اتقوا الله حق تقاته ) بدات ..

دوای وتارەکەی چووم بۆلای و زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و لێم پرسی: تۆ پەیوەندیت چیە بە ئیسلامەوە ؟ ئەویش ووتی: من خۆم و ژن و منداڵەکانم موسڵمان بووین .. وتم: چی وای لێکردی موسوڵمان ببیت؟! وتی: من نامەی دکتۆرام ئامادە دەکرد لەسەر زمانی ئیسپانی سەیرم کرد کە زۆر ووشەی عەرەبی تیایە , بۆیە پەیوەندیم کرد بە هەندێ عەرەبەوە , بۆ زیاتر شارەزابوون , کەچی زمانی (فصحايان) نەدەزانی , بۆیە کەوتمە دیراسەی قورئان تازیاتر لەزمانی فصحای عەرەبی شارەزابیم , قورئان دڵی کەمەندکێش کردم بەبێ ئەوەی کەس باسی ئیسلامم بۆ بکات , ئیتر لەو ساتەوە خۆم و ماڵ و منداڵم موسڵمان بووین , قورئانیشم وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی , چونکە بەڕاستی قورئانێکی وانەبوو کە بەچاکی وەرگێڕدرابێ لەلایەن موسوڵمانانەوە , ئەوەی لەبەردەستا بوو وەرگێڕانەکەی (سەیل)ی ئینگلیزی بوو کە هەشتا و پێنج لاپەڕە پێشەکی بۆ نووسیوەو بوختان دەکات بۆ ئەم دینە و دەیەوێ هەرکەس خوێندیەوە گومان لەدڵیا دروست بکات , ئەمە بێجگە لە دەستکاری مانای ئایەت و تەزویرێکی زۆر کە کردویەتی .. شایانی باسە وەرگێڕانەکەی (عبدالله يوسف علی ) ش بە زمانی شکسپیر بوو کە ئینگلیزیەکەی قورسەو ئێستا کەم کەس سوودی لێوەردەگرێت ..

دکتۆر زەغلول دەڵێ: بە ڕاستی ئێرڤنگ خۆی و منداڵەکانی قوتابخانەیەکی بانگەوازبوون بۆ ئیسلام , بۆیە لەساڵی١٩٦٣دا داوەتنامەم بۆ نارد تا بێت بۆ ئوسکۆتلەندە و وتار بۆ موسوڵمانان بدات ,کە گەیشت پارەی بلیتەکانی داینەوەو وتی: حەز دەکەم خۆم پارەکە بدەم تا خێری زیاترم دەست بکەوێت ..

جا کە وتاری بۆداین وتی: بەڕاستی موسوڵمانینە زۆر نووستن , هەق وابوو ئێستا ئێوە پێشەواو ڕابەری جیهان بن .. چل لاوی خوێن گەرمم بدەنێ کە جوان پەیڕەوی ئیسلام بخەن و باش تێی بگەن , ئەوانە چۆن فەتحی عالەمیان پێدەکەم..

موسوڵمانینە ڕاستە ئێوە ئێستا لەزۆر بواردا دواکەوتوون , بەڵام نووریکتان پێیە کە لای کەسی تر نیە و دەتوانن وا بکەن کەدنیا بە چوکدا بێت بۆتان .. شایانی باسە پڕۆفیسۆر ئێرڤنگ تائێستا ماوەو خەریکی هەوڵ و کۆششە بۆ ئیسلام لە جیهاندا .

**موسوڵمان بوونی پزیشکی ئیسپانی ( ڕافاییل کۆندی ) :**

پڕۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێ: دکتۆر (کۆندی) پزیشکێکی ئیسپانی بوو , خاوەنی عەیادە و خەستەخانەی خۆی بوو , زۆر هەوڵیداکە کچەکەی ببێت بەپزیشك و جێیبگرێتەوە , کەچی قەدەری خوا وابوو کە لە پێشبڕکێی شۆفێردا لە لۆفەیەك دا وەربگەڕێ و بمرێت .

دوای ئەم ڕووداوە زۆر شەو دەچووە خەوی باوکی و پێی دەووت باوکە لەگەڵ یەکتاپەرستەکاندابە و ڕێی ڕاست بگرەبەر .. ئەمیش ئەم خەوەی زۆر لا سەیربوو , ئەبێ ڕێی ڕاست چیبێ و چۆن بیچێ لای کێ بێ ؟ بۆیە ڕۆژێ چوو سەردانی زانکۆی کرد و هاوەڵەکانی کچەکەی بینی و, پاش پرسیارکردن بۆی دەرکەوت کە کچەکەی لە زانکۆ هاوەڵی موسوڵمانی هەبووە و موسوڵمان بووبوو , وە بەتەمابوو لەداهاتوودا موسوڵمان بوونەکەی ڕابگەیەنێ ..

پاش ئەوە کۆندی شەو خەو بە کەعبەوە دەبینێ و زۆر لای سەیر دەبێت و , حەز دەکات کە زیارەتی کەعبە بکات , بۆیە داوا لە هاوەڵێکی دەکات کە ناوی (عبدالصمد رومیرۆ رومان)بوو , تا کاری بۆ ئاسان بکات بۆ چوون بۆ زیارەتی کەعبە , ئەویش پێی وت: تا موسوڵمان نەبی ناتوانی بچی بۆ زیارەتی کەعبە.

بۆ ئەمەش عبدالصمد لە ڕێی برادەرێکییەوە لەجەدەوە کە خەستەخانەی هەبوو داوەتنامەی نارد بۆ دکتۆر کۆندی , کاتێك گەیشتە جدە , فێری ئیحرام بەستن و عومرەکردنی کرد و موسوڵمان بوونی خۆی تۆمارکرد , پاش ئەمە دکتۆر کۆندی چوو بۆ زیارەتی کەعبە و هەر ئەوەندەی لەدوورەوە بینی ئەوەندە گریا خەریك بوو ببورێتەوە و وتی: سبحان الله , ئەوەی ئێستە دەیبینم ئەوەیە کە لەخەوەکەمدا بینیومە ..

پڕۆفیسۆر زەغلول دەڵێ: کە دکتۆر کۆندیم بینی زۆر گلەیی کرد و وتی: ئێوە بەڕاستی ئیسپانیاتان پشت گوێ خستووە , لەکاتێکدا ئیسپانیەکان دەتوانن ببنە نوێنەرتان بۆ هەموو ئەوروپا و دەروازەیەکی گرنگە بۆ ئیسلام..

ئینجا وتی: ئێمە بە ئەسڵ موسوڵمانین , هەرچەندە ئێستا هیچ لەئیسلام نازانین , ماڵەکانمان ئایەتی تیا هەڵواسراوە و تێی ناگەین , ئێمە کاتی خوێ باووباپیرمان لەسەر ئیسلام سزا دراون و تائێستاش مردوو لەلای ئێمە دەشۆرێت و کفن دەکرێت و لەسەر لای ڕاست دەنێژرێت .. بە ڕاستی تەنانەت ناوی من (کۆندی) لەزانای بەناوبانگی موسوڵمانەوە (کندی) هاتووە ..

ئێوە هەقە بانگی خوا بدەنەوە بەگوێی ئیسپانیەکاندا .. شایانی باسە دکتۆر کۆندی و عبدالصمدی هاوەڵی چوونە سەرایڤۆ و خەستەخانەیان لەسەر حسابی خۆیان کردەوەو خزمەتێکی موسوڵمانانیان کرد کە بە دەوڵەتیش نەدەکرا .. (بەرنامەی اسلام بلا حدود) .

**موسوڵمان بوونی هەژدە پرۆفیسۆر لە لەندەن:**

پرۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێ: چوار ساڵ لەمەوبەر بانگ کرام بۆ زانکۆیەکی لەندەن , کە بەشداری بکەم لە کۆنفرانسێکدا لەبارەت قورئانەوە , زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسە کۆنەکان بەشدارییان کرد کە کۆنە قینێکیان لەدڵدایە بەرامبەر ئیسلام و کاتی خۆی دەزگا سیخوڕییەکان ناردبوویانن بۆ وولاتە ئیسلامیەکان ..

لە کۆنفرانسەکەدا هەژدە پرۆفیسۆری ڕۆژهەڵاتناس کە تەمەنیان نزیکەی (٣٥ – ٤٠ ) ساڵێك دەبوو , هەموو موسوڵمان بوون بەهۆی ئەو باسانەی کە لە کۆنفرانسەکەدا پێشکەش کران .

یەکێك لەو پرۆفیسۆرە گەنجانە وتی: ئەمشەو کە باسەکەم ئامادە دەکرد , لەبەر خۆمەوە وتم: باشە ئەمە هەق نییە ؟ دەی کە دەزانی هەقە بۆ دوای‌ناکەوی ؟ لەچی دەترسی؟ پاش تاووتوێیەك لەنەفسی خۆم دا بڕیارم دا موسوڵمان بم و خۆم یەکلایی کردەوەو خۆم گۆڕی و هەر شەوێ چووم لە مەرکەزێکی ئیسلامی موسوڵمان بوونی خۆم ڕاگەیاند ..

**موسڵمان بوونی عبد الصمد رومیرۆ رۆمان :**

دکتۆر زەغلول دەڵێت : ساڵێکیان لە حەج بووم ، لە عەرەفە پیاوێك هات بۆ لام کە ناوی عبدالصمد بوو، کوڕە تەمەن نۆ ساڵەکەشی لەگەڵ بوو کە هەموو قورئانی لەبەربوو، پاش خۆش وچۆنی کەوتە باسی موسڵمان بوونی خۆی و وتی : من ئیسپانیم وپسپۆڕم لە بواری مۆسیقادا ، ویستم لێکۆڵینەوەیەك ئامادە بکەم لەسەر مۆسیقای کلاسیکی و

هەر پەڕاوێکم دەخوێندەوە باسی گەورە مۆسیقارە کانی دەکرد وەك بتهۆڤن ، منیش پێم باش بووکە بۆ دەوڵەمەنـد کردنـی باسـەکەم لێکۆڵینـەوە بکـەم لەسـەر موەشـەحاتی ئەندەلووسی.

لەمووەشـەحاتەوە یەکخواناسـی فێربـووم و لەبەر ئـەوەی کـەزۆر باسـی پێغەمبەریشی تیایە لام خۆشەویست بوو ، چونکە بەڕاستی ئەو کەسێکە کە نارەحەتی زۆری هاتە ڕێ و خۆگر بوو ، وە بە درێژایی بیست و سێ‌ساڵ تۆزقاڵێك دانەبەزی لەبیروڕاکەی.. هاوین گەڕامەوە ماڵی باوکم لە غرناطة وپاشان خانوویەکم بەکرێ گرت لە گەڕەکی موسڵمانەکان کە بەڕاستی زۆر ڕێزیان لێدەگرتم و منیش گوێم دەگرت لە قورئانی مزگەوت و زۆر کاری تێدەکردم ، بۆیە داوام کرد لێیان کەکاسێتێکم بۆ بهێنن ،ئەوانیش کاسێتێکی عبدالباسط یـان بـۆ هێنـام و کاتێـك بەکۆمپیوتـەر لێکۆڵینـەوەم لەسـەر کـرد بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەو مۆسیقایەی لە قورئاندا هەیە بەڵگەیە لەسەر موعجیزەکەی ..

بەیانیان زوو گوێم دەگرت لە قورئـانی پێشنوێژی مزگـەوت و زۆر کاری تێدەکردم ، تا ڕۆژێـك دراوسـێکانم وتیـان کۆنفرانـسێك هەیـە لەشـاری تطـوان لەبارەیموەشـەحاتەوە و هەفتەیەك دەخایەنێت ، بڕیارمان دا بەیەکەوە بە ئوتومبیلەکەی من بچین ..

پاش سێ ڕۆژ لە کۆنفرانسەکە بەناو شاردا گەڕاین ، بـانگی ئێـوارەی داو ، برادەرەکانم چوون بۆمزگەوت بۆ نوێژو منیش بەپیاسە بەدەوری مزگەوتەکـەدا دەسوڕامەوە و قورئـان خوێنـدنی پێـشنوێژی مزگەوتەکـە هەسـت وهۆشـی هەژانـدم و بەپەلـە چـوومەوە نـاو ئوتومبیلەکـەم و زۆر گریـام ..کـە برادەرەکـانم هاتنـەوەو بـەو بێتاقەتیـە منیـان بینـی ، پرسیاریان کرد : چی بووە ؟ چی قەوماوە ؟ منیش وتم : هیچ نیەو دەمەوێت بە زووترین کات بگەڕێینەوە بۆ شاری غرناطة ، ئیتر پێکەوە گەڕاینەوە و یەکسەر لەماڵەوە خۆم شت و چووم بۆ مزگەوت و موسڵمان بوونی خۆم ڕاگەیاند ..

سەفیری سعودیە کە بەمەی زانی دەعوەتی کردین بۆ حەج و پاشان ( منحـەیان ) داینـێ کە خۆم و هاوسەرم لە زانکۆی ( ام القری ) بخوێنین و توانیم ماجستێر بهێنم لـە دراسـات ئیسلامیداو هاوسەرەکەشم بڕوانامەی لە پەروەردەی ئیسلامیدا هێنا ..

دکتۆر زەغلول دەڵێت : ناوبراو جارێك لـە ڕەمەزانـدا هـات بـۆلام بـۆ قاهیرەولـە ماڵمـان مایەوە ، شەو کە چووم ئاگاداری بکەمەوە بۆ پارشێو بینیم کەپێشتر هەستاوەو خەریکی شەو نوێژە ..

جارێکی تریش کەچووم لە فڕۆکەخانە پێشوازیان بکەم ، بینیم پیاوێکی ئینگلیزی لەگەڵدایە کەژنەکەی ئیسپانی بوو ، وەتەنها لەماوەی چەند سەعاتی گەشتەکەیاندا لە ئیسپانیاوە بۆ قاهیرە توانیبووی موسڵمانیان بکات ..

ساڵی پاریش بینیم لە ( شارقە ) و بۆی باسکردم کە کۆلێژی دیراسات ئیسلامی کردوتەوە و خەڵکێکی زۆر لێی سوودمەندن ، ئەمە بێجگە لەوەی کە ئیستگەشیان هەیەو بووەتە هۆی موسڵمان بوونی خەڵکی وئێستا نزیکەی ملوێنێك موسڵمان هەیە لەو وڵاتەدا ..

( خستنەڕووی ئایەتەکانی قورئان و بوونەوەر لە بانگەوازدا )

(١) لە خۆتان وردبنەوە :

قورئان دەفەرموێت( وَفي أنفسكم أفلا تبصرون ) الذاريات ٢١..وردبوونەوە لە دەروونی مرۆڤ و پێکهاتنی ئەندامەکانی ، مرۆڤ دەبات بەرەو ئیمان و تێگەیشتن لە دەسەڵاتی پەروەردگار , بۆ نموونە :

یەکەم : خڕۆکە سوورەکان سەد و بیست ڕۆژ دەژین و دوای ئەوە دەمرن و لە ڕێی سپڵەوە دەردەکرێنە دەرەوەو خانەی نوێ لەجێیان دروست دەکرێنەوە , لەباروزرووفی ئاساییدا دوو ملیۆن و نیو خڕۆکەی سوور لە چرکەیەکدا بەرهەم دەهێنرێت لە لەشداو , ئەم ژمارەیەش زیاتر دەبێت ئەگەر پێویست بکات , ڕێژەی ئەم بەرهەم هێنانەش هۆرمۆنێك ڕێکی دەخات کە ناوی (ئیریسرۆپۆیتین)ە ..

کاتێك لە ڕووداو و کارەساتێکدا مرۆڤ تووشی خوێن لەبەر ڕۆیشتن دەبێت , بەرهەم هێنان زیاد دەکات .. هەروەها کاتێك مرۆڤ بەسەر شوێنێکی بەرزدا سەرکەوێت و ئۆکسجین کەم بکات خڕۆکەی سوور زیاتر بەرهەم دەهێنرێت تا زۆرترین ئۆکسجین وەربگرێت.. ( ل/١٢٦ / التصميم في الطبيعة/هارون يحيى , وەرگێڕانی اورخان محمد علی) .

**دووەم : لە هەوادا تۆز و خۆڵ هەیە ولەساڵێکدا مرۆڤ نزیکەی نیو کیلۆ تۆز و خۆڵ لە رێی لووتیەوە بە هەناسەدان هەڵدەمژێت و، ئەگەر شەست ساڵ بژی دەکاتە نزیکەی سی کیلۆ .**

**پەروەردگاریش بۆ پاراستنی مرۆڤ لەو تۆز و خۆڵە لووتی بە جۆرێك دروست کردووە کە رێ لەو تۆز و خۆڵە بگرێ وکەمترینی بگاتە ناو بۆری هەناسە و سییەکان , ئینجا بەهۆی پژمینەوە ئەگەر ڤایرۆس و تۆز و خۆڵ هێڵەکانی بەرگری بڕیبوو دێنەوە دەرەوە ، بۆیە سوننەتە سوپاسی خوای لەسەر بکرێ .**

**هەروەها لە لووت دا ملیۆنەها خانەی بۆن کردن هەیە کە نزیکەی سێ هەزار جۆر بۆن لەیەکتری جیا دەکاتەوەو هەستی پێدەکات .. ئەمە بێجگە لەوەی کە لووت وەك ئێرکۆندیشن وایە , ئەگەر هەوای دەرەوە گەرم بوو وەك (ربعی الخالي) کە دەگاتە (٥٠) پلە , یان سارد بوو وەك (سیبریا) , ئەوا لەچوار چرکەدا هەواکە گەرم بێت یان سارد دەیکات بە (٣٠ – ٣٧) پلە ئەمەش بۆئەوەی زیان بە سییەکان نەگەیەنێت .. ( د.عبدالحمید القضاة – وتاری (وفي انفسکم افلا تبصرون) ).**

**(٢) سەرنج ڕاکێشان بۆ دروست کراوەکانی خوا :**

**قورئان دەفەرموێت** ( إن في السماوات والأرض لآيات لقومٍ مؤمنين وفي خلقكم ومايبث من دابةٍ آياتٌ لقومٍ يوقنون ) الجاثية/٤ .

**واتە: بە ڕاستی لە ئاسمانەکان و زەویدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن دەربارەی گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار بۆ کەسانێك کە بڕوادارن , هەروەها لە دروستکردنی ئێوەدا و لەو هەموو زیندەوەرە جۆراوجۆرانەی کە لەسەر زەوی و ژێرزەوی و ناو ئاودا هەن و بڵاویان دەکاتەوە , بەڵگە و نیشانەن لەسەر دەسەڵاتی خوا بۆ کەسانێك کە دڵنیان و باوەڕی دامەزراویان هەیە .**

**هەروەها دەفەرموێت** ( خلقَ السماوات بغَيرِ عمدٍ تَرَونها ، وألقى في الأرض رواسيَ أن تَميدَ بكم وبثَ فيها من كل دابة وأنزلنا من السماءِ ماءً فأنبتنا فيها من كلِ زوجٍ كريم ، هذا خلق الله فأروني ماذا خلق الذين مِنْ دونهِ بلِ الظالمونَ في ضلالٍ مُبينْ) لقمان ١٠.

واتـه: ئاسمانـەكانی دروسـت كـردووه بـەبێ كۆڵەكـه بەچـاوی خۆتـان دەيبيـنن , لـه زەويشدا كێوەكانی دامەزراندووه كه لەنگەری زەويان ڕاگرتووەو (چەندەها سوودی تريان هەيە) نـەوەكو ژێرەو ژوور ببن و لاريبنـەوه , جۆرەهـا زينـدەوەر و گيـان لەبەريـشی تيـادا بڵاوكردۆتــەوه , لــه ئاسمانيــشەوه بارانمــان بارانــد و, جۆرەهــا ڕووەك و گــژوگيای هاوجووتی بەسوود و بەكەڵك و جوان ڕازاوەمان له زەویدا پێڕواند .

ئائەمەيه دروست كراوەكانی خوا , وەرن پيشانم بدەن بزانم ئەوانی تر جگه لەو زاته , چيان دروستكردووه , نەخێر هيچيان دروست نەكردووه , بەڵكو ستەمكاران هەميشه له گومڕاييەكی ئاشكرادان .

خـوای گـەوره هەرچـی دروسـتكردووه بەوپــەڕی وردی و حيكمەتــەوه بـەدی هێنـاوه ( وخلق كل شيء فقــدره تقــديرا ) }الفرقــان/٢ . بۆ نموونـه: مێشووله بـەو وردی و بچكۆلەييەوه بەڵگەيه لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار بۆيـه لەبارەيـەوه دەفـەرموێت ( إن الله لايستحي أن يضرب مثلاً مابعوضةً فما فوقها ، فأما الذينَ آمنوا فيعلمونَ أنه الحق من ربِهم ، وأما الذين كفروا فيقولون ماذا أراد الله بهذا مثلا ، يُضل به كثيراً ويهدي بـــه كثيرا ، ومايُضل به إلا الفاسقينْ) (البقرة/٢٦) .

واتـه: بـه ڕاستی خـوا نـەنگ نيـه بەلايـەوه هـەر نموونـەيـەك بهێنێتـەوه بـه مێـشوولەيەك , لـەويش گـەورەتر يـان بـچوكتر , جـا ئەوانـەی باوەڕيـان هێنـاوه ئـەوه چـاك دەزانـن ئـەم نموونەيه ڕاسته و لەلايـەن پەروەردگاريانەوەيـه , ئەوانـەش كـافر و بێبـاوەڕن دەڵێن: خـوا مەبەسـتی چیبوو لـەم نموونەيـەدا ؟ (خـوای گـەورەش دەفـەرموێت) زۆرێكـی پـێ گـومڕا دەكـات و زۆرێكـی تريشی پـێ هيدايـەت و ڕينمـوويی دەكـات , بـەڵام ديـاره جگـه لـه لار و وێرو ياخی و تاوانباران كەسی تر گومڕا ناكات .

**مێشووله :**

مێـشووله بـەهۆی نيزامێكـی هەسـتی تايبەتيـەوه جێـی نێـچيرەكەی ديـاری دەكـات و , دەتوانێت لەتاريكيدا بەهۆی گەرمی لەشی نێچيرەكەوه بزانێ لەكوێدايه .. ئينجا كەلەسەر پێست دەنيـشێتەوەو كـونی دەكـات ماددەيـەك دەردەدات كـه تەخـديری خانـەكانی پێـست دەكـات لـەو شـوێنەدا و پاشـان دەكەوێتـه خـوێن مـژين و هـەمان مـادده نايـەڵێ خوێنەكـه بمەێت (ل/١٨٨ خديعة التطور/هارون يحيى/ وەرگێڕانی سليمان بايبارا ).

**سەیری فڕینی باڵندە بکەن :**

قورئانی پیرۆز سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ باڵندە و فڕینەکەی کە چۆن خوای گەورە لەشی وا دروستکردووە کە بەئاسمانا بفڕێت و نیزامێکی تایبەتی وای بۆداناوە کە ژیانی ئاسان بێت , هەروەك دەفەرموێت: ( أوَلَم يَرَوا إلى الطيرِ فوقَهُم صافات ويقبِضن ما يُمسكهُن إلا الرحمنُ إنهُ بِكل شيءٍ بصير ) (الملك/١٩) . واتە: ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە بەسەریانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵەکانیان لێك دەنێن , ئەو باڵندانە جگە لەخوای میهرەبان کەس بەئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات , بە ڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێك بینایە و هیچی لێ ون نابێت و چاودێری هەموو دروست کراوەکانی دەکات .

**باڵندەی ( زەقزاق )ی ئاڵتونی** , کۆچ دەکات لە (ئالاسکا)وە بۆ دوورگەکانی (هاوای) بۆئەوەی زستانی تیا بەسەر بەرێت , جا لەبەرئەوەی لە ڕێگاکەیدا دوورگەی تر نیە , ناچارە چوار هەزار کیلۆمەتر بەیەك جار ببڕێت و نزیکەی دووسەد و پەنجا هەزار جار باڵ بدات بەیەکدا و ئەم گەشتەشی (٨٨) سەعات دەخایەنێت ..

کێشی ئەم باڵندەیە لەسەرەتای کۆچ کردندا (٢٠٠)گرامە کە (٧٠)گرامی چەورییە و بۆ وزە بەکاری دەهێنێت , جا ئەگەر بڕی ئەو وزەیەی پێویستێتی بۆ ئەم گەشتە حسابی بکەین دەبینین پێویستی بە هەشتا ودوو گرامە , واتە دوانزە گرامی کەمە بۆئەوەی گەشتەکەی تەواو بکات ..

خوای گەورە وای دروست کردوون کە بەشێوەی (٧) بفڕن و بەوەش کەمترین وزە سەرف دەکا و لەسەدا بیست و سێی وزەکەی بۆ دەگەڕێتەوە , واتە لەجیاتی ئەوەی وزەی لێ ببڕێت , نزیکەی شەش گرام چەوریشی زیاد دەبێت کە دەتوانێت بۆ حالاتی (طوارىء) و ناکا و سوودی لێوەرگرێت ( ل٥٢ التصميم في الطبيعة ) ..

**باڵی مێرووەکان :**

زانای بایۆلۆجی ئینگلیزی (روبین ووتون) لەباسێکدا بەناوی ( التصميم الميكانيكي لأجنحة الحشرات ) دا دەڵێت: هەرچەند چاکتر و زیاتر تێبگەین لەکاری باڵی مێرووەکان , ئەوەندە زیاتر تصمیمی ورد و بەدیقەتی دەردەکەوێت بۆمان .. بە ڕاستی باڵەکانی مێرووەکان بە ووردی دروست کراوە و بە جۆرێکە کە بەئاسانی هەموو پارچەکانی لەشی

بجولێ وزیاتر بتوانێت له هەوادا بمێنێتەوه ..( ل/١٤ التصميم في الطبيعة/هارون يحيى , وەرگێڕانی ئورخان محمد على ) .

( اليعسوب _ پووش بەقنه ) :

پووش بەقنه چوار باڵی هەیه و ناتوانێ قەیی بکات و بیخاتەوه سەر لەشی ئەم وردەکارییەی باڵەکانی وایکرد له کۆمپانیای فڕۆکەی هێلیکۆبتەر (سیکورسکی) کە لەسەر شێوەو پێکهاتە و جۆری کارکردنی باڵەکانی فڕۆکەی هێلیکۆپتەر و فڕۆکەی گواستنەوه تصميم بکات ..

(جیلز مارتن)ی وێنەگری دیاردە سروشتیەکان , هەستا بە لێکۆڵینەوەی پووش بەقنه بۆ ماوەی دوو ساڵ و دەڵێت: ئەم زیندەوەره ئالیەتێکی فڕینی زۆر ئاڵۆزی هەیە و ئەتوانێ لەوپەڕی خێراییدا بوەستێ و پاشان یەکسەر دەست بکاتەوه بە فڕین بەپێچەوانەی ئاراستەیەوه و خێرایشی دەگاتە (٤٠ کم/سەعات)دا و , دەتوانێ بەو خێراییە خۆی بدات بە نێچیرەکەیدا و بیبورێنێتەوه یان بیمرێنێت , ئینجا بیخوات .

هەر چاوێکێشی پێك هاتووه لە سێ هەزار هاوێنەی جیاواز , کە وا دەکەن بوارێکی زۆر فراوان ببینێ .

شایانی باسە کۆنترین پووش بەقنەی بەبەرد بوو دەگەڕێتەوه بۆ دووسەد و پەنجا و میلۆن ساڵ لەمەوبەر کە هەر وەکو ئێستایەوئەمەش پشتی بیردۆزی ( تطور) دەشکێنێ .. ( ل/١٦ التصميم في الطبيعة) .

زانای فەرەنسی بواری گیانلەبەران (بییر بول غراسه) دەڵێت: ( ئێمە تائێستا لە تاریکیەکی تەواوداین لەبارەی ئەسڵی مێرووەکان ) .. چونکه تائێستا یەك بەڵگە نەدۆزراوەتەوه لە (متحجرات) و ئەو مێروانەی کە بوونەتە بەرد قۆناغەکانی پەرەسەندنی تیا دیاربێت .

گیانلەبەراتیش نوممەتن

(وما منْ دابةٍ في الارض ولاطائرٍ يطيرُ بجناحيه إلا أممٌ أمثالكم مافرطنا في الكتــاب من شيءٍ ثم إلى ربهم يحشرون ، والذين كذبوا بآياتنا صمٌ وبكمٌ في الظلمــات ، مــن يشأِ اللهُ يضللهُ ومن يشأ يجعله على صراط مستقيم) }الانعام/٣٩

واتە: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێك نیە بەسەر زەویدا بڕوات وهیچ باڵندەیەك نیە بە باڵەکانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێك نەبن وەك ئێوە ، دڵنیابن هیچ شتێك نیە پشت گوێمان خستبێت لە پەڕاوە تایبەتیەکەی ( لوح المحفوظ)دا , لەمەودوا هەر هەموو ئەوانە کۆ دەکرێنەوە بۆلای پەروەردگاریان , بۆئەوەی دادگایی بکرێن و هەموو کەس ماف خۆی وەربگرێت , یان تۆڵەی ڕەوای لێبسەنرێت .

ئەوانەی کە بڕوایان نەکردووە بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە , کەڕن وحەق نابیستن و، لاڵن وحەق ناڵێن , لەناو تاریکیەکاندا ژیان بەسەردەبەن , بێگومان ئەوەی خوا بیەوێت گومڕای دەکات (چونکە دەستپێشخەرە لەو بوارەدا و بەخواهیشتی خۆی هەڵی بژاردوە) و ئەوەش کە بیەوێت هیدایەتی بداو ( هێدایەت وەرگرێت ) دەیخاتە سەر ڕێبازی ڕاست و ڕەوا ..

ئەم ئایەتە بۆ خۆی موعجزەیەکی گەورەیە , چونکە کێ دەتوانێ هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەوبەر بڵێ : هەرچی گیانلەبەرێك هەیە و هەرچی بەباڵ دەفڕێت ئوممەتن .. ئەمڕۆ پاش ئەو هەموو هەوڵ و کۆشش و ڕەنجەی زانایان ئەو ڕاستیە دەرکەوتووە , پسپۆڕانی ئەو بوارە پاش چاودێری و دیراسەی ساڵەهای ساڵی گیانلەبەران و باڵندەکان دەڵێن: هەموو گیانلەبەران و باڵندەکان لەناو خۆیاندا جۆرە لەیەکتر گەیشتن و فیداکاری و خۆشەویستی‌یەك هەیە کە مرۆڤ سەرسام دەبێت لە ئاستیا , دیارە ئەو ئوممەتانەش هەریەکە و کارێکی تایبەتی هەیە و هاوسەنگی‌یەك دەپارێزن لەم سەر زەوی‌یەدا ئیتر دۆزرابێتەوە یان نا ..

بۆ نموونە: کاتی خۆی لە وڵاتی چین بڕیاریان دا کە هەڵمەتێکی نیشتمانی بکەن بۆ لەناوبردنی چۆلەکەی بەسەزمان , گوایە تۆ و دانەوێڵە دەخوات و زیان لە ئابووری دەدات , کاتێك بە خۆیان زانی کرم و مێرووی وا پەیدابوو کە زۆر زیان بەخشتربوون لە چۆلەکە , بۆیە بڕیاریان دا کە بەزووترین کات هەوڵی زاوزێ و زۆربوونی چۆلەکە بدەنەوە تا هاوسەنگی لە سروشت دا ڕابگرێ ..

**مۆڵگەکانی مێروولەی سپی :**

مێروولەی سپی گیانلەبەرێکی بچووکە و لە مۆڵگەی زۆر چڕدا دەژی و کاتێك ژمارەیان زۆر زیاد دەکات ، هێلانەکەیان چەند مەترێك لەسەر ڕووی زەوی بەرزدەبێتەوە , سەیریش لەوەدایە کە ئەومێروولە کرێکارانەی ئەوە دروست دەکەن کوێرن ..

نیزام و یاسای هێلانەی مێرووولەی سپی زۆر ئاڵۆزە و، شاژنێکیان هەیە کە کاری زاووزێیە , کاتێك شاژنەکە تلقیح دەبێت لەشی گەورە دەبێت تا دەگاتە نزیکەی (٩)سانتیمەتر و وەکو ئالەتێکی بەرهەم هێنانی لێدێت و ناتوانێ بجوڵێت و گەرا دادەنێت , گەراکانیش کۆمەڵێکی تایبەتی لە مێروولەکان گرنگیان پێ دەدەن و پاکیان دەکەنەوە و خواردنیان دەدەنێ , شاژن لە ڕۆژێکدا نزیکەی سێ هەزار گەرا و لە هەموو ژیانیشیدا نزیکەی دە میلۆن گەرا دادەنێت ..

مێروولەی کرێکار هەرچەندە کوێرە , تەمەنی سێ تا چوار ساڵ دەبێت و کاری دروست کردنی هێلانەکەیە و هەندێکیشیان چاودێری گەرا و بێچووەکان و شاژن دەکەن و لە ڕێگای ئیشاراتی کیمیاییەوە لە یەکتری تێدەگەن و یەکتری ئاگادار دەکەن لەهاتنی دوژمن ..

هێلانەکەیان بە تونێلی باریك و تەسك بەدەرەوە دەبەسرێتەوە تەنها مێروولەیەکی پیا دەچێت و پاسەوانیشی هەیە و ، هەر مێروولەیەك بێتە ژوورەوە بە بۆنەکەیدا دەیناسنەوە کە لەخۆیانە یان نا .. کاتێك مێروولە خۆرێك یان هەر دوژمنێك دێت , مێروولە سپییەکانی تایبەت بە بەرگریکردن ڕووبەڕوویان دەبنەوە و هەر یەکە لەو مێروولانەش کیسەیەکی تایبەتی لەلەشیایە کە ماددەی کیمیایی تیایە و کە دوژمن دەیگرێ ماسولکەکانی سکی خۆی گرژ دەکات و ماددەیەکی زەردی ژەهراوی دەردەکات کە زیان بە دوژمن دەگەیەنێ و بەدەرکردنی ئەو ماددەیەش خۆی پاش ماوەیەکی کەم دەمرێت , ئەگەر شەڕەکەش زۆر قورس بوو ناچار مێروولە کرێکارەکانیش بەشداری دەکەن لەشەڕەکەدا.. کە بە ڕاستی ئەمەش نموونەی ئەوپەڕی گیانفیدایی وخۆبەخت کردنە لەو مێروولە بچکۆلانەدا .

ئەم جۆرە مێروولەیە لە دارستانی ئیستوایی مالیزیا و خوارووی ئەفریقیا و خوارووی ئەمەریکادا دەژین (التصمیم في الطبیعة) .

**هەنگ و بەرگری کردن :**

ئاشکرایە هەنگ بەهۆی چزووەکەیەوە بە دوژمنەوە ئەدات و ئازاری پێدەگەیەنێت و بەمەش خۆی دەمرێت .

یەکێ لە دوژمنەکانی هەنگ زەردەواڵەی گەورەیە (بەتایبەتی لەیابان) , سێ دانە لەو زەردەواڵەیە دەتوانن سێ هەزار هەنگ لەناوبەرن لە سێ سەعاتدا .. جا کاتێك هەنگ

دەزانیٚ چزووەکەی لەم شەڕەدا سوودی نیە و کاریگەر نیە , ڕێگایەکی تر دەگرێتەبەر بۆ پاراستنی شانەکەی .. ئەویش بەوەی کەکاتێك ئەو زەردەوالآنە هێرش دەهێنن بۆنێکی تایبەت دەردەدەن کە بەهۆیەوە یەکتری ئاگادار دەکەن و بەرەو جەنگەکە دەچن , هەنگەکانیش هەست بەم بۆنەی ئەوان دەکەن و نزیکەی پێنج سەد هەنگیان دێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن , جا لەبەرئەوەی لە شەڕەکەدا پێوەدان سوودی نیە , ئەوا هەموو بەیەکەوە بە باڵەفرکیٚ پلەی گەرمی ئەو ناوچەیە بەرزدەکەنەوە بۆ نزیکەی چل و هەشت پلەی سەدی و بەم گەرمییە زۆرەش زەردەواڵەکان دەمرن (التصميم/ل١٦٤).

**بەزەیی و میهرەبانی لەناو گیانلەبەراندا :**

خوای گەورە (رحمان) و (رحیم)ە و بەزەیی و میهرەبانیەکەی کە سەد بەشە ، یەك بەشی لەسەر زەویدا داناوە , بەهۆی ئەو بەشە میهرەبانیەوە گیانلەبەران سۆز و بەزەیی و میهرەبانیان هەیە بۆ بێچووەکانیان , حەزرەت (ص) دەفەرمویٚت (جعل الله الرحمة مائة جزء ، فأمسك عنده تسعة وتسعين ، وأنزل في الأرض جزءاً واحداً فمن ذلك الجزء تتراحم الخلائق ، حتى ترفع الدابة حافرها عن ولدها خشية أن تصيبه) مسلم وبخاري ..

زانای زیندەوەرزانی سویدی (أدولف مودر) یەکەم کەسە کە گرنگی پێدان و چاودێری مێروو حەشەراتی دۆزیەوە بۆ بێچوەکانیان , لەساڵی ١٧٦٦دا , لەکاتێکدا کە دیراسەی دەکرد لەسەر مێرووی (المدرع الاوربي)و , بۆی دەرکەوت کە مێیەی ئەو مێرووە لەسەر هێلکەکەی دادەنیشیٚ بەبیٚئەوەی هیچ بخوا و بخواتەوە و ئەگەر دوژمنێکیش نزیك بێتەوە لەخۆی و هێلکەکانی زۆر بەتوندیبەگژیا دەچێتەوە .

هەروەها مێرووی (دانتیلا)ش باڵەکانی ئەدا بەیەکدا و سواری پشتی دوژمنەکەی دەبێت بۆئەوەی بێزاری بکات و دووری بخاتەوە لە (یرقات)ەکانی , جا لەو کاتەش دا کە دوژمنەکە سەرقاڵ دەبیٚ , خێرا (یرقات)ەکانی دەچن خۆیان دەشارنەوە لە گەڵایەکدا , زۆرجار مێیەکەش لەم بەرگریکردنەدا تیادەچێت و بەمەش وەچەکانیڕزگار دەکات (ل/٩٥التضحية) .

جۆرێك هەنگیش هەیە , کە پێی دەڵێن (النحل البري الحفار) چاڵێك هەڵدەکەنیٚ و گەرایەکی تیا دادەنیٚ و زۆر ژیرانە گڵە هەڵکەنراوەکە دوور دەخاتەوەو پاشان کوللەیەك یان حەشەرەیەکی تر دەگریٚ و تەخدیری دەکات و دەیهێنیٚ لای گەراکەوە دایدەنیٚ و دایدەپۆشێتەوە بەجۆرێك هەستی پیٚنەکرێت , کاتێك گەراکە دەتروکیٚ ودێتە دەریٚ

کوللەکەش دێتەوە هۆشی خۆی و بەمەش ئەو مێرووە تازە لەدایك بووە خواردنێکی تەڕوتازەی دەست دەکەوێت و ماوەیەك لەسەری دەژی و دوایی دێتە دەرەوە .. ( ل/٨٥ التضحیة) ..

هەندێك باڵندەش لەکاتی نزیك بوونەوەی دوژمندا دەنگێ دەردەکات وەك فیشکەی مار و باڵی دەدا بەیەکدا تا دوژمنەکەی بترسێنێ و نەوێرێ نزیك بکەوێتەوە . (ل/٩١ التضحیة) (فلیمی دۆبلاژکراوی التضحیة عند الحیوانات / ئارا ) .

**بەتریقی ئیمبراتۆر :**

ئەم جۆرە بەتریقە لە بەستەڵەکی خواروو دەژی , لەکەش و هەوایەکی زۆر ساردی سەختدا و, لەکاتی زاووزێدا چەندەها کیلۆمەتر دەڕۆن بۆ دۆزینەوەی جێگایەکی گونجاو ، مێیەکەش یەك هێلکە دەکات کە زۆربەی ووزە و توانای خۆی بۆ سەرف دەکات , کاتێکیش هێلکەکە دەکات یەکسەر نێرەکە دەیخاتە سەر قاچی و لەنێوان قاچ و سکیدا دایدەنێ و نایەڵێ سەهۆڵ وبەفری سەرزەوی بەربکەوێ , تابێچووەکەی لێ دێتە دەرێ , دایکەکەش دەڕوات دەگەڕێ بەدوای خواردندا و هەوڵ دەدات تێربێت و هێزو توانای خۆی پەیدا بکاتەوە ..

نێرەکەش بۆ چوار مانگێ لەشوێنی خۆی ناجوڵێ مەگەر بۆ زۆر پێویستیەك نەبێ , کە بیەوێ پشووش بدات لەسەر کلکی پشوودەدات کە وەك کورسیەك بەکاری دەهێنێ و هاوسەنگی خۆی پێ ڕادەگرێ ..

شایانی باسە لەو چەند مانگەشدا هیچ ناخوات ، کە دایکەکەش خواردنی باشی دەستکەوت دەگەڕێتەوە لای نێرەکەو بێچووەکەی و خواردن دەدا بەبێچووەکە , پاشان نێرەکە هەر دەمێنێتەوە بۆ چاودێری تا دە ڕۆژی تر و ئینجا دەچێتە لای دەریاوە بۆ پەیداکردنی خواردن و خۆتێرکردن , پاش چوار مانگ لە بەڕۆژووبوون و هیچ نەخواردن، کە ئەمەش زۆرترین گرنگی دانە بە بێچوو , وە چڵەپۆپەی میهرەبانی و بەزەیی و سۆزە کە لای ئەو گیانلەبەرانە هەیە (ل/٧٢ التضحیة) .

**نەعامە و سێبەرکردن :**

ئاشکرایە کە تیشکی خۆر گەرمایی زۆرە لە ئەفریقیادا , بۆیە زۆر لە گیانلەبەرانی ئەو کیشوەرە دەچنە شوێنی سێبەرەوە بۆ خۆپاراستن لەو گەرما زۆرە , کەچی نەعامە بە

لەشی خۆی و باڵەکانی سێبەر بۆ هێلکەکان و بێچووەکانی دەکات و نایەڵێ زۆر گەرمایان ببێت ، کە ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی گیان فیدایییە بۆ بێچوو .

**هاوکاری لەنێوان گیانلەبەراندا :**

گیانلەبەران زۆریان بەیەکەوە دەژین و هاوکاری یەکتری دەکەن و یەکتری ئاگادار دەکەنەوە لەهەر مەترسییەك کە روویان تێبکات .. کاتێك دۆلفینێك لەسەر ئەوەیە بێچووی ببێت ، دۆلفینێکی مێیەی تر لەگەڵیا هاوکارێتی و چاودێری دەکات و پاشان بە هەموویان خزمەت و چاودێری دۆلفینە بچوکەکان دەکەن و بە کۆمەڵ بەیەکەوە دژین (ل/١٥٩ - التصميم في الطبيعة) .

**تێبینیەکانی (کینیث ووکر):**

ئەم زانا بەناوبانگە گەشتێکی کرد بە ئەفریقیادا و کەوتە تۆمارکردنی ئەوەی کە دەیبینی و دەڵێ: پێش چەند ساڵێك لە ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقیا بەچاوی خۆم بینیم کە کۆمەڵێك ئاسك و کەری وەحشی بەیەکەوە بوون و هاوکاری یەکتریان دەکرد لە دەشتەکانی (هایتی)دا , بەجۆرێك کە یەکێکیان لەخۆیان دادەنا بۆ چاودێری کردنی ناوچەکە و هەر ئەوەندە هەستی بەشتێك بکردایە هەموانی ئاگاداردەکردەوە ..

هەروەها فیل و زەڕافەشم بینی , کە هاوکاری یەکتریان دەکرد , چونکە فیل چاوی کزە و بەهۆی گوێیەکانیەوە زیاتر هەست بە نزیك بوونەوەی دوژمن دەکات, زەرافەش بەملی بەرز و چاوی تیژی باشتر دوژمن دەبینێ , بۆیە زەڕافەکان هەر شتێکیان ببینیایە لەدوورەوە فیلەکانیان ئاگادار دەکردەوە ..

(وحيد القرن)یش باڵندەیەك لەسەر پشتی دەنیشێتەوە هەر مشەخۆرێك لەسەر پشتی بێت دەیخوات و بەمەش هاوکاری یەکتری دەکەن و هەر باڵندەکەش هەست بە دوژمنێك بکات دەنگێکی لێوە دێت و (وحيد القرن)ەکە ئاگادار دەکاتەوە تا ڕابکات و دوور بکەوێتەوە . (ل/١١٤ التضحية عند الحيوان/هارون يحيى ، وەرگێرانی/ مصطفى الستيتي/٢٠٠٢) .

**بەرنامەی خوا بۆ گیانلەبەران :**

ووردبوونەوە لە هەڵسووکەوتی گیانلەبەران و ڕێك وپێکی ژیانیان ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەخات , کە خوای گەورە بەرنامەی بۆ هەموان داناوەو هەمووان بەنەخشە و پلانێکی

تایبەت دەژین تا بەرگری بکەن لەتیاچوون و هەوڵ بدەن بۆ مانەوەو بەردەوام بوون , قورئان لەبارەی هەنگەوە دەفەرموێت :

( وأوحى ربك إلى النحلِ أن اتخذي من الجبالِ بيوتاً ومنَ الشجرِ ومما يَعرشون , ثم كلي من كل الثمرات فاسلكي سبُلَ ربك ذُلُلا يخرج من بطونها شرابٌ مختلفٌ ألوانه فيه شفاء للناس إن في ذلك لآية لقومٍ يَتَفكرونْ ) النحل/٦٩

واتە: پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد (ص) , ئەی ئینسان) نیگا و ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ کەجێگە بۆ خۆی ساز بکات لەکون و کەلێنی چیاکاندا , هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەی کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکات , لەوەودوا فێرمان کردووە کە لە هەموو بەروبووم و شیلەی گوڵ وشتی بەسوود بخوات و پێمان ڕاگەیاندووە ئەو نەخشانەی کە پەروەردگارت بۆی کێشاویت بە ملکەچیەوە ئەنجامی بدە , ( لە دروست کردنی شانەو مژینی شیلە و دروست کردنی هەنگوین و پوورەدان بەدەوری شاژندا و بەخێوکردنی گەراکان ..هتد) , جا لەناوسکی ئەو هەنگانەوە شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە کە شیفای تێدایە بۆ زۆر نەخۆشی خەڵکی , بەڕاستی ئالەمەشدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە

### بیردۆزی داروین و هەڵس و کەوتی گیانلەبەران :

پێش سەد و پەنجا ساڵ کە داروین بیردۆزی پەرەسەندنی ڕاگەیاند , مادده پەرستان و دوژمنانی ئاین دڵیان پێخۆش کرد ودنیایان پڕکرد و خرایە ناو بەرنامەی قوتابخانە و زانکۆکانەوە ، بەڵام پاش چەند ساڵێك وردەوردە ڕاستیەکان دەرکەوتن و ئەو بیردۆزە هەرەسی هێنا بە جۆرێك کە ئێستا لە چەند ویلایەتێکی ئەمریکادا ناخوێنرێت و هیچ گوێی پێنادرێت

یەکێ لەو هۆیانەی کە ئەو بیردۆزەی هەرەس پێهێنا ئەو ڕەفتار و هەڵسوکەوتە غەریزیەی گیانلەبەران بوو , کە تەنانەت دارونیشی سەرسام کردبوو , ئەوەتا داروین خۆی دەڵێت (أغلب الغرائز تمتاز بتأثير بالغ وتثير درجة كبيرة من الحيرة ، وكيفية نشوءها وتطورها ربما تبدو لقارىء نظريتي كافية لهدم نظريتي من الأساس) ل/٢١ التضحية

ئەوەتا داروین دان دەنێ بەمەسەلەی غرائزدا کە چۆن جێی سەرسوڕمانە و وردبوونەوە لێی وا دەکات کە خوێنەری ئەو بیردۆزە بڕوای پێی نەمێنێ و لەبنەڕەتەوە هەرەسی پێ بهێنێت .

هەروەها دەڵێت (إنه لخطأ كبير أن نتحدث عن فرضية اكتساب الأنماط السلوكية الغريزية بالطبع وتوريثها إلى أجيال لاحقة ، لاننا كما نعلم هناك غرائز محيرة للغاية كتلك التي عند النمل أو النحل ولايمكن أكتسابها بالطبع) ( ل/٢٦ هەمان سەرچاوە).

لێرەشدا دەڵێ : هەڵەیەکی گەورەیە کە باس لەو گریمانە بکەین کە ئەو ڕەفتار و هەڵس و کەوتە غەریزیە سەرسوڕهێنەرانە ، وەك ئەوەی کە لای مێرووله و هەنگ هەیە بە پەرەسەندن وردەوردە پەیدا بووبێ .

**دۆزینەوەکان ڕاستیەکان دەسەلمێنن :**

هەوڵی زانایان بەردەوامە و بەملیارەها دۆلار بۆ دیراسە و گەڕان و لێکۆڵینەوە خەرج دەکرێت و زۆر لە دۆزینەوەکان بوونەتە مایەی هەرەسهێنانی بیردۆزی داروین .. چونکە دەبوایە لەو دۆزینەوانەدا کە دەگەڕێتەوە بۆ ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر ئەو گیانلەبەرانە بدۆزرانایەتەوە کە پەرەیان سەندووەو لەحاڵەتێکەوە گۆڕاون بۆ حاڵەتێکی تر , هەروەها دۆزینەوەی جینات و کێشەی بازدان (طفرات) و زۆر ڕاستی تر کە جاران نەدەزانرا قوڕیدا بەدەمی ئەوانەی کەدوای ئەو بیروبۆچوونانە کەوتبوون .

**لەو بەبەردبوانەی دۆزراونەتەوە :**

١. بە بەردبوویەکی هەنگێك کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند ملیۆن ساڵێك لەمەوبەر و دیارە کە هەنگ پێش ئەو هەموو ماوە درێژە هەروەك خۆی بووە .

٢. بە بەردبوویەکی مێشی (التنين) کە تەمەنی بەبەردبووە کە (١٣٥)ملیۆن ساڵە و هەروەکو ئەمانەی ئێستا وایە .

٣. بەبەردبوویەکی مێروولەیەك دۆزراوەتە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر و هەروەك مێروولەی ئێستایە (ل/٤٦ خديعة التطور) .

٤. ماسیەکی جۆری ( کولاکانث ) دۆزرایەوە کە بووە بەبەرد و دەگەڕێتەوە بۆ (٤١٠)ملیۆن ساڵ لەمەوبەر , لەکاتێکدا لەهەمان جۆر ماسی لەساڵی (١٩٣٨)ەوە چەند جار ڕاو کراوە لەلایەن ماسیگرانەوە ( ل/٥٢ هەمان سەرچاوە ).

داروین دەیووت: ئەگەر بیردۆزەکەم ڕاست بێ ئەوا لەداهاتوودا (متحجرات) دەدۆزرێتەوە و ئەو گیانلەبەرانە دەرئەکەون تیایانا کە پەرەیان سەندووە .. کەچی وادەرنەچوو دۆزینەوەکان سەلماندیان کە ئەو گیانلەبەرانە پەرەیان نەسەندووەو لەپڕ پەیدا بوون و هەر بەهەمان شێوەی ئێستابوون .. ئەمەش زانای متحجراتی ئینگلیزی بەناوبانگ (دیریك اجر) دانی پیادەنێ و هەروەها زانای متحجرات (مارك سیزارنكی)یش دەڵێ: (إن المشكلة الأساسية في اثبات النظرية تكمن في سجل المتحجرات ، أي آثار الانواع المنقرضة المحفوظة فى التكوينات الجغرافية للأرض ولم يكشف هذا السجل قط اية آثار للأشكال المتوسطة التي افترضها دارون، وعوضاً عن ذلك تظهر الاجناس وتختفي فجأةً ويدعم هذا الشذوذ حجة دعاة الخلق القائلة بأن الأنواع قد خلقها الله) ل٤٦/ خديعة التطور .

٥. لەساڵی١٩٧٧دا ماریلیکی لەناوچەی (لاتولی) لە تەنزانیا لە چینەکانی زەویدا پاشماوەی جێ پێی مرۆڤێکی دۆزیەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٣,٦)ملیۆن ساڵ , ئەوەی سەیرە کە وەك جێ پێی مرۆڤی ئەم سەردەمە وایە .. ئەمەش جەختی کرایە سەر لەلایەن زانای بەناوبانگ (لویس روبنن) لە زانکۆی سەرووی کالیفورنیا و (راسل تاتل)یش کە لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر ئەو جێ پێیە لەساڵی ١٩٩٠دا لە وتارێکدا نووسی کە ئەو جێ پێیە هی ئادەمیزادێکە کە لە (٣,٦) ملیۆن ساڵ لەمەوبەردا ژیاوە .. ل٩٨ خدیعة التطور .

٦. شەویلگەیەکی خوارووی ئادەمیزادێکیش دۆزرایەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ (٢,٣)ملیۆن ساڵ , لەناوچەی (هادار) لە ئەثیوبیا و ئەم ژمارەیەی بۆ دانرا ( AL666-1 ) ل٩٩ هەمان سەرچاوە .

ئەم دۆزینەوانە و هەزارەهای تر کەبوار نیە باسیان بکەین بەڵگەن بۆ ئەو ئایەتەی کە پەروەردگار دەفەرموێت (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق , أولم يكف بربك أنه على كل شيء شهيد) ٥٣ فصلت .

**﴿ دوو موعجیزەی قورئانی ﴾**

**یەکەم : هەواڵدان بە فەتحی خەیبەر :**

لەساڵی شەشی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (ص) خەوێکی بینی کە خۆی و هاوەڵانی دەچنە ناو کەعبەوەو تەواف و عەمرە دەکەن و ئەمەی بۆ هاوەڵان گێڕایەوەو زۆر دڵیان خۆش بوو , ئینجا چوون بەرەو مەککە بۆ عەمرەکردن و تەواف ماڵی خوا کە شەش ساڵ دەبوو چاویان پێی نەکەوتبوو

قوڕەیش کە بەمەی زانی رێی لێگرتن و پێغەمبەریش (ص) نەیویست خوێن بڕژێ و کۆتایی بە سوڵحی حودەیبییە هات کە موسوڵمانان ئەو ساڵە بگەڕێنەوەو ساڵی داهاتووبێن عومرە بکەن و تا دە ساڵ شەڕنەبێت لە نێوانیاندا..

هاوەڵان ئەم سوڵحەیان زۆر پێناخۆش بوو , کە گەڕانەوە سورەتی فەتح هاتە خوارەوە کە باس لە سوڵحی حودەیبییە دەکات و بەفەتحی ئەداتە قەڵەم و مژدە ئەدات بە موسوڵمانان کە پاشە ڕۆژ بۆ ئەمانە و فەتحی نزیك چاوەڕێیانە , کە ئەوەش فەتحی خەیبەر بوو کە دەستکەوتێکی گەورەبوو بۆ موسوڵمانان و زۆریان پێخۆش بوو، ئەم هەواڵدانەی قورئان بەفەتحی خەیبەر کە لەماوەیەکی زوودا دەبێت موعجیزە بوو , هەروەك دەفەرموێت (إنا فتحنا لك فتحاً مبينا , ليغفر لك الله ماتقدم من ذنبك وماتأخر ويتم نعمته عليك ويهديكَ صراطاً مستقيما ، وينصركَ الله نصراً عزيزا) الفتح ١-٣

واتە: ئەی پێغەمبەر (ص) بەڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت (مەبەست رێکەوتنی حودەیبییەیە ) , تا خوا لەهەموو گوناهانی ڕابردوو و ئایندەشت خۆش ببێت و بەخششەکانی لەسەرت تەواوبکات و بتخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست , تا بەوبۆنەیەوە خوا سەرکەوتنێکی بەهێز و باڵات پێببەخشێت

بە ڕاستی هەواڵدان بەوەی کە سوڵحی حودەیبیە فەتحە ، زۆر گرنگە بۆ موسوڵمانان و موعجیزەیەکی تری قورئانیە چونکە هیچ یەکێ لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەو هەموو دەسکەوتەی دەبێت , بۆیە بەناچاری پێی ڕازیبوون و کە ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە پێغەمبەر (ص) ناردی بەدوای عومەردا و بۆی خوێندەوە ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئەوە فەتحە؟ فەرمووی: بەڵێ , ئینجا عومەر دڵی بەتەواوی ئارامی گرت و گەڕایەوە لەو هەموو هەوڵەی کە دای لەپێش سوڵحەکەدا تا نەکرێ و زۆر هانی هاوەڵانی دا کە وا بکەن پێغەمبەر (ص) ڕازی نەبێ بە پەیماننامەکە و بەزۆر فەتحی مەککە بکەن جا عومەر لەدواییدا کە ئەم ڕاستییەی بۆ دەرکەوت و

**رۆژگاریش سەلماندی کە چ خێر و بەرەکەت و فەتحێك بوو , دەیووت: بەردەوام خێر و چاکە دەکەم تا خوا لەو قسەو مەوقیفەی ئەوسام خۆش بێت**

**ئینجا لەدوای چەند ئایەتێکی تر دەفەرموێت** ( لقد رضـــي الله عــن المــؤمنين إذ يبايعونكَ تحت الشجرة فعَلِمَ مافي قلوبهمْ فأنزَل السكينةَ عليهمْ وأثابهم فتحــاً قريبــا ومغانم كثيرةً يأخذونها وكانَ اللهُ عزيزاً حكيما ، وعَدَكُم الله مغــانمَ كثيــرة تأخــذونها فعجل لكم هذه وكف أيدي الناسِ عَنْكُمْ ولتكونَ آيةً للمؤمنين ويهديكمْ صراطاً مستقيما ، واخرى لمْ تَقدروا عليها قَد أحاط الله بها وكان الله على كل شيءٍ قديرا) الفتح/١٢

**واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیبووە لەو باوەڕدارانەی کاتێك پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لەژێر درەختەکەدا , خوا خۆشی ئاگاداربوو بەوەی لەدڵەکانیاندا هەیە لە نیازپاکی و دڵسۆزی , هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بەمژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە , هەروەها بەڵێنی چەندین دەسکەوتی زۆری پێدان , کە لەئایندەدا دەستیان دەکەوێت و وەریدەگرن , خوا هەمیشە و بەردەوام بالأدەستە بەسەر خوانەناساندا ودانایەو دەزانێت چ کاتێك ئیمانداران سەردەخات**

**خوا بەڵێنیٚ دەسکەوتی زۆری پێداون , لە ئایندەدا دەستتان دەکەوێت و وەریدەگرن , بەڵام جاریٚ ئێستا هەرئەوەی پێبەخشیون کە دەسکەوتەکانی خەیبەرە ، دەستی خەڵکیشی لیٚ کۆتاکردن (مەبەست قوڕەیشە کە بەهۆی ڕێکەوتنەکەی حودەیبیەوە خوای گەورە لە بەگژاچوونی موسوڵمانان دەستی بەستنەوە) , تا ئەم دەسکەوت و سەرکەوتنە ببێتە نیشانە و بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئیمانداران (کە خوا یارو یاوەرو پشتیوانیانە) هەروەها ڕێنموونیان بکات بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست و, چەندینیٚ دەسکەوتی تریشیان هەیە کە ئێستا دەستیان بەسەریدا نەڕۆیشتووە , بەڕاستی خوا خۆی چاك بەو دەسکەوتانە دەزانێت کە بەڕێوەیە بۆتان , هەمیشە و بەردەوام خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە پاش چەند ئایەتێکی تریش دەفەرموێت** ( لقد صدق الله رســوله الرؤيا بالحق لَتَدخُلن المسجد الحرامَ إن شاء اللهُ آمنين محلقــين رؤســكم ومقــصرين لاتخافون فعلم مالم تعلموا فجعل من دونِ ذَلكَ فتحاً قريبا) الفتح/٢٧

**واتە: سوێند بەخوا بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاستی و وەك خۆی هێناوەتە دی کە دەفەرموێت: بەم زووانە ئێوە بەهەموو ئارامی و ئاسوودەییەکەوە بە ویستی خوا**

دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە , عەمرە بەجێ دەهێنن , سەرتان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە بێئەوەی ترس و بیمتان لەکەس هەبێت , جائەوەی نەتانزانیووە خوا دەیزانێ , کە جگە لەم سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی نزیکی تری بۆ بڕیار داون پێتان دەبەخشێت (کە فەتحیخەیبەرە) بەڵێ.. سوڵحی حودەیبیە فەتح بوو چونکە

١. لەسەرەتاکانی ساڵی حەوتی کۆچیدا پاش ئەم شەڕ وەستانە پاڵەوانەکانی قورەیش وەك عەمری کوری عاص و خالید کوڕی وەلید و عوسمانی کوڕی تەڵحە موسوڵمان بوون.

٢. چالاکی لەبواری بانگەوازدا زیاتر بوو , بەنامە نووسین بۆ پاشاو میرەکان و بانگکردنیان بۆ ئیسلام , وەك نەجاشی حەبەشەو (مقوقس) پاشای میسر و کیسرای پاشای فارس و قەیسەری پاشای ڕۆم

٣. لە موحەڕەمی ساڵی حەوتی کۆچیدا واتە پاش چەند مانگێک فەتحی خەیبەری کرد کە زۆر گرنگ بوو بۆ موسوڵمانان و بۆ شکاندن و نەهێشتنی شەوکەتی جولەکە , کە ئەمەش پەیمانی خوا بوو (وعدكم اللهُ مغانم كثيرة تأخذونها فعجل لكم هذه) الفتح/٢٠

٤. لە مانگی ذو القعدةی حەوتی کۆچیدا موسوڵمانان عومرەیان کرد وخەڵکی مەککە لەشار دەرچوون تا ئەمان عومرەی خۆیان کرد کە ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ ئیسلام

٥. لە جەمادی یەکەمی (٨)ی کۆچیدا جەنگی مؤتە ڕوویدا کە بەرەنگاربوونەوەی موسوڵمانان بوو لەگەڵ ڕۆمەکانداو سەرکەوتنێك بوو بۆ ئیسلام

٦ لەمانگی ڕەمەزانی (٨)ی کۆچیدا حەزرەت (ص) بە دەهەزار لە هاوەڵانیەوە فەتحی مەککەی کرد بە یەکجاری وبەم جۆرەش پەیمانەکانی خوا لەو ماوە کەمەدا هاتە دی کە ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە کە ئایەتەکانی سوورەتی فەتح باسی کردبوون (سەیری گولاوی سەرمۆر بکە بۆ درێژەی ئەم باسە)

**دووەم: کەسایەتی ( هامان ) وئیعجازی قورئان :**

قورئانی پیرۆز هەندێ شتی فەرمووە لەبارەی میسری کۆنەوە , کەکەس تا ئەم دواییە نەیزانیوە ..بۆ نموونە یەکێ لەو کەسایەتیانەی کە لەزەمانی فیرعەوندا ژیاوە , (هامان)بووە , کە لەگەڵ باسی فیرعەون دا قورئان باسی دەکات لەشەش جێگادا و ئەوەش دەردەخات کە زۆر نزیك بووە لەفیرعەونەوە.

شایانی باسە لەتەورات دا باسی (هامان) نەهاتووە ، ئەوەنەبێ کە لەکۆتایی بەشی دوایی (العهد القدیم)دا , ناوی هاتووە وەك یارمەتیدەری پاشای بابل کە لەدوای هەزار و سەد ساڵ لەزەمانی موسادا ژیاوەو زوڵمی زۆری لە جوولەکە کردووە (دیارە ئەمەی لەتەورات دایە دەستکاری کراوەو تێکیان داوەو شێوێنراوە) . دوژمنانی ئیسلام و زۆر لەناحەزان پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە پێغەمبەر (ص) لەتەورات و ئینجیلەوە شتی وەرگرتبێ , کە ئەمەش گرێی لەدڵی هەندێ نۆ موسوڵماندا دروست دەکرد کە تازەو کەم شارەزابوون .. کەدیارە ئەمانەش هەمووی دوورن لەڕاستیەوەو قورئان هەڵە و کەم و کورتی و ناتەواوییەکانی تەورات و ئینجیل ڕاست دەکاتەوەو بە دەسەڵاتە بەسەریانا , وەك قورئان خۆی وەسفی خۆی دەکات و دەفەرموێ (ومهیمناً علیه) واتە: قورئان (مهیمن)ە و (مسیطرة) بەسەر هەموو ئەو پەڕاوانەدا کە زووتر هاتوون و دەستکاری کراون .

قەدەری خوا وابوو کە ئەم ڕاستیەی قورئانیش بسەلمێنرێ بۆ جیهان , ئەویش بەوەی کە دووسەد ساڵێك لەمەوبەر نووسینی هیرۆغلیفی دۆزرایەوەو ڕەمزەکانی شیکارکرا .. بەمەش توانیان نووسینەکانی میسرییە کۆنەکان بخوێننەوە .. تا دووسەد ساڵ لەمەوبەر کەس نەیدەتوانی لەو زمانە تێبگات کە میسرییە کۆنەکان شتیان پێ نووسیبوو , ئەم زمانەش چەند سەدەیەك درێژەی کێشاوەو پاش بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە سەدەی دووەم وسێیەمی زایینیدا , میسرییەکان بێجگە لەگۆڕینی ئاینەکەیان زمانەکەشیان گۆڕدراو وردەوردە لاوازبوو، کەس پێی نەدەنووسی و دەڵێن دوانووسین کە بەزمانی هیرۆغلیفییە لە ساڵی ٣٩٤ زایینیدا بووە.

ئیتر ئەو زمانە لەبیر کرا تا ساڵی ١٧٩٩ زایینی کە بەردی (ڕەشید) دۆزرایەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦ی پێش زایین ..

نووسینەکانی سەر ئەم بەردە سێ نووسین بوو ، نووسینێك بەزمانی هیرۆغلیفی و نووسینێك بەزمانی دیمونیکی کە شێوەی نووسینی دەستی زمانی هیرۆغلیفییەو نووسینێکیشی بەزمانی یۆنانی .. جا بەهۆی یۆنانیەکەوە توانرا لەدەقی نووسینی هیرۆغلیفییەکە تێبگەن , کەئەمەش لەلایەن زانای فەڕەنسی (فرانجیس شامبیلون)ەوە جێبەجێ کرا ..

**دۆزینەوەی ئەم زمانە کۆنەی میسرییەکان خێری تیابوو , بەوەی کە ناوی هامان هاتووە لەسەر بەردێك لە مۆزەخانەی (هۆف) لە ڤییەننا و تیایا باس دەکات کە (هامان) نزیکی فیرعەون و لەحاشیەی بووە . وە لەقاموسی (الأشخاص في الملكية الجديدة)دا ( کە نووسراوە بەهۆی ئەو زانیارانەی کە دەستیان کەوتووە لەو بەردە و لەو دۆزراوانەی تری میسریە کۆنەکانەوە ) هاتووە کە هامان بەرپرسی بەرد هەڵکەنەکان وبەرپرسی بیناکردن بووە , بۆیە لەقورئاندا هاتووە کە فیرعەون داوا لەهامان دەکات کە بینایەکی بەرزی بۆ دروست بکات , تا گوایە لەسەر ئەو بینا بەرزەوە سەیری ئاسمان بکات و بزانێ خواکەی موسای لێیە یان نا ، دیارە ئەمەش بۆ خڵافاندنی خەڵك و سەرقاڵ کردنیان بووە ..**

**جا قورئان لەبارەی هامانەوە دەفەرموێت :**

١.(وقال فرعون ياأيها الملأ ماعلمت لكم من الهٍ غيري ، فأوقد لي ياهامان على الطين ، فاجعل لي صرحاً لعلي أطلع إلى إله موسى وإني لأظنه من الكاذبين) القصص/٣٨ .

**واتە: فیرعەون سەرکەشانە وتی: ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم کە شایستە بێت بەوەی خواتان بێت جگە لەخۆم , ئەی هامان تۆ لەگەڵ خشتی سوورەوە کراوم بۆ دروست بکە و قەڵایەکی بەرز و پتەوم بۆ بینا بکە بەڵکو پیایدا سەربکەوم , تا خوای موسا ببینم , هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە کە موسا لە درۆزنەکانە .**

٢. (وقَال فرعونُ ياهامان ابن لي صرحاً لعلي أبلغُ الأسباب ، أسبابَ السماوات فاطلعَ إلى إله موسى وإني لَأظُنهُ كاذبا) غافر/٣٧ .

**واتە: فیرعەون وتی: ئەی هامان بورجێکی بەرزم بۆ دروست بکەن , بۆئەوەی هەندێ هۆکارم دەست بکەوێت , هۆکاری بەرزبوونەوە بۆ ئاسمانەکان , تا لەوێوە سەرکەوم و نهێنیەکان شارەزابیم , تا سەردانێکی خوایموسا بکەم و بیبینم , هەرچەندە من دڵنیام کە درۆزنە .**

٣.(لقد أرسلنا موسى بِآياتنا وسُلطانٍ مبين إلى فرعَونَ وهامان وقارون فقالوا ساحرٌ كَذاب) غافر/٢٤ .

**واتە: سوێند بەخوا بە ڕاستی ئێمە موسامان ڕەوانەکرد هاوڕێ لەگەڵ چەندەها بەڵگەو نیشانەی ئاشکرادا , بۆ سەر فیرعەون و هامان و قارون , بەڵام ئەو ستەمکارانە وتیان: جادووگەرێکی درۆزنە .**

٤ .(ونُريدُ أن نَمُن على الذينَ استضعفوا في الأرض ونَجعَلَهُم أئمةً ونَجعَلَهُم الوارثين ، ونُمَكن لَهُمْ في الأرض ونُريَ فِرعَون وهامان وجنودَهُما مِنْهُم ماكانوا يَحذَرون) القصص/٦

**واتە: بەناردنی حەزرەتی موسا ویستمان دەروو بکەینەوە لەبەنی ئیسرائیلیە چەوساوەکان ومنەتی خێر بکەین بەسەریاناو بیانکەینە پێشەواو میراتگری سامان و دەسەڵاتی ستەمکاران .. هەروەها ویستمان پایەداریان بکەین و دەسەڵاتیان بچەسپێنین لە وولاتداو , ئەوە پێش بهێنین بۆ فیرعەون وهامان و سەربازانیان کە لێی دەترسان**

(وَأوحَينا إلى امِ موسى أنْ أرضعيه فإذا خفتِ عليه فألقيه في اليم ولاتخافي ولاتَحزَني إنا رادوه إليك وجاعلوُ مِنَ المرسلين) (القصص/٧) **ئێمە دایکی موسامان ئاگادارکرد , کەشیری بداتێ و پێمان ووت جاکاتێك مەترسیت پەیدا کرد لەوەی کە پێی بزانرێت فرێی بدەرە ڕووباری نیلەوە , نەبترسە تووشی بەڵابێت , نەخەفەتیشی بۆ بخۆ , چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆلات و لەئایندەشدا دەیکەینە یەکێك لەپێغەمبەرە پەیامدارەکان ..**

٥. ( فالتقطه آل فرعَون لِيَكونَ لهُم عَدواً وَحَزَناً ، إن فِرعَونَ وهامان وَجنودَهُما كانوا خاطئين) (القصص/٨) .

**واتە: ئەوسا ئیتر داروددەستەی فیرعەون هەڵیان گرتەوە , تا سەرەنجام ببێتە دوژمن و خەفەت بۆیان , بەڕاستی فیرعەون وهامان و سەربازەکانیان گوناهکار و تاوانبارو هەڵەبوون .**

٦.(وقارون وفرعون وهامان ولقد جاءَهُم موسى بالبياتِ فاستَكبَروا في الأرض وماكانوا سابقين) العنكبوت/٣٦ .. **واتە: قارون و فیرعەون و هامانیشمان لەناوبرد , سوێند بەخوا بێگومان موسا بەڵگەی زۆری بۆهێنان , کەچی خۆیان زۆر بەگەورە دانا لەزەویدا , سەرەنجام نەیانتوانی لەسزا و تۆڵەی خوا خۆیان ڕزگار بکەن و لەدەستمان دەرچن ..(المعجزات القرآنية/هارون يحيى/ل/٧٣ وەرگێڕانی ئورخان محمد علي/٢٠٠٣).**

## قورئان تەورات و ئینجیل ڕاست دەکاتەوە

١- قورئان زۆر ڕاستی شیوێنراو لەناو تەورات و ئینجیلدا ڕاست دەکاتەوە , بۆ نموونە: لەبارەی سولەیمانەوە سەلامی خوای لێ بێ دەفەرموێت : (وماكفرَ سُلَيمانُ ولَكن الشياطينَ كَفَروا) البقرة/١٠٢ .

واتە: سولەیمان کوفری نەکردووەو شەیاتینەکان کوفریان کرد ..

ڕەنگە کەسێکی فیترەت پاك سەری بسوڕمێ لەم دیفاعەی قورئان لە سولەیمان , بەڵام ئەگەر سەیری (العهد القديم) بکەین وسەیری بیروباوەڕی شێواویان بکەین , دەبینین کە زۆر بەخراپی باس لەپێغەمبەران دەکەن , بەتایبەت سولەیمان کە کوفرو سیحری دەخەنە پاڵ و دەڵێن: بتپەرستووە بەهۆی کاریگەری ژنەکانیەوە لەسەری .. بەڵێ.. قورئان ئەو بیروبۆچوونە ناڕاستانەی جوولەکەو گاورەکانی ڕاست کردەوەوباسی (معصوم)ی پێغەمبەرانی کرد .. دیارە سولەیمان کە هەزاران ساڵ پێش بووەو , هیچ زانیارییەکی وا لەبەردەستا نەبووە لەو سەردەمەدا لەسەری ،کەچی چونکە قورئان کەلامی خوایەو وەحییە , دەبینین زۆر بەجوانی بەبێ ئەوەی گوێباتە خەڵکی دەڵێن چی , یان ناڵێن چی , هەقی خۆی دەچەسپێنێ و دوای چواردە سەدە لەهاتنی قورئانیش ئەوانەی کە (دائره المعارف)ی بەریتانیان داناوە لەو هەڵانە خۆیان دەپارێزن و دەگەڕێنەوە سەرهەق و ڕاستی و دەڵێن: (لقد كان سليمان موحداً)

واتە: بەڕاستی سولەیمان یەکتاپەرست بووە..

هەروەها لە(دائره المعارف)ی (عهد القديم والجديد)یشدا کە هەوڵ و کۆششی زۆر زانای مەسیحی بەئینصافە , هەموو ئەو خورافاتەیان دایە دواوەو وتیان: ( سولەیمان دوور بووە لەبت پەرستی و شتی نالائیق .. ) دراسات قرآنية - ل/٩٦ الندوی.

٢- لە(عەهدی قدیم )دا ئەم دەقە هەیە کە دەڵێ (خلق الله السماوات والأرض في ستة أيام ، فاستراح في اليوم السابع) سفر التكوين ٢-٣ . واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا بەدی هێناو ڕۆژی حەوتەمیش پشوویدا (ئاشکرایە کەئەمە تحریف کراوە).

قورئانی پیرۆز ئەمەی ڕاست کردەوەو لەسوورەتی (ق/٣٨)دا و دەفەرموێت (ولَقَد خَلَقنا السماوات والأرض ومابينَهُما في ستةِ أيامٍ ومامَسنا مِنْ لُغُوب) . واتە: بەڕاستی ئێمە

ئاسمانەکان و زەوی‌و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە بەشەش ڕۆژ دروستمان کردوون , هیچ ماندوویەتیەکیش ڕووی تێنەکردین ..

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە پاش چواردە سەدە زانایانی مەسیحی و وەرگێڕەرانی تەورات ناچاربوون ئەو دەقە بگۆڕن و بەم شێوەیەی لێبکەن (خلق الله السماوات والأرض في ستة ايام ، فرغ من اعماله التي كان يقوم بها في اليوم السابع) سفر التكوين/٢٠٢ British And Foreignbible Society عەهدی قدیم ساڵی/١٩٥٨ ﴾ واتە: خوا بەشەش ڕۆژ ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناو لەکارەکانی بووەوە لە ڕۆژی حەوتەم دا (ل/٩٨ دراسات قرآنية/الندوی) .

**ژیاننامەی محمد ( صلی الله علیه وسلم )**

بانگخواز زۆر گرنگە شارەزابێت لە ژیاننامەی و لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە چی ڕاستە ئەوە هەڵگۆزێ و بیگەیەنێ بەخەڵکی , بەڕاستی تاقە پێغەمبەرێك کە ئاوا ژیاننامەی بەوردی نوسرابێتەوە (محمد)ە درودی خوا لەسەربێت , کەئەمەش ڕەحمەتی خوایە بۆ مرۆڤایەتی , بۆئەوەی تا قیامەت سەرمەشق و پێشەوابێت و، وانەیەکی کرداری بێت ژیانی پڕ بەرەکەتی بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت ڕێی ڕاست بگرێتەبەر و بیەوێت بەچاکی ڕەنگ دانەوەی قورئان ببینێ لەژیان دا .

لە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە زۆر ڕاستیمان بۆ دەردەکەوێت , یەکێ لەو ڕاستیانە ئەوەیە , کە هەروەك (ص) خۆی دەفەرموێت (چی لەئاسمانەکان و زەویدایە دەزانن کە من پێغەمبەری خوام , تەنها سەرکەشەکانی ئینس و جن نەبێت) .. ئەمەش چەند نموونەیەکە :

یەکەم / لەڕۆژی عەرەفەی حەجی ماڵ ئاواییدا (ص) وتاری بۆ زیاتر لەسەد هەزار کەس دا و، بەبێ ئەوەی بڵندگۆ هەبێت هەموویان گوێیان لەدەنگی بوو .

دووەم / (ص) چووە باخاتی یەکێ لەهاوەڵە ئەنسارەکانیەوە , کەحوشترێك تیایا بەلەسە بوو بوو بەکەس دابین نەدەکرا , کە حوشترەکە چاوی کەوت (ص) , چۆکی داداو فرمێسك بەچاویا هاتە خوارەوە , (ص) چوو دەستی موبارەکی هێنا بەسەریاو فەرمووی: کێ خاوەنی ئەم حوشترەیە ؟ لاوێکی ئەنساری هات وتی: هی منە ئەی پێغەمبەری خوا , ئەویش فەرمووی (نابێ لەخوا بترسی لەم گیانلەبەرەدا کەخوا

پێـی داوی، بەڕاسـتی ئـەو سـکاڵای کـرد لـەلام کـە تـۆ برسـی دەکـەیت و زۆر مانـدووی دەکەیت) (ابو داود/٣/٢٣/٢٥٤٩).

سێیەم / لەحەجی ماڵ ئاواییدا (ص) سـەد حوشـتری هێنـابوو سـەری ببڕێـت ، بەدەستی موبارەکی شەست و سێ دانەی سەربڕی و سیو حەوتەکەی تریدایـە دەسـت ئیمامی عـەلی تـا ئـەو سـەریان ببڕێ ، ئـەوەی سـەیرە حوشـترەکان جووڵـەیان تێکـەوتبوو هەریەکـەیان حـەزی دەکـرد پێشبکەوێ و زووتـر ببـێ بـەقوربانی بەدەسـتی موبـارەکی پێغەمبەر (ص) ، کەئەو بۆ سەربڕین دروسـت بووبێ بۆچی تـا زووە بەدەسـتی پیرۆزتـرین کەس نەبێ بەقوربانی (ئەم ڕووداوە ئیبن قەیم لـەزاد المعـاد ٢/٢١٦ باسـی کـردووە ، ابی داود ١٧٦٥/١٤٩/٢ ریوایـەتی کـردووە (ارنـاؤوط) سـەنەدەکەی بەچـاك دانـاوە ، ص/٣٨٦ الخطب المنبرية) ...

## تێگەیشتن لە دەسەڵاتی بێپایانی پەروەردگار

خوای پەروەردگار باڵادەسـتە و بەدیهێنـەری بوونـەوەرە ، ئـەو بوونـەوەرەی کـە عـەقڵی مـرۆڤ تائێـستا بەشـێکی کـەمی دۆزیوەتـەوە ، زانایـانی فەلـەك دەڵـێن ئاسمانـەکان و ئەسـتێرەو هەسـارەکان و هەرچـی دۆزراوەتـەوە تـەنها ئاسمـانی دنیایـەو یـەك ئاسمانـەو شەش ئاسمانەکەی تـر مەگـەر خـوا بزانـێ چەندەو چیـیەو چۆنە .. گـەورەیی ئـەوەی کـە دۆزراوەتەوە ئەگەر ڕۆکێتێك دروسـت بکـرێ کـە بـەخێرایی ڕووناکـی بـڕوات بـە (٢٤)ملیـار ساڵی ڕوناکی دەگاتە ئەو سنوورەی کە دۆزراوەتەوە .. پرۆفیسۆر ئـەنیس الـراوی دەڵـێ: کە منالْ بووم وباسی گەورەیی پەروەردگاریان دەکرد وام دەزانی بەخـەیاڵی منـاڵی خـۆم ، کە خوا بەقەدەر باوکم گەورەیـە ، بـەڵام ئێـستا کـەبیر لـەم بوونـەوەرە گـەورەیە دەکەمـەوە ، تێدەگەم کە دەسەڵات و توانای پەروەردگار چەندەو ئاشکراشە (إنما يَخشى الله منْ عبادهِ العُلَمـاء) زاناکـان زیـاتر لـەخوا دەترسـن ، چـونکە باشـتر لەدەسـەڵاتی بێپایـانی خـوا تێدەگەن .

بەڕاستی فەرموودەیەك کە ئیبن عـەباس ڕیوایـەتی کـردووە ژیـانمی سـەرتاپا گـۆڕی کـە دەفـەرموێت (ئاسمانـەکان و زەوی لەدەسـتی قـودرەتی پـەروەردگاردا وەك ئەوەیە کەسێك دەنکە خەرتەلەیەکی بەدەستەوە بێت) .

بەڵێ.. تێگەیشتن لەوەی کە (اللهُ أكبر) یـانی چـی ، مەسـەلەیەکی زۆر گرنگـە ، بۆیـە زۆر دووبارە دەکرێتەوە لەبانگ و نوێژدا و لەویردەکاندا ..سوونەتیشە یەکێك سەرکەوتە سەر

**بەرزاییەك بلێ (الله أكبر) تا لەیادی بێت هەركەس و هەرچی بەرزبێتەوە هەر خوا گەورەترو بالاَ دەست ترە ..**

**خوای گەورە (حیّ قیوم)ەو , بەهیچ جۆرێك لە دروستكراوەكانی غافل نابێ و خەوخەوەنۆچكە نایگرێت .. پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت:** (إن الله لاينام ولاينبغي عليه أن ينام ، يخفض القسط ويرفعه ، يُرفع إليه عمل النهار قبل عمل الليل ، وعمل الليل قبل عمل النهار ، حجابه النور أو النار ، لوكشفه لاحترقت سُبُحات وجه ماانتهى إليه بصره من خلقه) (ل/٥٩٩ الاساس في التفسير مجلد/١) .

**خوا ستەم لەكەس قبوڵ ناكات**

**قورئانی پیرۆز لەچەندەها ئایەتدا باسی زوڵم و ستەم دەكات و دەفەرموێت:**

١. (إن الشرك لظلمٌ عظيم) لقمان/١٣. **واتە: بەڕاستی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا ستەمێكی گەورەیە .**

٢. (تلكَ حدودُ الله ومن يَتَعَد حدود اللهِ فَأولئكَ هُمُ الظالمون) البقرة/٢٢٩ .**واتە: ئەوانە سنوورەكانی خوان , سنوورشكێنی مەكەن , هەركەس دەست درێژی بكات و سنوور بشكێنێ , ئەوانە ستەمكارن .**

٣. (أم تَقُولونَ إن إبراهيمَ واسماعيلَ وإسحاقَ ويعقوبَ والأسباطَ كانوا هوداً أو نصارى ، قُل أأنْتُم أعلَمُ أمِ الله ، وَمَنْ أظلَمُ ممنْ كَتَمَ شهادةً عِنْدَهُ مِنَ الله ، وَما اللهَ بِغافلٍ عما تَعْمَلون) }البقرة/١٤٠{ . **واتە:چۆن دەڵێن كە : ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و كوڕەكانی , جوولەكە یان گاوربوون ؟ پێیان بڵێ: باشە ئایا ئێوە دەزانن یان خوا ؟ جاكێ لەوە ستەمكارترە كە شایەتیەكی خوایی لەلابێت و شاردبێتیەوە , بێگومان خوا بێئاگا نیە لەو كارو كردەوانەی كە ئەنجامی دەدەن .**

٤. (وَمَنْ أظلم ممَن مَنَعَ مساجدَ اللهِ أن يُذكر فيها اسمُه ، وسعى في خرابِهااولئكَ ماكانَ لهم أن يَدخلوها إلا خائفين ، لَهَم فِي الدنيا خزيٌ ولَهُم فــي الآخــرةِ عَــذابٌ عَظــيم) (البقرة/١١٤) . **واتە:كێ لەوە تاوانبارترە مزگەوتەكانی خوا قەدەغە دەكات , لەوەی ناوی پیرۆزی ئەوی تیا ببرێت و هەوڵ بدات بۆ وێران كردنیان , ئەوانە بۆیان نیە بچنە**

**مزگەوتەکانەوە مەگەر ترسی خوایان لە دڵدا بێت , ئەوانە تەنها سوکیو ڕیسوایی بەشیانە لەدانیادا و، لە قیامەتیشدا سزای گەورەیان بۆهەیە .**

٥. (وَمَنْ أظلم ممَن ذُكرَ بآياتِ ربِّهِ فأعرَضَ عَنها ونسيَ ماقدّمَت يداهُ , إنا جَعَلنا على قلوبِهم أكنةً أن يفقَهوهُ وفي آذانهم وَقرا ، وإن تَدعوهم إلى الهدى فَلَنْ يَهتَدوا إذاً أبدا). الكهف/٥٧ .

**واتە: کێ لەوە ستەمکارترە کە یاداوەری کرابێت بەئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاری , کەچی ڕووی لێوەرگێڕاون و لووتی بەرزگرتووەو ئەوەشی لەیاد کردووە کە چ دەستپێشکەریەکی کردووە لەگوناهو تاوان , ئێمە بەڕاستی پەردەمان هێناوە بەسەر دڵیاندا تا لەئایەتەکانی ئێمە تێنەگەن و قورسی و کەڕیمان کردۆتە گوێیانەوە , خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێبازی هیدایەت و دینداری , ئەوە هەرگیز ئەوانە هیدایەت وەرناگرن.**

٦. (فَمَنْ أظلم ممَن افترى على اللهِ كَذِبا ليُضِل الناسَ بغَير علمٍ ، إن اللهَ لايَهدي القَومَ الظالمين) الأنعام/١٤٤.

**واتە: کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە ، تا بەبێ زانست خەڵکی سەرلێشێواو بکات , بەڕاستی خوا هیدایەتی دەستەی ستەمکاران نادات .**

٧. (ياأيها الذين آمَنوا لاتَأكلوا أموالَكم بَينَكُم بالباطل إلا أنْ تَكونَ تِجارةً عَنْ تَراضٍ منْكُم ، ولاتَقتُلوا أنفُسَكُم إن اللهَ كانَ بِكُم رَحيما ومَنْ يَفعَل ذلكَ عُدواناً وظُلماً فَسَوفَ نُصليه ناراً ، وكانَ ذلِكَ على اللهِ يَسيرا) النساء/٢٠ **واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و سامانی یەکتر بە ناهەق و بەبێ بەرامبەر مەخۆن لەنێوان خۆتاندا , مەگەر بازرگانیەك بێت و لەسەر ڕەزامەندی هەموولایەکتان بێت ،خۆتان مەکوژن و یەکتر بە ناحەق مەکوژن , کاتێك بێزاریی و بێتاقەتی ڕووتان لێ دەکات یان تووشی زیانێك دەبن , بەڕاستی خوا میهرەبانە پێتان , هەرکەسێکیش کاری وا بکات و سامانی خەڵکی بەناهەق بخوات وخۆی یان خەڵك بکوژێت , بە دوژمنایەتی وستەمکردن , ئەوە لەئایندەدا دەیخەینە دۆزەخەوەو بە ئاگر دەیسوتێنین , ئەو کارەش بۆ خوا هەمیشە و بەردەوام ئاسانە ..**

٨. (إن الذينَ يأكلونَ أموالَ اليتامى ظلما ، إنما يَأكَلُونَ في بطونِهِم نــاراً وَسَيَــصلَونَ سَعيرا) النساء/١٠ . واته: بەڕاستی ئەوانەی کە ماڵی هەتیو بەناهەق و بەستەم دەخۆن , بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لەناو سکیاندا و لەقیامەتیشدا دەچنە ناو دۆزەخەوە .

٩. (وَلا تَركنوا إلى الذينَ ظَلَموا فتَمَسَكُمُ النارُ وَمالكُم مِنْ دونِ اللهِ مِنْ أوليــاء ثُــم لا تُنْصَرون) هــود/١١٣ .. واتە: نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لەخوا یاخیبوون , چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسوتێنێت , کەسێکیش جگە لە خوا پشتیوانتان نابێت , لەوەو دوایش یارمەتی نادرێن .

١٠. (وَلَو يُؤاخِذِ اللهُ الناسَ بِظُلمِهِم ماتَرَكَ عَلَيها مِنْ دابةٍ وَلَكِن يُؤخِرُهُم إلى أجلٍ مسمى فَإذا جاءَ أجَلُهُم لايَستَأخِرونَ ساعةً ولايَستَقدِمون) النحل/٦٢.

واتە: خۆ ئەگەر خوا خەڵکی لەناو ببات وبیانپێچێتەوە بەهۆی ستەمیانەوە (ئەوەندە گوناه و تاوان زۆرە) زیندەوەر لەسەر زەویدا نایەڵێت و، هەر زوو خاپووری دەکات بە هەموو گیانلەبەرانەوە , بەڵام ئەو خوایە ئارامی و خۆگری بێ سنوورە , لەبەرئەوە تاکاتێکی دیاریکراو مۆڵەتی ئەو خەڵکە دەدات و دوایان دەخات , جا کاتێك ئاکامی دیاری کراویان هات , نەتاوێك دوا دەکەون و , نەتاوێك پێش دەکەون .

١١. (إن اللهَ لايَظلِمُ مِثقالَ ذرة) النساء/٤٠ واتە: بەڕاستی خوا مسقاڵە زەرەیەك ستەم لەکەس ناکات .. هەروەها ستەمیشی حەرام کردووە هەروەك لەفەرمودەی قودسیدا هاتووە (یاعبادي اني حرمت الظلم على نفسي وجعلته محرماً بينكم فلا تظالَموا) مسلم .

واتە: بەندەکانم من ستەمم لەخۆم حەرام کردووەو لەناو ئێوەشدا حەرامم کردووە , جا ستەم لەیەکتری مەکەن ..

**پێغەمبەریش ( ص ) جڵەوگیری کردووە لەستەمکردن و دەفەرموێت:**

ا) (الظلم ظلمات يوم القيامـــة) بخاری ومسلم . واتە:ستەم کردن مایەی تاریکی و ڕێ دەرنەکردنە لە قیامەتدا . چونکە بڕوادار بە نووری ئیمان ڕێی بۆ ڕۆشن دەبێتەوە , بەڵام ستەمکار بڕواکەی ناتەواوەو لاوازە وڕێگای بۆ ڕوونـاك نابێتـەوە و ئەگەر چاکەشی کردبێت دەدرێت بە ستەم لێکراوان .

ب) (إن الله ليملي للظالم حتى إذا أخذه لم يُفلتــه) بخاري ومسلم .واته: به ڕاستی خوا مۆڵەتیێ ئەدات بە ستەمکاران , بەلاّم کەگرتنی بەرەلاّیان ناکات و نایەلّێت قوتار بێن .

ج) ئامۆژکاری معاذی کوڕی جەبەلی کرد کاتیێ ناردی بۆ یەمەن و پێی فەرموو (واتقِ دعوة المظلوم فإنه ليس بينها وبــين الله حجــاب) بخاري ومسلم . واته: خۆت بپارێزە لەدوعا و نزای ستەملێکراو , چونکە لەنێوان ئەو دوعایەو خوادا پەردە نیەو یەکسەر گیرادەبێت .

د) (إياك ودعوة المظلوم ، فإنما يسأل الله حقه ، وإن الله لايمنع ذا حق حقه) البيهقي . واته: خۆت بپارێزە لەدوعا و نزای ستەملێکراو , چونکە بەڕاستی ئەو ستەملێکراوە داوای هەقی خۆی دەکات و بەڕاستی خواش مەنعی هیچ خاوەن هەقێك ناکاتِ لەهەقەکەی.

هەروەها دەفەرموێت (دعوة المظلوم مستجابة وإن كان فاجراً ، ففجوره على نفــسه). بخــاري , واتــە: دوعــاو نــزای ســتەملێکراو وەلاّم ئەدرێتــەوە ئەگــەر ســتەملێکراوەکە خراپەکاریش بێت , چونکە ئەو کەسە خراپیەکەی بۆ خۆیەتی و پەیوەندی نیە بەو ستەمەی کە لێی کراوە .

و) (من كان عنده مظلمة لأخيه من عرضه أو من شيء فليتحلله منه اليوم ، قبــل أن لايكون دينار ولا درهم , إن كان له عمل صالح أُخذ منه بقدر مظلمته , وإن لم تكن له حسنات أُخذ من سيئات صاحبه فحُمل عليــه). بخاري, واته: هەرکەس هەقی یەکێکی بەسەرەوەیەو ستەمێکی لەیەکێك کردووە , با تا دنیای ڕوونەو دینار و درهەم هەیە گەردنی خۆی پیێ ئازاد بکات , چونکە لە قیامەتدا هەقی هەرکەسێ بەسەرەوە بێت , لەچاکەکانی هەلّدەگیریێ و دەدریێ بە ستەملێکراوەکە , ئەگەر چاکەشی نەما لەخراپەکانی ستەملێکراو هەلّدەگیریێ و دەدریێ بەسەر ئەمەدا .

ه) غەش کردن و ناپاکی و لادانی هەرشتێك لە غەنیمەتیش ستەمەو سزای سەختی لەسەرە و بەخۆی وئەو شتە دزراوەوە لە قیامەتدا دەهێنرێت کە بەکۆلّیەوەتی و مەحکەمە دەکرێت . (ص) دەفەرموێت (لا الفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته بعير له رغاء , فيقول: يارسول الله أغثني , فأقول لاأملك لك من الله شيئا قد بلغتك لا الفين

أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته فرس لها حمحمة فيقول: يارسـول الله أغثنـي , فأقول: لاأملك لك من الله شيئا قد بلغتك , لا الفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته صامت , فيقول يارسول الله اغثني , فأقول: لاأملك لك من الله شيئا قد بلغتك) .. **واته: نـەتان بیـنم لەقیامەتـدا یـەکێکتان بێـت و حوشـترێکی بـە کۆڵـەوە بێـت و بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـوا فریـام بکەوە منـیش پێـی دەڵـێم: نـاتوانم هیـچت بـۆ بکـەم لای خـوا , مـن لـەدنیادا تـەبلیغم کـردی و ئاگـادارم کـردی , نـەبینم یـەکێکتان بێـت لـەڕۆژی قیامەتـدا ئەسپێك بە کۆڵێکەوە حیلەی بێت و , بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا: فریامکەوە , منیش پێی دەڵێم: هیچم بۆ ناکرێ لای خوا بۆت , من لەدنیادا تەبلیغم کردی , نەبینم لەقیامەتدا یەکێکتان بێت و شتێکی بێ دەنگی بەکۆڵەوە بێت و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام بکەوە , منیش پێی دەڵێم: ناتوانم هیچت بۆ بکەم لای خوا , من لەدنیادا تەبلیغم کردی .**

**دوعای ستەملێکراو**

**ستەم ئازاری دەروونی ستەملێکراو دەدات و بەکوڵ و دڵ دوعا لەستەمکار دەکات , یەکێ لەپاشاکانی فارس مامۆستایەك بۆ کوڕەکەی دەگرێت , تا بەچاکی پەروەردەی بکات و ئامادەی بکات ببێتە پاشای دواڕۆژ , ڕۆژێك مامۆستاکە زۆر لەکوڕی پاشا دەدات بە ناهەق , کوڕیش هیچی دەسەڵات نابێ بیکات بەرامبەری‌و زۆر دەروونی ئازار دەدات .. کاتێك باوکی دەمرێت و دەبێتە پاشای وڵات , دەنێرێ بەدوای مامۆستاکەی‌دا و پێی دەڵێت: فلان ڕۆژ بۆ بەناهەق ئاوا لێت دام و ئازارت دام , ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە تۆڵەت لێ‌بسێنم , ئەویش دەڵێ: ویستم تێت بگەیەنم کە ستەمکردن چەند ناخۆشە , تا ئازارەکەی بچێژیت و هەرگیز ستەم نەکەیت .**

**کاتێك کەسێکی ستەملێکراو دوعا دەکات لەستەمکار پەروەردگار یان یەکسەر یان پاشماوەیەك کارەکەی بۆ جێ‌بەجێ دەکات و لەفەرموودەدا هاتووە کەخوای پەروەردگار دەفەرموێت** (وعزتي وجلالي لأنصرنك ولو بعد حين) **بە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆم , سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەکی تریش بێت.. جاری وا هەیە خوا لەبەر حیکمەتێك سزای ستەمکار دوا دەخات , کە ئێمەی بەندەی هەست و هۆش سنووردار نازانین بۆچی‌یە و لەبەر چی‌یە , ئاشکراشە خوای گەورە کەس ناتوانێ موحاسەبەی بکات و بڵێ**

بۆ وایەو بۆ وانیە , وە تەنها ئەوە کە دەتوانێت بە دەسەلاتی خوایەتی خۆی لەهەموو کەس بپرسێتەوە (لایُسأل عما یفعل وهم یُسألون) الانبیاء ٢٣ .

## نزاکەی ئیمام ئەحمەد

کاتێك ئیمام ئەحمەد لەسەر مەسەلەی (خلق القرآن) گیرابوو , وەزیرێك بەناهەق شەقازڵەیەکی لێدا , ئەویش دوعای لێکرد وتی: خوایە من مەزلومم و هەقم بسێنە بەوەی کە لەلاشەی خۆیدا بەندی بکەی .. بەڵێ خوای گەورە نزاکەی وەرگرت و ئەو وەزیرە پاش ماوەیەك لایەکی تووشی ئیفلیجی بوو , زۆر بێزارو نارەحەت بوو بوو , دەیووت: لایەکم ئەگەر پارچە پارچە بکرێت بەخۆی نازانێت ولایەکیشم ئەگەر مێشێکی پێوە بنیشێ وا دەزانم شاخێکی بەسەرا کەتووە .

## شێخ ئیبراهیم الحسان

لەچەند مانگی پاش ئازادکردنی عێراق , وەفدێکی کوەیتی هاتن بۆ بەغداو چاویان بە وتارخوێنی مزگەوتێکی بەغدا کەوتبوو کە ناوی (شێخ ئیبراهیم الحسان)ە , شێخی ناوبراو ڕووداوێکی بۆ گێڕابوونەوە , کە نموونەی دوعا قبولْ بوونی ستەم لێکراوەو وتبوی : من خەڵکی بەسرەم و لەو شارە وتارخوێن بووم لە مزگەوتێکدا , لەیادی لەدایك بوونی [handwritten: مسلمین]دا لەنەوەدەکاندا هۆنراوەیەکی (ولید الأعظمی)م خوێندەوە , کە دەڵێ: (إسلامنا نور لمن یهتدي إسلامنا نار لمن یعتدي)واتە ئیسلامەکەمان نوورە بۆ هرکەسێك هیدایەت وەرگرێت وئیسلامەکەمان ئاگرە بۆ هەرکەسێك دەست درێژی بکات ، تا دەگاتە ئەو دێڕەی کەدەڵێ : ئێمە بەغەیری پێغەمبەر ئیقتیدا بەکەس ناکەین .. پاش تەواوبوونی یادەکە ڕاپۆرتیان لەسەر نوسیم و گیرام لەلایەن ڕژێمەوە .. پاش ئازار و چەرمەسەریێیەکی زۆر ڕزگارم بوو، پاشان ساڵی١٩٩٤ گواستیانمەوە بۆ بەغدا , لەیەکەم وتارمدا باسی زوڵم و ستەمم کرد , یەکێ لەئامادەبوان کە لەسەر کورسیێیەکی کەم ئەندامەکان دانیشتبوو تا لە وتارەکەم بوومەوە گریا ..

پاش نوێژ کوڕەکەی نارد بۆلام و وتی: باوکم حەز دەکات سەردانێکی ماڵمان بکەیت , منیش هەرچەند وتم: زۆر سەرقاڵم و کاتم نیە سوودی نەبوو .. ئیتر ناچار چووم بۆ ماڵیان و پاش بەخێر هاتن , بە کوڕەکەی وت: ئەو چادرە لابەن لەسەر ئەو ئۆتۆمبێلە لە گەراجەکەدا .. کەلایان برد سوپەرێکی سپی مۆدێل١٩٨٢بوو کە ڕەقەمی کوەیتی پێوەبوو

.. وتم: مەسەلەی ئەم سیارەیە چیەیە؟ کابرای خاوەن ماڵ وتی: من لەساڵی (١٩٩٠)دا لیوابووم لە سوپای عێراقیدا و کاتێك کوەیتمان داگیر کرد , من تەفتیشی بازگەکانم دەکرد لەنێوان عێراق و کوەیت دا , ڕۆژێك ئەم ئوتۆمبێلەم بینی بەدەست لاوێکەوە بوو چەند ئافرەتێکیشی تیابوو , حەزم لێکرد و بەپاسەوانەکانم وت: شەڕ بەو شۆفێرە بفرۆشن , ئەوانیش گێچەڵەیان پێکرد و بوو بەدەمەقاڵێیان و منیش چووم , کوڕەکەم دایە بەرشەق و زللە و زۆرم لێدا تا لەسەر شۆستەکە بورایەوە .. ژنەکان دابەزین بەگریان و زریکەو منیش دەستڕێژێکم کرد بەسەریاندا تا بترسن , ئینجا سەیارەکەمان لێسەندن و هێنامانەوە , پیرێژنێکیان دوعای لێکردم و وتی: یاخوا توشی ئیفلیجی ببیت و لەدنیا و قیامەتدا لەخۆت نەحەسێیتەوە ..

خوا ئاگادارە پاش چەند ڕۆژێك تووشی پشت یەشە بووم و دواتر قاچی چەپم سڕبوو , بەپەلە بردیانم بۆلای باشترین پزیشکی پسپۆری بەغدا , پاش فەحس کردن , بڕیاریان دا نەشتەرگەری بڕبڕەی پشتم بۆ بکەن .. بەڵێ نەشتەرگەریان بۆکردم و نەجاحەتی نەهێنا و تووشی ئیفلیجی بووم و لەوساوە لەسەر ئەم کورسی کەم ئەندامەم و ئەزانم ئاهی ئەو پیرێژنەیە گرتوومی ، تەوبەم کردووە و دەمەوێ ئوتومبێلەکەشیان بۆ بگەڕێنمەوە , ئیتر نازانم چۆن دەستم پێیان بگات و بیاندۆزمەوە .. جا کە تۆ وتارتدا زانیم لەهجەکەت بەسراویەو , دیارە خەڵکی بەسرەش تێکەڵاویان هەیە لەگەڵ کوەیتیەکاندا , بەڵکو لەبەر خوا سۆراخێکم بۆ بکەیت و سەیارەکەیان بۆ بگێڕینەوەو گەردنم ئازاد بکەن ..

شێخ ئیبراهیم دەڵێ: منیش پێم وت: ئاخر کێ ئەوێرێ پەیوەندی بکات بە کوەیتیەکانەوەو تەلەفۆنیان بۆبکات , دیارە حکومەت بەشتی وابزانێ سزای قورسی لەسەر ئەدات .. ئیتر هەموو هەینییەك کوڕەکەی دەنارده لام دەیووت: باوکم دەڵێ: بە قوربانە چی بۆکردووین ؟ منیش دەمووت : بەخوا هیچم بۆنەکراوە , ئەمە ساڵێکی خایاند , تا لەساڵی١٩٩٥دا بۆ کارێکی خۆم سەردانێکی بەسرەم کرد و کەویستم بگەڕێمەوە بۆ بەغدا چەند سەعاتێك لە نەقلیات چاوەڕێم کرد سەیارەیەکی بەغدام دەست نەکەوت .. برادەرێك کە منی ئاوا بینی وتی: یاشێخ فلان کەسی گەڕەکی خۆمان سەیارەی پێیە و دەچێت بۆ بەغدا بۆ لەگەڵ ئەو ناچی , منیش وتم: زۆر باشەو ئیتر ڕۆیشتم برادەرەکەم دۆزیەوەو لەگەڵی سواربووم بەرەو بەغدا , دیارە ڕێگەیەکی دوورو

درێژه و كەوتینه گفتوگۆ , برادەرەكە وتی: مامۆستا هەرچەندە ئەم سەیارەیە زۆر باش نیەو لایەق بەجەنابتان نین , چیبكەین خوابیانگرێت سەیارەیەكی باشمان هەبوو ئەو زاڵمانە لێیان سەندین , منیش پێم وت: قەت ناشێ سەیارەكەت سوپەرێكی سپی مۆدێلی١٩٨٢ی ڕەقەم كوەیت بێت , برادەرەكە هەر ئەبلەق بوو , وتی: یاشێخ دەڵێی كەراماتت هەیە ؟ وتم: نا كەراماتم نیە , وەرە بتبەم بۆلای سەیارەكەتان ..

ئیتر بردم بۆ ماڵی لیواكە و سەیارەكەی دایەوەو وتی: بەڵكو تەلەفۆن بكەی بۆ نەنكت لە كوەیت تا گەردنم ئازاد بكات , كوڕەش وتی: كێ دەوێرێ لەعێراقەوە پەیوەندی بكات بە كوەیتەوە ..

كابرای لیوا وتی: باشە پەساپۆرتت بۆ تەرتیب دەكەم و لەسەر حسابی من بچۆ بۆ (عەممان) و لەوێوە تەلەفۆن بكە .. بەڵێ.. پاش ماوەیەك هەموو شتێكیان بۆ ئامادەكرد و چوو بۆ عەممان و تەلەفۆنی كرد بۆ كوەیت و بەنەنكی وت: نەنە خوا كردی وا سەیارەكەمان دەستكەوتۆتەوەو كابرای لیوا تووشی ئیفلیجیبووەو داوای گەردن ئازادی دەكات , نەنكیشی ئەوەندەی تر دوعای لێكردو وتی: گەردنی ئازاد نەبێت و خوا لەوە خراپتری لێبكات .. كوڕە كە گەڕایەوە بەغدا لێمان پرسی ها چی بوو ؟ وتی: بەخوا چی خەریك بووم لەگەڵیا , گەردنی ئازاد نەكرد , منیش پێم وت: ئاخر كوڕی باش چۆن ئیش وا دەكرێ , ئەبوایە هەندێ فەزڵی عەفوكردن و لێخۆش بوونت بۆ باسكردایە و ئینجا داوای گەردن ئازادیت لێبكردایە .. ناچار جارێكی تر لەسەر حسابی (لیوا)كە چووەوە بۆ عەممان و ئینجا بەجۆرێكی تر قسەی لەگەڵ نەنكی كرد تا ڕازیبوو گەردنی ئازاد بكا.

خوا ئاگادارە پاش دوو هەفتەیەك كابرای لیوا بەرەوچاكی ڕۆیشت و لەسەر عەرەبانەكە هەستا و ئێستا بەگۆچان دێت بۆ مزگەوت بەپێی خۆی .. (ئەم ڕووداوە لە ڕەمەزانی ٢٠٠٣ , دكتۆر محمد عوضی لە بەرنامەكەی (صور وخواطر)دا باسی كرد).

**سەرچاوەکان**

١- روائع اقبال -الندوى

٢-محاضرات اسلامية في الفكر والدعوة - الندوي مجلد ١

٣- رۆژنامەی یەکگرتوو ژ- ٤٦٤

٤-ايات قرانية في مشكاة العلم -د . يحيى المحجري

٥-العلم طريق الايمان -الزنداني

٦-التصميم في الطبيعة - هارون يحيى -ترجمة -اورخان محمد علي

٧- خديعة التطور - = - = - = - سليمان بايبارا

٨- التضحية عند الحيوان- = = - = - مصطفى الستيتي

٩- المعجزات القرانية - = = - = - اورخان محمد علي

١٠-دراسات قرانية -الندوي -

١١-الخطب المنبرية - محمد الحسان

١٢- الاساس في التفسير - سعيد حوى

١٣- برنامج / صور و خواطر -د.محمد عوضي -الفضائية الكويتية

١٤- برنامج / اسلام بلا حدود - زغلول النجار - المحور

١٥ - بيوت الانبياء -جاسم المطوع -اقرأ

١٦ - الانترنيت - اسلام ئون لاين و موقع التسابيح

١٧- وتارى / وفى انفسكم افلا تبصرون/ د. عبدالحميد القضاة

١٨- برنامج / اوراق / د. محمد موسى الشريف / قناة اقرا

## ناوەڕۆك

## پێشەکی

بەرنامەیەك کەخوا ناردبێتیوپەڕاوێك کە خوا بە(عزین)ناوی ببات (وإنه لكتاب عزيز) فصلت ٤١ , بانگخوازانێکیش کەپشتیان بە خوا بەستبێ و کاروفرمانیان دابێتە دەست خوا (فوضت امري اليك ووجهت وجهي اليك,والجأت ظهري اليك ,لاملجأ ولا منجى منك الا اليك ) و, خواش پشتگیریان بێ ودەستی پێیانەوە بێ ( ومن يتوكل على الله فهو حسبه )الطلاق٣ ، هەرکەس پشت بەخوا ببەستێخوایبەسە ٠٠دیارە ئەو بەرنامەیە وئەو بانگخوازانە کاریگەریان دەبێت لە واقیعی ژیاندا و دلآن کەمەندکێش دەکەن بەرەو هەق و ڕاستی ..لەم لاشەوە کە دوژمنان ئەوە دەبینن چاویان بەرایی نایەو , پڕو پاگەندەیان بۆ دەکەن ، دوژمنان دەیان وت ئەوە جادوەو خەڵکی لە خشتە دەبات و چاو بەستیان لێدەکات , قورئانیش فەرمووی (افسحرٌ هذا اَم انتم لا تُبصِرون ) الطور ٥١ ، ئاخر ئەمە سیحرو جادووە ؟! یان کوێرایی بە چاوتانا هاتووە !! نا چاویان هەیە ,بەلآم نایانەوێ ببینن ونایانەوێ دان بنێن بەهەق وڕاستی دا , چونکە چاوی دڵیان کوێرە و شەیتان دڵیانی داگیر کردوە (انها لا تعمى الابصار ولكن تَعمى القلوب التي في الصدور ) الحج٤٦

کافران گورج و خێرا بوون لە کفرو خراپەکردندا و , هەندێکیان سەرو ماڵیشیان بەخت دەکرد , ئەمەش پێغەمبەری (ص) خەمبار کرد , بۆیە پەروەردەگار دڵنەوایی کردو پێی فەرموو: (ولا يَحزنك الذين يسارعون في الكفر , انهم لن يَضرُوا اللهَ شيئا يريد الله الا يجعَل لهم حظاً في الاخرة ,ولهم عذاب عظيم ) ١٧٦ال عمران واتە ئەی پێغەمبەر (ص) ئەوانەی کەپێشبڕکێ دەکەن لە کفرو بێباوەڕیدا خەمبارت نەکەن ,چونکە بەڕاستی ئەوانە هەرگیز هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنن ,خوا دەیەوێت هیچ بەشێکیان لە قیامەتدا پێنەبەخشێت , سزای سەخت وناسۆریش بۆیان ئامادەیە ..هەروەها دەفەرموێت ( ان الذين كفروا يُنفقون اموالهم ليصدوا عن سبيل الله ، فسيُنفقونها ثم تكون عليهم حسرة ثم يُغلَبون ، والذين كفروا الى جهنم يُحشرون ) الانفال ٣٦

لەمەوە تێدەگەین کە لە کێشمەکێشی نێوان هەق و ناهەقدا کافرانیش ماڵ و سامان سەرف دەکەن و ، قوربانی دەدەن و ماندودەبن و دان بە خۆیانا دەگرن, لەکاتێکدا کە تەنها دنیایان هەیەو بڕواداران دنیاو ئاخیرەتیان هەیە ٠٠ئەگەر ئەوان ئاوابن بۆ ناهەقی خۆیان لەپێناوی دنیادا، ئەی دەبێ بڕواداران چۆن بن لە هەوڵ و کۆشش و قوربانی دانیاندا بۆ بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خواو دەست کەوتنی دنیاوئاخیرەت ؟؟..

قورئانیش ئەمە دەخاتە بەرچاوی بڕواداران و لەپاش غەزای ئوحد دەفەرموێت (ولا تهنوا في ابتغاء القوم إن تكونوا تألمون فانهم يألمون كما تألمون وترجـون مـن الله مـالا يرجـون )النساء/١٠٤ واتە : سست و لاواز مەبن و کەم تەرخەم مەبن لە ڕووبەڕووبوونەوەی کافراندا ,خۆ ئەگەر ئێوە ئازارو ئەشکەنجە و ناڕەحەتیتان هەبێت ئەوانیش وەك ئێوە دەیان بێت , لەکاتێکدا ئێوە چاوەڕێی پاداشتی خوان و ئەوانیش چاوەڕێی سزایخوان ٠٠

کافران پیلان دادەنێن , پیلانێك کە شاخ لەبن دێنێ ؟!(وقد مكروا مكـرهم وعنـدالله مكرهم وإن كان مكرهم لتزول منه الجبال ) ابراهيم/٤٦ ئەگەر کافران بەرێبازی ناهەق و دنیا پەرستیانەوە بتوانن پیلانی ئاوا دابنێن , ئیتر چۆن ئەهلی هەق ودۆستانی خوا و, شوێن کەوتوانی بەرنامەکەی بەپشتیوانی خوا پیلانی مەحکەم و کاریگەر دانەنێن و گورج و گۆڵ و گەرم و گوڕ نەبن لەپێناو گەیاندنی هەقدا ٠٠ئالێرەوە جارێکی تر ژیانەوە بەشی سێیەم دێتەوە خزمەت خوێنەرانی بۆ تیشك خستنە سەر کۆمەڵێ چەمکی ئیمانی و ئامارەکردن بۆ هەوڵ وکۆششی پێغەمبەر (ص)بەتایبەتی و بانگخوازان بەگشتی , سا بەڵکو گوڕوتینێکی نوێمان بۆ بگەڕێتەوە و بتوانین بەرنامەی بێوێنەی قورئان بگەیەنین بە سەرتاسەری جیهاندا ٠٠٠

## بانگخوازی ماندونەناس

ئەگەر بانگخوازیپلەو پایەیەکی یەکجار بەرز و چاکترین قسەو گوفتاربێت کە کەسێك بیکات و مایەی ڕەزامەندی خوا بێت ,ئیتر بۆچی بانگخواز منەت بکاو هەست بە ماندویەتی بکات ؟!

هەرکات چاو بە ئایەت وفەرمودە پیرۆزەکاندا بگێڕین , گەورەیی بانگخوازیی تێدەگەین , ئەوە قورئانە دەفەرموێت (ومن أحسن قولا ممن دعا الى الله وعمل صالحاًوقال انني

من المسلمين )٣٣فصلت ، پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت (ان الله ومـــلا ئكتـــه واهـــل السماوات واهل الارض حتى النملة فى جُحرها وحتى الحيتان ليُصلون على معلمـــى النـــاس الخيـــر )باشە کەسێك خوای گەورەی بالأدەست ڕەحمەت وبەرەکەت ببارێنێ بەسەریاو مەلا ئیکەتەکان مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ چەندن دوعا و نزای خێر بکەن بۆی و چی لە ئاسمانەکان و چی لە زەویدایە , تەنانەت مێرووله , تەنانەت حوتیش دوعای خێری بۆ بکەن , ئیتر چی دەویّ ؟چۆن شەوو ڕۆژ ناخاتە سەریەك تا ئەو پلە بەرزەی دەست بکەوێت

خوای گەورە(مقدم )و (مؤخر )ە وهەرئەوە کەدەتوانێ بتباتە پێشەوە و پایەبەرزت بکات ,هەرئەویش دەتوانێ بتخاتە دواوە و نەیەلّێ سەر زیاد بکەیت، بۆیە بانگخواز هەموو هۆکارێك دەگرێتە بەرو ئینجا بەدلّیش پشت دەبەستێت بەخواو لێی دەپارێتەوە کاری بۆ ئاسان بکات و دەست بداتە بالّی، یان سەرکەوتن یان شەهادەتی پێببەخشێ وهەمیشە چاودەخشێنێ بەکارەکانیاو بەخۆیدا دەچێتەوە تاکارەکانی چاکتر بکات وکەموکورپیەکانی نەهێلّێ ٠٠

**هەرتۆم لێ نەڕەنجێ ی هیچم ناوێ !**

ئەوەی باسمان کرد لەژیاننامەی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەر رەوە سەردارو سەروەرماندا دەیبینین ...بۆ نموونە

لەشەوالی سالّی (١٠)ی پێغەمبەرێتیدا , پێغەمبەر (ص)بەرەو ( طـــائف)دەرچوو ، ئەم شارۆچکەیە (١٠٠)کم لەمەککەوە دوورە , بەپێ لە هەردووسەرەوە ماوەکەی بڕی , (زید)ی کوڕی (حارثة)ی غولأمی لەگەلّدا بوو , لەڕێگەدا بەلای هەر خێلّێکدا بگوزەرایە بانگی دەکردن بۆ ئیسلام , کەسیان بەدەمیەوە نەهاتن , کە گەیشتە (طـائف) چووە لای سێ برا لەخێلّی (ثقیـف) ,کە بریتی بون لە (عبد یالیل) و (مسعود) و (حبیب) کوڕی (عمرو)ی کوڕی(عمر) ی (ثقفـــي)٠٠ لەگەلّیان دانیشت و بانگی کردن بۆ ئیسلام یەکێکیان وتی :ئەگەر خوا تۆی ناردبێت شەرت بێ پۆشاکی کەعبە بدڕێنم , ئەوی تریان وتی: خوا کەسی نەدۆزیوەتەوە تۆ نەبێت ؟ سێیەمیشیان وتی بەخوا هەرگیز قسەت لەگەلّ ناکەم , ئەگەر تۆ پێغەمبەریت لەوە گەورەتریت کەمن ڕەتی قسەی تۆ بدەمەوە ,

ئەگەر لەگەڵ خواشدا درۆ بکەیت پێویست ناکا قسەت لەگەڵدا بکەم , ئیدی پێغەمبەری خوا (ص) فەرمووی : ئەگەر ئەوەی دەتانەوێت بیکەن ئەوا تکاتان لێ دەکەم ئاشکرام مەکەن ..

پێغەمبەر (ص) دە ڕۆژ لەناویاندا مایەوە و پیاو ماقوڵ نەما نەڕواتە لای ,پێیان وت: ئەوە برۆ دەرەوە , ئینجا هەرزەو نەفامەکانیان لێ هاندا ، کەویستی بگەڕێتەوە , نەفام و کویلەکان کەوتنە دوای بە جنێودان و هاوار لێکردن , خەڵکی کۆبونەوە و بەدوو ڕیز بۆی وەستان و کەوتنە بەرد باران کردنی و قسەی ناشرینیشیان پێدەوت , قاچیان دایە بەربەرد , هەتا نەعلەکانی پڕبوون لەخوێن و(زید)یش خۆی دەدایە بەری , هەتا بەردێك بەر سەری کەوت و شکاندی .. بەشوێنیەوە بوون هەتا ناچار بوو خۆی بکات بەباخێکی (عتبە)و (شیبە)ی کوڕانی (ربیعە)دا,کە(سێ)میل لە (طـائف)ە وە دوورە ( واتە :پێنج کیلۆمەتر ),کەچوە ناو باخەکەوە ئەوان گەڕانەوە!!..

پێغەمبەر (ص) چووە ژێر دار مێوێك , لەژێر سێبەرێکدا پاڵی دا بە دارێکەوە , کە هێورو ئارام بووەوە , نزا بەناوبانگەکەی کرد کەپڕیەتی لە خەمی دڵ وبێتاقەتی دەرهەق ئەو مامەڵە خراپەی توشی هات و , بێزار بونی لەدەست باوەڕ نەهێنانی هیچ کەسێك پێی , فەرموی (اللهم انيِ اَشكو اليكَ ضعف قوتيِ,وقلةحيلتيِ, وهوانيِ علىَ الناس,يا اَرحم الراحمين ,اَنت ربُّ المستضعفين ,وانت ربيِ,الى من تكلنيِ؟الى بعيد يتجهمنيِ ,اَم الى عدو ملكته اَمرى ,اِن لم يكن بك علىَ غضبَ فلا أُبالىِ , ولكن عافيتك هيِ اَوسع لـي أعوذ بنور وجهك الذيِ اَشرقت له الظلمات وصلُح عليه امرُ الدنيا والاخـرة ,مـن ان تنزلَ بيِ غضبك اَويحل علىَ سخطك , لك العُتبى حتى ترضى, ولا حول ولا قـوة الا بك) واتە : خوایە , شکاتی لاوازی و کەم توانایی وبێدەسەڵاتیم بەدەست خەڵکەوە لای تۆ دەکەم , ئەی بەبەزەیترینی هەموو بەبەزەییەکان , تۆ پەروەردەگاری چەوساوەکانیو , تۆ خاوەنی منی , بەکێم دەسپێریت ؟ بەدوورە کەسێك ئازارم بدات , یان بە دوژمنێك کارت داوە دەست ؟ ئەگەر تۆم لێ نەڕەنجێیت من باکم نیە , بەڵام بێ وەیێکردنی تۆ بۆ من دڵگوشادترە , پەنادەگرم بەنووری ڕووی پیرۆزی تۆ کە هەموو تاریکستانەکانی ڕووناك کردۆتەوە و, کاروباری دونیا و ئاخیرەتی لە سەر دامەزراوە لەوەی کە تووڕەیی

خۆتم بەسەردا داباریٚنیت , یان خەشمت بمگریٚت ، ڕازو نیاز هەربۆلای تۆیە هەتا ڕازی دەبیت , هیچ تواناو دەسەلأت و جولەیەك نیە مەگەر بەیارمەتی تۆ ٠٠

بەلیٚ. پێغەمبەر (ص)کەماموٚستای مرۆڤایەتی‌یەو ئیمامی پێغەمبەرانە سەلامی‌خوایان لیٚبیٚت , بەپیٚ (١٠٠) کم بەدەشت و دۆلٚ و هەردو چۆلەوانیدا دەبریٚت , سەرباقی هیلاکی و ماندووبوون بەلای هەر خیٚلیٚکدا ڕۆیشتووە بانگی کردوون بۆ ئیسلام و هەرچەند کەسیان وەلأمیان نەداوەتەوە , کۆلیٚ نەداوە و بیٚزار نەبووە .پاشان دە ڕۆژی ڕەبەق لەناو طائف دا هەولەکانی بەری نەگرت و زۆر بە ناشرینی وەلأمیان دایەوەو تەنانەت بەردبارانیشیان کردو پیٚنج کیلۆمەتر بە دوایەوە بوون و ئازاریان دا !

لە دوعاکەشیەوە لوتکەی بەنڎایەتی و خواپەرستیمان بۆ دەردەکەویٚ ,کەچۆن بەکولٚ و دلٚ دەپاریٚتەوە و تەنها شکات لای خوای بالأ دەست دەکات و دەترسیٚت کەم وکورتی‌یەکی هەبیٚت و بووبیٚتە مایەی غەزەبی خوا ! هەروەها هەموو مەبەستی ڕەزامەندی خوایە و دەفەرمویٚت :تەنها تۆم لیٚ نەڕەنجیٚیت باکم نیە و چی دەبیٚت بابیٚت..

**موسلمان بوونی عەداس :**

کە هەردوو کوڕەکەی ڕەبیعە بەو شیٚوەیە بینیان بەزەییان پیٚدا هاتەوە , غولأمیٚکی نەسرانیان هەبوو, ناوی (عداس)بوو , بانگیان کرد , پیٚیان وت :برۆ هیٚشویەك لەو تریٚیە ببە بۆ ئەو پیاوە , کە بردی و داینا لەبەردەم پیٚغەمبەردا (ص) بسم اللەی کردو دەستی کرد بە خواردنی , عداس وتی: خەلکی ئەم شویٚنە ئەو وتەیە بەکارناهیٚنن..

پیٚغەمبەر (ص) فەرمووی : تۆ خەلکی کویٚیت و چ ئاینیٚکت هەیە ؟

وتی :نەسرانیم و خەلکی (نینوی)م ,پیٚغەمبەر(ص) فەرمووی :خەلکی شاری پیاوە چاکەکەیت (یونس)کوڕی (مەتی)؟ وتی :تۆ چوزانیت (یونس)کوڕی (مەتی) کیٚیە ؟

پیٚغەمبەر(ص) فەرمووی :ئەو برای منەو پیٚغەمبەر بوو , منیش پیٚغەمبەرم..

ئینجا عەداس کەوت بەسەر دەست و قاچیاو کەوتە ماچکردنی ، کوڕەکانی (ربیعە)ش یەکیٚکیان بەوی تریانی وت:ئەوەغولأمەکەشی لیٚ هەلگیٚڕاینەوە ..

کەعداس هاتەوە پیٚیان وت :دایکت ڕۆلە ڕۆت بۆ بکات ئەوە چی‌یە ؟؟

وتی :گەورەم , لەسەر زەمیندا لەم پیاوە باشتر نیە , بەڕاستی هەوالیٚکی پیٚداوم جگە لە پیٚغەمبەر کەس نایزانیٚت ٠٠ پیٚیان وت:دایکت ڕۆلە ڕۆت بۆ بکات عەداس , نەکەیت لەئاینەکەت وەرت بگیٚڕیٚت , ئاینەکەی خۆت باشترە لە ئاینەکەی ئەو

ئەمەش یەکەم دڵنەوایی بوو بۆ پێغەمبەر (ص)کە کەسێکی نەسرانی خەڵکی نەینەوا موسڵمان بوو لەسەر دەستیا) ..

## دڵفراوانی تا دوا پلە

پێغەمبەری خوا (ص) پاش دەرچوونی لەباخەکە بەدڵشکاوی و خەمباری یەوە بەرەو مەککە گەڕایەوە تا گەیشتە (قرن المنازل) ، بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە :

جارێکیان عائشەپرسیاریکردلە پێغەمبەر (ص)کەئایاڕۆژی ناخۆشتروخراپترت بەسەر هاتوە لەڕۆژی ئوحود؟!ئەویش لەوەڵامدا فەرموی :خراپترین شتێك کە بینیم ڕۆژی عقبە)بوو, کەچوومە لای (عبد یالیل)ی کوڕی (عبد کلال)وبە هیچ شێوەیەك بەدەممەوە نەهات , ئیتر بەکۆمەڵێك خەم و خەفەتەوە دەرچووم , لە ( قرن المنازل ) نەبێت هۆشم نەهاتەوە , سەرم بەرز کردەوە بینیم هەورێك سێبەری بۆ کردووم ، لێی وردبوومەوە , سەیر دەکەم جوبرائیلی تیایە , بانگی لێکردم , فەرمووی :خوای گەورە گوێی لە وتەکانی گەلەکەت بوو کەپێیان وتی ، ئەوە خوای گەورە فریشتەی بۆ ناردویت بۆ ئەوەی بەخواستی خۆت فەرمانی بەسەرا بدەیت ٠٠ ئینجا فریشتەی شاخەکان بانگی کردم و سڵاوی لێکردم ,پاشان فەرموی :ئەی محمد ئەوە منم ,چیت دەوێت , ئەگەر دەتەوێت ئێستا ئەو دوو شاخەیان بەسەردا دەهێنمەوە , منیش وتم :بەڵکو ئومێدەوارم خوای گەورە لەپشتی ئەمانە نەوەیەك بخاتەوە کە تەنهاخوای گەورە بپەرستێت و هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا نەکات (ل١٤٩ گوڵاوی سەرمۆر ) ... لەم وەڵامەوە کەسایەتی لەوێنە نەبووی پێغەمبەرمان بۆ دەردەکەوێ کەچۆن گوێ ناداتە ناخۆشی و نارەحەتی یەکانی و هیوای بەدواڕۆژوو نەوەی داهاتووە ٠٠

## موسڵمان بوونی پەری یەکان

پاشان پێغەمبەر (ص)ڕێی مەککەی گرتە بەر تاگەیشتە شیوی (النخلە )و چەند ڕۆژێك لەوێدا مایەوە , خوای گەورە چەند پەرییەکی نارد کە بڕوایان پێ هێنا، کە لە دووشوێنی قورئاندا باس کراوە ، لەسوورەتی (ئەحقاف)دا دەفەرموێ : (وإذ صرفنا إليك نفراً من الجنّ يستمِعون القرآن , فلما حَضَرُوُهُ قالوا : انصِتُوا فلما قُضِيَ وَلّــوا إلـــى

قومِهِم مُنذِرين , قالوا : ياقومنا إنا سَمِعْنا كتاباً أُنزِلَ مِن بعدِ موسى مُصَدِقاً لِما بين يَدَيهِ يهدي الى الحقِ وإلي طريق مستقيم , ياقومنا اجيبوا داعيَ الله وآمِنوا بِهِ يَغفِرْ لكم مِن ذنوبِكُمْ ويُجِرْكُم مَنْ عذابٍ أليم , ومَنْ لايُجِبْ داعِيَ اللهِ فليس بُمعْجِزٍ في الارضِ وليس لهُ مِن دونِهِ أولياء اولئكَ في ضلالٍ مبين )۳۲ / الاحقاف .

**واته : یادی ئەوە بکە کاتێك ئێمە دەستەیەك پەریمان لادایە لای تۆ , تا گوێ لە قورئان بگرن , ئەوسا کە ئامادەبوون بە یەکتریان وت : گوێ بگرن وبێ دەنگ بن , کاتێك قورئان خوێندنەکە تەواو بوو , پەری یەکان گەڕانەوە بۆناو هۆزو قەومەکەیان و دەستیان کرد بەئاگادار کردنەوەو بانگکردنیان بۆ پەیڕەوی کردنی ئەم ئاینە نوێ یە .**

**وتیان :ئەی هۆزو گەلی ئێمە , باوەڕ بکەن , گوێمان لە پەڕاوێك بوو کە لە دوای موسا نێردراوە , سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و ڕێکە لەگەڵیاندا و , ڕێنمایی و هیدایەت دەدات بۆ هەق و ڕاستە شەقامیڕاست ودروست .**

**ئەی خزمینە , بچن بەدەم بانگخوازی خواوە و بڕوای پێ بهێنن , ئەوکاتە لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت و لەسزای بە ئێش و ئازار دەتانپارێزێت ٠جائەوەی پێشوازی لەبانگخوازی خوا نەکات , ئەوە وەنەبێت لەدەست خوا دەرباز ببێت و خوا دەستی قودرەتی نەیگاتێ ، کەسیش ناتوانێت جگە لەخوا ڕزگاری بکات و پشتیوانی لێ بکات , ئائەوانە لە گومڕایىو سەر لێشێواوێکی زۆر ئاشکرادان ٠٠**

**لە سورەتی (الجن)یش دا دەفەرموێت** (قل أُوحى الِيَ انهُ استمَعَ نفَر من الجن فقالوا :انَا سَمعنا قراناَ عجباَ ,يهدي الىَ الرشدِ فآمنا به ولن نشرِك بربنا اَحدا ٠٠٠ واَنا ظننا اَن لَن نُعجِزَ في الارض ولَن نُعجِزَه هَرَباَ) الجن (١-١٢)

**واتە:ئەی محمد (ص) پێیان بڵێ :سرووشم بۆ هاتووە کە بەڕاستی دەستەیەك لە پەرىیان گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جاکە تەواو بووە وتویانە :بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەرسوڕهێنەرمان بیست , هیدایەت دەدات بۆ ڕێبازی ژیری و تێگەیشتن و ئێمەش باوەڕمان پێکرد و هەرگیز کەس ناکەینە هاوەڵ بۆ پەروەردگارمان.**

**ئینجا قورئان جەخت دەکاتە سەر ڕاستیەك کە ئەویش ئەوەیە :کەس ناتوانێ لەدەستی پەروەردەگار دەرچێت و کەس ناتوانێ لێی ڕابکات, هەروەك**

پەرییەکان دەرکیان بەم راستیە کردووە کە دەڵێن (وانا ظننا اَن لنَ نُعجِـزَ اللَّــه فـــي لارض ولنَ نُعجِزَه هرباَ).

لەسورەتی (ئەحقاف )یشدا هەمان راستی باسکرد , تاتێمان بگەیەنیٚ کەنە (ئینس) و نە (جن ) ناتوانن لەدەسەلاٚت و توانای خوا خۆیان قوتار بکەن ,مەگەر بەفەرمانبەری و گوێڕایەڵی بۆ پەروەردگار (ومَنْ لايُجبْ داعيَ الله فليس بِمُعْجِزٍ في الارض وليس مِن دونه أولياء اولئك في ضلال مبين)....

بەڵگەی لەبەرچاویش بۆ ئەمە ئەو سزایە بوو کەخوا ناردی بۆ خەڵکی (طــائف)ودایە دەست (ص) , کە لە زۆری میهرەبانیو دامەزراویخۆیەوە ,حەزی نەکرد خوا ژێرە و ژووریان بکات و لەناویان ببات..

بۆ تاقە ساتێکیش بیٚ هیوا نەبوو

ئەگەر بەوردی سەیری ژیاننامەی حەزرەت (ص)بکەین , بۆمان دەردەکەوێت کەبۆ تاقە ساتێکیش (ص)بیٚ هیوا نەبووەو هەمیشە دڵنیابووە لە سەرکەوتنی بەرنامەی خوا , ئەوەتا لە ناخۆشترین ڕۆژو لەسەختترین کاتدا , لەپێش ئەوەی بچێتە ناو مەککەوە زەید لێی پرسی : چۆن دەڕۆیتەوە بۆ ناویان لەکاتێکدا کە قورەیش دەریان کردویت ؟ ئەویش فەرمووی : ئەی زەید , ئەوەی تۆ دەیبینی خوا دەرووی خێر دەکاتەوەو پێغەمبەر و ئایینەکەشی سەردەخات ..

بەوەفایی

پێغەمبەری خوا (ص) کە لەمەککە نزیك بووەوە ,لە (حرا )مایەوە , پیاوێکی خێڵی (خوزاعە)ی نارد بۆلای (اخنس) ی کوڕی (شریق)تاپەنای بدات ,پەنای نەدا ,ئینجا ناردی بۆ لای (سهیل)ی کوڕی (عمرو)ئەویش ڕازی نەبوو , ئنجا ناردی بۆ لای (مُطعم )کوڕی (عدی),(مطعم)ڕازی بوو, کوڕەکانی و خێڵەکەی بانگ کردوو بەچەکەوە لەدەوری کەعبە کۆبونەوە و ڕایگەیاند کە (محمد)ی داڵدە داوەو کەس نابیٚ دەست بهێنێتە ڕێی , ئینجا هەواڵی نارد بۆ (ص)کەبێتە ناو مەککەوە هات تەوافی کەعبەی کردوو دوورکات نوێژی کرد و گەڕایەوە ماڵیٚ خۆی و, سەر لەنویٚ کەوتەوە هەوڵدان , تاپاش چەند ساڵێك لەشاری (یثرب)ە وە دەرگا لەبانگەوازەکەی کرایەوە ٠٠

**جا پێغەمبەری خوا (ص) هەمیشە پیاوەتیەکەی (مطعم)ی لەبەرچاو بوو , لە بارەی دیلەکانی بەدرەوە کە حەفتا کەس بوون فەرمووی : ئەگەر(مطعم)ی کوڕی (عدی)لەژیاندا بوایەو تکای بۆ ئەم دیلانە بکردایە هەموویانم بۆ بەردەدا ! کە بەڕاستی ئەمەش لوتکەی بەوەفایی و مەردایەتی یە ...**

## بانگخوازو پاڕانەوە لەخوا

**ئەگەر سەیری نزاو پاڕانەوەکانی حەزرەت بکەین (ص)بۆمان دەردەکەوێت کەگرنگی زۆری داوە بەنزاو پاڕانەوە , چونکە ئەوەش جۆرێکە لەعیبادەت .. پێغەمبەری خوا هەمیشە دەمی پیرۆزی پاراو بووە بەنزاو پاڕانەوە و یادی خوا , ئەوەتا کە شەو دەنووست دەیفەرموو :** ( اللهم اسلمت نفسي إليك , وفوضت امري إليك , ووجهت وجهي إليك , وألجأت ظهري إليك , لاملجأ ولا منجا منك إلا إليك , آمنت بكتابك الذي انزلت وبنبيك الذى ارسلت ).. **جا داوامان لێدەکات کەئەمە بخوێنین و , هەرکەسیش بیخوێنێت و بمرێت لەسەر فیترەت دەمرێت ..**

**بەهەمان شێوە سەیری دوعاکانی بەیانیان و ئێواران و شەونوێژی بکە , لوتکەی بەندایەتیت بۆ دەردەکەوێت کەحەزرەت (ص)گەیشتبوویە .. لەڕۆژی عەرەفەی حەجی ماڵ ئاواییدا بەجۆرێك پاڕاوەتەوەو هەژاری و بێ دەسەڵاتی و ئاتاجی زۆری خۆی بۆ خوا دەردەبڕێت کەجێی تێرامان و سەرنجە , کەدەفەرموێت :**

(اللهم انك تسمع كلامي , وترى مكاني , وتعلم سري و علانيتي ,لايخفى عليكَ شيء من أمري ,انا البائس الفقير ,المستغيث المستجر ,والوجل المشفق,المقرُ المعترف بذنوبي ,اسالك مسألة المسكين ,وأبتهل اليك ابتهال المذنب الذليل ,وأدعوك دعاء الخائف الضرير,مَن خضعت لك رقَبَتُهُ وفاضت لك عيناه , وذل جسده, ورغِم أنفه لك ,اللهم لا تجعلني بدعائك رب شقيا, وكن لي رؤوفاً رحيماً, ياخير المسؤلين وياخير المعطين )

**بەڕاستی هەرچەندە ئەم دوعایە دەخوێنم و بیری لێ دەکەمەوە , گەورەیی حەزرەتم بۆ دەردەکەوێ و وانازانم کەس هەبێ وەك ئەو پایەبەرزە هەژاری وبێ نازی و کەساسی و**

بێکەسی خۆی بۆ خوا بەیان کردبێ و پاڕابێتەوە .. ئەوەتا دەفەرموێ :خوایە لێت دەپاڕێمەوە هەروەك پاڕانەوەی کوێرێکی نابینای ترساو( وادعوك دعاء الخائف الضرير ) ، پاڕانەوەی چ کەسێك ؟! پاڕانەوەی کەسێك کە گەردنی بۆ خوا کەچ کردبێ و چاوانی فرمێسك بڕێژێ و دان بنێ بە کەمتەرخەمی و کەم و کورتی و گوناهەکانیا , ئەمە لەکاتێکدا کەخوا بە دەقی ئایەت پێی ڕاگەیاندووە لەگوناهی بەرودوای خۆش بووە !
( ليغفر لك الله ماتقدمَ مِن ذنبكَ و ماتأخر ويُتِمَ نعمتَهُ عليكَ و يهديكَ صراطامستقماً , وينْصُرَكَ الله نصراً عزيزاً )الفتح٣ ..

حەزرەت (ص)مەعسوم بووە ئاوا دەفەرموێ , دەی ئێمەی گوناهکاری داماوی بێدەسەلات , کەهەر ڕۆژەی شەیتان لە لایەکەوە زەفەرمان پێدەبات ئەبێ چۆن بپاڕێینەوە و بڵێین چی ؟!

**کاروانی ماندوونەناسان**

**یەکەم : دکتۆر عبدالرحمان السميط :**

دکتۆر عبدالرحمان پزیشکەو خەڵکی (کوێت)ەو لەزانکۆی (ام درمان الاسلاميه) دکتۆرای هێناوە ، کارێکی کرد بۆ ئیسلام لەئەفریقیادا کەمێژوو بەئاوی ئاڵتون بۆی تۆمار دەکات و نەك هەر لەئاخیرەت دا (ان شاءالله ) باشترین پاداشت وەردەگرێ , لەدنیاشدا هەردەم جێی ڕێز و پێزانین بووە , تەنانەت چەندجار خەڵات کراوە , وەك (وسام النيلين) و (جائزة الملك العالمية لخدمة الاسلام)و (وسام التكريم من دول تعاون الخليجي )و .. هتد ..

پێنج کوڕی هەیە چواریان دەرچووی زانکۆن و کچێکیشی هەیە لەگەڵ مێردەکەیدا لە (کندا) دکتۆرا دەخوێنێ ..بیست وپێنج ساڵە لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیای دامەزراندووە و خاوەنی ئەزمونێکی گەورەیە لە بانگەوازی ئەفریقیادا و لەگەڵ ئەوەدا کە لە تەمەندایەو نەخۆشی شەکرەی هەیەو چاوی (نزيفی )هەیە و ڕۆژی پێنج دەرزی لەخۆی دەدا , کەچی هەر هیممەت بەرزەو ساڵانە یانزە مانگ لە ئەفەریقیایەو یەك مانگیش لە کوێت , تووشی ناخۆشی و ناڕەحەتی زۆر بووە بۆ خوا , بڕیاریشی داوە پاشماوەی ژیانی لە ئەفریقیادا تەواو بکات و خۆی سەرپەرشتی منداڵی بێ باوك بکات و هاوسەرەکەشی ببێتە مامۆستای منداڵە بێ باوکەکان ..

ئەمەش چەند وێستگەیەکی هەوڵ و خەباتەکەیەتی بۆ دینی خوا , هەروەك خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە :

١ ) نەبوونی ئاوو خواردن :

لەیەکێ لەگەشتەکانما لەگەڵ ماڵ و منالّم دا لەدێهات و دارستانەکانی ئەفریقیادا , پێنج ڕۆژ منالّەکانم سێ ژەمە مۆزیان خوارد , تاناوسکیان هەموو دانا ! وتیان وا دەمرین و دلّمان تێکەڵ دێت لەمۆز , بەڵکو شتێکی ترمان بۆ پەیدا بکەی بیخۆین , منیش چی گەڕام چەند هێلکەیەکم لە کوخەکان دەستکەوت لەوناوە ,کەچی ئەویش سوودمان لێ نەبینی چونکە پیس بووبوون وبۆمان نەخوران .

٢ ) ئیسلامەتی و ئەفریقیا :

ئیسلامەتی لە بەرەبەیانی بانگەوازی ئیسلامیەوە گەیشتۆتە ئەفریقیا , بەهۆی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی بەفەرمانی حەزرەت (ص)کۆچیان کرد بۆ حەبەشە , موسڵمانان لە مێژووی خۆیاندا لە ئەفریقیاهەڵکشان و داکشانی زۆریان بەسەردا هاتووە , سەردەمی واهەبووە دەسەڵاتدار بوون و ئیمپراتۆریەتیان دروست کردووە لەناوچەی بەرفراوانی ناو ئەفریقیادا و, بەهۆی پیلانی دوژمنان و داگیرکارانەوە , زۆر جاریش دوور کەوتوونەتەوە لە ئیسلام و تەنها بەناو موسڵمان بوون و لەوپەڕی جەهالەت و نەفامیدا ژیاون ..

بۆ نموونە , دێیەك هەیە لە ئەفریقیادا ناوی (مەککە)یەو یەکێکی تر ناوی (حیجاز ) ە و باووباپیرانیان لەدێر زەمانەوە کەموسڵمان بوون ئاوا ناویان ناوە لەبەر پیرۆزی مەککەو مەدینەو حیجاز لەلایان , بەڵام ئەمان هیچ لەبارەی مەککەو مەدینەو حیجازەوە نازانن و هەرواش نازانن هەن ..

بۆئەوەی سەردانی دێی مەککە بکەم , چوار سەعات بەناو جۆگەو ئاودا ڕۆیشتم کە گەڵاو قەوزە تەنانەت پیسایی و پاشەڕۆی ئاژەڵی زۆریشی تیابوو , منیش لەبەرئەوەی شەکرەمەو زۆر زۆرم تینوو بوو , ناچار لەو ئاوە پیسەم خواردەوە !

لەو ناوچانە بەفەزڵی خواو ,لەئەنجامی هەوڵ و کۆششی زۆرەوە نزیکەی حەڤدە هەزار کەس موسڵمان بوون و هەندێکمان لەسەرکردەکانیان نارد بۆحەج , کە گەڕانەوە وەك ( صاروخ )یان لێهات و نزیکەی دووسەد هەزاری تریان موسڵمان کرد ! نزیکەی هەشت سەدو پەنجا دێ یان هەیەو توانیومانە تائێستا حەفتاو پێنج مزگەوتیان بۆ دروست بکەین ..

**٣) بت پەرستی لەئەفریقیادا :**

ژمارەیەکی زۆر بێئاگان لە دین و خەریکی بت پەرستین , بۆیە هەوڵمان دەدا کەزۆر بەنەرمی مامەڵەیان بکەین و تادواپلە بەئارام بین لەگەڵیاندا .. ئەمەش زۆر سوودمان لێبینی ..

لەیەکێ لەدێکانی ئەفریقیاداجادووگەرێك سەرکردەیان بوو , ڕۆژێ لەپێشیانەوە دەڕۆیشت و خەڵکەکەش بەدوایدا و, هەندێکیان کەڵەشێریان بەرز کردبۆوە بەسەر سەریانەوە تا بیبەن لەبەردەمی بتەکەیانا سەری ببڕن .. خوا کردی داڵێکی برسی لە ئاسمانەوە هات و پڕی کرد بە کەڵەشێرێکدا وبردی , ئەم دیمەنە زۆرکاری کردە سەر جادوگەرەکەو چووە بەردەمی بتەکەو تفی لێکرد و وتی : ئەگەر دەتوانی دیفاع لەخۆت بکە ؟! ئەوە ئەگەر بۆمن بهاتایە نەم ئەهێشت ئەو داڵە ئاوا بیبات . ئەمەش سەرەنجام بووە مایەی هیدایەتی خۆی و خەڵکی ئەوناو چەیە ! .

**٤) خەڵکێکی ڕووت و قووت :**

هەندێ هۆزوعەشیرەت هەن لەئەفریقیادا کە باوەڕیان وایە , مادەم خوا بەڕووتی دەیان هێناوەتە دنیاوە , کەواتە دەبێ هەروابن , بۆیە کە قسەم بۆ دەکردن گوێیان لێ نەدەگرتم چونکە داپۆشراو بووم ..

ڕۆژێک ئامادەی دادگایی کردنێك بووم , دووکەس زۆران بازیان کردبوو , ئەوی سەرکەوتبوو ژنی ئەوی تریانی بردبوو , ژێر کەوتوو کەژنەکەی برابوو , لای سەرۆکی هۆزەکە شکاتی کردبوو کە ئەو پارچە جلەم دەوێتەوە کەبۆ ژنەکەمم کڕیوە کاتێ هێناومە , ژنەکەش زۆر بەئاسایی لەسەر حوکمی سەرۆك هۆزەکە پارچە جلەکەی لەبەری داکەند , کەتەواو کۆن بوو بوو لەبەریاو دایەوە بەمێردە کۆنەکەی و لەگەڵ مێردە تازەکەی بەڕووتی ڕۆیشتن !

لەم هۆزە نەفامە سادەو ساکارەدا , کارمان کرد و زۆر ڕەنجمان دا , خواش بەرەکەتی خستە کارمانەوە و ئێستا هی وایان تیایە نیوەی قورئانی لەبەرەو هیواشیان هەیە ئێستا لەزانکۆ دەخوێنێ !

من لەبەرگدروویەکی مۆریتانیەوە وانەی ئارام گرتن و مامەڵە کردن فێر بووم لەگەڵ ئەو مرۆڤە سادەو ساویلکانەدا ..

ئەو بەرگدرووە دادەبەزیە پلەی ئەوان و دەهات زۆرانبازی لەگەڵدا دەکردن و خۆی چەور دەکرد بۆئەوەی نەتوانن بەئاسانی بیگرن و لەدەستیان بخلیسکێ ! ئابەو جۆرە بەئارامگرتن وردە وردە فێری جل لەبەر کردنی دەکردن !

**٥) دوعای باران بارین !**

دوانزە ساڵ لەمەوبەر سەردانی هۆزێکی بت پەرستمان کردو نزیکەی دووسەعات قسەمان بۆ کردن , هیچ سوودی نەبوو , وتیان : ئێمە ئەو قسانە نازانین , سێ ساڵە باران نەباریوە لەناوچەکەماندا و برسێتی و قات و قڕی کەوتۆتەوە و، پێش تۆش گاورەکان هاتوونە لامان و بەوە تاقیمان کردنەوە کەئەگەر ڕاست دەکەن بادوعا بکەن و بارانمان بۆ ببارێت ، هەرچی دوعایان کرد باران نەباری بۆیە بڕوامان پێنەهێنان .. جائێستەش تۆ بەهەمان شێوە تاقی دەکەینەوە فەرموو ئەگەر ڕاست دەکەیت دوعا بکە با بارانمان بۆ ببارێت , بەڕاستی منیش لەخۆم ڕانەئەبینی دوعام قبوڵ بێ و بەدوعاو پاڕانەوەی من باران ببارێت , بۆیە کەوتمە بڕو بیانوو هێنانەوە و وتم : من وا دووسەعاتە بەپێوەم ماندووم , وتیان : جا فەرموو دانیشە دوعاکانت بکە ! وتم : ئاخر دەنگم دەرنایەت و دووسەعاتە قسە دەکەم و دووڕۆژیشە هیچمان نەخواردووە ؟! وتیان : ئەوە نازانین , باران نەبارێت بڕوات پێناهێنین .. بۆیە ئیتر ناچار بووم کەمادەم ئەمان عەقڵیان وابێ , بکەومە دوعاکردن , نیەتی خۆم ساف کرد بۆ خواو بەدڵ وبەکوڵ کەوتمە پاڕانەوەو، لە بارەگای خوادا وتم : خوایە هەرچەند منی گوناهکارو کەمتەرخەم پیاوی ئەوەنیم دوعام قبوڵ بێت , بەڵام خۆت ئاگاداری وە زعەکەیت و ئەمان بیانووی باران دەگرن , خوایە لەبەرمنی گوناهکار نا کە لێرەدا ئەگەر نەبارێ ئابڕوم دەچێ لایان و لەبەرچاویان دەکەوم , لەبەر ئاینەکەی خۆت , لەبەر بەرزبوونەوەی پەیامەکەی حەزرەتی (رسول الله), دەست مەنێ بەڕوومانەوەوقاپی ڕەحمەتت بکەرەوە بۆمان وبەدەم دوعاکانیشەوە فرمێسکم دەڕشت ..

دوای ودوعاکان وتیان وائێمە دەڕۆین و سێ سەعاتی تر دێینەوە ! بزانین چی دەبێت , خوا ئاگادارە ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش لەژێر درەختێکدا ماینەوە , کاتێك هاتنەوە

بەفەزڵی خوا باران باری و ئێستا نیوەیان زیاتر موسڵمانەو یارمەتی بانگخوازەکانیان دەدەین بەمەڕوماڵات و شتی تر سابەڵکو ئەوانی تریش بانگ بکەن بۆئیسلام !

**٦ ) قوربانی کردن :**

هۆزێکی ئەفریقیا بیرو بۆچونیان وایە کەخوا گاومانگای لەبەر ئەوان دروست کردووە , بۆیە هەمیشە مناڵەکانیان واپەروەردە دەکەن کە لە هەرکوێیەك گاومانگایان دی بیدزن , چونکە وا دەزانن هی ئەمانەو خەڵکی تر بردویانە و لێیان زەوت کردون . جارێك کۆمەڵێك گاومانگامان کڕی و ویستمان قوربانیان بۆ بکەین , خوا ڕەحمی پێکردین کەپاسەوانی ڕەشەوڵاخەکان لەخۆیان بوو , ئەگینا هەربەو شەوە هەرهەموویان دەبرد بۆ خۆیان ..

**٧ ) ناوچەیەکی پڕ مەترسی :**

جارێك من و صهیب ی کوڕم کەمناڵ بوو بەلای قەفەسی شێرێك دا ڕۆیشتین لەباخچەیەکیاندا , تومەز پاسەوانەکە کەخواردن ئەدا بەشێرەکە بیری چووە دەرگاکە داخاتەوە , بۆیە هەرئەوەندە لەکوڕەکەم غافڵ بووم دەبینم چۆتە ناو قەفەسی شێرەکەوە , منیش ناچار چوومە ناوەوە و بەهەر حاڵێك بوو دەرمهێنایەوە , خوا ڕەحمی کرد شێرەکە تێر بوو ئەگینا ڕزگارمان نەدەبوو !

هەموو جارێك بەناوچەیەکدا دەڕۆیشتم زۆر خۆش و ئارام بوو بەشۆفێرەکەم دەوت لێرەدا بوەستە , دەوەستاو منیش دەستنوێژێکم دەشت و دووڕکات نوێژم دەکرد .. جارێك لای ئەو ئاوو سەوزاییەوە ویستم قاچم دابنێم , وەم زانی بەردە , چاوم باش نەیدەبینی بەهۆی شەکرەکەمەوە , کاتێکم بەخۆم زانی تیمساحە و دەمی کردەوە بۆم , بەپەلە ڕامکردو ناچار بە (تیمم)نوێژێکم کرد .. تومەز من ئاگام لێ نیە پێش من لەو ناوچەیەدا تیمساح چەندەها جار خەڵکی لەناو بردووە !( شایانی باسیشە زۆربەی کارمەندەکانمان بۆ چەند جار تووشی مەلاریا و چەندەها نەخۆشی تربوون )..

**٨ ) توانای زۆرو بەرهەمی کەم :**

ئاشکرایە گاورەکان ساڵانە بۆ کاری مژدەدان پارەیەکی بێ ئەندازە کۆدەکەنەوە, بۆ نمونە لەساڵی (٢٠٠٣)دا تەنها لە ئەمریکادا سێسەدو بیست ملیار دۆلاریان کۆکردەوە و نزیکەی شەش ملیار ئینجیلیان بەبیست زمان چاپ کردووەو بەخۆڕایی دەیبەشنەوە !

لەبەرنامەیاندا بوو لەساڵی دوو هەزاردا هەموو ئەفریقیا بکەنە گاور , بەڵام خوای گەورە بەرەکەتی لەکارەکەیان هەڵگرتوەو لەگەڵ ئەو هەموو توانایەدا بەرهەمیان کەمەو شایانی باس نیە ..

ئەمەش چەند ئامارێکە لەسەر تواناکانیان :

* لەساڵی ١٩٧٠توانیان ٧٠ملیۆن دۆلار بۆ مزدەدان کۆ بکەنەوەو لەساڵی ٢٠٠٣دا گەیشتە ٣٢٠ملیار تەنها لەئەمەریکا و، بە تەمان لەساڵی ٢٠٢٥دا بگاتە (٩٥٠)ملیار دۆلار.

* لەساڵی ١٩٧٠دا دوو هەزارو دووسەد دەزگاو ڕێکخراو مزدە دەریان دەنارد بەجیهاندا بۆ کاری مزدەدان و گاور کردن , لەساڵی (٢٠٠١) دا ژمارەیان گەیشتە چوار هەزار و سەد ڕێکخراو, واش چاوەڕوان دەکەن کەساڵی(٢٠٢٥)دا بگاتە شەش هەزار ڕێکخراو .

* لەساڵی ١٩٧٠دا ,(١٢٣٠)ئێستگەو کەناڵی تەلەفیزۆنیان هەبوو بۆ مزدە دەدان , لەساڵی (٢٠٠١)دا گەیشتە (٤٤٥٠)و بەتەمان لە (٢٠٢٥)دا بگاتە (٥٤٠٠) ئیستگە و کەناڵی تەلەفزیۆن .

* لەساڵی (١٩٧٠)دا (٥١٠)پلانیان هەبوو بۆ بەگاور کردن , لەساڵی (٢٠٠١)دا بوو بە (١٥٤٠)پلان و، لەساڵی (٢٠٢٥)دا بەتەمان ببێ بە (٣٠٠٠) پلان ٠

* لەساڵی (١٩٧٠) دا (٢٤٠) هەزار مزدە دەری بیانی کاریان کردووە ، لەساڵی (٢٠٠١)دا بوون بە (٤٢٥)هەزار و، بەنیازن لەساڵی(٢٠٢٥)دا ببن بە (٥٥٠)هەزار مزدەدەر ( گۆڤاری الایمان ژ ٦١/ ٢٠٠٣) ..

٩ ) هاوکاری هەندێ قەشەو موسڵمان بوونیان :

لەناوچەیەکدا قەشەیەك ملیۆنەها دۆلاری خەرج کردبوو بۆ بنیاتنانی قوتابخانەو ئاوەدانکردنەوەی دێیەکی گەورە , بەهیوای بەگاورکردنی ئەو موسڵمانانەی لەو ناوچەیەدا بوون .. کاتێك ئێمەش چووینە ئەو ناوچەیە هاتەلامان وتی : پەنجاو یەك ساڵە من خەریکم نەمتوانیوە خەڵکی بکەم بەگاور , وامن پیربووم وەرن بادێیەکە بکەم بەناوتانەوە , نەوەك دوای من کەنیسە داوای ئەم ناوچەیە بکات و دەست بگرێ بەسەر موسڵمانان دا , ئێمەش قایل نەبووین بیکا بەناوی ئێمەوە , بۆیە تەگبیرمان بۆ کرد کە ئەو زەوییانەی هەیەتی و ئەو پرۆژەو بینایانەی کردونی دابەشی بکات بەسەر موسڵماناندا ..

لەپرواندا‌ش شێخی بانگخوازەکانمان شێخ (اسحاق) قەشە بوو موسڵمان بوو..

لەناوچەیەکی تریش قەشەیەك زۆر دژایەتی دەکردین , دوایی موسڵمان بوو , ئێستا بانگبێژی مزگەوتەو وازی لەماڵ و سامان و ئوتومبیل وموووچەی کەنیسە هێنا لەبەرخوا .

ئەگەر باسی ئەوانە بکەین بەگشتی کەموسڵمان بوون بەهۆی کارەکانی ئێمەوە زۆرن و نزیکەی سێ ملیۆن ونیوکەس موسڵمان بوون ..

**١٠) منداڵە بێ باوکەکان و بڕوانامە :**

ئەو منداڵە بێباوکانەی کە ئێمە کەفالەتمان کردون , ژمارەیەکی باشیان خوێندنیان تەواو کردووە وبڕوانامەی چاکیان بەدەست هێناوە ، هەیانە بوون بە پزیشك و یەکێ لەو منداڵانەش پاش ساڵانێکی زۆر خزمەت ئێستا بووە بە (خبیر البنك الدولی )..

لە (مـلاوی )لەساڵی ١٩٨٠ دا یەك دەرچووی زانکۆ نەبوو موسڵمان بێت , ئێستا سیکەس لەمنداڵە بێ باوکەکان کەلای ئێمە بوون بڕوانامەی باڵایان بەدەستهێناوە و شەشیان دکتۆرایان هەیەو تەنانەت هەیانە ئێستا بوون بەوەزیر و هەندێکیان بوون بەسەفیری وڵاتەکەیان ..

**١١) موسڵمان بوونی سوڵتانێك لە تشاد :**

ناوچەیەکی تشاد (حرکەی تمردی )تیابوو , هەرچی عەرەبێك بەویا بچوایە کوژرابوو , ئێمە حەز بەئاژاوە و پشێوی هیچ کوێیەك ناکەین , ڕەمەزان چووین لەو ناوچەیە سفرەو خوانی ڕەمەزانیمان دروست کرد .. لایان سەیر بوو ! دوای دوومانگ سوڵتانی ناوچەکە هەشت هەزار مەتری داینێ وتی بیکەن بەمزگەوت و چەند خانووی ڕووخان بۆمان ..

هەندێ لاوی نەفامی کەنیسە هاتن و (مضخات) ی سەربیرەکانیان بردو بەوەش خەڵکی وەزعیان خراپ بوو , ئەویش بەو هەڵوێستە زۆر بێتاقەت بوو , بڕیاریدا موسڵمان بێت , بەڵام لەسەر دەستی ئەو ژنەدا کە پارەی مزگەوتەکەی دابوو ..

دیارە ئەمەش ئاسان نەبوو , پیاوێکی چوارشانەی ڕەش پێستی ئەفریقی ببەین بۆلای پیرێژنێکی کوەیتی , تا لەسەردەستیاموسڵمان ببێت .. هەرچۆنێك بوو گەشتەکەمان بۆ ڕێکخست وداوامان لەبەرپرسانی کوەیت کرد کە پێشوازی لەم میوانە بکەن و ئەوانیش ماڵیان ئاوابێت پێشوازیان کردو ڕێزی زۆریان لێگرت ، پاشان لەسەردەستی ئەوژنەدا

موسڵمان بوو .. ئەو شەوە نەنوست هەتا فێری (فاتحە)بوو ! وەناوی خۆی گۆڕی بۆ (عبدالعزیز). . پاشان ناردمان بۆ حەج و لەوێش پێشوزای باشی لێکراو حەج زۆرکاری تێکرد , کەگەڕاشەوە , پەنجاودوو سەیارەمان بەکرێ گرت وبۆ پێشوازی و ڕێزلێنانی لەگەڵیابوون، تاناردمانەوە ناوچەکەی خۆی ..

لەڕێگاکەشیا بەدرێژایی چەند کیلۆمەترێك خەڵکی ناوچەکە هاتن بەپیریەوەو کەئەو ڕێزو حورمەتەیان بینی , هەشت سوڵتانی تری ناوچەکە موسڵمان بوون , ئەمە بێجگە لە شەست هەزار کەسی تر کەهەمویان لەسەردەستیا موسڵمان بوون ..

**١٢) بەموسڵمانی پێم خۆشە بمرم لەبرسا :**

هارون عبدول ڕەحمەتی خوایلێبێت , موسڵمانێکی ئەفریقی یە ناوچەکەی تووشی برسێتی و قات وقڕی بوو, بیست هەزار کەسیان لەبارێکی زۆرخراپدا بوون . لە دوورەوە تۆزو خۆڵی چەند لۆریەك پەیدابوو, کاتێك نزیك بوونەوە هاورن قسەی لەگەڵ کردن, قەشەیەکەیان لەگەڵ بوو پێی ووت: بە مەرجێ ئەو یارمەتیەتان دەدەین کەببن بەگاور, ئەویش ڕازی نەبوو بۆیە لۆرییەکان گەڕانەوە بەو هەمووئازوقەیەوە کە هەڵیان گرتبوو, هارون عەبدولیش قسەیەکی کرد کە نیشانەی باوەڕو دامەزراوییەو وتی: پێم خۆشە لە برسا بەموسڵمانی بمرم و نەبمە گاور !!

شایانی باسە هاورن عبدول پاش ماوەیەك بە ڕووداوی ئوتومبێل گیانیسپارد..

**١٣) بەرنامەی (١٥) ساڵی لە بانگەوازدا :**

ئێمە پاش دیراسەکردنی هەر ناوچەیەك , بەپێیخۆی بەرنامەی دە تاپانزە ساڵی بۆ دائەنێین لەڕێی قوتابخانەو خولی ئیشی دەستو ئیستگەو زۆر هۆکاری ترەوە کە هیچ نەبێ نیوەیان موسڵمان بکەین وبەجێیان بهێڵین تائەو نیوەیەش نیوەکەی تر بەچەند ساڵێك موسڵمان بکەن..

ئیستگەمان هەیە دەیەها کیلۆمەتر دەڕوات و بەزمانی خۆیان بەرنامە بڵاو دەکاتەوە..بەمەش زۆر ناوچەی دوورەدەست دەنگی بەرنامەکەی خوای پێدەگات..

لە یەکێ لەنیوە دوورگەکانەوە ڕاوچیەك هاتبوو بۆ شارو پێیوتم ئێمە ساڵی دووجار دێین بۆ شار, ئەوا بۆ یەکەمجار ئەمساڵ بوو بەسێ جار, لەبەر ئەوەی ناچاربووین بێین (پیل) بکڕین بۆ رادیۆکانمان تا گوێ لە بەرنامەکانتان بگرین منیش زۆر سوپاسیخوام کرد لەسەر نیعمەتەکانی..

دێیەکیش لەنەیجیریا موسڵمان بوون و پیتاکیان کرد تا ڕادیۆیەك بکڕن و گوێ بگرن لەوبەرنامانەی دەگاتە ناوچەکەیان..

**١٤) منداڵێك لەمردن گەڕایەوە :**

لەناوچەیەکدا کە برسێتی بڵاو بوو بۆوە، خەڵکێکی زۆر سەرەی گرتبوو، کە ناویان بنوسین و هاوکاریان بکەین وبۆ ماوەیەك ئازوقەیان بدەینێ..لەو منداڵانەدا کە دەمکێشان منداڵێکی بێ باوك بوو کە دایکەکەی هێنابووی، کە کێشام تەواو وشکبووبۆوە و لەگیانەڵادا بوو، منیش وەك پزیشکێك هیوام بەژیانی نەبوو بۆیە دامەوە دەست دایکی و ناوم نەنووسی، دواتر کە بینیم دایکەکەی زۆر گریا، لەسەر پارەی خۆم کەفالەتم کردو پاش دوو هەفتە خزمەت و خواردنی باش هۆشی هاتەوەو بوژایەوە..

دوای پانزە ساڵ هاوەڵانم لە مەکتەبەکەمان لەو ناوچەیە وێنەی ئەو منداڵەیان بۆ ناردم کە ناوی (صدیق کنین)ەو وتیان ئەمە ئەوەیە کەبڕوات نەدەکرد بژی، وا لە سایەی خواوە ماوەو لەقوتابخانە یەکەمەو دە جزم قورئانیشی لەبەرە..

لەکینیا کیژۆڵەیەکی بێباوك زۆر هەژار بوو، پێڵاوی نەبوو، جل وبەرگی دڕابوو، کە هاوینان منداڵەکانی خۆم دەهاتن بۆ ئەفریقیاو سەریان لێ دەدام دیاری و شت ومەکیان ئەدا بەومناڵە کە نزیك نووسینگەکەمان بوو، ئەو کچە بچکۆلەیە پێگەیشت و خۆی و خوشکێکی تریشی هەردوکیان ئێستا لە کۆلیژی پزیشکین.. شایانی باسە لەکینیا لە دایەنگاوە تا زانکۆمان هەیەو کۆلێژی شەریعەتیشمان کردۆتەوەو زۆر خزمەتمان بە خەڵکی ناوچەکە کردووە..

**١٥) موسڵمان بوونی هۆزی ( غریامە ) :**

حاجی رەشید شای مەکتوب یەکێکە لە هۆزی غریامەو لەخێزانێکی گاوردا لەدایك بووەوبە گاوری گوێی ئاودراوەو، کە گەورەبوو بووە قەشەوبەرپرسی کەنیسەی ناوچەکەیان لەساڵی (١٩٣٨)ەوە تاساڵی (١٩٩٣) واتە پەنجاو چوارساڵێك.. بەهۆی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیاوە موسڵمان بوو، هەموو ئەوانەی هاتوچۆی کەنیسەشیان دەکرد کە سێسەد کەس بوون ئەوانیش موسڵمان بوون.. لە بارەی موسڵمان بوونیەوە دەڵێت:

سەدان ساڵ لەمەوبەر بەهۆی بازرگانی موسڵمانەوە ئیسلامەتی گەیشتۆتە ناوچەکەمان و باوك و باپیرانمان موسڵمان بوون و ئێمە ناومان موسڵمانانەیەو گۆشتی مردارەوەبوو ناخۆین و مردوومان کفن و دفن دەکەین و منالمان خەتەنە دەکەین..

بەهۆی داگیرکەرانەوە کە بەناوی ئازادکردنی مرۆڤی ئەفریقی هاتبوون ئێمەیان کردە گاورو سەد ساڵێك لەمەوبەر زۆریان لێکردین بە کۆیلەو لێیان بردین بۆ وڵاتانی ئەوروپاو وەکو ئاژەڵ مامەڵەیان کردین.. بۆیەزۆرێك لە ئەندامانی هۆزەکەی من لە ترسا لە دارستانە چڕەکاندا خۆیان دەشاردەوە.. من وەك قەشەیەك بۆم دەرکەوت کەئینجیل پاش سەدساڵ زیاتر لە دوای حەزرەتی عیساسەلامی خوای لێبێت نوسراوەتەوە لەلایەن (پۆلص)ەوەو بۆم دەرکەوت کە عیسا خوا نیەو کوڕی خواش نیە ، بەڵکو پێغەمبەری خوایە وەك سەرجەم پێغەمبەرانی تر..

کەڕاستیەکانم بۆ دەرکەوت موسڵمان بووم‌و هەر چەند زۆر هەوڵیاندا لەگەڵمدا بەپارەو سامان تەنانەت بە هەڕەشەو چاوسوورکردنەوەش لەسەر ڕای خۆم سوور بووم‌و موسڵمان بووم..

بەڵێ وازم لە ماڵ‌و سامان‌و ئوتومبێل و پلەوپایەی دنیایی هێنا تاخوا لە خۆم ڕازی‌بکەم‌و ئایینی هەق هەڵبژێرم..

پاش ئەوەش کە چووم بۆ حەج زیاتر سووربووم لەسەر ئیسلامیەتیەکەم‌و پێشتر ئەگەر وەك برینپێچێك بوویم بەو حەجە بووم بە پزیشکێکی شارەزاو باشتر خەڵکی بانگ دەکەم بۆ ئیسلام..

بەڕاستی من هیچم نەدەزانی لە بارەی حەجەوە , تەنها ئەوە نەبێت دەمزانی کە حەزرەتی ئیبراهیم‌و کوڕەکەی هەبوون‌و پێغەمبەر بوون, خەڵکی لای ئێمە باوەڕیان وا بوو کە هەرچی بچێت بۆ مەککە ناگەڕێتەوە, بۆیە کەس‌وکارم حەزیان نەدەکرد بچم‌و ، تەنانەت موسڵمانێکی تریش کە بڕیار بوو بێت بۆ حەج نەیوێرا بێت !

بەڕاستی لە حەج تێگەیشتم کە مانای (الحمد لله رب العالمین)یانی چی کە ئەو هەموو موسڵمانەم بینی لە هەموولایەکی دنیاوە هاتبوون.. الایمان ژ (١٦)

**دووەم/ محمد عز الدين القسام:**

ئەم پیاوەخواناسە ماندونەناسە خەڵکی سوریایەو لە نزیك (لاذقیة) لەساڵی ١٣٠٠ کۆچی لە دایك بووە , نۆ ساڵ لە ئەزهەر قوتابی بوو, گەڕایەوە بۆسوریاو بوو بە

مامۆستا، بەیانیان بۆ گەنج و لاوو شەویش بۆ بە تەمەنەکان ، دەیویست فریای تەمەنی بکەوێ و ساتەکانی ژیانی بە فیڕۆ نەچن, لەو ڕۆژگارەدا دەوڵەتی عوسمانی لاواز بوو بوو, دوژمنی زۆریشی هەبوو, وەك ڕەمزێك وابوو بۆ موسڵمانان کە ڕووخا هەیبەتی موسڵمانان و شان و شەکەوتیان نەما, داواکرا لە خەڵکی سوریا کە جیهاد بکەن دژی داگیرکەران و فێری بەکارهێنانی چەك ببن.. لەو ڕۆژگارەدا ئیتاڵیا لیبیای داگیرکردبوو, پیلانیش هەبوو بۆ داگیرکردنی وڵاتەکانی تر .

( قسام ) لە مزگەوتی (المنصوریه) وتاری داو هانی موسڵمانانیدا هاوکاری موسڵمانانی لیبیا بکەن و، خۆشی وەك پێشەواو سەرمەشقێك خانووەکەی خۆی فرۆشت و دایبەچەك تا جیهادی پێ بکات دژی داگیرکەران..

(قسام) خۆپیشاندانی ڕێکدەخست و لەگەڵ جەماوەردا دەردەچوون دژی داگیرکەران و، دەڵێن بەنهێنی گەیشتبووە لای (عمر مختار) و کۆبوونەوەیان کردبوو..

کاتێك فەرەنسیەکانیش لەساڵی ١٩١٨ دا سوریایان گرت و بەریتانیاش عێراق وفەلەستینی گرت.. جەنراڵ ( اللنبی ) سەرکردەی بەریتانی چووە ناو (قودس)ەوەو وتی: الآن انتهت الحروب الصليبية.. ئێستا جەنگی خاچپەرستان کۆتایی هات!!

(غورو)ش سەرکردەیەکی سوپای فەرەنسی بوو چووە سەر قەبری سەلاحەدین و شەقێکی تێهەڵداو وتی: ئێمە ڕۆڵەکانی ریکاردوس وخاچپەرستانین, کوا ڕۆڵەکانی تۆ سەلاحەدین !

(قسام) شۆڕشی کرد دژی فەرەنسیەکان,ئەوانیش کە هەستیان کردبە زەبری بەرگری موسڵمانان , وەفدێکیان ناردبۆلای تاپارەی بکەن و بیکڕن, بەڵام دیارە مەرامیان نەهاتە دی.. بۆیە حوکمی کوشتنیان بەغیابی دا..

(قسام) بەنهێنی خۆی گەیاندە (حیفا)و بوو بە وتاربێژی مزگەوتی (الاستقلال), پانزە ساڵ لە فەلەستین مایەوە تا شەهید بوو, زۆر بەرچاو ڕوون و هوشیاربوو,هەمیشە کاری دەکرد بۆبەرچاوڕوونی وهوشیارکردنەوەی موسڵمانان و هاندانیان بۆ جیهاد دژی داگیرکەران..

لەو ڕۆژگارەدا ئینگلیز پڕوپاگەندەیەکی زۆریان هەبوو, وایان لە خەڵکی دەگەیاند کە فەرەنسیەکان شارستانی ترن و (شریف حسین) یان خەڵەتاند تالە سایکس بیکۆدا ناوچەکەیان بەشکرد لە ساڵی ١٩١٦ز ..

عوسمانیەکان نوسخەیەکی وەعدی بلفۆریان نارد بۆ (شریف حسین) تاچی تر نەخەڵەتێ بە داگیرکەران, ئەویش کوڕەکەی نارد بۆ بەریتانیاو ئەوانیش زۆر پێشوازییەکی جوانیان لێکردو بە درۆ وتیان: ئێمە هەردەم لەگەڵ باوکت داین!

(قسام) بەموسڵمانانی دەوت بەقسەی ئینگلیز مەخەڵەتێن چونکە وەك ئەو ڕاوچیەن کە ئەگەربەهۆی تۆزو خۆڵو ڕەشەباوە چاویشی ئاوبکات, ئەوە گریان نیەو سەیریکاری دەستی بکەن چۆن باڵندەکان سەردەبڕێت..

لەو ڕۆژگارەدا (بەهائیەکان) و (قادیانیەکان) ئەڵقە لە گوێی ڕۆژئاوابوونو جیهادیان دژی ئینگلیز حەرام کردبوو بەناوی ئیسلامەوە ..

هەندێك پیاوی باشیش وەك (حاجی ئەمین حسینی)و کەسانی تریش حزبیان دروست کرد, بەڵام بە داخەوە پرسو ڕایان بەئینگلیز دەکردو هەندێکی تریش دەیووت: جوولەکە میوانو ڕێزگرتنی میوانیش بەشێکە لە ئیسلامەتی..

(قسام) دەبوایە ڕووبەڕووی هەموو ئەو بیرو بۆچوونانە ببێتەوە, بۆیە بەخەڵکی دەووت: جوولەکە لەژێرسایەی سەری ئینگلیزدا ئەم وڵاتە داگیر دەکەن, هۆشیاربن, بەفاکوفیکی دوژمن مەخەڵەتێن ، دیارە هەرواش دەرچوو کە ئەو وتی!

شۆڕشی (بوراق) کرا لە ساڵی ١٩٢٩ داو ئینگلیز سیانیان هەڵواسی ،(قسام) لەسەر مینبەر موسڵمانانی هاندا بۆجیهادو وتی: ئەوانەی هەڵواسران ئەهلی فەلەستین نەبوون؟! وەك ئێوە نەدەهاتن بۆ مزگەوت؟! بەمەش شەڕێك هەڵگیرساو خەڵکەکە ڕووبەڕووی داگیرکەران بوونەوەو سەدو شانزە کەس شەهید بوون وسێسەد کەسیش برینداربوون ..

(قسام) دەیووت:من گرنگ نیەبەلامەوە سەربکەوم, بەڵکو گرنگە بەلامەوە کە گیانی جیهادکردن لە موسڵماناندا ببوژێنمەوە !

لەکاتی نوێژدا,ئایەتی(واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل..) وئایەتی جیهادی زۆر دەخوێند, تا ڕۆژێك گرتیانو لە (تحقیق) دا لێیان پرسی ئەو ئایەتانە بۆ دەخوێنی؟! ئەویش وتی:ئەوئایەتانە بەشێکن لە قورئانو ناکرێ لەیادیان بکەینو لەبیر خۆمانی بەرینەوە..

جا خەڵکی هەموو مانیان گرت، بۆیەناچاربوون (قسام) بەربدەن..

(قسام)بەنهێنی خەڵکیڕێك دەخست چونکە (استخبارات)ی بەریتانی هەموو شوێنێکیان تەنی بوو ! ئەوانەی دەهاتنە مزگەوت , لێی هەڵدەبژاردن و لەماڵەکانیاندا سەردانی دەکردن و هەر پێنج کەس و (نقیب)ێکی دەکردە چاودێریان, بەو شێوەیە نزیکەی هەزارکەسێکی بە جەرگ و نەبەردی دروستکرد کە دوای شەهیدبوونی خۆی دریژەیان بە کارەکەدا!

پێش ئەوەی شەهید ببێت بە دووساڵ, جیهادی ڕاگەیاندو، دژی جوولەکە چالاکیان دەکرد, لە (مستوطنه) یەك شەڕی لەگەڵ کردن و دوو جولەکە کوژرا, ئینگلیز مەراقی بوو بزانێ کێ لەپشت ئەو چالاکیانەوەیە ..

(قسام) لەشاخ وداخ و چڕە دارستانەکاندا خۆیان ساز دەکردو پیلانێکیان دانا کە دەوری حەیفا بدەن و دەست بگرن بەسەریا, بەڵام یەکێ لە تێکۆشەران هەڵەیەکی‌کردو پیلانەکەیان ئاشکرابوو, ئەویش بەوەی کاتێك دوو جولەکەی بینیەتەقەی لێکردن و یەکێکیانی کوشت و دووەمیان بۆی دەرچوو, هەر ئەوەندە ئینگلیز بەمەی زانی, دەوری ناوچەکەی گرت و (قەسام)و چەند هاوەڵێکیان لە ڕووبەڕووبوونەوەدا شەهید کرد لە ساڵی (١٩٠٠)دا, دوای ئەویش(فرحان السعدی) هەوڵ و خەباتەکەی دریژە پێدا تائەویش لە تەمەنی (٧٧)ساڵیدا لە سێدارە دراو شەهید بوو..

(دروزە) دەڵێ: (قسام) ڕێی جیهادی بۆ ڕووناك کردینەوە!

بەڵێ.. هەروابوو.. (قسام) توانی بە ئیمکانیاتێکی زۆر کەمەوە لەناو جەماوەرێکی بێئاگاو ناحاڵیدا, جارێکی تر ڕێی جیهاد ڕۆشن بکاتەوەو خۆشی ببێتە سەرمەشق وشەهیدیەکەشی بووە مایەی چاوقایمی و نەبەردی‌و کۆڵ نەدانی موسڵمانان و شاگردەکانی! بەرنامەی (اوراق) اقرا..

**سێیەم/ شێخ ئەحمەد یاسین:**

شێخ ئەحمەد یاسین لەساڵی ١٩٣٨ز لە فەلەستین لە دایك بووەو لە دوانزە ساڵی‌دا لەیاری‌دا ئازاری فەقەراتی ملی دەگات و، ماوەیەك ملی دەگرنە گەچ و پاشان بەهۆی ئەم ڕووداوەوە لاوازو بێهێز دەبێت و زۆر بە ئاسانی بە بچوکترین شت دەکەوێت, بەو حاڵەوە خوێندن تەواو دەکاو دەچێتە زانکۆی ئەزهەرو پاشان دێتەوە فەلەستین و لەگەڵ هەژاری‌وباری تەندروستی خراپیدا, بەهیممەتی بەرزی بزوتنەوەی (حماس)ی دامەزراند.

جوولەکە گرتیان‌و زیاتر باری تەندروستی‌خراپ بوو تا وای لێ هات تەنها سەری دەجوڵاو لەسەر عەرەبانە هاتووچۆی پێدەکرا..

لـە هـەوڵێکی تیرۆریـستی‌دا لـە ئـەردەن دەزگـای سـیخوڕی جوولەکـە ویـستیان (خالیدمشعل ) بکوژن‌و سەر نەکەوتن‌و گیران, ئەمەش بووە مایەی‌ئیحراجی شا حسین‌و بەرامبەر بەئازاد کردنی ئەودوو سیخوڕە ،جوولەکە شێخ ئەحمەد یاسینی‌بەردا..

شێخ ئەحمەد یاسین لەبەرنامەی (شاهد علی العصر)دا پێش شەهید بوونی بەماوەیەك وتی: من پێش ئەوەی لەدایك بم لەخەودا بەدایکمیان وت: تۆ کوڕت دەبێ‌و ناوی بنێ ئەحمەد.. بۆیە کە لەدایك بووم، دایکم ناوی نام ئەحمەد هەرچەند باوکم دوو ژنی تری هەبوو، هەردووکیان زۆر ناو ئەحمەدیان پێناخۆش بوو، بەڵام دایکم بەقسەی نەکردن..

ئەم پیاوە خوای گەورە وەك بیانووی لەش ساغەکان ببڕێت هێشتیەوە تا مانگی سێ ی (٢٠٠٤)، کەبەیانیـەکیان لەنوێـژ گەڕایـەوە خـۆی و چـەند کەسـێك کـە لەگـەڵیا بـوون بەصاروخی فڕۆکەی جوولەکە شەهید بوون..

د. زغلول النجار دەڵێ: ڕۆژێ پێش ئەوەی شەهید ببێ لەخەستەخانەبوو گیانی ئەداو کـەس بەتـەمای نـەبوو، خـوای گـەورە ویـستی وا بـوو کەلەسـەر جێگـا نـەمرێت و بێتـە دەرەوەو شەهیدی ببێ بەنسیبی..

شــەهیدبونی ئــەم نەبــەردە قارەمانــە گیــانی جیهــادو خــەباتی کــردەوە بەبــەری موسڵماناناداو هەموو سەرکردە عەرەبەکانی شەرمەزار کرد..

شێخ بەئاواتی خۆی گەیشت کەهەمیشە دەیووت: (انا طالــب الــشهادة) من بەدوای شـەهادەتدا دەگـەڕێم.. هـەروەها کـەدەیووت: مـن ئاواتـە خـوازم خـوا لـێم رازی بێـت.. کاتێکیش لەبەندیخانەدا بوو دەیوت: من شادمان‌و بەختەوەرم چونکە لـەپێناوی هەقێکدا بەند کراوم کەبڕوام پێیەتی..

بەڕاستی بـانگخوازێکی ماندونـەناس بـوو، تـوانی بـەو حاڵەشـەوە رووبـەڕووی پیلانـی دوژمنـان ببێتـەوە ، نـەك هـەر لـەژیان دا بـەڵکو پـاش مـردنیش.. ڕۆژنامەیـەکی بـەریتانی وتی: ئەگەر ئەحمەد یاسین لەژیاندا بوایە چەندی لەجوولەکە دەکوشت، پاش مردنی‌و بەشەهید بوونی زۆر لەو ژمارەیە زیاتر دەکوژرێ!..

**چوارەم/ ئیمامی نەوەوی:**

ناوی (یحیی) کوڕی (شرف)ی نەوەوییە لەساڵی ٦٣١ی کۆچیدا لەدایك بووە، باوکی پیاوێکی خواناس بوو، (ذهبی) دەڵێ: باوکی پیاوێکی موبارەك بووە..

باوکی نەوەوی دەڵێ: یەحیا شەش حەوت ساڵێك دەبوو شەوی بیستو حەوتی ڕەمەزان خەبەری کردینەوەو وتی: نابینن ژوورەکەمان رووناك بۆتەوە، هەرچەند ئێمە هیچمان نەدی، بەڵام زانیم کە شەوی قەدرەو ئەو لەئێمە پاکترەو خوا وەکو کەرامەتێك پیشانی داوە..

نەوەوی لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: کاتێك لە (نوی) وە چووم بۆ دیمەشق دوو ساڵ تیا مامەوە، لەو دوو ساڵەدا رانەکشام لەناو جێدا بۆ نووستن.. وتیان: ئەی چۆن دەنووستی؟ وتی بەسەر کتێبەکانمەوە کەزۆر ماندوو دەبووم خەوم لێدەکەوت !

شایانی باسە کەخەبەریشی دەبۆوە بەم حاڵەشەوە دەیووت: (انا لله ضیعنا مدة من الزمن)!.

چەند ساڵ سەری لەزانایان دەداو شەوو رۆژی دوانزە دەرسی دەخوێند کەزیاتر بوون لەدوانزە سەعات..

بەشەو شەونوێژی دەکردو زۆرجاریش بەڕۆژ بەڕۆژوو بووە، ئەمە بێجگە لەوەی کە شەوو رۆژی یەك ژەم نانی خواردووە !ناسراوێکی دەڵێت: شەوێك چوومە مزگەوتی دیمەشق، گوێم لێ بوو لەپاڵ پایەیەکدا شەو نوێژی دەکردو ئایەتی ( وقفوهم انهم مسؤولون ) ی بەگریانەوە دووبارە دەکردەوە، ئەوەندە سۆزو خواناسیو خشوعی تیا بوو زۆر کاری تێکردم..بەڵێ.. هەستی بە بەرپرسیاریەتو مەسئولیەت دەکرد، خواخوای بوو فریا بکەویو کارێك زیاتر بکات ، تەنانەت بواری نەبوو لە سەرقاڵیدا ژن بهێنێت ! شەوێکیان شتی دەنووسی چراکەی سوتەمەنی تیا نەما، بەفەزڵی خوا نەکوژایەوە هەتا هەموو شتەکانی نووسیەوەو تەواوی کرد.. دەڵێن جارێك کە شتی نووسیوەو تاریك بووە سەر پەنجەی خۆیو قەڵەمەکەی رووناك بوونەتەوە تا تەواو بووە، دیارە ئەمەش کەراماتێك بووە خوا پێی داوە..

پیاوێکی پارێزکار بووەو، وەرعی بەجۆرێك بووە کەلەو ماوەیەی ژیانی کە لەدیمەشق دا بووە، میوەی نەخوارد، دەیووت : زۆر لەباخو بێستانەکان وەقفی منداڵی هەتیونو

خۆیان هیچیان پێناکرێ و سەرپەرشتیارەکانیشیان بەجۆرێك دەجولێنەوەو هەڵسوکەوت دەکەن کەجێی (ڕاجیاوازی) و خیلافە..

لەژیانی پڕ بەرەکەتیا کە نزیکەی چل‌وپێنج ساڵێك ژیا زۆر بەرهەمی نایابی هەبوو، وەك:

١-ریاض الصالحین، کەلەدوای قورئانەوە زۆرترین چاپکراوە لەدنیاداو بۆ چەندەها زمان وەرگێڕدراوەو سوودی زۆری لێبینراوە.

٢-الاذکار، ئەمیش ئەو پەڕاوەیە کەبوو بوو بەپەندو و خەڵکی دەیان وت: (بع الدار واشتر الاذکار) واتە خانووەکەت بفرۆشەو پەڕاوی (اذکار) ی پێ بکرە..

٣-أربعین النووی.. کەچل فەرموودەی هەڵبژاردووەو زۆر لەموسڵمانان لەبەریان کردووەو بەوانە بەیەکتری دەڵێنەوە...

٤-شەرحی صحیحی موسلیم، کەئەمەش زۆر بڵاوبۆتەوەو ناوبانگی دەرکردووە، لەکاتێدا (قرطبی)یش شرحی موسلیمی کردووە، کەچی وەك ئەو بەناوبانگ نیە..

ئەمە بێجگە لەچەند پەڕاوێکی تر کەمرۆڤ سەرسام دەبێت چۆن فریای ئەو هەموو بەرهەمە کەوتووە، دیارە بەرەکەتی ئیخلاسە .

ئەوەوی لەهەق دا چاونەترس بوو، فەرمانی دەدا بەچاکەو جڵەوگیری دەکرد لەخراپە، تەنانەت کە (ظاهر بیبرس) سەرکەوت بەسەر تەتەرەکاندا، ویستی هەندی باخ و بێستان دەست بەسەرا بگرێت و بۆ سوپاکەی سەرفی بکات، ئەوەوی نامەیەکی بۆ ناردو تیایا ئاگاداری کردەوەو ئەویش بەڕەقی وەڵامی بۆ ناردەوە ، ئەمجارە ئەوەوی زۆر بەتوندتر لەجاری یەکەم سەرزەنشتی کردو لۆمەی کرد لەسەر ئەو کارەی..

پاش چل و پێنج ساڵێك تەمەن، پاش هەوڵ و کۆششی نەبڕاوە، لەدوا هەفتەی تەمەنیدا سەردانی هاوەڵەکانی کردو زۆر گریا لایان و ئامۆژگاری کردن لەسەر پارێزکاری و خواناسی..

بەڵێ.. لەساڵی ٦٧٦ کۆچیدا لە (نوی) مەلی بەرزە فڕی گیانی دایە شەقەی باڵ و دنیای ڕەنج و ماندووبوونی بەیەکجاری بەجێهێشت، هەرچەند ناوی بەهۆی پەڕاوەکانیەوە هەر ماوەو بەخێر باسدەکرێت. (بەرنامەی (اوراق))

## كۆنفرانسی حەوتەمی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەت

لەمانگی سێی ساڵی دوو هەزارو چواردا بەئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە زانایان لە شاری دبی کۆنفرانسی حەوتەمی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەت بەسترا، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر بابەتی ئیعجاز پێشکەش کرا کەسێ ڕۆژی خایاند لەبەیانیان و ئێواران دا، لەو باسانەی کەپێشکەش کرا:

**ئیعجازی ئایەتێک :**

قورئانی پیرۆز باسی شیر دەکات کەجێی تێرامان و وردبوونەوەیەو بەڵگەیە لەسەر دەسەڵاتی بێپایانی پەروەردگارو دەفەرموێت:(وإن لكم في الانعام لعبرة نسقيكم مما في بطونها ولكم فيها منـافع كثيـرة ومنهـا تـأكلون) المؤمنـون/٢١، واتە: بەڕاستی لەبەدیهێنانی ماڵاتیشدا جێگەی سەرنج و پەندە بۆتان ، کە وردببنەوە لێی ، جا لەوەی لەناو سکیاندایە کەشیرە دەرخواردتان دەدەین و، چەندەها کەڵکی زۆری تری هەیە بۆتان، هەروەها لێشیان دەخۆن..لەئایەتێکی تریش دا بەدرێژ ترو زیاتر سەرنجمان رادەکێشی و دەفەرموێت: (وإن لكم في الانعام لعبرة نسقيكم مما في بطونه من بين فرث ودم لبنـا خالصا سائغا للشاربين) النحل/٦٦،

واتە/بەڕاستی لەمەڕو ماڵاتدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێرامانە، تێراوتان دەکەین لەوەی لەسکەکانیاندایە، لەنێوان گژوگیاو خواردنی هەرسکراوو خوێنەوە شیرێکی پاک و بێگەردو خۆش و بەتام بەرهەم دەهێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە..

بەڕاستی سەرنج راکێشان بۆ شیر کە دروستبوونەکەی چەند گرنگە موعجیزەیە و بەعەقڵی کەسدا نەهاتووە لەو ڕۆژگارەدا ، زۆر لەشاعیرو وێژەوانانی ئەو سەردەمە سەرنجیان بۆ (عەرەق) راکێشاوەو چەندەها ناویان لێناوەو بەباڵایدا شیعرو شانامەیان هەڵداوە، بەڵام کەس تا ئەم سەدانەی دوایی ئاوا باسی شیرو پێکهاتنی و گرنگی‌یەکەی نەکردووە کەڕۆژ بەڕۆژ شتی زیاتری لێدەردەکەوێت .

باشە، هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەرحەزرەت (ص) کەپیاوێکی نەخوێندەوار بووەو هیچی لە (تشریح) و (طب) ی بەیتەری نەزانیوە چۆن باس لەوە دەکات کەبەهۆی خواردنی هەرسکراوو خوێنەوە ئەو شیرە پێک دێت و دەگوێزرێتەوە ناوگوان ، مرۆڤیش

دەیدۆشێت و سوودی زۆر لەڤیتامین و پرۆتینەکانی دەبینێ.. ئەگەر ئەمە موعجیزە نەبێ و خوا لەقورئاندا نەیهێنێ، کێ هەزارو چوار سەد ساڵ لەمەوبەر زانیویەتی خوێن لەمەسەلەی شیردا دەوری هەیە ، خوێن لەکوێ و شیر لەکوێ ؟!

زانایەك لەو کۆنفرانسەدا سەرنجی ئامادەبووانی راکێشا بۆ وشەی (بطـون) بۆچی لەهەردوو ئایەتەکەدا (بطون) بەکۆ هاتووە، مەگەر مەڕو ماڵات یەك سکی هەیە یان چەند سکێك؟!، لەسەدەی نۆزدەوە زانرا کەمەڕوماڵات چەند سکێکیان هەیەو ئەو سکانە کاریگەریان هەیە لەسەر دروستکردنی ئەو شیرە..( ئەو سکانە یان ئەو ورگانە ، یەکێکیان ئەوەیە کە دەکرێ بە گیپەو ، یەکێکیان شیلاوگە و ئەوی تریان کلاوقازی پێدەوترێت وچوارەمیشیان بەکارنایەت ) ..

شایانی باسە لەفەرموودەیەکیشدا حەزرەت (ص) لەبارەی گرنگی شیرەوە دەفەرموێت: (من اطعمه الله طعاما فليقل اللهم بارك لنا فيه وأطعمنا خيرا منه ومن سـقاه الله لبنـا فليقل: اللهم بارك لنا فيه وزدنا منه فانه ليس شيء يجزيء من الطعام والـشراب الا اللبن) ابوداود والترمذي عن ابن عباس.

واتە: هەرکەس خوای گەورە خواردنێکی دایە با بڵێ: پەروەردگارا بەرەکەت بخەرە ناوی و چاکترمان پێ ببەخشەو، هەرکەسیش خوای گەورە شیری پێبەخشی با بڵێ: پەروەردگارا بەرەکەتی تێبخەو زیاترمان بدەرێ لێی، چونکە هیچ شتێك وەك شیر جێی خواردن و خواردنەوە ناگرێت ( ل ٤٦ الرسول/ سعيد حوى) .

**موعجیزەیەکی پزیشکی لەفەرموودەیەکدا :**

دکتۆر عبدالباسط محمدالسید کەمامۆستای (الکیمیاءالحیویة)یە لەمەرکەزی قەومی بۆ لێکۆڵینەوە لەمیسر، لەکۆنگرەی حەوتەمدا باسێکی تازەی زانستی پێشکەش کرد کە (براءة اختراع)ی ئەمریکی و ئەورووپی لەسەر وەرگرت..

باسەکە بریتی بوو لەدۆزینەوەی دەرمانێك لەفەرموودەیەکی پێغەمبەرەوە (ص)، کەچارەسەری نەخۆشی (التهاب الكبد الڤايروسی) دەکات.

د. عبدالباسط لەباسەکەیدا وتی :

حەزرەت (ص) دەفەرموێت (عليكم بالسّنا والسّنُوت فان فيهما شفاء من كـل داء الا السام) (ترمذی ٢١٦٣، ابن ماجة ٣٤٦١، حـاكم ٤/٢٠١) واتە: ئاگاتان لە ڕووەکی سەناو ڕووەکی سەنوت بێت کەچارەسەری نەخۆشیەکانن جگە لەمردن .

شایانی باسە حەزرەت (ص) تەنها لەم فەرموودەیەو فەرموودەیەکی تردا باسی دوو ڕووەك دەکات بەیەکەوە ، کاتێك دیراسەمان کرد بۆمان دەرکەوت کە ئەو دوو ڕووەکە (سنا) و (سنوت) بەیەکەوە کاریگەری تەواویان دەبێتو یەکتری تەواو دەکەن..

سەرەتا هەریەکە لەو ڕووەکانەمان دا بەمشکی تاقیکردنەو بۆ چوار هەفتەو هەموو پشکنینێکمان بۆ کردن، دەرکەوت کەهیچ زیانێکیان نیە.. (چونکە ئەو ڕووەکانە لەلایەن مرۆڤیشەوە دەخورێنو بەکاردەهێنرێن)..

پاشان بیست مەیموونی شەمپازیمان هێناو تووشی نەخۆشی(التهاب الكبد الڤایروسی)مان کردنو دەرمانێکمان دانێ کە لەو دوو ڕووەکەوە دروستمان کردبوو. پاش چلو پێنج ڕۆژ شانزەیان چاکبوونو دوای دوو مانگی تریش دوانیان چاك بوونو، لەبەرئەوە دوانەکەی تریش لاساربوونو دەرمانەکەیان نەدەخوارد چاك بوونەوەیان زیاتر دواکەوت .

ئنجا لەسەر پەنجا مرۆڤی نەخۆش تاقیکرایەوەو (٣٤) یان چاك بوونو لە ئەمریکا پشکنینیان بۆکرا.. سەرەنجام دەرمانەکەمان سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی بەدەستهێناو بەمەش (براءة الاختراع) یان پێدام.. ئێستاش ڕێکەوتووم لەگەڵ کۆمپانیایەکی دەرمانی (هۆڵەندی ئەمریکی)دا، کەئەو دەرمانە بەرهەم بهێننو بیخەنە بازاڕەوەو، مەرجێکیشم لەسەر داناون کە دەبێ جێبەجێی بکەن ئەویش ئەوەیە کە لەسەر دەرمانەکە بنوسرێ (ئەم دەرمانە لەفەرموودەی محمد پێغەمبەرەوە(ص) وەرگیراوە)..

### قورئانو دڵئارامی!

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت (ألا بذكر الله تطمئن القلوب) غافر ...

واتە: بەڕاستی بەیادی خوا دڵان ئارام دەبن.. ئەم ڕاستییە لەهەموو کاتو شوێنێکدا هەستی پێکراوەو دڵان بەیادی خوا ئارام بوون، لەکاتێدا کەهیچ شتێك نەبووە فریایان بکەویو بێت بەهانایانەوە..

(علی) کوڕێکی فەلەستینی چەپڕەو بوو، لەبەر خراپی باری گوزەرانی کۆچی کرد بۆ (پۆڵەندا)، لەبارەی گەڕانەوەی بۆ ئیسلام لەچاوپێکەوتنێکی کەناڵی (إقرأ) بەرنامەی (المسلمون فی الغرب) دا شەوی ۱۹/۲۰ی/۳/۲۰۰٤ دا وتی:

من کە لەپۆڵەندا بووم، ئەو موسڵمانانەی کە لە (جمعیاتی طلبە ی اسلامی)یەوە دەهاتن بۆ بانگەوازکردن دژایەتیم دەکردن و کارەکەم لێتێك دەدان..

(ئیڤۆنا) ئافرەتێکی رێکوپێکی پۆڵەندی بوو، خووڕەوشت جوان بوو بۆیە پاش یەکترناسین خواستم، ئەویش لەبەرئەوەی من بەناو موسڵمان بووم هەندێ پرسیاری ئاینی لێدەکردم، منیش زۆر بە (منطق)ی وەڵامم دەدایەوە .

رۆژێك ویستم بگەڕێمەوە بۆ سەردانی خزمانم لە (یۆنان) ، پارەکەم کەم بوو، بۆیە نەمتوانی هاوسەرم لەگەڵ خۆم ببەم، ناچار بووم کە لەبەشی ناوخۆیی زانکۆ بەتەنها بەجێی بهێڵم، لەبەرئەوەی کاتی پشووداني هاوینیش بوو، زانکۆ چۆڵ و هۆڵ بوو، قوتابی تیا نەمابوو..

(ئیڤۆنا) وتی: ئەگەر بەتەنها ترسام و تووشی دڵەڕاوکێ بووم چی بکەم، منیش (قل هو الله) و (لا الـه الا الله)م لەسەر کاغەزێك بۆ نووسی و وتم: ئەگەر تووشی شتی وا هاتی، ئەمانە بخوێنە..

ئیتر چووم بۆ سەفەرەکەم و کە گەڕامەوە، هاوسەرەکەم وتی: دەمەوێ موسڵمان ببم ، وتم: ئەوە دەڵێی چی؟! ئیسلامی چی؟! من ئەوا عارەق و مەشروباتم بەدیاری هێناوە بۆهاوەڵانم و بەنیازم بۆ یان بەرم.. ئنجا با بزانم چی وای لێکردوویت موسڵمان ببیت ؟؟.. وتی: شەوێکیان کە تەنها بووم ترسێکی زۆر زۆرم لێنیشت و وەك شۆڕەبی هەموو گیانم دەلەرزی !

وەك گاورەکان نوێژم کرد هیچ سوودی نەبوو، بیرم کەوتەوە ئەو کاغەزە بخوێنمەوە کە بۆت نووسیبووم، کە کاغەزەکەم خوێندەوە چەند جارێك ، دڵم ئارام بوو بەجۆێك بەدڵنیایی نووستم و تا بەیانیش دڵنیاییەکەم بەردەوام بوو.. بەمەدا بۆم دەرکەوت کەئەم دینە هەقە و ڕاستە و مایەی دڵئارامی و شادمانییە..

بەڵێ.. خێزانەکەم بەڕاستی ئیسلامی وەرگرت و هیدایەتەکەی ئەو بووە مایەی هیدایەتی مینش..

ئێستاش بەیەکەوە خەریکی بانگەوازین بۆ ئیسلام و نزیکەی دوانزە ساڵە خزمەت بەئیسلام دەکەین‌و، توانیومانە بەفەزڵی خوا چەندەها پەڕاو وەربگێڕین بۆ سەر زمانی پۆڵۆنی ، لەکاتێکدا کەپەڕاوی ئیسلامی بەو زمانە نەبوو لەکتێبخانەکاندا..

هەروەها لەزۆربەی شارەکاندا وتار دەدەین‌و خەڵکیش موسڵمان دەبن، تەنانەت لە دواخێوەتگەی ژناندا نزیکەی سەدئافرەتی پۆڵەندی موسڵمان بوون..

دەمانەوێ قورئانیش بەزمانی پۆڵەندی ڕاڤە بکەین تا خەڵکی بتوانن زیاتر تێی بگەن‌و سوودی لێببینن .

شایانی باسیشە زۆر لەو قوتابیانەی ئێستا بوون بە دکتۆرو مهندس لەم وڵاتەو پێشتر چەپڕەو بوون ، گەڕاونەتەوە باوەشی ئیسلام‌و کار بۆ خزمەتی بەرنامەی خوا دەکەن..

( ئیڤۆنا )ش دەڵێ :

پۆڵۆنیەکان پرۆتستانتن‌و لەبەرئەوەی پاپاش لەوانە شانازی پێوە دەکەن، خەڵکی هیچی وا نازانن لە بارەی ئیسلامەوەو ئەوەش کە دەیزانن ناتەواوو شێوێنراوە ، من کەجاوو گوێم کرانەوە هەستم بە بۆشاییەکی گەورە دەکرد لە دەروونمدا، بۆیە کە ڕێم لە ئیسلام کەوت هەروەك ئیسفەنجێکی وشك چۆن ئاو هەڵدەمژێ‌و تێراو دەبێ ، منیش بەئیمان‌و ئیسلامەتی بۆشایی دەروونم پڕ بووەوە..

من قەدەرم وا بوو کە (علی) بناسم‌و ببێتە هاوسەرم‌و لەو ڕێگایەشەوە ئیسلام بناسم، سوپاس بۆ خوا، دوای دوو ساڵ لەموسڵمان بونیشم کەدڵنیا بووم لە ئیمان‌و ئیسلامەتیەکەم‌و زانیم (حیجاب) فەرزە ، خۆم داپۆشی لە کۆمەڵگایەکدا کە بەلایانەوە سەیر بوو، جا خەڵك هەرچۆنێك بۆ حیجاب بڕوانن من شانازی‌دەکەم بەحیجابەکەمەوە چونکە فەرمانی خوایە .

(ئێمە لە کۆمەڵگایەکی نیوە موسڵمان ونیوە ماددی‌دا وەك ئەوان ڕەنگە هەست بەو تینوێتی شکانە نەکەین ، لە کاتێکدا قورئان بە ئاشکرا باسی دەکات و دەفەرموێت (الذين كفروا اعمالهم كسراب بقيعة يحسبه الظمآن ماء حتى اذا جاءه لم يجده شيئا ووجد الله عنده فوفاه حسابه ، والله سريع الحساب ) النور ٣٩ ..

واتە :ئەوانەی بێباوەڕن کردەوەکانیان وەك ئەوەیە هەموو تەمەنیان تینوو بن و دوای سەراب کەوتبن ، کاتێك تەمەنیشیان تەواو دەبێت دەزانن دوای سەراب کەوتوون

وتینویێتیـان ناشـکێت و ، تـازه کـاریش لـەکار تـرازاوەو مـردن یەخـەی گرتـوون و خـوای گەورەش لێیان دەپرسێتەوه..)......

## بینای ژیان لەسەر ئیمان

مـرۆڤ بەگـشتی و بـانگخوازان بەتایبـەتی (خلیفـە)ن، جێنـشینن و خـوای گـەوره لـە نەبوونەوه هێناونێتیه دنیای بوونەوه (وإذ قال ربك للملائكة انی جاعــل فــي الارض خليفة) البقرة: ٣٠، بۆئەوەی كه بینـای ژیـان بكـەن بـەپێی بەرنامـەو نەخشەیپەروەردگار كه لەرێی پێغەمبەرانەوه سەلامی خوایان لێبێت دەهێنرێت بۆ مرۆڤ (هــو أنــشأكم مــن الارض و استعمركم فيها، فاستغفروه ثم توبوا اليه، ان ربي قريب مجيب) (هود: ٦١).

واتە: خوای گەورە ئێوەی بەدیهێناوەو لەزەویدا دایناون بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەویو پـەرەدان بـەژیان، بـەپێی بەرنامـەی ئیمـانو ئیـسلام، جـا هەرچـەند لـە شـارێ لاتـان داو دوورکەوتنـەوە بگەرێنـەوەو تەوبـە بکـەنو داوای لێخـۆش بـوون بکـەن لـەخوا، بەڕاسـتی پەروەردگار نزیکەو وەڵامتان دەداتەوەو دێت بەهاناتانەوه..

مـرۆڤ نابێتـە مەلائیکـەو، معـصوم نیـە، بۆیـە ئەگـەر لاواز بـوو، شـەیتان زەفـەری پێبرد لەهـەر کاتێکـدا، بەتەوبەیـەك کارەکـەی ڕاسـت دەبێتـەوەو، خـوای گـەورەش میهرەبـانو خۆشەویستە (وأستغفروا ربكم ثم توبوا اليه، ان ربي رحيم ودود) هود: ٩٠.

## هاوکێشەکانی ژیان

هـەروەك چـۆن لەعالـەمی مادديـاتدا، ياسـاو هاوكێـشه هەيـه، كـه زانايـان دەيدۆزنـەوەو كـاری لەسـەر دەكـەن ، بەهـەمان شـێوەش لەعالـەمی مەعنـەويات و مامەڵـەو هەڵـسوكەوتی مرۆڤەكانـدا لـەدنيادا هاوكێـشەی تايبـەت هەيـە كەكاتێك لايـەكی دێتـە دی لاكـەی تريـشی بێگومان دێتە دی بەهۆی كارلێكەكانەوه..

ئاو لەپلەی سەدا دەكوڵێت، ئەمە ياسايەكە، ئەگەر هەر جارەو لەپلەيەكدا بكوڵايە ژيان نەدەبوو، چونكە شتێكی (نەگۆڕ) و (ثابت) نەدەبوو كەكاری لەسەر بكرێت، هـەروەها دوو گەرديلـە هايـدرۆجين و گەرديلەيـەك ئۆكـسجين يـەكبگرن ئـاو پێـك دێـنن لـەبارو زروفـی تايبەتدا..كه ئەمەش ياسايەكی نەگۆڕه ..


$H_2 + O \rightarrow H_2O$

**بەهەمان شێوەش قورئانی پیرۆز باس لە کۆمەڵێ یاساو هاوکێشەی ئیمانی دەکات کە لەژیاندا دێنە دیو دەیانبینین، بۆ نموونە،** (والليل إذا يغشى، والنهار إذا تجلى، وما خلق الذكر والانثى ان سعيكم لشتى) ٤ الليل..

**واتە/ سوێند بەشەو کاتێك دادێت و ، سوێند بە رۆژ کاتێك دنیا رووناك دەبێتەوەو تاریکی دەرەوێنێتەوە، سوێند بەو زاتەی کە نێرو مێی دروستکردووە، بەڕاستی هەوڵو کۆششی ئێوە جۆراوجۆرە (هەیە رێی راست دەگرێو هەشە بەپێچەوانەوەیە)** (فأما مَن أعطى واتقى، وصدق بالحسنى، فسنيُسره لليُسرى) ٧/الليل.

**واتە: ئەوەی ببەخشێ لەماڵو سامانو زانستو.. هتد، پارێزکارو لەخواترس بێو بڕوای پتەوی بەپاداشتی چاکی خوا بێ، ئەوە ئێمە رێگای چاکەکاری بۆ ئاسان دەکەینو سەرەنجام دەیخەینە خێرو خۆشیەوە..**

**کەواتە: بەخشین + پارێزکاری + بڕوا بەپاداشتی خوا .... سەرەنجامی.. ئاسانکردنی رێگای چاکەکاریە بۆیو پاشان بەهەشتی بەرینو هەتا هەتایی..**

**لەلایەکی تریشەوە** (وأما مَن بخل واستَغنى، وكـذبَ بالحُسنى فسنيُسره للعُسرى، ومايُغني عنه ماله اذا تردى) ١١/الليل.

**واتە: ئەوەی رەزیلو چرووك بێتو وا بزانێت پێویستی بەخوا نیەو هەوڵ نەدات لەخۆی رازی بکات و بڕوای نەبێت بەپاداشتی خوایی ئەوە بەرێبازی تەنگانەو ناخۆشدا دەیبەین بەرەو دۆزەخ و تیاچوون..**

**ئینجا باش بزانن کە** ( إن علينا للهُدى ، وإن لنا للآخرة والاولى ) ١٣/الليل.

**واتە: بەڕاستی روونکردنەوەی رێبازی خێرو هیدایەت لەسەر ئێمەیەو بێگومان دەسەڵاتی بێ سنوورمان هەیە بەسەر پاشەرۆژو قیامەتو بەسەر دنیاش دا..**

**خوای گەورە تەوفیقی خراپەکاران نادات :**

**لەکاتێکدا کەخوا یارمەتی چاکەکاران دەداتو کارئاسانیان بۆ دەکاتو دەستیان دەگرێ** (يا أيها الذين امنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا، يُصلح لكم اعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم، ومن يُطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما) ٧١/الاحزاب،

**واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسنو پارێزکار بن، هەمیشە قسەی بەجێو بەسوود بکەن ئەوسا ئیتر کردەوەکانتان چاکو بەجێو پەسەند دەکات**

**و(تەوفیقتان دەدات) و لەگوناهەکانیشتان خۆش دەبێت، جا ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بێت ئەوە بەڕاستی سەرکەوتن و سەرفرازییەکی بێ ئەندازەو بێ سنووری بەدەستهێناوەو، لەلایەکی تریشەوە خراپەکاران کارو کردەوەیان بۆ چاك ناکرێ و یارمەتی نادرێن** ( إن الله لايُصلح عمــل المفــسدين) ٨١/يــونس، و (وان الله لايهدي كيد الخائنين)، ٥/ يوسف.

**واتە: بەڕاستی خوا کاری خراپەکاران چاك ناکات و، بەڕاستی هیدایەتی ناپاکان نادات لەپلان و ناپاکیانداو هەرچی بکەن چەند بەهێزیش بن لاوازیان دەکات** (ذلكــم وأن الله موهِن كيد الكافرين) ١٨/ الانفال.

**لە دنیای خۆشماندا ئەمە بەچاکی دەبینین، یاساناسان دەڵێن: هیچ تاوانێك نیە سەد دەرسەد تەواو بێت و نیشانەیەك بەجێ نەهێڵێ، رەنگە بڵێی چۆن؟ ئاخر نازانی خوا نایەڵێت ، خۆ خوا دنیای بەرەڵا نەکردووە ، هەرچی چی دەکات بیکاو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچێت و شانی پیابکات..**

**خوای گەورە نەك هەر دادپەروەرە (عادل)ە بەڵکو هەموو دادپەروەرەی خۆیەتی واتە (العدل)ە ، بۆیە لەناوو سیفاتەکانی خوادا (العدل) بەکارهاتووە نەك (عادل)..**

**خوای گەورە (منتقم)ە، تۆڵەسێنەو بەزوڵم و ستەم قایل نابێ و لێی بێدەنگ نابێ، چونکە زوڵم و ستەمی لەخۆی حەرام کردووەو لەناو خەڵکیشدا یاساغی کردووەو رازی نابێت کەس زوڵم لەکەس بکات، هەروەك لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە** ( يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته مُحَرَما بينكم فلا تظالموا ) ...

**یاسا و باوی خوا گۆڕینی بۆ نیە :**

**یاساو باوی خوا لەدنیادا قورئان بە (سُنَن) ناوی دەبات و دەفەرموێت** (وأقسموا بــالله جَهد أيمانهم لئن جاءهم نذير ليكونن اهدى من احدى الامم، فلما جاءهم نذير مــازادهم الا نفورا، استكبارا في الارض ومكر السيء، ولايحيق المكر السيء الا بأهله، فهــل ينظرون الا سنت الاولين، فلن تجد لسنت الله تبديلا، ولن تجد لسنت الله تحويلا) ٤٣/ فاطر.

واتە: ئەو کافرو بت پەرستانەی قورەیش زۆر بەگەرمی سوێندیان دەخوراردو دەیانوت: ئەگەر پێغەمبەرێکی بێدارکەرەوە بۆیان بێت بێگومان لە هەموو گەلانی تر باوەڕدارتر دەبن، کەچی کاتێ کە پێغەمبەرێکیان بۆ هات لەسەر کەشیودوورەپەرێزی زیاتر هیچی تریان لێنەوەشایەوە ، چونکە خۆیان بە گەورە دەزانی لە زەویداو پیلانی شەڕو تاوانیان کێشا، لە کاتێکدا کەپیلانی شەڕو تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن، ئەمانە بەدڕایەتی ئیسلام ئەبێ تەنها چاوەڕێی سزای خوا بکەن وەك گەلانی پێشین، ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لەیاساو بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێتو، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن..

ئنجا دەفەرموێت: (اولم يسيروا في الارض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم، وكانوا اشد منهم قوة، وماكان الله ليعجزه مِن شيء في السماوات ولا في الارض، انه كان عليما قديرا) فاطر: ٤٤.

واتە: ئایا نەگەڕاون بەزەویدا، تاسەرنج بدەن و تەماشا بکەن چۆن بوو سەرەنجامی گەلانی پێش ئەمان وچیمان بەسەرهێنان، ئەوانە هێزو دەسەلاتیان لەمان زیاتر بوو، وەنەبێت خوا هیچ شتێك دەستەوسانی بکات لە ئاسمانەکانو لە زەویدا، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشەو بەردەوام زانای بە دەسەلاتو بە توانایە..

قورئانی پیرۆز زۆرگرنگی داوە بەوەی کە موسڵمانان لەو یاسایانە تێبگەن و ڕوون بێت لایان ، هەروەك دەفەرموێت : (يريد الله لِيُبَينَ لكم ويهديَكم سُنَن الذين من قبلكم ويتوبَ عليكم والله عليم حكيم ) النساء ٢٦ /واتە :خوا دەیەوێت هەموو شتێکتان بۆ ڕوون بکاتەوەو ڕێنموونیتان بکات بۆ ئەو یاساوباوانەی کە بەسەر گەلانی ڕابردوودا هاتوون و لێتان خۆشبێت، خوا زاناو دانایە ...

**نموونەکان زۆرن :**

چاوگێڕان بەژیانی خۆمانو خەڵکیدا لەکۆنو نوێدا ئەم ڕاستیانە دەسەلمێننو هەندێکیان دەماودەم دەگێڕدرێنەوەو هەندێکیان لەدوو تویێ پەڕاوێکدا تۆمار کراون و هەندێکیشی بیر دەچنەوە، لیوا روکن (محمود شيت خطاب) لە پەڕاوەکەیدا (عدالة السماء) چەند نموونەیەکی بۆ تۆمارکردوینو مامۆستا ڕاشیدیش لە (صناعة الحياة) دا چەند نموونەیەك باس دەکات، کە دەڵێت :

**یەکەم/ پیاوێك یەکێك دەکوژێو فڕێی دەداتە چاڵێکەوە،** پاش ماوەیەکی زۆر، یەکێك پەیدا دەبێتو لەکێشەیەکەوە دەیەوێت ئەم بکوژێ، رادەکاتو نازانێ لەکوێدا خۆی بشارێتەوە، سەرەنجام ئەچێتە ئەو شوێنەی کەخۆی پیاوەکەی تیا کوشتبوو، دوژمنەکەی هاتو لەوێدا دۆزیەوەو لەهەمان شوێن دا کوشتیەوە (الجزاء من جنس العمل)..

**دووەم/ کاتێك سوپای عوسمانی لەبەغداد کشانەوە،** سەربازێکی تورك پەرتەوازە بوو بوو، لەدەرگای مزگەوتی (أبي الحنيفة) وەستا بوو، بێکەسو بیدەر، نەگبەتێ هات کوشتیو شتەکانی برد، پاش بیست ساڵ ئەو نەگبەتە شەڕی بوو لەگەڵ زەلامێکداو چەقۆیەکی لێدا، لەتاو برینەکەی شپرزە بوو، سەدان مەتر رای کرد تا گەیشتە ناو دەرگای مزگەوتی (أبی حنیفه) و لەویا بەدەما کەوتو مرد !.

**سێیەم/ ئەحمەد جەمال الحریری خوا لێی خۆش بێت بۆی گێرامەوە،** کە لە مەککە (مطوف) بوو، تەوافی بەخەڵك دەکرد، وتی: کوڕم لات سەیر نەبێت کەلاشەی ئەمیر (عبدالاله) لە بەیانی شۆڕشی چواردەی تەموزدا لەبەغدا رایان کێشا، من بەچاوی خۆم دیم لەبەیانی ڕۆژی نوێ شعبان دا لەمەککە، ئەو ڕۆژەی شۆڕشی عەرەبی راگەیەنرا کە (لورنس) سەرکردایەتی دەکرد، عەلی باوکی ئەو (عبدالاله) ە، چووە سەر قەڵای مەککەو بە (حامیە)ی عوسمانی وت کە ئەمین بنو دەستیان بۆ نابەن ، تاخوێن نەڕژێ و بگەڕێنەوەو ئەو ناوچەیە بەجێبهێڵن، ئەوانیش بۆئەوەی لەمەککەدا خوێن نەڕژێت خۆیان تەسلیم کرد، کەچی سەربازەکانیان بەرداو چواردە ئەفسەری عوسمانیش کە لەگەڵیان بوون قاچیان بەستنەوەو بەزیندوویی رایان کێشان تاپاش چەند سەد مەترێك گیانیان دەرچوو، پاشان لەنێوان مەککەو(منی) دا بەمردوویی بەدارا هەڵیان واسین..دیارە کوڕەکەشی لەو موبارەکتر نەبووە !! بۆیە بەڕاستی عەدالەتی خوایە، کەئەو نەگبەتیو تاوانە خوا بە(عبدالاله)ی کوڕی رشتو بێجگە لەسزای قیامەت هەر لەدنیادا پیشانی دان.. لاپەڕە ١٢ (صناعة الحياة) ..

**چوارەم/ بەندە ، برادەرێکم بۆی گێڕاینەوە کە لە شەڕی کوەیتدا،** دوو سەربازی کورد لەوێ دەبن، یەکێکیان دەیەوێت خۆی بەرێتە پێشێ لە ئامرەکەیو دەڵێ: قوربان دەچم شتێکت بۆ دێنم، ئەویش لەگەڵ سەربازە کوردەکەی تردا دەینێرێ کە سایەق دەبێت، لەڕێ

سايەقەکە پێی دەڵێت: خوا هەڵناگرێ بۆ شتی وا دەکەیت ، ئەویش دەڵێت: من دەمەوێ بەهەر نرخێك بێت (ئیجازە) وەربگرم و بگەڕێمەوە سلێمانی بۆ ناو کەس و کارم..

بەڵێ.. ئەو برادەرە دەچێتە سەر ماڵێکی کوەیتی قوڕ بەسەرو دەست دەداتە (نیرکۆندیشن)ەکەیان و دەیهێنێ لەو چلەی گەرمایەدا، هەرچەند ماڵ و منداڵی خاوەن ماڵەکە دەپاڕێنەوە سوودی نابێت .

کە دەیهێنێ بۆ ئامرەکەی، لەبەرئەوەی شەو کارەبا داناگرسێنن لەترسی هێرشی (حولەفا)، ئامرەکە دەڵێت: ئەو کارەبایەی بۆ ترتیب بکەن باهیچ نەبێ بەم گەرمایە ئێرکۆندیشنەکە بخەینە ئیش و فێنکمان ببێتەوە، سەربازەکەش خەریکی کارەباکە دەبێت و لەگەرمەی سەرقاڵیدا نازانن کارەباکە دادەگرسێنن و کارەبا دەیگرێت و دەیکوژێت..

سەربازە کوردە دەست پاکە بەویژدانەکە دەڵێت: خوا ئاگادارە من لاشەی ئەو برادەرەم بەئیجازە هێنایەوە کەبەتەما بوو بەو زوڵم و ستەمە ئیجازە وەرگرێ؟!!..، وەری گرت بەڵام بەمردوویی.. ئەوە عقوبەتی خوا.. خوا بمانپارێزێ..

**پێنجەم / حاجی شێخ عومەری قەراخی خزمەە و لەجادەی خانەقا دوکانداره**، بۆی گێڕامەوەو وتی: لەپەنجاکاندا لاو بووم و لە بەستی دەربەندیخان کەتازە دروست دەکرا حەرەس بووم، هەندێ خەڵکیئەو ناوە فێربووبوون دەهاتن لەگەڵ حەرەسەکاندا رێك دەکەوتن و بەشەو شتیان دەدزی بەشەریکی..

هاتنە لای من و وتیان: رێبکەوە لەگەڵمان بەشەو بەقەیاغ دێین و شت دەبەین دەیفرۆشین بەشەریکی.. منیش وتم: من خیانەت ناکەم ، یەکێکیان وتی: تا تۆ ئەمە عەقڵت بێت نابی بەخاوەنی هیچ و ناتوانی ژن بهێنی و خۆت دروست بکەت..

خوا ئاگادارە رێم نەدان وخواش ڕزقی حەڵاڵی دام و پاش بیست ساڵێك ئەو کابرایەی وای بەمن وت: کوڕەکەی دەستی گرتبوو هاتە بەر دوکانەکەی من و سواڵیان دەکرد بۆ پارەی عیادەی دکتۆر..

کەئەمەم بینی وتم: سبحان الله بەتەما بوو بەدزی و درۆزنی پێبگات ، دیارە سوننەتی خوا وا نیە لەدنیادا، کەس خێر لەحەرام و دزی نابینێ و بێ بەرەکەتە..

**شەشەم/ شەهیدکردنی پێشەوا ( بەننا )**

پێشەوا بەننا ئەو کەسایەتیە بوو کەموسڵمانانی بەئاگا هێنایەوە لەبەردەم مەترسی هێزە ئیمپریالیزمەکان و لەناو ریزەکانی رێکخستنەکانی ئیخواندا رۆڵی راستەقینەی بۆ لاوان دیاری کردو، هەر ئەو بوو فیکری ئیسلامی لەچوارچێوەی کلێشەی دەستکردی داگیرکارو دوژمنانی ئیسلامدا دەرهێناو لەبەرگی ڕاستەقینەی خۆیدا بۆ هەموو جیهانی ئیسلامی خستەڕوو وتی:

ئیسلام ئاین و دەوڵەتو سیاسەتەو... هتد، بەکرداریش هەموو ئەو بنەما فیکریوعەقیدیانەی پیادەکردو خەڵکی لەسەرتاپای میسرو جیهانی ئیسلامی دا جارێکی تر بینیانو بیستیان .

پێشەوا (بەننا) توانی بەو ڕۆڵە ئەمەکدارانە بەرگری بکات لەقودسو لەپێناوی مەزڵومیەتی قودسو فەلەستیندا تێبکۆشێ، تاجولەکە ریشەکێش بکرێن لە فەلەستین..

دوژمنانی ناوەوەو دەرەوەی میسر پیلانیان دانا و کۆمەڵەی برایانیان هەڵوەشاندو لەبەندیخانەکان توندیان کردن و، پێشەوایان بەتەنها هێشتەوە بۆئەوەی فرسەتی لێبهێننو شەهیدی بکەن..

هەموو دەرگایەکیان بەڕوویدا داخستو وەك باڵندەی ناو قەفەسیان لێکرد، زۆرچاك چاودێریان دەکردو پاشانیش رووخسەی دەمانچەکەشیان لێسەندەوە کەلەو زەمانەدا هەموو سەرۆك حیزبەکان دەمانچەی شەخسیان پێ بوو..

لەکۆشکی مەلیك (فاروق) ەوە پیلان داڕێژرابوو، جولەکەش لەپشت پەردەوە بەهۆی کیژێکی جوانیانەوە کاریان لەسەر مەلیك دەکرد، کەدەستی لەگەڵی تێکەڵ کردبوو..

پێشەوا بەننایان بانگ کرد بۆ بارەگای (شُبان المسلمین) گوایە نوێنەری حکومەتیش ئامادە دەبیٚو دانوستان دەکەن، بەڵام هەرچەند (بەننا) و زاواکەی (عبدالکریم عابدین) چاوەڕێیان کردن نەهاتن..

پێشەوا بەننا بۆ دواجار لەژیانیا پێش نوێژی بۆ کردنو بەکۆمەڵ نوێژی ئێوارەیان کرد، ئنجا هاتنە خوارەوە دەست لە تەکسیەك رابگرن، کە تەکسییەکە وەستا جادە چۆڵو تاریك بوو، ئیمام بەننا سوار بوو لە دواوەو زاواکەی لەتەنیشتیەوە، لەوکاتەدا دوو چەکدار لەبەردەم ئوتومبیلەکەدا پەیدا بوونو تەقەیان لێکردن و بریندایان کردن..

برینەکانی بەننا کەمتر بوون ، بۆیە لە تەکسییەکە دابەزی‌ودوای تاوانبارەکان کەوت، کە ئوتومبیلێک لەپێشتر چاوەڕێی دەکردن، بەننا توانی ژمارەی ئوتومبیلەکە بگرێ کە (۹۹۷۹) بوو..

پاشان بەو برینداریيە سەرکەوتەوە بارەگاکەو داوای ئیسعافی کرد بەتەلەفون، بەڵام ئیسعاف دواکەوت‌و ناچار بەتەکسی‌یەك گەیاندیاننە لای ئیسعافێك‌و پاشان بردیانن بۆ خەستەخانەی (القصر العینی).

لەوکاتەدا کەخەریکیان بوون ، نوێنەری مەلیك هات‌و کەچاوی پێیان کەوت بەتوڕەیی هاواری کرد ( تاوانباران هێشتا نەمردوون ! ) و ئیتر ڕۆیشت..

کەدکتۆر هات ویستی چارەسەری برینەکانی بەننا بکات، فەرمووی حاڵی من باشترە بچن بەلای (عبدالحکیم)ەوە.. جارێکی تر نوێنەری مەلیك هاتەوە ژوورەوەو بەپزیشکەکەی وت من لەلایەن میرییەوە هاتووم بزانم حاڵی بەننا چۆنە، ئەویش وتی: حاڵەتی ترسناك نیەو ئاساییە.

ئینجا بەنناو زاواکەیانیان جیاکردەوەو هەریەکەیان لەژوورێکدا دانا ، ئەوەبوو نوێنەری مەلیك نەی هێشتبوو دکتۆرەکان بچن بەلای پێشەوا (بەننا)دا، تابەهۆی لەبەر ڕۆیشتنی خوێنی زۆرەوە شەهید بوو..

(شایانی باسە لەسەعات (۸,۵) ی شەوی شەممەی ۱۱ی فبرایەری ۱۹٤۹ پێشەوا بریندارکرا لەتەمەنی چل‌و سێ ساڵی‌دا و، بەناهەق خوێنی مجددی سەدەی بیستیان ڕشت).

**ناشتنی پێشەوا بەننا :**

پۆلیسی سیاسی (سەعات یەکی شەوی ۱۱ی فبرایەری ۱۹٤۹) پەیوەندیان کرد بەشێخ (احمد عبدالرحمان بەننا) باوکی پێشەوا (بەننا)و، سەرپشکیان کرد لەنێوان دوو مەسەلەدا، کەلاشەی بەننا بنێژێ‌و هیچ مەراسیمێکی بۆ نەکرێت، یان کەخۆیان بینێژن‌و هەر چاوی پێی نەکەوێت..

باوکیشی ئەوەی یەکەمی هەڵبژارد، لەشەودا لاشەکەیان لەژێر چاودێرییەکی زۆری پۆلیس دا هێنایە ماڵەوەو تەنها باوکی جەرگ سوتاو لاشەکەی شت‌و کفنی کرد، ئنیجا خستیە تابوتەوەو بەسەرشانی (دایکی)بەنناو هاوسەرەکەی‌و وەفای کچی‌و باوکی پیری

برا بەرەو سەر قەبران و، لە قەبرسانی ئیمام شافیعیو ئیمام (اللیث کوڕی سعد) بەخاك سپێردرا.

ئنجا نەیانهێشت تەعزیەی بۆ بگیرێو قورئانی بۆخوێنرێ و، هەرکەس نزیك ماڵیان بکەوتایەتەوە دەیان گرتو لە بەندیخانە توندیان دەکرد، تەنها (مکرم عُبید پاشا) کەپێشتر وەزیر بوو، وە قبطی بوو، توانی خۆی بگەیەنێتە ماڵی پێشەوا بەنناو سەرخۆشی بکات لە کەسوکارەکەی ..

**مەلیك فاروقیش مرد!**

پاش عەزل کردنی فاروق لەلایەن (ضباط الاحرار)ەوە، مەلیکی لێکەوتوو، پاش چەند ساڵێك بەتەنهایی لە (ئیتاڵیا) سەری نایەوە، بێئەوەی کەس پیایدا هەڵبداتو ماستاوی بۆ سارد بکاتەوە، جا ئەمیش هەروەك پێشەوا بەننا هەرکەس پەیوەندی پێوە بکردنایە، حکومەتی میسری نارەحەتی دەکردو توندوتیژی دەنواند بەرامبەری..

پێشەوا بەننا لە (٤٣) ساڵیدا شەهید بوو بۆ خوا ، مەلیك فاروقیش لە(٤٥) ساڵیدا بەتاوانی زۆرەوە گیانی دەرچوو، لەشەوی ١٩٦٥/٣/١٨ دا لەهەمان ئەو سەعاتەدا کەبەنناى تیا شەهید کرا .

ژنانی خێزانەکەی لاشەی بەننایان ناشتو، تەنها باوکیو کوڕەکەی بەننا (ئەحمەد سیف الاسلام) یان لەگەڵدا بوو کەتەمەنی (١٤) ساڵ بوو، بەهەمان شێوەش لاشەی فاروق مایەوە لەقەبرسانی رۆما چاوەڕێی فەرمانی (عبدالناصر) بوون کەرازی بێ و بهێنرێتەوە بۆ میسر.

(عبدالناصر) رازی بوو بەمەرجێك بهێنرێتەوە کەوەك پاشایەك نەنێژرێو کەسی لەگەڵدا نەبێ و لەقەبرسانی (الاسره المالکە)دا نەنێژرێ،بەڵکو لە قەبرسانی ئیمام شافیعیدا تەسلیم بەخاك بکرێ!..

بەڵێ .. بەئەنقەست تەرمەکەی لە ئەسیناوە بەفڕۆکە لە نیوەشەوی (٣١)ی مارسی ١٩٦٥ هێنرایەوە بۆ قاهیرە، کە تەنها خوشکەکانی بەجلی رەشەوە پێشوازیان کرد.. ئینجا بەهۆی ئیجرائاتی ئەمنیەوە درەنگ برا بۆ سەر قەبران وکات گەیشتە سەعات (٩)ی بەیانیو نەشیانهێشت کەس توخنی بکەوێ .

(شایانی باسە کەپێشەوا بەنناش سەعات ٩ی بەیانی بەهەمان شێوە نێژرا)..

مەلیك فاروق تەنها پۆلیس و ژن لەگەڵی دا بوو لەسەر قەبران!! پاشان ئەمیرە فەوزیەی خوشکی داوای لەسادات کرد کەرێی بدات تەرمەکەی بگوێزێتەوە بۆ مزگەوتی (الرفاعی)، ئەویش رازی بوو بەمەرجێ ئەمە بێدەنگ و بەنهێنی بکرێ، جا تەرمەکەیان بەسەیارەیەکی رەش برد بۆ ئەو مزگەوتەو تەنها مجەوری مزگەوتەکە نوێژی لەسەر کردەوەو هەر لەسەعات ٩ی بەیانیدا بوو کە بۆ دووەم جار ناشتیانەوە، پاش دە ساڵ لەناشتنی یەکەم جاری! کەئەمەش عەدالەتی خوامان بۆ دەردەخات کەهەر لەدنیادا مەلیك فاروقی بەو دەردە بردەوەو ئاوا بێ کەس و بێ دەر نێژرایەوە، جا دادگایی قیامەتیش با لەولاوە بوەستێ!؟ (موسوعة الشهداء عبدالحلیم الکنانی).

**حەوتەم : ئاخرشەڕی :**

ئەوانەی کەخراپەکارن و تاوانکارن ئاخر شەڕ دەبن ، بۆ نموونە :

١- حسین علی مازندەرانی کۆمەڵەی بەهائییەکانی دامەزراندو ویستی ئاینێکی نوێ لە ئیسلام دروست بکات کە جیهادی تیانەبێت وخەڵکانێکی نەفامی سەرگەردان کرد ، سەرەنجام شێت بوو ، بەئاخر شەڕی سەری نایەوە ..

٢- غولام ئەحمەدیش بەهەمان شێوە کۆمەڵەی قادیانی دامەزراندو سەرەنجام تووشی تاعون بوو ، لەئاودەستدا گیانی پیسی خراپەکاری دەرچوو.....

٣- سەرەنجامی صدامی دیکتاتۆرو کورەکانی و بنەماڵەکەشی گەورەترین پەندە بۆهەرکەس فامیدەو ژیر بێت .. ئەمانە وهەموو تیاچوونێکی ستەمکارێك تەفسیری ئەم ئایەتەن کە دەفەرموێت :(ولا تحسبن الله غافلا عما يعمل الظالمون )ابراهیم ٤٢.. وامەزانن خوا غافڵ و بێئاگایە لەستەمکاران ، ئەگەر ماوەیەکیش موڵەتیان بدات حیکمەتی تیایە وکاتێ لە ناوی بردن خۆی دەزانێ چۆن لە ناویان دەبات .. ( الغفله /عبدالرحمن المعلمی/١٦٩) ..

## تیاچوونی گەلان

ئەوەی باسمان کرد لەژیانی تاك دابوو ، لەکۆمەڵ وگەلیشدا هەروایەو، چەندەها گەل و کۆمەڵیش بەسزای خواوە گیرۆدە بوون و تیاچوون کاتێك زوڵم و ستەمیان کردووە..مێژووش شایەتە (قل سیروا في الارض فانظروا کیف کان عاقبة المجرمین) النحل: ٦٩.

پێیان بڵێ: بڕۆن بگەڕێن بەزەویدا سەیرکەن سەرەنجامی تاوانباران چۆن بووە !

مامۆستا راشد دەڵێ: چووم بۆ شاری بۆمبی لەخوارووی ئیتالیا، بینیم کە خوا بە (بورکانی فیزوف) پێش دوو هەزار ساڵ هەموویانی لەناو بردووەو بوون بەبەرد، کەبەئاشکرا دیارە رووتوقوت بوونو خەریکی فیسقو فجورو مەی خواردنەوە بوون.. خوای گەورە غەزەبی لێگرتوونو کردونی بەپەندو عیبرەت بۆ هەر کەسێ کە بیبینێ.. ل ١٣ صناعة الحياة.( فليمي دۆبلاژکراوی دەرئەنجامی گەلان / ئارا ) ..

روسیا حەفتا ساڵ زوڵمو ستەمی کرد لەموسڵمانان، سەرەنجام رووسیاو ریسوا بوونو، بەدەست بێکاریو فەسادو خراپەوە دەناڵێننو خوا ئەمریکای بۆ ناردن کەدەسەڵاتو بریقو باقیان نەهێشتن ولە ئەفغانستانیشدا بوونە پەندی زەمانە ، بەڕاستی کورد واتەنی هەموو شتێك لە باریکیدا دەپچڕێت زوڵم وستەم نەبێت کەلە ئەستووریدا دەپچڕێت ..

## دوا وتە

کاتێك موسڵمان بەیەکجاری خۆی دەداتە دەست خواو هەموو پشتو پەنایەکی بە خوای گەورە دەزانێو هەروەك حەزرەت (ص) دەڵێ (اللهم اسلمت نفسي اليك ، ووجهت وجهى اليك ، وفَوَضتُ امري إليك ، والجأت ظهري إليك، رغبة ورهبة إليك ، لاملجأ ولامنجى منك الا إليك ، آمنت بكتابك الذى أنزلت ونبيك الذى ارسلت) بخارى ومسلم.

هەروەها کاتێك دەچێتە رکوع و دەڵێ (سبحان ربي العظيم) و بۆ ئەو خوا گەورە باڵا دەستەش کە کەس لەو (عظـيم) تر نییە و نابێو، هەموو ئەندامەکانی لەشی (خاشع) دەبن لەحزوری خواداو دەڵێت: (اللهم لك ركعت وبك آمنت ولك أسلمت ، خـشع لـك سمعي وبصري ومُخي وعظمي وعصبي) مسلم..

بەڵێ.. کاتێ خوێنو گۆشتو گوێو چاو و مۆخو ئێسقانو دەمارەکانی بۆ خوا (خاشع) دەبێت.. ئینجا تێدەگات کەقەزاو قەدەری خوا بۆی هەمووی خێرەو مایەی ئەجرو پادشاتی دنیاو قیامەتە..

دیارە دنیا بۆ کەس لەبار نییە تاسەر، دنیا دونیایەو کەم کورتو کەم ونزمەو بەرزی راستەقینەو هەتا هەتایی وا لەقیامەتا..

بۆیـه زۆر زەروورە لـەوە تێبگـەین دەسـتکەوتنی مـاڵو سـامان، تەندروسـتی چـاك، نیشانەی رەزامەندی خواو رێز لێگرتن نیە، (فأما الانسان إذا مابتلاه ربه فاكرمه ونعمه فيقول ربی اكـرمن) الفجـر ١٥ ، هـەروەها نـەبوونی و ناخۆشـی و بـەڵاو موسـیبەتیش نیشانەی رسوایی و بێڕێزی نیە (واما إذا مابتلاه فقدر عليه رزقه فيقول رب أهانن).. (كلا) :. نەخێر وا نیە .

دەبێت باشترو روونتر بۆ ئەو مەسەلانە بڕوانین ، کاتێك دایكو باوك بۆ پـەروەردەی منداڵەکـەیان هەنـدێ شـتی لێدەگرنـەوەو هـەموو داوایـەکی جێبـەجێ ناکـەن، لـە ڕوانگـەی منداڵەکەوە دایكو بـاوکی ناهـەقی لەگـەڵ دەکـەن، یـان خۆشـیان ناوێـت، یـان.. لەکاتێکدا هـەموو دەزانـین کـەدایكو بـاوك منـاڵ بەپارچـەیەك لـەخۆیان دەزانـن و لـەخۆیان خۆشـتر دەوێت !..

(ولله المثل الاعلى).. خـوای گـەورەش کەئـەم مرۆڤـەی لـە نەبوونـەوە هێناوەتـە بـوون، (رؤوف رحـيم)ە بەرامبـەری، ئەگـەر شـتێکی لێبگرێتـەوە حیکمـەتی تیایـەو لـە بەرژەوەندییەتی.. لەفەرموودەدا دەفـەرموێت: (إن الله ليحمي عبده المؤمن مـن الـدنيا وهو يحبه كما يحمي أحدكم مريضه) واتە: بەڕاستی خوا بەندەی بڕواداری خۆی لـەدنیا دەپـارێزێ لەبەرئـەوەی خۆشـی دەوێـت ، هـەروەك چـۆن یـەکێ لـەئێوە نەخۆشـەکەی دەپارێزێت..

ئاشکرایە مرۆڤ دەست دەداتـە زۆر شت، وەك هۆکارەکانی ژیـان کەپێویستە دەستی باتێ و دەستەوسان نەبێ و بێکارە دانەنیشێ، بەڵام چەند دێت بەدەستیەوە؟! دیارە ئەمە تەوفیقی خوای دەوێت کەهەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا بەفەرمانی ئەوە..

ڕۆژێك سوفیانی ثوری لەوپـەڕی بێتاقـەتی و بێـزاری دا دەبێـت لـەبارو وەزعـی دنیای ، هاوەڵێکی پێـی دەڵێت: (يا سفيان إن منع الله كله عطاء، لأنه لايمنع من بخـل، إنمـا نظرا و اختبارا) (صراطنا المستقيم/ محمد احمد الراشد).

واتە: سوفیان بزانە، مەنعی خوا، کاتێك شتێك نـادات لەڕاستیدا بەخشینە، چونکە ئەو لەبەخیلی نیە کەنابەخشێ، بەڵکو لەبەر تاقیکردنەوەو قەزاو قەدەرێکی خێرە..

ناسری سوبحانی بەڕەحمەت بێت دەیووت: ئێمە لەسەرمانە چی بکەین و چۆن بکـەین، ئینجا چی دەبێت با ببێـت، ئـەوە کـاری خوایـەو ئـەنجامی شتەکان ئـەو بەفـەزڵ و کـەرەمی

خۆی بڕیاری لەسەر دەدات. هەروەها دەیووت : کاتێك باخەوانێك سالأنە لقەکانی دار مێوێك دەبڕێت ، ئەوەی نەزانێت ڕەنگە بەلایەوە ستەم بێت ، لەکاتێکدا ئەوە دڵسۆزییە بەرامبەری‌و چاکەی لەگەڵ دەکات ، چونکە بەو بڕینە بەرهەمی زیاد دەکات و بەهێز دەبێت ..

مەولەوی‌یەکەی خۆشمان دەڵێت :

خەم خەفەت مەینەت عەشقی پڕ لە خوێن

هەرکامێکیان دێن بابێن بە خێربێن

خەلیفەی پێنجەمیش عومەری کوڕی عبدالعزیز دەیووت : گەیشتوومە حاڵێك کە شادمانم بەهەموو قەزاوقەدەرێکی پەروەردگار ..

بەهیوای دوعای خێرتان تابەیەکگەیشتنەوەیەکی تر بەخواتان دەسپێرم هەردەم شادودروست وسەرفرازبن ..

**سەرچاوەکان**


١- گوڵاوی سەرمۆر /المبارکفوری /وەرگێڕانی بکر حمە صدیق

٢-بەرنامەی صفحات من حیاتی / کەناڵی المجد

٣- بەرنامەی اوراق / کەناڵی اقرا /د.محمد موسی الشریف

٤- بەرنامەی شاهد علی العصر /الجزیرة

٥-بەرنامەی المسلمون فی الغرب / اقرا

٦-گۆڤاری الایمان ژ/١٦

٧-الرسول /سعید حوی

٨-صناعة الحیاة /محمد احمد الراشد

٩-صراطنا المستقیم /محمد احمد الراشد

١٠-موسوعة الشهداء /عبدالحلیم الکنانی

١١- الغفلة /عبدالرحمن عبدالقادر المعلمی

## ناوەرۆك

## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و درووودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارویاوەران..

جوولەکـە لـە نـەوەی کوڕەکـانی (یـەعقوب)ن سـەلامی خـوای لێبێـت , کوڕەکـانی (یـەعقوب)یـش , ئـەو کارەیـان کـرد بـەباوکیان و بەحـەزرەتی (یوسـف)ی برایـان (سـەلامی خوای لێبێت )کەبەدرێژی لەسوورەتی یوسف دا باسکراوە..

ئەمانـە نـەوە دوای نـەوە پیـاوی چـاك و خواناسـیان تیاهەڵکـەوتووە و خراپـەکاری زۆریشیان هـەبووە , چـەندەها پێغەمبـەریان بۆنێردراوە و زۆر بە گـران وزەحمـەت ڕاست بوونەتەوە ..

هـەوڵی کوشـتنی پێغەمبـەرانیان داوەو حـەزرەتی زەکـەریاو یـەحیای کوڕیـان شـەهید کرد , ئەمە بێجگە لەوەی کە بانگخوازو پیاوچاکیشیان دەکوشت .. (وضُـرِبَت علـيهم الذِّلَةُ والمسكنة وباءوا بغضبٍ من الله , ذلك بأنّهم كانوا يكفُرُونَ بآيـاتِ الله ويقتلـون النبيّين بغيرِ الحق , ذلك بما عصَوا وكانوا يعتدون) (٦١ البقرة ).

واتە / بەهۆی لاساری‌یانەوە سوکی وڕیسوایی ولاتی و زەبوونی درا بەسەریاندا وشایانی خەشم وقینـی خـواش بـوون , چـونکە ئـەوان بەڕاسـتی باوەڕیـان نـەدەکرد بەئایەتـەکانی خـوا و پێغەمبـەرەکانیان بەناحـەق دەکوشـت , ئـەوەش بـەهۆی ڕۆچـوونیانەوە لـەیاخی بوون و نافەرمانیدا , هەمیشە دەستدرێژیان دەکرد ..

هەرچی خراپ بوو کردیان بەرامبەر حـەزرەتی (موسـا)ی پێغەمبـەریان و تـا بۆیـان کـرا ئازاریـان دا , تـاپێی فـەرموون ( وإذ قال موسى لقومه ياقومِ لِمَ تُؤذُونني وقد تعلمونَ أنّي رسولُ اللهِ إليكم , فلما زاغوا أزاغ الله قلوبهم والله لايهدي القوم الفاسقين)الصف ٥ .

واتـە : بیریـان بخـەرەوە , کاتێك موسـا بـە گەلەکـەی وت : ئـەی گـەل و هـۆزم ئێـوە بۆچـی ئازاری ڕۆح ودڵم دەدەن , لە کاتێکدا چاك دەزانن کەمن نێردراوی خوام بۆتان , جاکاتێك ئەوان گوێیان بۆ ڕاستی نەگرت و لەهەق لایاندا , خواش دڵەکانیانی لەخشتە بردو مۆری پیانا , چونکە خوا ڕێنموویی گەل وهۆزی تاوانکارو لە سنوور دەرچووناکات .

ئەمە بێجگە لەوەی کە دژایەتیەکی گەورەی حەزرەتی عیسایان کردو هەوڵی کوشتنیان داو سەرەنجام خوا بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و یەکێکی تریان کوشت لەجیاتی کەخوا خستبوویە شێوەی حەزرەتی عیساوە سەلامی خوای لێبێت .

دوژمنایەتیشیان بۆ پێغەمبەری خۆمان (ص)ئەوە پەڕاوەکانی ژیاننامەی حەزرەت کە هەمووی باس دەکەن ..

جوولەکە لە هەرکوێ بووبن هەوڵی ئاژاوەو فیتنە و فەسادیان داوەو قورئان تۆماری کردووە لە سەریان (وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيراً مِنْهُمْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ طُغْيَاناً وَكُفْراً وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَاراً لِلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً وَاللَّهُ لا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ) (المائدة:٦٤)

واتە :ئەو جوولەکە نەفام و خوانەناسانە دەیانووت : خوا دەستی بەستراوە و خێری لە دەست نابێتەوە !! دەك دەستیان بەستراوو بێ خێر بێ و ئیفلیج بێت , دەك نەفرینیان لێبێت , بۆ خۆیان و قسەیان , نەخێر , وانیە بەڵکو دوو دەستەی پڕ بەرەکەتی هەمیشە و بەردەوام کراوەیە , چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت ! سوێند بێت زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان بۆ زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە کوفردا , ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان لەنێوانیاندا بەرپاکردووە , هەرکاتێك دەیانەوێت جەنگ بەرپابکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خوا دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات , ئەوانە زۆر بەپەلە و بەگەرمی هەوڵی بڵاوبوونەوەی فەسادو تاوان دەدەن لەزەویدا , خواش ئەوکەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن .

جوولەکە لە پشت زۆرترین خراپەکانی ئەم دنیایەوەن و لەهەرکوێ بووبن میوانێکی ڕەزا تاڵ بوون و لە هیچ شوێنێك جێیان نەبۆتەوە !

نووسەرێکی جوولەکە کە ناوی (بنسکر)ە گاڵتە بەجوولەکە دەکات و دەڵێ : ( ئەوەی بڵێ جوولەکە گەلی هەڵبژێردراوی خوانیە کوێرە , ئەوان خوا هەڵی بژاردوون بۆ ئەوەی هەموو جیهان ڕقی لێیان بێت ) وە (کلاتزکین)کە ئەمیش جولەکەیە دەڵێت (جوولەکە گەلێکی ڕاڕاو بێ بناغەن و ژیانێکی درۆو فاسید دەژین ) (ل ٤٥ القنبلة) .

جوولەکە فوویان کرد بە بیردۆزی داروین داو دەیانویست بەهەر فرۆفێڵێك بێت دژی دین بەکاری بهێنن و بەخەڵکی بسەلمێنن کە ئەوەی مەیمونن ! هەروەك لەپروتۆکۆلاتی حوکەمای صهیون دا باسکراوە و ، ئەوزانایانەش کەپروپاگەندەیان بۆئەو بیردۆزە دەکرد گۆڤاری (العلوم الامریکیة) لەژمارەی کانونی دووەمی ١٩٦٥ دا لەبارەیانەوە دەڵێ :-

( هەموو ئەو زانایانەی کەباس لە (تطور)دەکەن ئەمانەتی عیلمیان نیەو مەناعەتیان نیە پەنا بەرنە بەرهەرفێڵێ تادەلیلی درۆ بچنن بۆ سەلماندنی ئەوەی کەدەیانەوێت ) ل٢٣٢ القنبلة / ئەمەش وای کرد کە ئێستا لە ئەمریکادا بەرەسمی بیردۆزی داروین لە بەرنامەی خوێندن دا لابرێ و بەتەواوی ڕیسوا بوو !

یەکێ لەپیلانە نوێ یەکانی جوولەکە ئەوەیە کە لەبەرنامەیەکی کەناڵە فەزائیەکاندا باسکرا , کە دەزگای مۆسادی ئیسرائیلی پاش ئازاد کردنی عێراق لەناو عێراقدا کاردەکەن و ژمارەیەکی زۆر لەزانا عێراقیەکانیان تیرۆر کردووەو بەردەوام هەڕەشەش دەنێرن بۆ ئەوانەی تر تا بێزاریان بکەن و عێراق بەجێ بهێڵن ئەمە بێجگە لەوەی کەپێیان ڕادەگەیەنن کە فرسەتی ئیش زۆرە لە ئیسرائیل و هەموو کار ئاسانیەك دەکەن , ئەگەر یەکێکیان بیەوێ بچێت بۆلایان !

نموونەکان زۆرن لەسەر تاوانی جوولەکە لە سەرتاسەری جیهاندا , بۆیە ئەم بەشی چوارەمەی ژیانەوەمان تەرخان کرد بۆ فرۆفێڵ و پیلانی جوولەکەوهەندێ لەو ئایەت و فەرموودانەمان هێناوە کە باسی ناڵەباری جوولەکە دەکەن و ئنجا باسی گەورەترین دۆزینەوەمان کردووە کە ئەویش دۆزینەوەی مۆمیای ئەو کەسانەیە کەخوای گەورە غەزەبی لێگرتن و کردنی بەمەیمون و بەراز کە لە قورئاندا بە (اصحاب السبت)ناویان هاتووە ..

ئاشکرایە دەردی فێڵ و خۆخەڵەتاندن قابیلی دووبارە بوونەوەیە و، بۆ ئەوەی موسڵمانان دووچاری ئەو بەڵایە نەبن , قورئان بۆ پەندو ئامۆژگاری باسی فێڵی جوولەکەی کردووە و پێغەمبەریش ( ص)لەفەرموودەکانیا جڵەوگیری موسڵمانانی کردووە کە تووشی سەرپێچی و فێڵ کردن بن و سەرەنجامیش خوا غەزەبیان لێبگرێت ئەوەتە پێغەمبەر (ص)دەفەرموێت ( لاترتکبوا ما ارتکبت الیهود , فتستحلون محارم الله بأدنی الحیل ) رواه ابو هریرة واسناده جید وأخرجه ابن کثیر / واتە : ئەو تاوانە مەکەن

**کەجوولەکەکان کردیان ، ئەو شتانەی خوا یاساغی کردوون بەفێڵ حەڵاڵیان بکەن بۆ خۆتان .. بۆیە تەوەرەیەکی تری ئەم بەشەمان بۆ ئەم باسە تەرخان کردووە , تاوەکو بەفەزڵی خوا ببێتە مایەی هۆشیاری موسڵمانان وفێڵ نەکەن وخۆیان نەخەڵەتێنن ..**

**کێ لەخوا قسەی ڕاستە !**

**ئاشکرایە ڕاسترین قسەو وتار قسەو وتاری خوایە , قورئان دەفەرموێت** (الله لاإلــه إلاهو , لَيَجمَعَنكَمُ إلى يوم القيامة لاريب فيه ومَن أصدقُ من الله حــديثا)٨٧ النــساء / **واتـە : خوایـە کە بێجگـە لـەو هـیچ خوایـەکی تـر نیـە , سـوێند بـەخوا لـەڕۆژی قیامەتـدا کۆتاندەکاتەوە و هیچ گومانی تیانیە , جاکێ هەیە لەخوا قسەی ڕاستتر بێت ..**

**هـەروەها** ( والذين آمنوا وعملوا الصالِحات سَنُدْخِلُهُمْ جنات تجري مِن تحتهــا الانهــار خالدين فيها ابداً , وعد الله حقاً ومَن أصدَقُ من الله قيلا )١٢٢ النساء

**واتە : ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە , ئەوە لەمەودوا دەیانخەینـە نـاو باخـەکانی بەهەشـتەوە کەچـەندەها ڕووبـار بـەژێر درەخـت و بەبـەردەم کۆشکەکانیاندا دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی ونەبڕاوەو بەردەوام تیایدا دەبەنەسەر , ئەوە بەڵێنێکی خوایە , جاکێ هەیە ڕاستتر و دروستتر لەخوا بەڵێنی خۆی بباتە سەر ؟**

**بەڵێ بەرنامەی خوا بەتەواوی و ئەمانەتەوە گەیەنرایە دەستی (محمد)(ص)و ئەویش بەئەمانەتەوە گەیاندی** (وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدقاً وَعَدْلاً لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُــوَ الــسَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (الأنعام:١١٥) **واتە : فەرمان و فەرموودەکانی پەروەردگارت ئەی محمد (ص)لـەو پەڕی ڕاستی و دادپەروەریدا بەئەنجام گەیشتووە , هـەرگیز شتێك نیـە بیانگۆڕێت , هـەر ئەویش بیسەرە بەگوفتاری هەمووان و , زانایە بەهەموو نهێنی و ئاشکرایەك..**

**ئەم قورئانە هەر لەسەرەتاوە کە دەست پێدەکەیت دەفەرموێت :** (الم , ذلك الكتــاب لاريب فيه , هدىً للمتقين)(البقرة ١ ) .

**واتـە : (ئـەلیف , لام , مـیم ... ئـەو قورئانـە پەڕاوێکـە هـیچ گومـانێکی تیانیـە و مایـەی ڕێنمـایی و سەرچاوەی هیدایەتـە بۆ ئەوانـەی پارێزکـارن و دەیانـەوێ خۆیـان بپـارێزن لـە سزای خوا )..**

**کافرەکـان خۆیـان دەخەڵەتانـدو بـۆ سـەر لێشێواندنی خـەڵکی و دورخـستنەوەیان لـە ئیسلام پڕوپاگەندەی نابەجێیان دەکرد , کەخۆشیان باش دەیانزانی وانیـەو دەیـان وت :**

( وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْماً وَزُوراً , وقالوا أساطير الاولين اكتتبها فهي تُملى عليه بكرة وأصيلا , قل أنزله الذي يعلم السرَّ في السماوات والارض انه كان غفوراً رحيما ) ( الفرقان ٦ ).

**واته : ئەوانەی بێباوەڕبوون وتویانە : ئەم قورئانە درۆیەك نەبێت كە محمد (ص)خۆی هەڵی بەستووە , شتێكی تر نیەو كەسانی تریش یارمەتیانداوە , بەڕاستی ئەوانە بەو گوفتارەیان ستەم و بوختانێكی گەورە دەكەن و قسەیەكی ناڕەوایان كردووە . هەروەها وتویانە : ئەم قورئانە داستانی پێشینەكانەو داوای نووسینەوەیانی كردووە , بەیانیان و ئێواران بەسەریدا دەیخوێننەوە !! تۆ ئەی محمد (ص)بڵێ : ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە بەهەموو نهێنییەك دەزانێت لە ئاسمانەكان و زەویدا , هەرئەویش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبووی میهرەبانە ..**

**هەروەها كافران دەیان وت** (وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلاً قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ) (الرعد:٤٣)

**واتە : ئەوانەی كە بێباوەڕبوون دەڵێن : تۆ پێغەمبەرو ڕەوانەكراوی خوا نیت , لە وەڵامیاندا بڵێ : هەرخوا بەسە كە شایەت بێت لەنێوان من و ئێوەدا , هەروەها ئەو كەسەش كە شارەزای قورئان و كتێبە ئاسمانیەكانە ..**

**دیارە گەورەترین شە[illegible]ی , شایەتی خوای پەروەردگارە كە هیچی لێ ون نابێ و ئاگاداری وردو درشتی ئەم بوونەوەرەیە , هەر لە ئەتۆمێكەوە هەتا هەسارەیەك ..**

(قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ أَإِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُلْ لا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ , الذين أتيناهم الكتاب يَعْرِفونه كما يَعْرِفون أبناءهُم , الذين خسروا أنفُسَهُمْ فَهُمْ لايؤمنون) (الانعام : ٢٠) **واته : ئەی پێغەمبەر (ص)بەوانە بڵێ كەشایەتیان دەوێ لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ . چ شتێك هەیە گەورەترو ڕاستترە لە شایەتیدا ؟! هەرخۆت بڵێ : (الله)ڕاسترین شایەتە , كە شایەتی نێوان من و ئێوەیە . من ئەم قورئانەشم بەوەحی بۆ هاتووە تائێوەو هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە ئاگادارو بێدار بكەم , لەگەڵ ئەم هەموو ڕوونكردنەوانەدا ئایا ئیتر ئێوە شایەتی دەدەن كە بەڕاستی لەگەڵ خوادا چەند خوایەكی تر هەبێت ؟!**

بلێ : من بەش بەحاڵی خۆم شایەتی ناهەق و ناڕەوای وا نادەم و بڵێ : بەڕاستی ئەو خوایە زاتێکی تاك و تەنهایە و من بەڕاستی بەریم لەهەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانکەن بە هاوەڵ و هاوتای ئەو زاتە .ئەوانەی پەڕاوی ئاسمانیمان پێداون لە گاورو جوولەکە , پێغەمبەر (ص)دەناسنەوە هەروەك چۆن منالی خۆیان دەناسنەوە , بەلام ئەوانەی کەخۆیان دۆڕاندو بڕوایان بە (محمد) (ص)نەهێناوە , ئەوە هەر باوەڕناهێنن ..

کەواتە ئەهلی کیتاب کۆمەلێ ڕاستیدەزانن , ئەوانەیان کە بە ئینصافن دان دەنێن بەڕاستی داو ئەوانەش کە دڵیان مۆرکراوە خۆیانی لێ هەڵە دەکەن , ئەم ڕاستیەش چەندجاری تر قورئان جەخت دەکاتەوە سەری .. ئەوەتا هەر لە (الاسراء)دا ئایەتی (١٠٩)دەفەرموێت : (قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّداً , ويقولون سجان ربنا إن كان وعد ربنا لمفعولا , ويخرون للآذقان يبكون ويزيدهم خشوعاً) (الاسراء:١٠٩)

واتە :پێیان بڵێ : (ئەی خوانە ناسان )باوەڕ بهێنن بە قورئان یان باوەڕی پێنەهێنن , بەڕاستی ئەوانەی پێشتر زانیاریان پێدراوە و ڕاستیەکانی تەورات و ئینجیل دەزانن و بەویژدانن ، کاتێك قورئانیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە خۆیان پێناگیرێت , خێرا سەری ڕێزو نەوازشی بۆ دادەنەوێنن و سوژدە بۆ خوا دەبەن و دەشڵێن : پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارمانە, بەڕاستی بەڵێنی پەروەردگارمان هەردێتەدی , (نموونەی ئەوانەش زانای گەورەی جوولەکە عبدالله کوڕی سەلام و (مُخَیرق)بوو کە دواتر باسیان دەکەین )..

بەڵێ قورئان زۆر گرنگی داوە بەو ڕاستیانەی لای جوولەکەو گاورەکان هەیەو دەیداتەوە بەڕوویاندا ..

## بگەڕێن بە زەویدا تا بگەنە ڕاستیەکان

لەقورئاندا باسی دووجۆر گەڕان کراوە بەزەویدا و دەفەرموێت :

(وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاماً) (الفرقان:٦٣) واتە : بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە بەهێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن , کاتیکیش نەفامان بەقسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن , لەوەلامیاندا دەلێن : سلاو . بەمەش ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن و لاناکانەوە

**بەلایانداو گوێیان نادەنێ .. بەڵێ .. ئەمە جۆری یەکەمە لە ڕۆیشتن کە ڕۆیشتنێکە بەسەر زەویدا ( یمشون علی الارض )..**

**جۆری دووەمیش بریتییە لەڕۆیشتن و گەڕان بەزەیدا , گەڕانێك کە بەدوادا گەڕان بێت لەسەر زەوی و لە ناو زەویدا , هەروەك قورئان دەفەرموێت :**

( أو لَمْ يروا كيف يُبدئُ الله الخلق ثُمَّ يُعيده , إنَ ذلك على الله يسير, قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (العنكبوت:٢٠)

**واتە : ئایا سەرنجیان نەداوە چۆن خوا لە سەرەتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت و پاشان دووبارەی دەکاتەوە , بێگومان ئەو شتانە بۆ خوا زۆر سادەو ئاسانە , ئەی پێغەمبەر (ص)پێیان بڵێ : بابگەڕێن بەزەویدا , تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە , لەوەو دواش هەرخوا سەر لەنوێ دروستیان دەکاتەوە بەو شێوەیەی کەخۆی دەیەوێت , بەڕاستی خوا دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.**

**ئەمە گەڕانە بەناو زەویدا بۆ دۆزینەوەی سەرەتاکانی دەست پێکردنی ژیان , کە ئەمەش بەڵگەی تیایە لەسەر دەسەلاتی خواو دووبارە دروستکردنەوەو زیندوکردنەوە ..**

**هەروەها دەفەرموێت :** (أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيماً قَدِيراً) (فاطر:٤٤)

**واتە :ئایا ئەوە نەگەڕاون بەزەویدا , تاسەرنج بدەن و تەماشابکەن , چۆن بوو سەرەنجامی گەلانی پێش ئەمان و چیمان بەسەر هێنان , ئەوانە هێزو دەسەلاتیان لەمان زیاتر بوو , وەنەبێت خوا هیچ شتێك دەستەوسانی بکات لە ئاسمانەکان , یان لەزەیدا , چونکە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زانایەو بەدەسەلات و توانایە ..**

**لە ئایەتێکی تریش دا دەفەرموێت:** ( قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ) (النمل:٦٩) **واتە :پێیان بڵێ : بگەڕێن بەزەیدا و سەیر بکەن سەرەنجامی تاوانباران چۆن بووە ..**

## لەسوودەکانی گەڕان بەزەویدا

قورئان دەفەرموێت ( فَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وهِي ظَالِمَةٌ فَهِـي خَاوِيَـةٌ عَلَـى عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُعَطَّلَةٍ وقَصْرٍ مَشِيدٍ , أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُـونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ) (الحـــج:٤٦) واتە چەندەها شارو شارۆچکەمان لەناوبرد لەکاتێکدا دانیشتوانی ستەمکاربوون , ئەوەتە دەبینیت خانووبەرەکانیان بەسەریەکدا تەپیوە , بیری ئاوی کوێر بووەو کۆشك و تەلاری بەرزو بڵندی زۆریشمان بەچۆڵی هێشتەوەو بێ خاوەن ماوەتەوە ،کە بەڵگەیە لەسەر خەشم و قینی خوا لێیان

ئایا ئەوانە بەزەویدا نەگەڕاون بەدڵ و دەروونێکی هوشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە , کوان خەڵکانی ڕابردوو؟؟ , ئەو شارانە بۆ کاولکران ؟ کێ ئێمەی دروست کردووە ؟ ئامانج لەژیان چیە ؟ ! یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەر هاتەکانیان ببیستن و لێکی بدەنەوە , چاوە نەبێت چاوان کوێر بووبێت , بەڵکو ئەو دڵانە کوێردەبن کەوان لەسینەکاندا (چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و وردنابنەوە ).

لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت ( أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِـنَ الْقُـرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ أَفَلا يَسْمَعُونَ) (السجدة:٢٦)

واتە ئایا ئەوە پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن لەوەی ئێمە پێش ئەمان چەندەها جیل و نەوەمان لەناو بردووە , بەناو ماڵەکانیانا دێن و دەچن , بەڕاستی ئالەو دیمەنانەدا بەڵگەی زۆر بەهێز هەیە لەسەر دەسەڵاتی ئێمە , ئایا ئەوە نابیستن ؟!

ئەو گەڕانەش بەپێی قەدەری خوا لەکات و شوێنی تایبەت دا دەبێتە مایەی دۆزینەوە , عومەری کوری خطاب کاتێك پرسیار دەکرا لەهەندێ ئایەت یان شتانێك کە تێی نەدەگەیشتن دەیفەرموو واز لەم شتانە بێنن تا ئەو کاتەی کەخوا ڕێ دەدات بە عەقڵەکان کەبیدۆزنەوە

### ئەصحابی السبت

قورئانی پیرۆز لەبارەی دانیشوانی ناوچەیەکی گوێ دەریاوە کەجوولەکە بوون لەچەند شوێنێکدا سەرگوزەشتەیان باس دەکات تاببێتە پەندو عیبرەت و دەفەرموێت

**یەکەم /** (وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَوْا مِنْكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ، فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ) (البقرة:٦٦)

**واتە :سوێند بەخوا بێگومان زانیوتانەو ئاگادارن چیمان بەسەر ئەوانە هێنا ڕۆژانی شەممە دەستدرێژیان دەکردو لەسنوور دەردەچوون , لەبەرئەوە بڕیارماندا و وتمان : ببنە مەیموونی دوور خراوە لە ڕەحمەتی خوا , ئنجا ئەو بەمەیموون کردنەمان گێڕا بەپەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی هاوچەرخی ڕووداوەکە بوون بۆئەوانەش لەدوای ئەوان دێن , هەروەها کردمانە ئامۆژگاری بۆخواناس و پارێزکاران ..**

**دووەم /** (قل يا أهل الكتاب هل تنقمون منا إلا أن امنا بالله) **واتە/**

**ئەی** (محمد)(ص)**پێیان بڵێ بەو جوولەکەو گاورانەی گاڵتە بە ئاینەکەتان دەکەن : ئایا ئێوە ئەوە لەئێمە دەکەن بەعەیب و لەکە ، کەبڕوای تەواوو ڕاستمان بەخواو پێغەمبەرانی هەیە ؟!** (وما أنزل إلينا )**هەروەها ئەوەمان لێ دەکەن بە لەکە کە ئیمانمان بەو قورئانە هەیە کە نێردراوە بۆ سەرمان** (وما أُنْزِلَ مِن قبل ) **هەروەها ئەونامە ئاسمانیانەش کە لەوەو پێش نێردراون بۆ سەر گەلەکانی تر , دەی ئەم بیروباوەڕەمان نابێتە عەیبەو شایانی ڕەخنە گرتن نیە** (وأن اكثركم فاسقون) **کە لەڕاستیش دا ئێوە زۆربەتان فاسقن و دوورن لە ئاین ..** (قل : هل انبئكم بِشَرٍ مِنْ ذلك )**ئنجا پێیان بڵێ ئەی محمد** (ص) **: ئایا پێتان ڕاگەیەنم ئەی گاڵتەکەران , کەدەڵێن :پێمان وانیە ئاین لەئایینی ئێوەخراپتر بێت ! پێتان بڵێم کێ خراپترە لەخاوەنی ئەو ئاینەی کەئێوە ڕقتان لێ یەتی و گاڵتەی پێدەکەن ؟** (مثوبة عند الله )**لەبارەی تۆڵە و سزای خراپەوە لای خودا** (مَن لعنه الله وغضب عليه ) **ئەوە خراپەی ئەو کەسەیە کەخودا نەفرینی لێکردووە و لەڕەحمەتی خۆی دووری خستۆتەوەو ڕق و خەشمی لێیەتی و** (وجعل منهم القردة والخنازير )**کردنی بەمەیموون و بەراز و** (وعبد الطاغوت)**کردنی بەگوێرەکە پەرست و بت پەرست وملهوڕ پەرست :** (أولئك شرٌ مكاناً واضل عن سواء السبيل ) (المائدة : ٦٠ )

**ئەوانە جێگایان خراپەو ئاکامیان شەڕەو ڕێگایان لێ وون بووەو گومڕا و سەرگەردانن .**

**سێ یەم / (** وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعاً وَيَوْمَ لا يَسْبِتُونَ لا تَأْتِيهِمْ كَذَلِكَ نَبْلُوهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ) (الأعراف:١٦٣)

**واتە : پرسیار لەجوولەکان بکە دەربارەی ئەو شارەی کە لە گوێ دەریا بوو , لە کاتێکدا ئەوان لە ڕۆژی شەممەدا سنووریان دەشکاند (کەبڕیار بوو ڕۆژی شەممە تەرخان بێت تەنها بۆ خواپەرستی ) .**

**کاتێک لە ڕۆژی شەممەکەیاندا ماسیە گەورەکانیان بۆ دەهاتە سەر ئاوەکەو , ئەو ڕۆژانەش کە شەممە نەبوو ماسیەکانیان بۆ نەدەهات , ئابەو شێوەیە بەهۆی یاخی بوون و لادانیانەوە تاقیمان کردنەوە .**

**جوولەکەکان داوایان کرد کەخوا ڕۆژێکیان بۆ بکات بەڕۆژی پشوو کەکارو کاسپی تیانەکەن , خوای گەورەش شەممەی بۆ دانان و ئیرادەیانی تاقیکردەوە کە ئایا ڕاست دەکەن لەگەڵ خوادا یان نا , ئەوە بوو بەفەرمانی خوا ماسی گەورە لەشەممەاندا دەردەکەوتن و ئەمانیش چوارچاو دەبوون بۆیان , پاشان ڕۆژانی تر خۆیان دەشاردەوە و، ئەمانیش کاریان ماسی گرتن بوو , بۆیە هەندێکیان خۆیان بۆ نەگیراو شەیتان چووە بنکلێشەیان و کەوتنە فێڵ کردن بەوەی کە لە قەراغ دەریا ئەستێراو دروست بکەن و شەپۆلی دەریا شەمموان ماسی لەگەڵ خۆی دەهێنا بۆ ناوی و دوایی لەحەوزەکاندا گیریان دەخواردو یەك شەممان ڕاویان دەکردن ..**

**لێرەدا خەڵکەکە بوون بەسێ دەستەوە , یەکەمیان ئەم خراپەکارە فێڵبازانە بوون , دووەمیان چاکەکار بوون وخواناس بوون ئامۆژگاریان دەکردن , سێیەمیشیان هیچیان نەدەکردو هەرچەند خراپەکار نەبوون , بەڵام بەچاکە کارانیان دەووت : بۆ چی ئامۆژگاری ئەو خراپانە دەکەن و هەقتان چییە بە سەریانەوە , ئەوانە هیچ سوودی نیە لەگەڵیاناو خوا سزایان دەدات ..**

(وإذ قالت أمة منهم لِمَ تَعِظُونَ قوماً اللهُ مُهلِكُهُمْ أو مُعَذِّبُهُمْ عذاباً شديداً ) **کاتێك کۆمەڵێك لەو خەڵکە , کە بێ لایەن بوون و پێیان وابوو ئامۆژگاری کردن سوودی نیەو دەستیان بەکڵاوی خۆیانەوە گرتبوو بانەیبات , بەبانگخوازە چاکەکارەکانیان ووت : ئەوە ئێوە بۆچی ئامۆژگاری کۆمەڵێك دەکەن کەپەروەردگار بڕیاری لەناوبردنی داون ؟! ئێوە**

نەزانن کەخوا لەدونیادا بەهیلاکیان دەباو لەقیامەتدا سزای سەختیان دەدات ؟!
ئامۆژگاری کارەکانیش وتیان (قالوا : مِعذِرةً إلى ربِّكُمْ و لَعَلَّهُمْ يَتَّقُون )بۆیە : ئامۆژگارییان دەکەین , بۆئەوەی بە ئەرکی سەرشانمان هەستین و لای خوا عوزرمان هەبێ و بڵێین : لە ئاستی خراپەدا بێ دەنگ نەبووین و بەرهەڵستی خراپەمان کرد و، وێڕای ئەوەش ئێمە نائومێد نابین لە گەڕانەوەیان بۆلای هەق و هاتنەوەیان بۆ سەر ڕێی ڕاست و، بەڵکو وریاببنەوەو دەست بکێشنەوە بەئامۆژگاری یەکانمان ..

ئنجا (فَلَمّا نَسُوا ما ذُكِّرِوا بِهِ انجينا الذين ينهون عن السوء وأخذنا الذين ظَلَموا بعذاب بئيس بما كانوا يفسقون ) کاتێك ڕاوچی‌یەکان گوێیان بەئامۆژگارییەکان نەدا و فەرامۆشیان کرد , ئەوانەی کەچاکەکارو بانگخواز بوون ڕزگارمان کردن و ئەوانەش کە ستەمیان کردو هەوڵیان دا بۆ ئەو کارە ناڕەوایە , بەسزایەکی سەخت گیرۆدەمان کردن , بەهۆی ئەوەی لەسنوور دەرچوو بوون .

( فَلَمَّا عَتَوْا عَنْ مَا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ) (الأعراف:١٦٦) کاتێك هەر سەرکەشیان کردو هوشیار نەبوونەوەو دەستیان نەگێڕایەوە لەوەی لێیان قەدەغە کرابوو , پێمان وتن :ببنە کۆمەڵە مەیمونێکی سووك و ڕیسواو دوور لەڕەحمی خوا ..

**چوارەم** / ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقاً لِمَا مَعَكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَطْمِسَ وُجُوهاً فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً) (النساء:٤٧)

واتە : ئەی ئەوانەی پەڕاوی ئاسمانیتان پێدراوە باوەڕ بهێنن بەو قورئانەی کە ناردوومانە و بەڕاست دانەری ئەوەی ئێوەیە , پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە ڕووخسارانێکی بێ دین پان وپلیش بکەینەوە و ئاسەواری دەم و چاو نەهێڵین و بەرەو پشتی بکەین و (وەکو پشتی سەری لێ بکەین ), یاخود نەفرینیان لێبکەین وەکو چۆن نەفرینمان لەخەڵکانی ڕۆژانی شەمموان کرد (کەبەفێڵ فەرمانی خوایان شکاند ), بێگومان هەر فەرمانی خوایە کە هەمیشە و بەردەوام ئەنجامدراوە ..

**چەند سەرنجێك :**

١ ) لەئایەتەکانی پێشەوە تێدەگەین کە ئەهلی کیتاب ئەم بەسەرهاتەیان زۆر بە باشی زانیوە بۆیە دەفەرموێ (ولقد علمتم الذين اعتدوا منكم في السبت ) یان دەفەرموێ

(واسألهم عن القرية التى كانت حاضرة البحــر ) ..**جاكاتێك عبدالله ی کوڕی سەلام لەشامەوە هات بۆ مەدینەو گوێی لەئایەتی :** (ياأيها الذين اوتوا الكتاب أمنوا بما نزلنـا مصدقاً لما معكم من قبل أن نطمس وجودها فنردها على أدبارها أو نلعنهم كمـا لعنـا أصحاب السبت ) **بوو بەپەلە هات بۆلای پێغەمبەرو موسڵمان بوو , چونکە دەیزانی خوا چی بە (اصحاب السبت)کردبوو , وە دەیزانی کە هەڕەشەی خوا ڕاستە چونکە هیچ شتێك نیە بتوانێ ڕێی لێ بگرێت ..**

**کەموسڵمانیش بوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا لەڕێ زۆر دەترسام کەخوا (مەسخم) بکات و شکڵ و شێوەم بگۆڕێت ..**

**(کعب الاحبار )یش لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا موسڵمان بوو خۆی و کەس و کارەکەی بەهۆی ئەو ئایەتەی کە باسمان کرد , جا کەعب کە گوێی لەو هەڕەشەیە بوو یەکسەر وتی ( رب أسلمت ).. پەروەردگار من موسڵمان بووم .. ئنجا دەڵێ کەخۆم شت کاتێ موسڵمان بووم , دەستم دەگێڕا بەدەم و چاوم داو دەترسام خوا مەسخی کردبم ..**
**( ل٢٤٩ القنبلة )..**

**٢) هەندێ لەموفەسیرەکان بۆ ئەوە چوون کە ڕەنگە ئەوانەی کە فەرمانیان بەچاکە نەداوەو جڵەوگیریان نەکردووە لەخراپە خوای گەورە ئەوانیشی سزا دابێت , بۆیە ئیبن عباس خوا لێی ڕازی بێت کە ئەم ئایەتانەی دەخوێندەوە دەگریا لەترسی ئەوەی هەرچی بێدەنگ بێت لە ئاستی خراپەداو بەپێی توانا ڕۆڵی خۆی نەبینێ ، خوای گەورە وەك ئەوانەی باسکران غەزەبی لێ بگرێت ..**

**هەندێکی تریش دەڵێن : ڕەنگە قورئان کەباسی نەکردوون ، ئیهمالی کردبن چونکە شایانی باس نین و هەروا چارەنووسیانی بەنەزانراوی هێشتۆتەوە ..**

**٣) قورئان باسی چەند جۆرێك سزا دەکات کەخوای گەورە سزای خەڵکی پێداوەو ئەوانەش دەگونجێ دووبارە ببنەوە , هەروەك دەفەرموێ :** ( وَلَمَّا أَنْ جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً وَقَالُوا لا تَخَفْ وَلا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّـا امْرَأَتَـكَ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ , إنا مُنْزِلون على أهل هذه القرية رِجْزاً من الـسماء بمـا كـانوا يَفْسُقُون , ولقد تركنا منها أية بينة لقوم يعقلون ) (العنكبوت:٣٥)

واتـه   كاتێـك فریـشتەكان گەیـشتنە لای لـوط , بـەهاتنیان زۆر دڵتـەنگ و غـەمبار بـوو , نەیدەزانی كە فریشتەن و سەری دنیای لێ هاتەوەیـەك , وتیـان   مەترسـەو خـەمت نەبێت ئەوان ناتوانن دەستدرێژی بكەنە سەر ئێمەو ئێمە فریـشتەین , بێگومان ئێمە ڕزگاركەری تـۆو كەسـوكارەكەتین تـەنها هاوسـەرەكەت نـەبێت كـە لـە تیاچـووانە , بەڕاسـتی ئێمـە دابەزێنـەری سـزاو بـەلای ئاسمـانین بەسـەر خـەڵكی ئـەم شـارەدا بـەهۆی ئـەوەی كـە دەردەچوون لەفەرمانی خوا , سوێند بەخوا بەڕاستی سەرەنجام ئاسەوارێكی ئاشكرامان لەشاری كاول ووێران بەجێهێشت  بۆ كەسانێك كەژیرو هۆشمەندبن

ئنجا دێتە سەرباسی (شعیب)سەلامی خوای لێبێت  دەفەرموێت

(وإلى مدين أخاهُم شُعيبا فقال ياقوم اعبدوا الله وارجُوا اليوم الآخـر ولا تَعْثَـوا فـي الارض مُفسدين , فكذَّبوه فأَخَذَتْهُمُ الرجْفَةُ فأصْـبحوا فـي دارِهِـمْ جـاثمين)هـەروەها شـوعەیبمان ڕەوانـەكرد بۆنـاو براكـانی لەشـاری مەدیـەن , پێـی وتـن   ئـەی گـەل و هـۆزم تـەنها خـوا بپەرسـتن , بـەهیوای قیامـەت و ئاینـدە بژین و ترسـی تەنگانـەی ئـەو ڕۆژەتـان هەبێت , گوناهو تاوان و خراپە لەسەر زەویدا ئەنجام مەدەن و مەیچێنن (چونكە زەوی بێ خـاوەن نیـەو ژیانتـان تاسـەرنیە )لەئاكامـدا خەڵك،كـە بڕوایـان پێنـەكرد ,ئیتر بـە بوومـە لەرزەیـەك هـەر هـەموویان لەماڵەكانیانـدا بەچـۆكدا هـاتن ومـردن و بـوون بـەژێر خـاك و خۆڵەوە

ئنجا دێتە سەر باسی گەلی عادو ثمودو دەفەرموێت

(وعاداً وثمودَ وقد تَبَيَّنَ لكم مِن مساكِنِهِمْ وزَيَّنَ لهُم الشيطانُ أعمـالهُمْ فَـصدَّهُمْ عـن السبيلِ وكانوا مُستبصرين)هەروەها (عـاد) ی گـەلی (هـود)و (ثمـود)ی گـەلی (صـالح)یشمان لەناوبردكـە ئاشـكرابوو بۆتـان تیاچـوونیان لەشـوێنەواری كاولیانـەوە , شـەیتانیش كردەوەی نادروست و ناپەسەندیانی بۆ ڕازاندبوونەوە , لەڕێگەو ڕێبازی ڕاست وێڵی كرد بوون , لەكاتێكدا ئەوان خاوەنی عەقڵ و بیرو هۆشیش بوون

ئنجا دێتە سـەر باسـی قـارون و فیرعـەون وهامـان (وقارونَ وفِرعونَ وهامـانَ ولقـد جاءَهُمُ موسى بالبينات فاستكبَرُوا في الارضِ وماكانوا سابقين )واتە   قارون و فیرعەون و هامانیشمان لـەناوبرد ,سوێند بـەخوا بێگومـان موسـا بەڵگـەی زۆری بۆ هێنـان , كەچـی

خۆیان زۆر بەگەورە دانا لەزەویدا , سەرەنجام نەیانتوانی لەسزاو تۆڵەی خوا خۆیان ڕزگار بکەن . ئنجا دێتە سەر باسی هۆی لەناوبردنیان کە گوناهوتاوان کردنە :

( فَكُلّاً أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ فَمِنْهُمْ مَنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِباً وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُمْ مَنْ خَسَفْنَا بِهِ الْأَرْضَ وَمِنْهُمْ مَنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ) (العنكبوت:٤٠)

واتە : ئێمە هەریەکێك لەوانەمان بەسزای تاوانی خۆی گەیاند , جا هەیانبوو بەرد بارانمان کردن ( وەك گەلی لوط ), هەیان بوو دەنگ و سەدای بەهێز (الصیحة)لەناوی برد , هەیانبوو بەناخی زەویدا بردمانە خوارەوە و نغرۆی زەویمان کرد وەك ( قاروون ), هەشیانبوو نقومی دەریامان کرد وەك ( فیرعەون ), جاوەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن , بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد..

جاری واش هەیە خوای گەورە لەبەر حیکمەتێك سزا کە دوادەخات , بۆیە کافران دەکەونە لاقرتێ و گاڵتەکردن و پەلەکردن , کوا خوا بۆ لەناومان نابات ؟؟ هەروەك لەسورەتی عنکبوت دا دەفەرموێت :

( وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلا أَجَلٌ مُسَمّىً لَجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ , يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ , يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ) (العنكبوت:٥٥)

واتە :بێباوەڕان پەلەت لێدەکەن و داوای هاتنی سزا دەکەن , خۆ ئەگەر کاتی تایبەتیمان دیاری نەکردایە بۆ پێشهاتنی , یەکسەر سزایان بۆ دەهات , بێگومان ئەو سزاو تۆڵەیە , لەناکاو یەخەیان دەگرێت ، لەکاتێکدا ئەوان هەست بەنزیك بوونەوەشی ناکەن .

بێباوەڕان پەلەت لێدەکەن و داوای هاتنی سزا دەکەن , بێگومانیش دۆزەخ دەوری کافرانی داوەو هەرگیز لەسزاکەی دەرباز نابن . لە ڕۆژێکدا کەسزا دایاندەگرێت لەسەرویانەوە و لەژێر پێیانەوە و , خوای گەورە پێیان دەفەرموێت : بچێژن سەرەنجامی ئەو کاروکردەوانەی ئەنجامتان دەدا ..

٤) هەرچەند قورئان بەجوولەکە دەفەرموێ (وأن أكثركم فاسقون )زۆربەتان خراپەکارن , بەڵام بە ئینصافەوە باسی هەندێکیان دەکات کەخواناس و چاکن و ئەو دەرگایە بەواڵایی و کراوەیی بەجێ دەهێڵێ بۆ کەسانێك کە بیانەوێت بگەڕێنەوە , هەروەك دەفەرموێت :

(... لَيْسُوا سَوَاءً مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ , وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ) (آل عمران:١١٥)

**واته : گاورو جوولەکە هەموویان یەکسان و چوونیەك نین , بەڵکو لەخاوەنانی کتێب دەستەیەك لەئیماندارانیان هەن , ئایەتەکانی خوا لەکاتەکانی شەودا دەخوێننەوە و نوێژ دەکەن و سوژدە دەبەن , ئەوانە ئیمان و باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیەو فەرمان دەدەن بەچاکەو جڵەوگیری دەکەن لەخراپە و دەست و بردن بۆ چاکەکردن ، بێگومان ئەوانە لەڕیزی چاکەکارو چاکەخوازاندان . ئەو بڕوادارانە هەرچاکەیەك ئەنجام بدەن بەفیڕۆ ناچێت , خواش زانایە بەپارێزکارو دینداران .**

**یەکێ لەوانەش زانایەکی جوولەکە بوو بەناوی** (مُخَيرِق), **کە لەغەزای ئوحد دا , بەجوولەکەکانی وت :** (یامعشر یهود , والله إنكم لتعلمون أن نصر محمد عليكم لحق) **واتە : ئەی کوڕ گەلی جوولەکە بەخوا ئێوە بەڕاستی دەزانن کە سەرخستنی (محمد)پێویستە لەسەرتان ..**

**پاشان چەکی هەڵگرت و چوو بۆ جیهاد و شەهید بوو , وە لەبەرئەوەی وەسیەتی کردبوو کە ئەگەر شەهید بوو ماڵ و سامانەکەی بدرێ بە حەزرەت (ص) چی لێ دەکات بیکات .. ماڵ و سامانەکەشی حەوت باخ بوون حەزرەت (ص)کردی بە وەقفی موسڵمانان لەمەدینەداو پاش شەهید بوونی حەزرەت (ص) فەرمووی (مخيرق خير يهود) واتە موخەیرق چاکترینی جوولەکەکانە ..**

**هەروەها لەئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت:** ( وَمِنْ قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ) (لأعراف:١٥٩) **واتە : کۆمەڵێك لە نەتەوەی ئیسرائیل لە سەردەمی موسادا و پاش لە دنیادەرچونیشی شوێن هەق کەوتن و بەهەق و عەدالەت حوکمیان کردووەو پابەندی بەرنامەی خوا بوون ..**

**٥) کاتێك کۆمەڵی کافران دەوری مەدینەیان داو جوولەکەکانی ( بنی قریظە)پەیمانیان شکاند , خوای گەورە موسڵمانانی سەرخست بەوەی ڕەشەبای نارد داروپەردوی بەسەریەکەوە نەهێشتن و دووبەرەکی تێخستن .. ئنجا حەزرەت (ص)چووە سەر ( بنی**

قريظـه) و گـویّ یـان لیّ بـوو کـه لەسـەر شـووراکانیانەوە جنێویـان بەموسـڵمانان دەدا , حەزرەت (ص)پێی فەرموون (یاإخوان القردة هل أخزاكم الله وأنزل بكم نقمته ؟! )
واتە :ئەی براکانی مەیموون ئایا خوا ڕیسوای کردن و سزا و خەشمی خۆی بۆ ناردن ؟!
ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەکاتی خۆی هەنـدێکیان بوون بەمـەیمون و هەندێکیان بوون بە بەراز , هاوەڵان لەحەزرەتیان (ص)پرسی : ئایا مەیمون و بەرازی ئێستا ئەوەی ئەوانن ؟ حەزرەتیش (ص)فەرمووی : نەخێر هەرکەس خوا مەسخی بکات نەوەی نابێت !
ئنجا ئاخۆ چۆن بوون بە مەیمون و بەراز ؟!

**گەورەترین دۆزینەوە !**

کاتێك هەنـدێ لـە جوولەکەکان کەوتنـە فڕوفێڵ کـردن و حـەڵاڵ کردنـی ئـەوەی کـەخوا لێـی حـەرام کردبوون , خـوای گـەورە کلکـی مـەیموونی لیّ ڕوانـدن و هەندێکیشیان کلکـی بەرازیان بـۆ پەیـدا بـوو , دەنگیـان نـەماو وەك مـەیمون و بـەراز دەنگیـان دەردەهـات , بۆیـە لەماڵـەوە نەهاتنـە دەرەوە , جاکـە خـەڵکی نـەیان بیـنین بـچنە سـەر کـاری خۆیـان و دیـار نەبوون چوون بۆ ماڵەکانیان !! بینیـان (مەسخ)بـوون و شیوازیان تێك چووەو کلکیـان بـۆ پەیدابووەو چـی قسەیان لەگـەڵ کـردن بـە ئیشارەت وەڵامیـان دانـەوە ! ﴿ سـەیری تفسیر جامع البيان / الامـام الطبري / سورة (الاعـراف)بکـە ﴾دیـارە ئەمـەش بەڵایـەکی گەورەیـە و بوون بەپەندی زەمانە , بەرگەیان نەگرت , هەنـدێکیان سـەری خۆیـان هـەڵگرت بـۆ بیابـانی میـسری و هەنـدێکیانیش بـەرەو شام و سـەرەنجام لـەو بیابان و دەشـت و هـەردو چۆڵەدا لەناوچوون , هەندێکی تریشیان پاش چەند ڕۆژێك لەماڵەکانی خۆیاندا گیانیان دەرچوو.
بەپێی عادەتی ئەو زەمانە هەندێك لەوانەیان (مۆمیا)کرد , وەك مۆمیای میسری یـەکان و لـەتابووتی تەختــەدا دایــان نــان کــە هــیچ بزمــاری پێوەنیــە , بـەپێیَ بیروبۆچـوونی جوولەکەکان ..

خوای گەورە کە هـەردەم دەسـتی خێـری بـەم ئوممەتەوەیـە , لەلوتکـەی زەبـرو زەنـگ و تاوانی جوولەکەدا لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٠)دا , ئیرادەی خێری وابوو کەئەم مەسەلەیە بۆ تەسدیقی قورئان ئاشکرا ببێت ..

بـەڵێ .. هەنـدێ لەشـوێنەوار نـاس و پـسپۆڕی موسـڵمانی فەلەسـتینی توانیـان قەبرسانێك بدۆزنەوەو ئەو مۆمیایانە دەربهێنن و وێنەی بگرن ...

مۆمیاکان , قژی سەرو لاشەیان ماوەو دەمیان داچەقیوەو ترس و شپرزەییان پێوە دیارە و هەندێکیان کلکیان هەیە وەك مەیمون و هەندێکیان کلکیان بستێك دەبیٚ وەك بەرازو هەندێکیان ناوقەدیان درێژ بۆتەوەو شێواوە , ئەمە بێجگەلەوەی کەپارچەی تۆڕی ڕاوچیٚیەکانیش دۆزراوەتەوە ..

ئنجا لەبەرئەوەی کە دەستی جوولەکەی نەگاتیٚ , دایان پۆشیەوەو بەنهێنی هێشتیانەوە , تائەو ڕۆژەی وەزعەکە باشتر دەبێت .. پاشان وێنەکانیان برد بۆلای نووسەری میسری (محمد عیسی داوود)و داوایان لێکرد کەبلاٚوی بکاتەوە بەناوی خۆیەوە , ئەویش وێنەکان و باسەکەی لەپەڕاوێکدا بلاٚو کردەوە بۆ جیهان لەساڵی ٢٠٠٢ دا بەناوی ( القنبلة / يهود مسخهم الله قردة وخنازير , اكتشاف القرية حاضرة البحر ) تاببێتە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ئەوانەی کەسنوور شکێنی دەکەن و گوێ نادەن بەفەرمانی خوا ..

## سفرەو خوانێکی ئاسمانی

هاوەڵانی عیسی (سەلامی خوای لیٚ بێت )داوایان کرد لەحەزرەتی عیسا کە داوابکات لەپەروەردگار سفرەو خوانێکیان لەئاسمانەوە بۆ دابەزێنیٚ تالیٚ ی بخۆن و بەم موعجیزەیەش زیاتر دڵنیابن , قورئانیش باس لەم ڕووداوە دەکات لەسوورەتی(مائدة)دا کە لەم ڕووداوەوە ناوەکەی هاتووە دەفەرموێت :

( إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ ؟؟ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ .قَالُوا نُرِيدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ) (المائدة:١١٣)

واتە : کاتێك حەواریٚیەکان وتیان : ئەی عیسای کوڕی مەریەم , ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێت لە ئاسمانەوە سفرەو خوانێکمان بۆ دابەزێنێت ؟ عیسا سەلامی خوای لێبێت فەرمووی : لەخوا بترسن ئەگەر ئێوە ئیماندارن ..

حەواریٚیەکان وتیان : دەمانەوێت لیٚی بخۆین و دڵنیا بین و چاك بزانین کە بێگومان ڕاستت لەگەڵدا کردوین و لەسەریشی ببین بەشایەت ..

**ئنجا** : ( قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنْزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيداً لِأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِنْكَ وَارْزُقْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ .قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ

يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَاباً لا أُعَذِّبُهُ أَحَداً مِنَ الْعَالَمِينَ) (المائدة:١١٥) **حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێبێت دوعای کردو فەرمووی : ئەی خوای پەروەردگار لەئاسمانەوە سفرەو خوانێکمان بۆ دابەزێنە تابێتە جەژن و بۆنەوەکانی ئێستاو داهاتوومان و بەڵگەیەك بێت لەلایەن تۆوە بۆ پێغەمبەرایەتی من و دەسەڵاتی بێ سنوورت و لەرزق و رۆزی بەهرەوەرمان بکە , هەرتۆی چاکترین ڕۆزی بەخش ..**

**ئنجا خواوەند فەرمووی : بەڕاستی من ئەو سفرەوخوانەتان بۆ دادەبەزێنم , جائەوەتان دوای دابەزینی ئەو سفرەو خوانە بێ بڕوابێت و سوپاسگوزار نەبێت , ئەوە بەڕاستی من سزایەکی دەدەم کە سزای هیچ کەسێکم لەجیهانا ئاوا نەدابێت ..**

**هەندێك لەموفەسیرین لایان وایە کە حەواری یەکان لەترسی ئەو هەڕەشەیە پەشیمان بووبنەوەو سفرەیان نەویستبێ و دانەبەزیبێ ..**

**بەڵام فەرموودەیەك کە (ترمذی) ڕیوایەتی کردووە لەعەمماری کوڕی یاسرەوە حەزرەت (ص)دەفەرموێت :** (أنزلت المائدة من السماء خبزاً ولحماً , وأُمروا ألا يخونوا , ولايدخروا لغد فخانوا وادخروا ورفعوا لغد فمسخوا قردة وخنازير ) التاج الجامع للاصول .

**واتە : سفرەو خوانەکە لەئاسمانەوە دابەزی کەنان و گۆشت بوو , فەرمانیان پێدرا خیانەت نەکەن و لێی هەڵنەگرن بۆ سبەینێ , کەچی خیانەتیان کردو لێیان هەڵگرت , خوای گەورە مەسخی کردن و بوون بەمەیمون و بەراز ..**

**جائەگەر وابێ کەواتە ئەم بەڵایەش بەسەر گاورەکاندا هاتووە ..**

## فرۆفێڵ لەخوا ناکرێت

**هەندێ کەس وا دەزانێت ئەگەر تواني شتێك لەخەڵکی بشارێتەوە دەتوانێت لەخواشی بشارێتەوە , یان بەمانایەکی تر چۆن خەڵکی دەخەڵەتێنێ وادەزانی دەتوانی خواش بخەڵەتێنێ , کەدیارە ئەمەش ئەستەمە , چونکە هیچ شتێك نیە لەم بوونەوەرەدا ورد یان درشت خوا ئاگای لێی نەبێت :** ( قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَاماً وَحَلالاً قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ ,وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَشْكُرُونَ) (يونس:٦٠) **واتە : پێیان بڵێ : هەواڵم بدەنێ , ئێوە چۆن لەخۆتانەوە ئەو رزق و ڕۆزیەی**

**کەخوا پێی بەخشیون بەکەیفی خۆتان حەڵاڵ و حەرامی دەکەن , پێیان بڵێ ئایا خوا خۆی مۆڵەتی داون , یان لەخۆتانەوە شت بەدەم خواوە هەڵدەبەستن ؟!**

**باشە , ئاخۆ لەڕۆژی قیامەتدا گومان و بۆچوونی ئەو کەسانە چۆن بێت کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن ؟ ئایا وادەزانن لێپرسینەوە نیە ؟ بەڕاستی لەگەڵ لاری زۆربەی خەڵکیدا خوا هەر خاوەنی فەزڵە بەسەریانەوە , هەرچەندە زۆربەیان بێ ئەمەکن و سوپاسگوزارنین**

( وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ وَلا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ) (يونس:٦١)

**واتە ئەی محمد (ص)تۆبە هیچ کارێك هەڵناسی , هیچ بەشێك لەقورئان ناخوێنیتەوە کەئێمە ئاگادار نەبین , ئێوەش ئەی خەڵکینە بەهیچ هەڵسوکەوتێك هەڵناسن کەئێمە شایەت نەبین بەسەریەوە لەکاتێکدا ئەنجامی دەدەن و تیایدا ڕۆدەچن , هیچ شتێك لەپەروەردگاری تۆ ون نابێت , لەمسقاڵە زەڕەیەکەوە , لەزەوی یان لەئاسمانەوە , بچوکتربێت یان گەورەتر , کە لەدۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادا لای ئێمە تۆمار نەکرابێت.**

**لە سورەتی (سبأ)یش دا جەخت دەکاتەوە سەر ئەمەو دەفەرموێت** ( وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ لا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلا فِي الْأَرْضِ وَلا أَصْغَرُ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ) (سبأ:٣)

**واتە ئەوانەی کافرو خوانەناسن دەیانووت قیامەت هەر نایەت و نامانگاتێ ، ئەی پێغەمبەر (ص)پێیان بڵێ نەخێر وانیە , سوێند بەپەروەردگارم هەر یەخەتان دەگرێت چونکە ئەو زاتە زانایە بەنهێنی و شاراوەکان و ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك لەئاسمانەکان و زەویدا لەخوا ون نابێت , هەروەها لەویش بچوکتر یان گەورەتر نیە لەپەڕاوێکی تایبەتی ڕوون و ئاشکرادا تۆمار نەکرابێت**

**لەگەڵ زانایی بێ سنووری پەروەردگاردا کەسی واهەیە** ( وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ , يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ) (البقرة:٩)

واتە : لەناوخەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن : ئیمان و باوەڕمان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە , ئەوانە لەڕاستیدا درۆدەکەن و بڕوادارنین , ئەوان بەخەیاڵی خۆیان وا دەزانن خواو بڕواداران دەخەڵەتێنن , کەچی جگە لەخۆیان کەسیان پێناخەڵەتێت , بەڵام هەست ناکەن و فام ناکەنەوەو بیرناکەنەوە .

پێغەمبەریش (ص)لەفەرموودەکانیا جەخت دەکاتە سەر فێڵ نەکردن و خۆنەخەڵەتاندن و دەفەرموێت (مابال أقوام يلعبون بحدود الله , يستهزءون بأياته)(ابن ماجه)واتە : چییانە کەسانێك یاری بەسنووری خوا دەکەن و گاڵتە بەئایەتەکانی دەکەن.

هەروەها دەفەرموێت : (والذي نفسي بيده ليبيتن أناس من أمتي على اشر وبطر ولعب ولهو , فيصبحوا قردة وخنازير , باستحلالهم المحارم و أكلهم الربا ) (ئیمام ئەحمەد) واتە :بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە کەسانێك لەئومەتم سەرگەرمی تاوان و زیادە ڕەوی و (لهو)و (لعب)دەبن و , خوا دەیانکات بەمەیمون و بەراز , بەهۆی حەڵاڵ کردنی حەرام و سووخواردنەوە ..

لەفەرموودەیەکی تریشدا دەفەرموێت : (ليشربن ناس من أمتي الخمر , ويسمونها بغير اسمها , يُعزف على رؤوسهم بالمعازف و المغنيات , يخسف اللهُ بهم الارض , ويجعل منهم قردة وخنازير )ابن ماجه .

واتە: هەندێ لەئومەتم عەرەق دەخۆن و ناوی تری لێ دەنێن (وەك ئێستا کەدەڵێن مەشروباتی رۆحی ؟!)ولەسەر سەریانەوە مۆسیقا و گۆرانی هەیە , خوای گەورە نغرۆی زەویان دەکات و دەیانکات بەمەیمون و بەراز .

زانای پایە بەرز (ئیبن القيم )یش لەپەڕاوی اغاثة اللهفان لاپەڕە (٣٤٦)دا دەڵێت : مەسخ بوون و گۆڕان بۆ مەیموون و بەراز لەم ئومەتەشدا هەردەبێ ببێت لە دوو کۆمەڵدا , یەکەم : زانا خراپەکان کەدرۆ بەدەم خواو پێغەمبەرەوە دەکەن , ئەوانەی دینی خواو شەرعەکەی دەگۆڕن و خواش ڕەنگ و ڕووخساریان دەگۆڕێت . دووەم: ئەوانەی کە بە ئاشکرا خەریکی فیسق و خراپەوحەرامن .. جاهەرچیەکیان لەدنیاش دا مەسخ نەبن لەقەبرو قیامەتدا دەبن .. لەفەرموودەشدا هاتووە (يُحشر آكل الربا يوم القيامةفي صورة الخنازيروالكلاب , مِن أجل حيلتهم على الربا , كما مُسخ أصحاب داود , لاحتيالهم

على أخذ الحيتان يوم السبت ) واته : سووخۆرەكان لەشێوەی بەرازو سەگدا حەشر دەكرێن بەهۆی حیلە شەرعیانەوە لەسووخواردن دا , هەروەك چۆن گەلی ئیسرائیل لە زەمانی (داود)دا , بوون بەمەیموون و بەراز بەهۆی ماسی گرتنیانەوە لەرۆژی شەممەدا ..

**چەند جۆرێك لەفێڵ كردن**

أ – هەندێك بۆئەوەی كە رزگاری بێت لەزەكات دان , پێش ئەوەی ساڵ بێتەوە بەسەر ماڵ و سامانیا , تەرتیباتێك دەكات بۆئەوەی (نصاب)ە كەی كەم بكات و ئەمەش پێغەمبەر (ص)جڵەو گیری لێكردووەو فەرموویەتی: (لايُجمع بين مُتفرق , ولا يُفرق بين مجتمع خشية الصدقة)البخاري ٢ / ١٣٨٢ .

ب – دیارە كاتێك كەسێك سێ جار هاوسەرەكەی تەڵاق دات , ئیتر ناتوانێت بیهێنێتەوە تاشوویەكی تر نەكات بەپیاوێكی تر چونكە دیارە بەكەڵكی یەكتری نایەن و بەیەكەوە ناژین , ئنجا هی واهەیە فێڵ دەكات لەم مەسەلەیەدا و لەگەڵ كەسێكدا رێك دەكەوێت كەژنەكەی مارەبكات و تەڵاقی بداتەوە تابۆی حەڵاڵ بێتەوە , دیارە ئەمەش فێڵەو حەزرەت (ص)دەفەرموێت ( لعن الله المُحَلِلَ والمُحَلَل لَهُ )مجمع الزوائد ٤ / ٢٦٧

واتە : خوا لەعنەتی كردووە لەوەی كەژنی كەسێك مارە دەكات و تەڵاقی دەداتەوە , بەبێ ئەوەی بەراستی ببێتە هاوسەری , تەنها بۆ ئەوەی بۆی حەڵاڵ بێتەوە , وەهەروەها لەعنەتیشی كردووە لەوەی كە بۆی حەڵاڵ دەكرێ (واتە مێردی یەكەمی ئافرەتەكە ) .

ج – هی واهەیە سوو دەخوات و ناوی كڕین و فرۆشتنی لێ دەنێ واتە فێڵ دەكات و خۆی دەخەڵەتێنێ كەئەمەش جڵەوگیری لێكراوە ( يأتي زمان على الناس يستحلون الربا بالبيع )البيهقى ٥ / ٣٧٥ .

د– هەندێك ناوی تر دەنێن لەعەرەق و بڕوبیانووی بۆ دروست دەكەن و خۆیان دەخەڵەتێنن , هەروەك حەزرەت (ص)هەواڵی داوینێ :

( لاتذهب الايام والليالي حتى تشرب طائفة من أمتي الخمر يُسمونها بغير اسمها ) ابن ماجه ٤/٦٥ / ٣٣٨٤ . واتە: دنیا تەواو نابێت تاوەكو كۆمەڵێ پەیدا نەبێت لەئومەتم كە عەرەق دەخۆن و ناوی تری لێ دەنێن ..

هەروەها هی واهەیە خۆی دەخەڵەتێنێ و دەڵێ وەك عیلاج دەیخۆمەوە , دیارە ئەمەش قەدەغەکراوە و حەزرەت (ص)بیانویانی بڕیوەو دەفەرموێت : (خوای گەورە شیفای ئوممەتمی نەخستۆتە ئەو شتانەوە کەحەرامی کردوون )..

ھ - دیارە بەرتیل وەرگرتن حەرامەو لەعنەت کراوە لەوەی کە وەری دەگرێت و لەوەی کە دەیدات و لەوەش کە کارەکە رێکدەخات و لە نێوانیاندا دەبێت , هەروەك حەزرەت (ص)دەفەرموێت : (لعن الله الراشي والمرتشي والرائش الذي يمشي بينهما )حاكم ٤ / ١٠٣ . جابۆیە هەندێك کەس بەناوی دیاری یەوە بەرتیل دەبات و ئەوی تریش بەناوی دیاری یەوە وەری دەگرێت و لەڕاستیش دا بەرتیلەو حەرامەو بەو فێڵەو بەو ناونانە حەلاڵ نابێت .

و - پیاوێك بە سوفیانی ثوری وت : دەزانی کە وتنی هەریەکە لە (لاإلــه إلا الله ) و (الحمد لله)و (الله اكبر) دە حەسەنات و چاکە دەست مرۆڤ دەخات , سوفیان وتی : بەڵێ دەزانم , کابرا وتی : بەلاتەوە چۆنە کەسێك سی هەزار درهەمی بەناشەرعی دەست بکەوێت و دانیشێ تەسبیحات بکات و چاکە دەست خۆی بخات , تاچاکەکانی خراپەکانی بسڕێتەوە ؟! سوفیان وتی : شتی وانابێت , باپارەکە بگێڕێتەوە لەپێشدا , چونکە زیکرەکە ئەو تاوانەی لەسەر لانابات .. جابەڕاستی وایە , هی واهەیە بەهەڵە لەئایەتی (إن الحسنات يُذهِبنَ السيئات)تێگەیشتووەو بەتەمایە بەفێڵ لێی دەرچێ ، دیارە خوای گەورە لەهەقی خەڵکی خۆش نابێت تابۆیان نەگێڕدرێتەوە ..

ی- جوولەکە فێڵی تریان زۆر بووە , ئەوەتە حەزرەت (ص)لە بارەیانەوە دەفەرموێت (لعن الله اليهود , حُرِمَت عليهم الشحوم , فجملوها وباعوا , وأكلوا منها )ابن ماجــه / واتە : خوا لەعنەتی کرد لە جوولەکە , چونکە (شحوم - بەزو پیوی ماڵاتیان )لێ حەرام کراو ئەوانیش ئەیانتوانەوە و بەو شێوەیە دەیانفرۆشت و لێ یان دەخوارد .. (پەڕاوی الحيل الشرعية / بين الحظر والإباحة / نشوة العلواني)..

**لەخواغافڵ مەبن**

خوای گەورە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی یەو ئاگاداری هەموو وردو درشتێکە لەم بوونەوەرەدا هەروەك لە قورئان و سوننەت دا ئاماژەی پێکراوە , ئەمەش بۆ ئەوەی مرۆڤ غافڵ نەبێ و بزانێ خوای گەورە چاوی لێیەتی و هەمووکارو کردەوەیەکی لەسەر حساب دەکات ئەگەر مسقاڵە زەرەیەکیش بێت .. بۆ نموونە :

١) ( وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ ) (المؤمنون:١٧) واتە :سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە ڕاسەرتانەوە حەوت چین ئاسمانمان دروستکردووە و ئێمە هەرگیز لە دروستکراوان غافڵ و بێئاگانین و هیچ شتێکمان لێ ون نابێت و هیچیش پشت گوێ ناخەین .

٢) ( وَقُلْ لِلَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ , وَانْتَظِرُوا إِنَّا مُنْتَظِرُونَ , وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (هود:١٢٣) واتە : بڵێ بەوانە کە بڕوا ناهێنن : ئێوە لەشوێنی خۆتاندا کاری خۆتان بکەن و بەڕاستی ئێمەش خەریکی کاری خۆمان دەبین , بەردەوامیش چاوەڕێی دەرئەنجامی کاری هەردولابکەن و ئێمەش بەڕاستی چاوەڕێین , ( دیارە خوای گەورە تەوفیقی کێ دەدات و هی کێش نادات ).. هەر بۆخوایە نهێنی و نادیارەکانی ئاسمانەکان و زەوی , هەمووکارو فەرمانیش هەربۆلای ئەو زاتە دەگەڕێتەوە , دەی کەوابوو هەر ئەو بپەرستەو تەنها پشت بەو ببەستە , هەرگیز خوای پەروەردگارت بێئاگانیە لەوەی ئێوە دەیکەن و ئەنجامی دەدەن ..

٣) ( ولكل دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ) (الأنعام:١٣٢) واتە : بۆ هەریەکێك لە بێباوەڕو موسڵمان چەندەها پلەو پایە هەیەو هەرکەس بە جۆرێك پاداشتی خۆی لەچاك یان لەخراپ وەردەگرێت و خوای پەروەردگارت بێئاگانیە لەو کردەوانەی کە دەیکەین ..

٤) ( قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجاً وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (آل عمران:٩٩) واتە : بەخاوەن کتێبەکان بڵێ : ئەی خاوەنانی کتێبی ئاسمانی بۆ ڕێدەگرن لە بڵاوبوونەوەی ئاینی خواو دەتانەوێت ئەوەی باوەڕی هێناوە ڕێبازی دینداری بەچەوتی بگرێت ؟ لەکاتێکدا خۆتان شایەتن

و چاك دەزانن (ئەوە ڕاست نیەو چەوتە )دڵنیاش بن کەخوا غافڵ و بێئاگا نیە لەو شتانەی کە دەیکەین

٥) (وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (النمـل:٩٣) واتـە بڵـێ سـوپاس و سـتایش بـۆ خوایـە , لەئایندەیـەکی نزیکـدا , بەڵگـەو نیـشانەکانی خۆیتـان نیـشان دەدات و دەیانناسـنەوە کەهـەمووی دروسـتکراوو بـەدیهێنراوی خوایـە , بێگومـان پـەروەردگاری تـۆ غافـڵ وبـێ ئاگانیـە لـەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن

٦) (وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (البقرة:١٤٩)واتە لە هەر شوێنێکەوە دەرچوویتە دەرەوە , لە هەرکوێ بویت لە نوێژەکاندا ڕووبکەرە کەعبەی پیرۆز , بێگومان ئەو فەرمانە حەق و ڕاستیە و لەلایەن پەروەردگارتەوەیە , خوا غافڵ و بێئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن

٧) ئەوانەی بێئاگاو غافڵن لەپلەی ئادەمیزادیەوە دادەبەزنە پلەی ئاژەڵێتی (وَلَقَـدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِنَ الْجِنِّ وَالْأِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُـونَ بِهَـا وَلَهُـمْ أَعْـيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَـلُّ أُولَئِـكَ هُـمُ الْغَـافِلُونَ) (لأعـراف:١٧٩) واتـە سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لەپەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ داناوە , ئەوانە دڵیان هەیە و کەچی هەقی پێنادۆزنەوە و , چاویان هەیە و هەقی پێنابینن و گوێیان هەیە و هەقی پێنابیستن , ئائەوانە وەکو ئاژەڵ وان , بگرە وێڵ و سەرگەردانتریشن, ئائەوانە غافڵ و بێئاگان

لە فەرموودەیەکیشدا حەزرەت (ص)دەفەرموێت: (إن الله يبغض كَـلَّ جعظـري جواظ , صَخَّابٍ في الاسواق , جيفة بالليل , حمارُ بالنهار , عالم بالدنيا , جاهِـلُ بامْرِ الآخِرة )رواه ابن حبان / الالبانى / السلسلة الـصحيحة ١ / ٣٣١ / رقـم ١٩٥

واته : بەڕاستی خوا ڕقی لەوانەیە کە فیزداروخەڵك بەکەم زانن و موّن و ڕقاوین ولە بازاڕدا قیرەقیرکەرو، لە شەودا لاکە توّپیون و هەڵناستن بوّ نویّژو ، لەڕوّژیشدا گویّدریّژن و ، زانان بە دنیا و نەفام و جاهیلن بە ئاخیرەت

چەند وەسفیّکی سەیرە ، تو خوا سەد دەر سەد باسی حاڵی ئەوانە نیە کە دوورن لەبەرنامەی خواوە

٨) (اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ , مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ لاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنْتُمْ تُبْصِرُونَ) (الانبياء: ١-٣) واتە لیّپرسینەوە وحسابی خەڵکی نزیك بوّتەوە , لە کاتیّکدا زوّربەیان بیّ ئاگاو غافڵن و پشتیان لە ئاینی خوا کردووە وڕوویان لیّوەرگیّڕاوە و , هیچ یادەوەرییەکی تازەیان لەلایەن پەروەردگاریانەوە بوّ نایەت کە ئەوان گویّ بیستی نەبووبن و لەوکاتەدا یاری و گەمەنەکەن , دڵەکانیان بیّئاگاو سەرگەردانە , ئەوانەش کە ستەمیان کرد , قسەکانیان شاردەوە و بەنهیّنی دەیانووت , ئایا ئەمە تەنها بەشەریّك نیە وەك ئیّوە ؟! ئایا ئیّوە بەدەم جادووگەرییەوە دەچن ؟! لە کاتیّکدا ئیّوە چاوتان هەیەو دەبینن ! (واتە وەك خوّیان دوای هەق ناکەون , خەڵکیش سارد دەکەنەوەو هەق بەجادوو دائەنیّن و گاڵتە بەوانە دەکەن کە دوای ڕیّ ڕاست دەکەون ).

٩) (فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ) (يونس:٩٢) واتە (ئەی فیرعەون , ئەمڕوّ کە نقوم بوویت , لاشەی توّ ڕزگار دەکەین , تاببیّتە موعجیزە و پەندو ئاموّژگاری بوّ ئەوانەی دوای توّ دیّن و ( بزانن کە توّ خوا نەبوویت و بەچاوی خوّیان لاشەی ساردو سڕو بیّگیانت ببینن و لە سەرەنجامی تاوان و ستەم تیّبگەن ), بەلاّم بەڕاستی زوّربەی خەڵکی لەئایەت و موعجیزەکانی ئیّمە غافڵ و بیّئاگان

١٠)(وما يَعْزُبُ عن رَبِّكَ من مثقال ذرة في الارض ولا في السماء ولا أصغر من ذلك ولا اكبر إلاّ في كتاب مبين) (يونس ٦١) واتە :ئەی محمد (ص)هیچ شتیّك لە پەروەردگاری توّ ون نابیّت , لەمسقاڵە زەڕەیەکەوە , لەزەوی یان لەئاسماندا

بچوکتربێت یان گەورە ترو , هەمووی لە دۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادایە لای ئێمەو تۆمار کراوە ..

پێغەمبەریش (ص)ئاماژە بۆ ئەم ڕاستیە دەکات ودەفەرموێت :(ولا يَغْترنَّ احدكم بالله فإن الله لوكان غافلاً شيئاً لأغفل البعوضة والخردلة والذرة )(تفسيرابن كثير٦ / ١٢٩ ) واتە : لەخوا غافڵ مەبن و لەسنوور دەرمەچن , بەڕاستی خوا ئەگەر غافڵ بوایە و گوێی نەدایە بەدروستکراوەکانی , ئەوا گوێی نەئەدا بەمێشوولەو دەنکە خەرتەلەو مێروولەو ...هتد ..

دەی کەخوا ڕزقی هەموو ئەو دروستکراوانە بدات و , بوونیان پارێزرابێ و هەموو هاوسەنگی خۆیان ڕاگرن و ڕۆڵی خۆیان ببینن بەو جۆرەی کەخوا بۆی دیاری کردوون لەدنیادا , ئیتر چۆن مرۆڤێك کەخوا کردویەتی بە جێنشین لەم سەر زەوی یەداو هەموو ئەو شتانەی تری لەبەرئەم دروستکردووەو دنیای بۆ تەسخیر کردووە , چۆن لێی غافڵ دەبێ و چۆن لێی ناپرسێتەوە ؟!

١١)زۆرجار غەفڵەت درێژە دەکێشێ تا دوا ساتەکانی سەرەمەرگ و گیان دەرچوون , ئەو کاتەی کە مرۆڤ قاچێکی لەدنیاو قاچێکی لەئاخیرەت دایەو مەلائیکەت لۆمەی دەکەن و پێی دەڵێن (لقد كنت في غفلة من هذا فكشفنا عنك غطاءكَ فبصرُكَ اليومَ حديد)ق ٢٢ واتە :بە بێباوەڕ دەوترێت : سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتە غافڵ بوویت و گوێی خۆت لێ خەواند بوو , ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوت لاداو هەموو ڕاستیەکان دەبینیت وچاوەکانت تیژە ..

١٢)هوشیار بوونەوە لە کاتێکدا کە کار لەکار ترازاوە و سوودی نیە ؟!

(حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ , وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ) (الانبياء:٩٧)

واتە : ئەو کاتەی بەربەستەکەی (ذو القرنين)لەسەر دووتیرەی (یأجوج و مأجوج)دەکرێتەوە ( کەئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی کۆتایی دنیا)و ئەوانە ئەوکاتە لەهەموو کون و کەلێنێکەوە بە لێشاو دێن , ئەوسا ئیتر بەڵێنی ڕاستی نزیك دەبێتەوە ودەست پێدەکات , ئنجا دەبینیت چاوی ئەوانەی بێباوەڕن ئەبڵەق و زەق

دەبێت و ، دەڵێت : هاوار بۆ ئێمە ، چاك غافڵ بووین لەم ڕۆژە ولەم سەرەنجامە ، نەك هەر ئەوە ! بەڵكو ئێمە ستەمكاریش بووین .

١٣) (وَعْدَ اللَّهِ لا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ ، يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ) (الروم:٧) واتە :بێگومان ئەوە بەڵێنی خوا خۆیەتی ، خوا بەڵێنی خۆی دەباتە سەر، بەسەر خستنی هەق و ڕاستی و بەهێنانی قیامەت و .. هتد ، هەرچەند زۆربەی خەڵكی تەنها بە ڕواڵەت لەدنیا دەزانن و عەقڵیان لەچاویاندایە ، ئەوانە بێئاگاو بێخەبەرن لە ڕۆژی دوایی و قیامەت ..

١٤)حەزرەت (ص)تاچاوی خەڵكی بكاتەوە و ڕێیان بۆ ڕۆشن بكاتەوە وبێئاگاكان بەئاگا بهێنێتەوە: (لِتُنْذِرَ قَوْماً مَا أُنْذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ) (يَس:٦) واتە:تائینزاری خەڵكی بكات و وریایان بكاتەوە لەسزای خوایی ، لەكاتێكدا كەباوك و باپیریان ئاگادارنەكراونەتەوەو بێئاگاو غافڵن ..

### سەرەنجامی غافڵ بوون

قورئانی پیرۆز گرنگی زۆری بەمەسەلەی غەفڵەت داوەو لەچەندەها ئایەتدا باسی كردووە وسەرەنجامی غەفڵەتیش دەخاتە بەرچاومان تازوو خۆمانی لێ ڕزگار بكەین ، هەروەك دەفەرموێت :

١)غەفڵەت مایەی سزای خوایە ، هەروەك چۆن دووچاری گەلی فیرعەون بوو :( فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ) (الأعراف:١٣٦) واتە : تۆڵەمان لێسەندن و نقومی دەریامان كردن ، چونكە ئەوان بڕوایان بەبەڵگە و موعجیزەكانی ئێمە نەبوو بەدرۆیان دادەناو ، ئەوان لێی بێئاگا بوون ..

٢)غافڵ مۆر ئەنرێ بەسەر دڵ و چاوو گوێی دا : (أُولَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ) (النحل:١٠٨) واتە : ئەوانە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێ و چاویاندا و ئەوانە غافڵن .. ئەمەش وادەكات كە سوود لەئایەت و بەڵگە زۆرەكانی خوا وەرنەگرن لەقورئان و لەبوونەوەردا :( سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَإِنْ يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لا يُؤْمِنُوا بِهَا وَإِنْ يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً وَإِنْ يَرَوْا سَبِيلَ الْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا

غافلِينَ) (الأعراف:١٤٦) واتە : ئەوکەسانەی کە بەناهەق فیز دەکەن لەزەویداو خۆیان بەگەورە دەزانن , لەمەودوا ڕووی دڵیان وەردەچەرخێنم لەتێگەیشتنی ئایەت و فەرمانەکانم , خۆئەوانە ئەگەر هەر بەڵگەو نیشانەیەك ببینن ئەوە باوەڕی پێناکەن , ئەگەر ڕێبازی ژیری و بەرژەوەندی دنیاو قیامەت ببینن ئەوە نایگرنەبەر , خۆ ئەگەر ڕێبازی ئارەزووپەرستی و گومرایی ببینن ئەوە دەیگرنە بەرو پەیڕەوی دەکەن , ئەوە لەبەرئەوەیە چونکە بەڕاستی ئەوان بڕوایان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبوو هەروەها غافڵ بوون ..

٣)ئەوانەی غافڵن و گوێ بە بەرنامەی خوا نادەن دۆزەخ مەنزڵ و جێگەیانە :( إِنَّ الَّــذِينَ لا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا وَرَضُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّوا بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَـــا غَـــافِلُونَ , أُولَئِكَ مَأْوَاهُمُ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) (يونس:٧- ٨ )

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە بەتەمای ئامادەبوونی بەربارەگای ئێمەنین و باوەڕیان نیەو ڕازی بوون بەژیانی دنیاو دڵنیان پێ‌ی و دڵیان پێی خۆشەو ئەوانەش کە لەئایەتەکانی ئێمە غافڵن , ئائەوانە شوێن وجێگەیان ئاگری دۆزەخە بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیکەن ..

## چارەسەری غەفڵەت

١) زانین و شارەزابوون :

دیارە ئەوانەی کە زانین و زانستیان زیاترەو باشتر خوا دەناسن , زیاتر لەخوا دەترسن , قورئان دەفەرموێت ( إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) (فاطر:٢٨) هەروەها خاتوو عائیشە دەڵێت (يا أمة محمد واللهِ مامِن أَحَدٍ أغْيَرُ مِن اللهِ انْ يَزْنــي عبــدَهُ أو تَزنيَ أَمَتُهُ , يا أمة محمد والله لو تعلمون ماأعلمُ لضَحِكتُم قليلاً ولبكيتم كثيراً )(صحيح البخاری / فتح الباری / ٢ / ٢٢٤ )واتە : ئەی ئوممەتی محمد بەخوا کەس نیە بەهێندەی خوا (غيرە)ی هەبێت بەرامبەر بەوەی کە عەبدێکی پیاو یان ژن زینا بکات , ئەی ئوممەتی محمد بەخوا ئەگەر ئەوە دەزانن کەمن دەیزانم تۆزێ پێدەکەنین و ئنجا زۆر دەگریان بۆ حاڵی خۆتان .

**٢)یادەوەری بەردەوام و ترسان لەسزای خوا :**

**قورئان دەفەرموێت :** ( فَذَكِّرْ إِنْ نَفَعَتِ الذِّكْرَى ,سَيَذَّكَّرُ مَنْ يَخْشَى, ويتجنبها الاشـــقى ، الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى) (الأعلـــى:١٢) **واتە : تۆلەسەر یادخستنەوەی ئەو کەسانە بەردەوام بە ئەگەر ئامۆژگاری کردن سوودی هەبێت بۆیان , بێگومان ئەوکەسەی کە ترسی خوای لە دڵدا بێت یاداوەری وەردەگرێت .. خراپترین کەس خۆی لیێ دوور دەگرێت و یادەوەری وەرناگرێت , ئەوەی دەچێتە ناو ئاگرە گەورەکەوە و دەسوتێت تیایدا ..**

**٣) نوێژ کردن لەکاتی خۆی دا :**

**دیارە نوێژ ڕۆژێ پێنج جار هۆکارێکی گرنگە بۆ هۆشیاری و غافڵ نەبوون بۆیە ئەوەندە گرنگی پێدراوە لەئیسلامدا , پێغەمبەر (ص)لەم بارەیەوە دەفەرموێت :** (مَن حافظ على هؤلاء الصلوات المكتوبات لم يُكتَبْ مِن الغافلين)**سلسلة الالبانى الصحيحة / ١١٤٢ واتە :هەرکەس نوێژە فەرزەکان بپارێزێ و لەکاتی خۆیاندا جێ بەجێیان بکات لە زومرەی غافلأن نانوسرێت .**

**نوێژی جومعەش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە و ئەوەی بەبێ بیانوویەکی مەشروع بیفەوتێنێ لەغافلأن حساب دەکرێ ومۆر دەنرێ بەدڵیا وحەزرەت (ص)دەفەرموێت** (لينتهينَّ اقوامٌ عَنْ ودَعهم الجُمُعات أو ليَختِمنَّ الله على قلوبِهم ثمَّ ليكوننَّ من الغافلين).

**شەو نوێژیش بەهەمان شێوە مایەی هۆشیاری یەو گرنگی زۆری پێدراوە حەرزەت (ص)دەفەرموێت** (مَن قام بعشر أياتٍ لم يُكتب من الغافلين )صحيح الآلبانى / ٦٤٣ .

**واتە : کێ شەو هەستێ و دەئایەت بخوێنێ لەشەو نوێژدا لەغافڵەکان نانوسرێت ..**

**٤) پارێزکاری :**

**یەکێکی تر لەچارەسەرەکانی غەفڵەت پارێزکاری یە , چونکە ئەوانەی پارێزکارن کاتێك شەیتان لێیان نزیك دەبنەوە , زوو هۆشیار دەبنەوەو ناخەڵەتێن :** ( إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُـمْ مُبْـصِرُونَ) (لأعـراف:٢٠١) **واتە : بەڕاستی ئەوانەی کە پارێزکارن کاتێك خەتەرەو خەیاڵێك لەلایەن شەیتانەوە تووشیان دەبێت , خێرا بێدار دەبنەوەو بەرچاویان ڕوون دەبێت و غافڵ نابن و بەشەیتان ناخەڵەتێن .**

٥)یادی خوا :

یادی خوا کردن بەقورئان خوێندن و ئەو یادو زیکرانەی کە حەزرەت (ص)کردوونی و فەرمانی پێداوین بیکەین هۆکارێکی زۆر گرنگن بۆ هۆشیاری بەردەوام و غافڵ نەبوون ، قورئان بەحەزرەت (ص)و موسڵمانان دەفەرموێت : ( وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ) (الأعراف:٢٠٥)

واتە : یادی پەروەردگارت بکە لەدڵی خۆت دا بەلالانەوەو ترسەوە , بێ دەنگ بەرزکردنەوە (لەنێوان چپەو ئاشکرادا )لەبەیانیان و دەمەو ئێواراندا و لەبێئاگایان مەبە ..

لە فەرموودەیەکدا حەزرەت (ص)دەفەرموێت (وآمُرُكم أنْ تذكروا الله تعالى فإن مثل ذلك كمثل رجل خرج العدو في أثره سراعاً حتى إذا أتى على حُصن حصين فأحرز نفسه منهم كذلك العبد لا يحرز نفسه من الشيطان إلا بذكر الله تعالى )ئیمام ئەحمەد .

واتە : فەرمانتان پێدەدەم کەیادی خوا بکەن , نموونەی ئەوەش وەك ئەوەیە کە پیاوێك دوژمن بەدوایەوە بێت و ڕابکات تادەگاتە قەڵایەکی چاك و خۆی تیا حەشار بدات و ڕزگاری بێت لەدوژمنەکانی , بەهەمان شێوەش مرۆڤێك خۆی ناپارێزێ لەشەیتان مەگەر بەیادی خوا ..

## ئامۆژگاری پیاوباشان

بەردەوام بانگخوازان وپیاوباشان ئامۆژگاری دەکەن , تاببنە مایەی هۆشیاری و گەڕانەوەی خەڵکی لەگوناهو تاوان و غافڵی ..

ئەبو درداء ڕۆژێك لەسەر مینبەری دیمەشق فەرمووی (ئەی ئەهلی دیمەشق : ئەرێ گوێ ناگرن لەبرایەکی دڵسۆزتان ؟ بەراستی ئەوانەی پێش خۆتان زۆریان کۆ دەکردەوەو بینای چاکیان دەکرد و , هیوای زۆریان هەبوو , جا کۆکردنەوەیان نەماو , بیناکانیان بووە قەبرسان و هیواکانیشیان نەهاتەدی )..

جارێکی تریش فەرمووی : سێ شت دەمهێنێتە گریان :

ا – کەسێك کە بەدوای دنیادا ڕادەکاو مردنیش وا بەدوایەوە ..

ب–کەسێك کە بەقاقاپێدەکەنێ و نازانێ ئاخۆ خوای ڕازی کردووە یان نا ..

ج– کەسێکیش کەغافڵەو خواش لێی غافڵ نیە !!

بەیەزیدی کوڕی (مرثد)یان وت : بۆچی دەتبینین چاو بەگریانی ؟ لەوەڵاما وتی : برا بەڕاستی خوا پەیمانی داوەمەتیٚ ئەگەر بیٚ گوێی بکەم لە دۆزەخ دا بەندم دەکات , بەخوا ئەگەر پەیمانی بدامایەتیٚ لەحەمامێك دا بەندم بكات , هەق بوو جیٚ بەخۆم نەگرم و هەردەم لە فەرمانبەریدابم !

ئەبوبەکری صدیق یش خوا لێی رازی بێت دەیفەرموو : کوان ئەوانەی کەجوان بوون و بەگەنجیانەوە دەنازین ؟ کوان ئەو پاشایانەی کە بیناو کۆشکی مەزنیان کردو چواردەوریان کرد بەشورای قایم ؟ کوان ئەوانەی لەجەنگەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا ؟ دەورو زەمانیان گۆڕدرا و ئێستا وان لەتاریکاییەکانی گۆڕدا , خێراکەن , خێرا کەن ، دەست و بردکەن , دەست و بردکەن , ((بۆ سەرفرازی دنیاو قیامەت))(الغفلة / عبدالرحمان عبدالقادر المعلمي )

## پیلانی دوژمنان بۆ غافلٚ کردنی موسلٚمانان

دوژمنانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا پیلانی بەردەوامیان هەیەو شەیتانەکانیان هانیان دەدەن بۆ بەردەوامی لە دژایەتی هەق و ڕاستیدا , واتە شەیتانانی ئینس و جین یەك دەکەون و , یەکتری تیژ دەکەن لە بڕواداران , هەروەك قورئان دەفەرموێت : (أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزّاً, فَلا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدّاً) (مريم:٨٤) . واتە : ئایا نابینیت بەڕاستی ئێمە چۆن شەیتانەکان دەنێرینە سەر خوانەناسان , بەگەرمی هانیان دەدەن بۆ تاوان و گوناهو خراپە و پیلان دانان , ئەی محمد (ص)پەلەیان لیٚ مەکە , چونکە بێگومان ئێمە بەوردی هەرهەموو کارو کردەوەیان بە ژمارە تۆمار دەکەین ..

بەلٚیٚ .. خراپەکاران پیلانیٚ دادەنێن شاخ لەبن دێنێت (وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِنْدَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِنْ كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ, فَلا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ) (ابراهيم:٤٧)

واتە : بێگومان خوانەناسان پیلان و تەلٚەکەی خۆیان گێڕا , فێلٚ وفڕی زۆریان کرد , بەلاٚم هەموو پیلان و فێلٚیان لای خوا ئاشکراو دیارەو بەسەرخۆیاندا دەشکێتەوە , هەرچەند پیلان و فێلٚیان کێوەکانیش لەبن بهێنێت .. کەواتە , وا حساب مەکە (ئەی محمد

(ص))خوای گەورە بەڵێنی خۆی بۆ پێغەمبەران ناباتە سەر بەسەر خستن و لەناو بردنی کافران , چونکە بەڕاستی خوا باڵادەستە و خاوەنی تۆڵەیە لە ستەمکاران ..

بەڵێ .. دوژمنان شەوو ڕۆژ ئەدەنە دەم یەك و بەردەوام لەهەوڵدان ئەمەش بۆ غافڵ کردنی موسڵمانان و لەخشتە بردنیانە , ئەوەتە لەخشتە براوەکان لەقیامەتدا دەڵێن : (وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَنْ نَكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أَنْدَاداً وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَجَعَلْنَا الْأَغْلالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (سبأ:٣٣) واتە : خەڵەتاوو ژێردەستەکان وتیان بەزۆردارو دەسەڵاتدارەکان : نا , وانیە بەڵکو پیلان و نەخشەی شەوانە و ڕۆژی بەردەوامتان بوو کە فەرمانتان پێدەداین بڕوامان بەخوا نەبێت , هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین , پاشان هەمووان پەشیمانی لەدڵ و دەروونیاندا دەشارنەوە , بەتایبەتی کاتێك سزاو تۆڵەیان بینی بۆیان ئامادەیە , ئێمەش چەندەها کۆت و زنجیری ئاگرینمان کردە گەردنی ئەوانەوە کە بێ بڕوابوون , ئایا پاداشت دەدرێنەوە جگە بەوەی کە دەیانکرد ؟!

بەڵێ .. دوژمنانی هەق و ڕاستی گەرمن لەسەر دوژمنایەتی و لەسەر کپ کردنی دەنگی زوڵاڵی ئیسلامەتی , بۆئەم مەبەستەش پارە بەلێشاو خەرج دەکرێ و تواناکان بەگەڕ دەخرێن , ئەوەتە زۆربەی کەناڵە فەزاییەکان شەوو ڕۆژ لەکاردان , بۆسەرقاڵ کردنی خەڵکی بەتایبەتی گەنج و لاوەکان تاخەوو خەیاڵیان ببێت بەئارەزوات و بەفیڕۆدانی تەمەن و بێ بەرنامەیی لەژیاندا ، جاهەروەك سیحرو جادوویان لێبکەن غافڵ دەبن و هەوڵی دەوێ تا بەئاگابێنەوە و سیحرەکە بەتاڵ بێتەوە .. قورئان پێیان دەفەرموێت (قل : فأنى تُسحَرون)(المؤمنون ٨٩) واتە پێیان بڵێ : ئەوە چیتانە سحروجادوتان لێکراوە ؟!

جائێمەش بۆ بەتاڵ کردنەوەی سیحری دوژمنان و لەبەرئەوەی کە باسکردنی هیممەت بەرزان و خواناسان دەبنە مایەی هۆشیاری و بەخۆدا چوونەوە , چەند نموونەیەکی کەسانی هۆشیارو بۆ خوا سوڵحاو باس دەکەین :

**یەکەم / ئیبن سینا** / ئەم زانایە سوودی لەتەمەنی وەرگرت و توانی دووسەدو پەنجا پەڕاو بنوسێت و یەکەم کەسە کەباسی پیس بوونی هەوای کردووە و یەکەم کەسە کەباسی

نەخۆشی سیلی کردووە و ، ئەوروپا پێی دەڵێت (ئەمیری پزیشکان )و , لەزانکۆیەکی فەرەنسیش دا پەیکەریان بۆ کردووە .

ئیبن سینا دەڵێت : من زۆر سوودم لەئایەتی (وكذلك جعلناكم أمة وسطا)کردو , لێیەوە فێر بووم کە هەموو شتێ ئەمسەروئەو سەرێکی هەیەو (وسط) یشی هەیە , بەگەڕان بەدوای (وسط)دا زۆر ئەنجامی باشم بەدەست هێناو ئەگەر شتێکم لێ عاسی ببوایە , دووڕکات نوێژم دەکردو دوعام دەکرد تیایدا و دەمووت : ئەی ئەو خوایەی کەمنت کردووە بەئوممەتی (مصطفی )(ص), کە ئوممەتی (وسط)و میانەڕەوە , هیدایەتم بدە ..

**دووەم / عباس کوڕی فیرناس** : ئەم زانایەش هەرلەمناڵیەوە قورئانی لەبەر کردو کە گەورە بوو , زۆر وەستا لەخزمەتی ئایەتی (یامعشر الجن والانس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السماوات والارض فانفذوا لاتنفذون إلا بسلطان )( الرحمان )داو پرسیاری کرد : کەس ئەم ئایەتەی هێناوەتەدی ؟؟وتیان : کەس شك نابەین , وتی : من ئەمەوێ یەکەم کەس بم کەئەمە بهێنمەدی .. کەوتە بیرکردنەوە و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هۆکارێك بۆ فڕینی ئادەمیزادو لەسەر خۆی تاقیکردەوە .. ڕۆژێك خەڵکی (قرطبە)ی کۆکردەوە و لەبەرزاییەکەوە وەستاو پەڕو باڵی بۆ خۆی دروست کردبوو , پێی وتن : ئێوە شایەتم بن لەقیامەتدا کەهەوڵم داوە ئەو ئایەتە بهێنمەدی ...

هەرچەند هەوڵەکەی سەرکەوتوو نەبوو , نەیتوانی بفڕێت و قاچی شکا , بەڵام تا تەمەنی هەشتا ساڵی ژیاو هەوڵەکەی بوو بەبەردی بناغەی بیرکردنەوە بۆ فڕینی ئادەمیزاد , تالە دوای خۆی زیاتر پەرە بەو کارە دراو پاش چەندەها سەدە ئەوە فڕۆکە کە بەئاسماندا دەفڕێت و ڕێی دوور نزیك دەکاتەوە !

بەڕاستی تێگەیشتنێکی جوانە , دەیەوێ (مُبدع)و داهێنەربێت , دەیەوێ ڕوو سووری قیامەت بێت و خەڵکی شایەتی بۆ بدەن کە هەوڵی داوە , دیارە خوای گەورەش هەوڵی خێری کەس بەزایەنادات ..

**سێیەم / ئیبن خلدون** : ئەم زانایەش (علم الاجتماع )ی دامەزراند و دەڵێت ئایەتی (قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ, هَذَا بَيَانٌ لِلنَّاسِ وَهُدىً وَمَوْعِظَةٌ لِلْمُتَّقِينَ) (آل عمران:١٣٨) وای لێکردم , کەهەوڵ بدەم جێبەجێ ی بکەم و ئەم زانستە دابمەزرێنم ..

چوارەم / محمد الفاتح :

حەزرەت (ص)هەرزوو هەواڵی دابوو کەئەو سوپایەی فەتحی قسطنطینیە دەکات سوپایەکی چاکەو ئەمیرەکەشی ئەمیرێکی چاکەو خوا لێیان خۆش دەبێت .. ئەمەش وای کرد کە موسڵمانان چەند جار هەوڵی گرتنی بدەن , لەهەشت سەدساڵدا دەجار هەوڵی بۆ درا , تەنانەت ئەبو ئەیوبی ئەنصاری لەسوپای (یزید)دابوو کە دەوری ئەو شارەیان بۆ چەند ساڵێك دا , سەرەنجام ئەبو ئەیوب نەخۆش کەوت و وەسیەتی کرد کە تاکویٚ نزیك بوونەوە لەقەڵاکە لەوێدا بینێژن , لێیان پرسی بۆ حەزدەکەی لەنزیك قەڵاکە بنێژرێیت , فەرمووی : بۆ ئەوەی کە بە پێغەمبەر (ص)گەیشتمەوە من نزیکترین کەس بم لەقەڵاکەوە و سابەڵکو لەگەڵ ئەو سوپایەدا حەشر بکرێم کە فەتحی دەکەن ..

قسطنطینیە گرتنی ئاسان نەبوو چونکە دووڵای ئاوبوو وە پێنج سەد کەشتی جەنگی پاسەوانیان دەکرد .. شوێنەکەی زۆر گرنگ بوو , ناپلیۆن وتبووی : ئەگەر هەموو دنیا وڵاتێك بێت , باشترین پایتەخت بۆی (قسطنطینیە) یە .

محمد فاتح هەر لەمناڵیەوە بلیمەت بوو , پێنج زمانی دەزانی , مامۆستاکەی پێی وت : من وادەزانم تۆ ئەو ئەمیرەیت کەفەتحی قسطنطینیە دەکەی ..

لەبیست و سیٚ ساڵیدا باوکی مردو ئەم بوو بەخەلیفە ..

لەشارەزایانی پرسی هۆی چیە قسطنطینیە فەتح ناکریٚ وتیان لەبەرسیٚ هۆ :

١) ئەوان لەقەڵای قایم دان و ئەو سوپایەی کەدەچێت لەدەشتێکی کاکی بەکاکی ڕووت دا ناتوانیٚ خۆی بگریٚ و ناتوانریٚ بەئاسانیش قەڵا دروست بکرێت .

٢)قەڵاکانیان بەرزەو بەتۆپی قورس نەبیٚ کاری تێناکرێت ..

٣)زنجیری ئاسنیان لەو ئاوەدا داناوە کە لەدەوری قەڵاکەیەو کەشتی ناتوانیٚ پیا بڕوات ..

هیممەتی مەردانەی محمد فاتح کەتەمەنی گەیشتبووە (٢٥)ساڵێك کەوتە کارو لەسیٚ مانگدا قەڵایەکیان بەرامبەر قەڵاکانی ڕۆمەکان دروست کرد , پێش ئەوەی زستان بێت بەسەریاندا .. بۆ دروستکردنی تۆپی قورسیش وتیان زانایەکی شارەزای مەجەری هەیە لەلای ڕۆمەکان بەندەو کارەکەش بەو دەکرێت , وتی :ئاسانە ئازادی دەکەین و دەیفڕێنین ..

ئەوەبوو كە سی بلیمەت و ئازای ناردو توانیان ئەو زانایە لەبەندیخانەدا دەربکەن وبیفرێنن و بیهێنن بۆلای سوڵتان محمد فاتح .. ئەو زانایەش تۆپی قورسی بۆ دروستکردن تا بگاتە قەڵاکان و هەر (تۆپ)ێکیش سەد کەسی بەدەورا بوو ..

ئنجا بۆ ڕزگار بوون لەزنجیرەکانی ناو ئاوەکە , درەختی ئەو ناوەی بڕیەوەو چەوری کردن و حەفتا کەشتی بەسەر ئەو دارانەدا ڕاکێشا بەناو دەشت ودۆڵ و شاخدا لەلایەکی ترەوە لەپشت زنجیرەکانەوە خستنیەوە ناو ئاوەکە ..

ئەم کارەشی لەیەك شەودا جێ بەجێ کردو بەیانی زوو لەناکاو پەلاماری کەشتی یەکانی دوژمنی داو زۆربەیانی سوتاند ..

(محمد فاتح)زۆر هانی سەربازەکانی دەداو ورەی بەرزدەکردنەوە , پێی دەوتن : حەز دەکەن شوێنکەوتەی حەزرەت بن (ص), ئەمشەو زۆر سەڵاوات بدەن لەسەر گیانی ئەو زاتە , ئەمشەو فەرموودەیەکی حەزرەت (ص)دێنینە دی ..

ئنجا داوای لێکردن کەئەو شەوە پێش ڕۆیشتن یەکی دووڕکات نوێژ بکەن و دوعا بکەن خوا کارەکەیان بۆ ئاسان بکات ..

(محمد الفاتح )پاش ئەوەی کەسەرکەوت وتی : من بەدووشت سەرکەوتم :

١)دڵێکی ڕەقم هەیە وەك بەرد نەرم نابێ هەتا ئەوەی دەمەوێ جێ بەجێ ی دەکەم .

٢)دووچاوی فرمێسك ڕێژم هەیە کە لەترسی خوا ئەسرین دەڕێژێ ..

ئەم پیاوە مەزنە , چەند جار دوژمنان پیلانی کوشتنیان دانا , هیچی سەری نەگرت , تاپزیشکێکیان نارد کە خۆی لەسوڵتان نزیك کردەوەو پزیشکی تایبەتی بوو , کەم کەم ژەهری ئەدایە تا لە لەشیا زۆر بوو بەوە شەهید بوو , ئنجا نامەی نارد بۆ وڵاتەکانی دەرەوە و مژدەی دانێ و تیا نووسی (هەڵۆی بەرزە فڕی ئیسلام مرد ).. (هەروەك لەبەهاری دڵان دا بەدرێژی باسم کردووە ).. (بەرنامەی صناع الحياة / عمرو خالد )

### وانەیەك لەمێروولەوە

لەدارستانەکانی ئەمازۆن دا جۆرێك مێرولە هەن , کە (٥٠٠)هەزارێکیان بەیەکەوە دەژین و کارەکانیان دابەشکردوە و هەرکەسەو بەکاری خۆی هەڵدەستێ زۆر بەچاکی و بەبێ وەستان ..

هەندێکیان ڕێگا دەکەنەوە و پاکی دەکەنەوە بەبەردەوام ،هەندێکیان دەڕۆن بەسەر درەختەکاندا سەردەکەون و پارچە گەڵا دەبڕن بەهۆی دوو چەقۆوە کە بەدەمیانەوەیەوەو بەمادەی (زنك)داپۆشراوە ..

ئەو پارچە گەڵایەی کە هەڵی دەگرێ و بەخێرایی دەیهێنێت وەك ئەوە وایە کەسێك دووسەدو پەنجا کیلۆی بەکۆڵەوە بێت و بەخێرایی پێنج کیلۆ مەتر بڕوات لەدەقیقەیەکدا ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ مرۆڤدا .

جۆرێك هەنگ ئەم مێرولانە دەخۆن بۆیە هەر پارچە گەڵایەك کە هەڵی دەگرن مێرولەیەکی پێوەیە بۆ ئەوەی کە ئەگەر هەنگە کە نزیك بۆوە بەرگری بکات لەو مێرووڵەیەی کە گەڵاکەی هەڵگرتووە ..

ئەو گەڵایانە کە دەبڕن دەیهێننەوە بۆ مەملەکەتەکەی خۆیان کە لەپێنج مەترەوە تاهەشت مەتر دەبێت و ژووری تایبەت و ڕێی تایبەتی تیایەو بەشێوەیەکی ئەندازەیی زۆر ڕێك و پێك دروستکراوە ..

هەندێ لەمێرووڵەی تر ماددەی (مضاداتی)ی (انتیبیوتیك ) لەدەمیەوە دەردەدات و گەڵاکانی پێ پاك دەکاتەوە , نەوەکو بەکتریای پێوە بێت و نەخۆشی بڵاو بکاتەوەو ژیانیان لێتێك بدات ..

ئنجا هەندێکی تریان گەڵاکان ورد دەکەن بۆ ئەوەی کەڕوو( فطریات )ی لێ دروست ببێ و پاشان ئەمان ئەو (فطریات)ە دەخۆن .. پاشماوەی گەڵاکانیش کە سوودیان نیە , هەندێ مێرووڵەی تر فڕێی دەدەنە دەرەوە.

مێرووڵەی تریش هەن کاریان پاسەوانی مەملەکەتەکەیەو ئەگەر شتێکی نامۆ نزیك ببێتەوە پەلاماری دەدەن و گازی لێدەگرن و وازی لێ ناهێنن و دەمی لێ بەرنادەن ئەگەر تیاش بچن کە ئەمەش ئەو پەڕی گیانفیدایی یە ..

جائەو وانەیەی لەم مێرولانەوە وەری دەگرین ئەوەیە ئەم گیانلەبەرە بچکۆلانەیە بە فیترەتی خۆی وا دروست بووە کەئەو ژمارە زۆرەوە بەیەکەوە بژین و ئاوا کارەکانیان دابەش بکەن و زاڵ بن بەسەر خۆخۆیی دا .. جابەڕاستی پێکەوە ژیان و خۆ گونجاندن لەزۆر لایەنی تری ژیانی گیانلەبەراندا دەیبینین ,بۆیە هەق وایە بڕواداریش خۆی بگونجێنێ لەگەڵ هاوبیرەکانیداو بەکارەکانیان یەکتری تەواو بکەن , تاشەیتان و شوینکەوتوانی شەیتان نەتوانن زەفەری پێ بەرن و بەرەو غەفڵەتی بەرن ..

**حەزرەت (ص)فەرموویەتی : شەیتان لەیەكێكەوە نزیكەو لەدوانەوە دوورترە ولەسیانەوە زیاتر دوورە ..**

**هەروەها فەرموویەتی :** (المؤمن یألف ویُؤلف لاخیر فیمن لا یألف و لایُؤلف)**واتە : بڕواداری ڕاست خۆی دەگونجێنیّ و پەیوەندی دەبەستیّ لەگەڵ خەڵكیداو خێر لەوەدانیە كە دوورەپەرێزەو نەگونجاوە و لەگەڵ خەڵكدا دەرنابات ..**

**(بەرنامەی روعة الخلق / اقرا – فلیمی دۆبلاژكراوی الاعجاز فی النمله /ئارا )**

## دوا ووتە

**لەكۆتایی ئەم گەشتە ئیمانی یەدا وەرن هەروەك حەزرەت (ص)بادوعا بكەین و بڵێین** (اللهم إني أعوذ بك من العجز والكسل , والبُخلِ والهَرَم , والقسوة والغفلة , والعيلة والذلة والمسكنة , وأعوذ بك من الفقر والكفر ,والفسوق و الشقاق والنفاق و السمعة والرياء , وأعوذ بك من الصمم والبكم والجنون , والجذام والبرص وسيئ الاسقام ) **رواه الطبراني في الصغير . دوعایەك كە لەدڵێكی هوشیارەوە بێت سابەڵكو خوای گەورە بەرەحمی خۆی لێمان وەرگرێت , چونكە دوعای غافلان بستێك بەرزنابێتەوە** (لايُقبل الدعاء من قلب غافل لاه ) الالبانی السلسلة الصحيحة ٥٩٤ .

**سەرچاوەكان**

١-الغفلة /عبدالرحمان عبدالقادر المعلمی

٢-القنبلة/يهود مسخهم الله قردة وخنازير /محمد عيسى داود

٣-الحيل الشرعية بين الحظر والاباحة / نشوة العلوانی

٤-**بەرنامەی** /صناع الحياة /عمرو خالد

## ناوەرۆك



شپرزی و ئەبڵەقبوون
بە ڕوخساریەوە دیارە



مۆمیاکە بەپێچراوەیی





مۆمیای هاوەڵانی شەممە
کەخوا غەزەبی لێگرتوون
و بەڕاستی کردوونی بە
مەیموون و بەراز ..
لەفەلەستین دۆزراونەتەوە .



کلکی مرۆڤەکە دیارە



ناوقەدەکە درێژ بووە

## دەنگی نەرمی پێی ئاو

کاتێ ئـاو ڕێـی خۆی دەگـرێ
ڕەنگە بەردێ بیەوێ ڕێ بگرێ
ئەویش هێمنانە ئەگەر بۆی بکرێ
خۆی لائەداو بەزمانی حاڵ دەڵێ:
( سلام عليكم لا نبتغي الجاهلين )
دیسانەوە ملی ڕێ دەگرێ
ئەگەر بەربەستێکی گەورەتری هاتە ڕێ
پەنگ دەخواتـەوەو ماوەیـەك دان بـەخۆیدا دەگـرێ
تـا تواناکانی کۆ دەبێ و بەسەر بەربەستا دەگوزەرێ
زۆر جاریش ئەوەی ڕێ بگرێ و بکەوێتە ململانێ
ئـاو ئەوەندە بەهێزە ڕای دەماڵێ
هەندێ جاریش کەف سەردەکەوێ
ئـاسمانی لێ دەگرێ
ئەوەی نـاحاڵی و نەفام بێ وادەزانێ
جارێکی تـر رووی جوانی ئـاو نـابینرێ
کەچی هێندەی پێناچێ کەف لادەچێ
ئەوەی دەمێنێتەوە ئـاوە ،
ژیانەوەو خێرو بێرە کە قورئـان پێمان دەبێژێ
( فأما الزبد فيذهب جُفاءاً وأما ما ينفع النـاس فيمكث في الأرض، كذلك يضرب الله الأمثـال )..

## پێشەکی

**سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درووودوسەلام لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەران و شوێن کەوتوان ..**

**(ژیانەوە)ئەم جارەش بەکۆمەڵێ باس و خواسی ئیمانییەوە دێتەوە بەردیدەی هۆگرانی، کە تەوەرەکەشی بریتییە لە باسی بڕواداری ڕاست و دروست و تەواو، لەژێر ڕۆشنایی ئەم چەند ئایەتەدا کە دەفەرموێت :(** قَالَتِ الأعْرَابُ آمنَّا قُلْ لَم تُؤمِنوا ولكِنْ قُولوا أسْلَمْنَا ولَمَّا يَدْخُلِ الإيمانُ فَي قُلُوبِكُمْ وإنْ تُطِيعُوا اللَّه ورَسُولَهُ لا يَلِتكُم مِنْ أعمالِكُمْ شَيئاً إنَّ اللَّه غفُورٌ رَحِيمٌ) (الحجرات: ١٤)

**واتە: هەندێك لە بیابان نشینە عەرەبەکان وتیان : باوەڕمان هێناوە، پێیان بڵێ : نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەلاّم بڵێن : بەناچاری موسوڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوەو تیایدا جێگیر نەبووە ، خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەر بن، ئەوا خوای گەورە لە پاداشتی چاکەکانتان هیچ کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبووی میهرەبانە.**

**ئینجا قورئان دێتە سەرباسی بڕواداری ڕاست و دروست و تەواو**﴿ إنَّمَا الْمُؤْمِنُون الَّذِينَ آمَنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوالِهِم وَأنفُسِهِم فِي سَبِيلِ اللهِ أُولئِكَ هُمُ الصَّادِقُون ﴾ (الحجرات:١٥) **واتە: بێگومان بڕوادارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو پاشان نەکەوتونەتە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بەخۆیان و سەروماڵیشیانەوە تێکۆشاون لەپێناو ئاینی خوادا، تەنها ئائەوانە ڕاستن.**

**ئنجا دەفەرموێت**﴿ قُلْ أتُعَلِّمُونَ اللَّه بِدِينِكُم واللَّهُ يَعْلَمُ ما في السَّماواتِ وَما فِي الأرضِ واللَّهُ بِكُلِّ شَئٍ عَلِيمْ ﴾ **(الحجرات:١٦) واتە: ئەی محمد (ص) پێیان بڵێ: ئایا ئێوە خوای گەورە لەئاینی خۆتان ئاگادار دەکەن و دەڵێن بڕوادارین، لەحاڵێکدا (ئێوە قسە بکەن یان نەیکەن) خوا ئاگادارو زانایە بەهەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە؟!**

**ئنجا کە خوا بەهەموو شت ئاگادارەو دەزانێ ئیمان و بڕواکەیان چۆنە دەفەرموێت:**

﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسلمُوا قُلْ لاتَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلامَكُمْ بَلِ اللَّه يَمُنُّ عَلَيكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ للإِيمَانِ إِنْ كُنْتُمْ صادِقِينْ ، إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ غَيبَ السَّماواتِ والأرضِ واللهُ بَصيرٌ بِمـا تَعمَلُـون﴾ (الحجرات:١٨) واتـه: ئەوانـه منـەت دەكەن بەسـەر تۆدا كـه موسـوڵمان بـوون، پێیـان بڵـێ: منەت مەكەن بەسەرمدا لەسەر موسوڵمان بوونەكەتان، بەڵكو خوا منـەت دەكات بەسـەر ئێـوەدا كـە هیدایـەتی داون بـۆ ئیمـان و بـاوەڕ ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت دەكـەن لـەئیمان و بڕواكەتاندا، بەڕاستی خوا نهێنی و شاراوەكانی ئاسمان و زەوی دەزانێت ، هەروەها خوا بینایە بەهەموو ئەو كردەوانەی كە ئەنجامی دەدەن ...

بەڵێ : خوای گەورە مسقاڵە زەرەیـەك و كـەمتر لەوەشـی لـێ وون نابێـت لـەم گـەردوونـه بەر فراوانەداو ئاگای لە ئیمان و بڕوای بڕوادارانەو ئەشـزانێ كـێ بەڕووكەشـی موسـوڵمان بـووەو ئیمـانی دانەمـەزراوە ، جـا بۆیـە بـا هـەوڵ بـدەین دڵ و دەروونمـان بەچـاكی ئیمـان بچێژێ و ، دوودڵـی و ڕاڕایـی واز لێبهێـنین و ئێمـەش وەك عەرەبـە دەشـتەكیە نەفامـەكان منەت نەكەین و، بزانین كە خوا خـاوەن منـەت و فەزڵـە بەرامبـەر بەئێمـەو هـەردەم سـوپاس گوزاربین.

## مەرجەكانی بڕوای تەواو

١- بڕوابوون بەخواو پێغەمبەرەكەی و نەبوونی گومان و دوودڵی.

٢- تێكۆشان لە ڕێی خوادا بەسەروماڵ.

زانـای پایـه بـەرز( إبـن تیمیـه ) لـەبارەی ئـەو بڕوادارانـەوە كـە جیهـاد ناكـەن دەڵێـت(ئەوانـه ڕاسته وازیان هێناوە لەخراپەكردن، بەڵام (مجاهد)نین و تێناكۆشـن بـۆ نەهێشـتنی خراپـه ( حَتَى لاتكون فتنةً ويكون الدين لله) تـاوەكو فیتنـه نـەمێنێ و هـەموو بەرنامـه بەرنامـەی خوا بێت) الفتاوی (ج١٥ ، ص٢٤٠ ).

هەروەها(إبن قیم)یش دەڵێت: (لەغافڵبوونتە لـە نەفسی خـۆت، وە لەئەنجامی دووریتـە لـە خوا،كـەدوور دەكەوێتـەوە لـەوەی خـوا پێـی ناخۆشەو،كەچـی فـەرمان نـادەی بەچـاكەو جڵەوگیری ناكەی لەخراپە، لەترسی خەڵكی كە لەڕاستیدا هیچیان پێناكرێ بەرامبـەرت و ناتوانن سوود یان زیانت پێبگەیەنن مەگەر بەئیزنی خوا ) الجواب الكافی ص٤٤...

## گۆڕانکاری

هەوڵدان بۆ گەیشتن بەبڕوای تەواو پێویستی بە خۆ گۆڕین و (ئیرادە)یە، پێویستی بەگۆڕانکارییە لەژیانیدا، قورئان دەفەرموێت :﴿ ذلكَ بأنَّ اللهَ لَمْ يَكُ مُغيِّراً نعمَةً أنْعَمَها عَلى قَومٍ حتى يُغَيِّرُوا ما بأنفُسهِم وأنَّ اللهَ سميعٌ عَليمٌ ﴾ (الأنفال:٥٣ ) واتە: بێگومان خوا هیچ نازونیعمەتێکی نەگۆڕیوە کەبەخشیبێتی بەهەر گەلێك، هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن، بەڕاستی خوای گەورە بیسەرو زانایە ...

یان دەفەرموێت :﴿ إنَّ اللهَ لايُغيِّرُ ما بقومٍ حتى يُغَيِّروا ما بأنفُسهِمْ ﴾ (الرعد:١١ ).

واتە: بەڕاستی خوا بارودۆخی هیچ گەلێك ناگۆڕێت، تا حاڵی خۆیان نەگۆڕن و ئەوەی فەرمانیان پێدراوە نەیکەن..بەڵێ مێژووش ئەوەی سەلماندووە کەمرۆڤ ناتوانێت داهاتوویەکی پرشنگدار و شارستانێتییەکی پێشکەوتوو بۆخۆی بنیات بنێت، تاوەکو مرۆڤەکان دڵو دەروونیان چاك نەکەن و لەخۆیانەوە دەست پێنەکەن...

گۆڕانکاریش پێویستی بەجددیەت و بەرنامە ڕێژی هەیەو ئینجا لەگەڵ بەکارهێنانی هەموو هۆکارێکدا دەبێت پشت بەخوا ببەستێ ﴿ فإذا عَزَمتَ فَتَوَكَّل على اللهِ إنَّ اللهَ يُحِبُّ المتَوَكِّلينَ ﴾ (آل عمران : ١٥٩ ) ...

ئنجا لەم هەوڵەشدا نابێت کوڵ بدات، بەڵکو تووشی هەرچی بوو، یان هەر جارێك کەوت، دەبێت هەستێتەوەو خۆی بتەکێنێو دەست پێبکاتەوە ، دەڵێن: کابرایەك ئەسپێکی پیری دەبێت ، دەکەوێتە چاڵێکی قوڵەوەو هەرچی دەکات بۆی دەر نایەتەوە، بۆیە دڵی نایە هەروا بەجێی بهێڵێ لە برسا بمرێ، بڕیار دەدات لەگەڵ یەك دوو برادەریا کە خۆڵ بکەن بەسەریا، دوای ئەوەی بەخاکەناز خۆڵ دەکەن بەسەریا پاش ماوەیەك هەرگوێیان لەدەنگی ئەسپەکە دەمێنێ لایان سەیر دەبێت، کەسەیر دەکەن چی ئەمان خۆڵ دەکەنە سەر پشتی ، ئەو خۆی دەتەکێنێ و دەیکاتە ژێر پێیەوە و خۆی پێ بەرز دەکاتەوە ، وورده وورده تا بەرز دەبێتەوە و دوایی دەری دەهێننەوە... جائەمە حیکمەت و ژیری ئەسپەکە بوو کە بەڕاستی لەلای مرۆڤیش هەروایە...

### گۆڕانکاری لێزانینی دەوێت

شێخێکی بەتوانا هەبوو مەشقی بە قوتابیەکانی دەکرد لەسەر بانگەواز کردن. شەش مانگ لەباری تیۆری و سێ مانگ لەبواری پراکتیکدا، خوێندکارێك کەلەبەرنامەی تیۆریدا

سەرکەوتو بوو چاوەڕێی سێ مانگی بەرنامەی پراکتیکی نەکردو چوو بۆ گوندێکی دوور بۆ بانگەواز کردن، لەیەکەم هەینیدا ئیمامی مزگەوتەکە کە پیاوێکی نەشارەزا بوو، لە وتارەکەیدا کۆمەڵێ شتی باسکرد کەناتەواو دوور بوون لە ڕاستیەوە، دەمودەست خوێندکارەکە هەستاو هاواری کرد: ( ئەم ئیمامە درۆزنەو نەخواو نەپێغەمبەر (ص) شتیان وایان نەوتووە)، ئیمام بەرپەرچی دایەوە کە ئەم لاوە کافرەو شایەنی سزادانە !!

نوێژکەران کەوتنە لێدانی لاوەکە و هەموو گیانیان شکاند، پاشان خوێندکارەکە گەڕایەوە لای شێخەکەی بەسەروچاوی شکاوەوە . شێخ پێی ووت ڕێگام بدە نموونەیەکی چاکت نیشان بدەم بۆ بانگەواز کردن ...

ڕۆژی هەینی داهاتوو بەیەکەوە چوونەوە هەمان مزگەوت، بینیان ئیمامی مزگەوتەکە لەسەر هەمان شێوازی پێشوو وتاری دەخویندەوە ، پاش ئەوەی شێخ گوێی لە وتارەکە گرت هەستاو وتی: (خەڵکینە ئیمامەکەتان لەو کەسانەیە کە بەبەهەشت شاد دەبن و هەرکەسێك بتوانێت تاڵێك موو لەریشی بکاتەوە دەچێتە بەهەشتەوە)، خەڵکەکە هەر ئەوەندەی ئەوەیان بیست بەخێرایی پەلاماری ریشی ئیمامیان داو دەستیان کرد بە هەڵکێشانی مووەکانی ریشی، هەتا هەموو دەموچاویان کردە خوێن و مووی ریشیان هەموو هەڵکەند، لەو کاتەدا شێخ بەچرپە بە ئیمامەکەی وت: (واز دێنێت لەوتاری ناتەواو نادروست ؟ یان سزای ترت دەوێت ؟) (ل ٢٣ مەشقی ڕێبەری سەرکردەیی).

بەڵێ بەڕاستی بانگەواز کردن و خراپەگۆڕین لێزانینی دەوێت و لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لەزەمانێکەوە بۆ زەمانێکی تر دەگۆڕدرێت.

عەمر خالید دەڵێت: لە لەندەن دەگەڕامەوە، لە فڕۆکەدا لاوێك لەلامەوە بوو، دیاربوو گوێی بەهیچ حەرام و حەلاڵێك نەئەداو منیش لەباسی خراپی زیناکردندا پێم ووت: تۆ پێت خۆشە دایکت زینا بکات؟ تۆ پێت خۆشە خوشکت زینا بکات؟ تۆ پێت خۆشە کچەکەت زینا بکات؟ وەڵامێکی دامەوە کە سەرسامی کردم !؟ وتی: جا چییە ئەوە ئازادی خۆیانە !! بەڕاستی تێگەیشتم کەئەو زەمانەی حەزرەت (ص) ئەم حیوارەی کرد لەگەڵ لاوێکداو پێی چارەسەر بوو جیاوازە لەم زەمانەی ئێمە، ئەوسا ڕەوشت و خوو بەم جۆرەی ئێستای لێنەهاتبوو! ئێستا دەبێت لەلای ترەوە بۆ مەسەلەکە بچیت و بەزمانێکی تر بدوێی[1]

## بەهەشتی هەتاهەتایی

قورئانی پیرۆز گرنگی داوە بە باسی بەهەشت و، هەرچیش بوترێ لە بارەیەوە بۆ ئەوەیە لە تێگەیشتنی مرۆڤ نزیک ببێتەوە شتێکی لێ تێبگات ، خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێ ( أعددت لعبادی ما لا عین رأت و لا أذن سَمِعَت و لاخطر علی قلب بشر) واتە : ئامادەم کردووە بۆ بەندەکانم لە بەهەشتدا شتێك کە نەچاو دیویەتی و نە گوێ بیستویەتی و نەهەرگیز بە خەیاڵی کەسدا هاتووە...

حەزرەتیش (ص) بە فەرمودەکانی هاوەڵاکانی پەروەردە کرد لەسەر ئەوەی کە بۆ بەهەشت بژین، بەبێ ئەوەی دنیا فەرامۆش بکەن ...بۆنمونە دەفەرموێت﴿مَن خافَ أدلج،ومن أدلج بلغ المنزل،الآ ان سلعة الله غالیة،الآ ان سلعة الله الجنة﴾واتە: هەرکەس بترسێ لەوەیکە لە کاتی پێویستدا نەگاتە جێ، شەونخونی دەکات و دەمەوبەیان و لەکاتی فێنکدا سەفەر دەکات، هەرکەسیش وا بکات دەگاتە جێ ، بەڕاستی کەل و پەلی خوا بەنرخە ( کە دەبێ هەولی دەست خستنی بدرێ) بەڕاستی کەل وپەلی خوا بەهەشتە...

خوای گەورە سەرو ماڵی داوەو هەر خۆشی لێیان دەکڕێتەوە بەبەهەشت : ﴿ انَ الله اشترى من المؤمنينَ أنفسهم وأموالهم بأَنَ لَهُم الجَنَةُ يُقاتلُونَ فى سبيلِ الله فَيَقتلُونَ و يُقتلونَ وَعداً عَلَيهِ حَقَاً فى التَوراةِ و الانجيلِ و القرآنِ وَمَن أوفى بعَهدِهِ مِنَ اللهِ فَاَستبشروا بِبيعِكُم الذى بايَعتُم بِهِ و ذَلِكَ هُوَ الفَوزُ العظيمُ﴾(التوبه:١١١)

واتە / بە ڕاستی خوا ماڵ و گیانی لە ئیمان داران کڕیوە بەوەی کەبەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە، ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئاینی خوادا، دوژمنانی خوا دەکوژن، یان دەکوژرێن و شەهید دەبن، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایەو باسکراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا ، جاکێ هەیە وەك خوا بەوەفا بێت بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کە ئەنجامتان داوە بەو کڕین و فرۆشتنەی کە لەسەری ڕێکەوتوون ، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوەو بی سنوور.

کاتێك پێغەمبەر(ص) لە پەیمانی عەقەبەدا پەیمانی بەست لەگەڵ هاوەڵاندا کە دینی خوا سەربخەن و سەرو ماڵیان بەخت بکەن ، وتیان: چیمان بۆ هەیە بەرامبەر بەوە ؟ فەرمووی : بەهەشت...

## بەهەشتت لە بەرچاوبێت

١. (عبدالله کوڕی ئونەیس) لاوێك بوو، حەزرەت (ص) بەکارێك ناردی ، کە هاتەوە هەر لە دورەوە حەزرەت (ص) فەروومووی : چیت کرد؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیشەکەم جێبەجێ کرد؟

حەزرەت (ص) فەرمووی : بەخوا بەخشیشێکت ئەدەمێ...

عبدالله وەستا ،حەزرەت (ص) چووە ماڵەوە و هاتە دەرەوە پارچە دارێکی بچوکی دایەو فەرمووی: ئەم دارە هەڵگرە با لە قیامەتدا ئەمە لەنێوانماندا بێت بەوە دەتخەمە بەهەشتەوە... ئەویش ووتی : بەخوا دەبێت شەوو ڕۆژ پێم بێت و کە مردیشم بخرێتە قەبرەکەمەوە !

٢. کاتێك لە شەڕی مؤتە دا سێ سەرکردە شەهید بوون ، زەیدی کوڕی حارثە و جعفر و عبدالله ی کوڕی ڕەواحە ، حەزرەت (ص) موسوڵمانانی کۆکردەوە لە مەدینەو فەرمووی : ئەوا زەید شەهید بوو دەیبینم لە بەهەشتدا، ئەوا جعفر شەهید بوو دەیبینم لە بەهەشتدا ئەوا عبدالله ی کوڕی ڕەواحەش شەهید بوو دەیبینم لە بەهەشتدا ، ئەوا شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا بوو بە سەرکردەیان و ...هتد...ئەمەش بۆ خۆی پەروەردەیەکی گرنگە لەسەر ژیان بۆ بەهەشت...

٣. حەزرەت (ص) بە هاوەڵانی فەرموو: ئوحود شاخێکی بەهەشتە و ئێمەی خۆش دەوێ ئێمەش خۆشمان دەوێت ، بۆ ئەوەی هەرچەند ئوحودیان بینی بەهەشت بێتە بەرچاویان، هەروەها فەمووی : نێوان ماڵەکەم و مینبەرەکەم باخێکە لە باخەکانی بەهەشت ، بۆ ئەوەی زیاتر بەهەشت لە هەست و هۆشیاندا بێت و کاتێ لەو شوێنەدا دانیشتن زیاتر هەست بە بەهەشت بکەن ...

٤. ڕۆژی حەزرەت بەلاوێکی فەرموو کە ناوی حارثة بوو،( كيف أصبحت يا حارثه ؟!) ... لەچی دایت ئەی حارثە .. وتی:أصبحت مؤمناً حقاً يا رسول الله.. بوومەتە بڕوادارێکی تەواو ئەی پێغەمبەری خوا..

ئەویش فەمووی بزانە دەڵێی چی؟ هەموو قسەیەك بەڵگەی دەوێ ، بەڵگەی تۆ چییە لەسەر قسەکەت؟

وتی :وام لێهاتووە بە ڕۆژ بە ڕۆژووم و بە شەویش شەو نوێژ دەکەم و هەروەك عەرشی خوا بەسەر سەرمەوە ببینم وایە، بەهەشت لەبەر چاومە کە چاکەکاران لە ناز و نیعمەتدان و دۆزەخیش لە بەر چاومە کە خراپەکاران سزا دەدرێن تیایدا...حەزرەتیش فەرمووی ( عرفت فالزم، عبد نوَرَ الله الایمان فی قلبه) ڕێی خۆت دۆزیوەتەوە بەردەوام بە ، بە ڕاستی عەبدێکیت خوا نوری خستۆتە دڵتەوە... جا ئەم حارثە یە لە غەزادا شەهید بوو دایکی هاتە لای حەزرەت ووتی : حارثە جیَو ڕێی چۆن دەبێت؟ ئەگەر لە بەهەشتایە با دڵخۆش بم وئەگەر واش نی یە با شیوەنی خۆمی بۆ بکەم ! حەزرەت (ص) فەرمووی: (أجنة هی ، بل هي جنان ، وإن ابنك أصاب الفردوس الأعلـــى) واتە : هەر بەهەشت ، بگرە چەندەها بەهەشت، کوڕەکەی تۆ بەڕاستی لە فیردەوسی ئەعلادایە، دایکەکەش ڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە دەیوت: ( بخ بخ لك یا حارثـه ) بەه بەه بۆ خۆت و جێت ئەی حارثە...

٥. ڕۆژێك حەزرەت (ص) بە هاوەڵانی فەرموو : کێ لە ئێوە چوٚتە بەهەشتەوە؟ عبدالله ی کوڕی عومەر ووتی: من !

( حەزرەتی عومەر کەلەویا بوو وەڵامەکەی عبدالله ی کوڕی لا سەیر بوو)، ئنجا حەزرەت (ص) فەرمووی : کێ لە ئاوی بەهەشتی خواردۆتەوە؟ عبدالله ووتی : من ! ئنجا فەرمووی :ئەی کێ لە خواردنی بەهەشتی خواردووە؟ عبدالله ووتی: من؟! حەزرەت(ص) فەرمووی:ئادەی بزانم چۆن؟! ئەویش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ هەواڵت داوینێ کە لە ئیسراو میعراجدا بەهەشتت دیوەو لە ئاوەکەیت خواردۆتەوە و لە خواردنیت خواردووە ، جا کەتۆ چوبیت لە جیاتی ئێمە و هەواڵی تۆش گومانی تێدا نیە، هەروەك من چووبم وایە ئەمەش جێی سەرسوڕمانی هاوەڵان بوو..

٦. حەزرەت(ص) لەگەڵ هاوەڵاندا بوو بەرنامەیان دادەنا بۆ چوونە ناو مەککەوە ، لەو کاتەدا سیخوڕێك لە کافرەکان هاتبووە ناویان و کەزانی هەستیان پێ کردووە ، خێرا سواری وولاخەکەی بوو بۆی دەرچوو، حەزرەت (ص) فەرمووی: هەرکەس بیگرێ و بیهێنێ دەچێتە بەهەشتەوە... لەو کاتەدا یەکێ لە هاوەڵەکان حوشترەکەی ئامادە بوو

دوای کـەوت، یـەکێکی تـریش سـواری وولاخەکـەی بـوو دوای کـەوت..ئـا لـەم کاتـەدا سـەلەمەی کـوڕی ئـەکوەع کـە وولاخ و حوشـتری نـەبوو ، هەسـتاو لەبـەر دەسـتکەوتنی بەهەشـت بـەڕاکردن دوای کـەوت ، دیـارە نەیـدەتوانی هیـچیان بگرێتـەوە خـەریك بـوو بگەڕێتەوە ، غیرەتی دایە بەر خۆی و بەردەوام بوو، پاش ماوەیەك کە کافرەکە بە تەواوی دوور کەوتـەوە و لـە بـەر چـاو دیـار نـەما، دوو هاوەڵەکـە کـە بـە حوشـترو وولاخ دوای کـەوتبوون گەڕانـەوە و ، کافرەکـەش کـە تـەواو دوور کەوتـەوە و دڵنیـا بـوو لـە ژێـر درەختێکـدا پـشووی دا،پـاش ماوەیـەك سـەلەمە گەیـشتە سـەری و ووتـی: وەرە تـۆ بەهەشتەکەی منی و، هێنایەوە بۆ لای حەزرەت(ص)...

حەزرەت (ص) لە بارەی سەلەمەوە دەفەرموێت( خير رجالاتنا سلمه بن الاكوع ) .

٧. (أم عمارە) ئەو ئافرەتـە پاڵەوانەیـە کـە زۆر تێکۆشـا بـۆ ئیـسلام، بەتایبـەت لـە جەنگی ئوحودا لەبـەردەم حەزرەتـدا(ص) هێرشـی کافرەکـانی بەرپـەرچ ئەدایـەوە و شـەڕی دەکـرد، تا( إبن قميئه ) شمشێرێکی دا لەشانی و بەجۆرێك برینداری کـرد کـە یـەك لـەپی دەسـتی پیا دەچوو، حەزرەت(ص) پێی فەرموو: ﴿مَنْ تُطيق ما تُطيقين يا أُم عُمارة ﴾ کێ بەرگـە دەگـرێ وەك ئـەوەی کـە تـۆ بەرگـەت گرتـووە ئـەی (ام عُمـارە)، ئـەویش ووتـی: ﴿ أطيـــق وأطيق وأطيق ولكن أسألك مرافقتك فـــي الجنـــة﴾ واتـە: بەرگـەدەگرم ، بەرگـەدەگرم ، بەرگەدەگرم ، بەڵام داوای هاوەڵی تۆ دەکەم لە بەهەشتا...

حەزرەتیش(ص) فەرمووی : بەتەنها هاوەڵم نابی، بەڵکو خاوو خێزانـت هـەموویان هـاوەڵم دەبن لەبەهەشتا....

لە شەڕی یەمامەدا، پاڵەوانانە جەنگاو هـەقی کوڕەکـەی کـردەوە کەموسـەیلەمە پارچـە پارچەی کرد، بەوەی کە گەیـشتە سـەر موسـەیلەمەو شمـشێرێکی لێـدا، هـەر لـەو شـەڕەدا قۆڵێکی پـەڕی، کـە هاتـەوە مەدینـە زۆر نەدەچـووە نـاو ژنانـەوە....عومـەر کەبەمـەی زانـی لەمزگەوتـدا بـانگی لێکـردو پێـی وت: بیـستوومە شـەرم دەکـەی لـەوەی کـەقۆڵێکت بـڕاوە لەپێناوی خوادا !! تۆ چۆن شەرم دەکەی لەپارچەیەکت کە پێش تۆ چۆتە بەهەشتەوە....
ئـیتر ئەمـە وەك ڕاچـڵەکاندنێك بـوو بـۆی و زۆر بەئاسـایی وبەشـانازیەوە دەچـووە نـاو ژنانەوە....

## دڵنیایی و ڕازی بوون

ئاشكرایه خوای گەورە ژیان و مردنی دروست كردووە، بۆ تاقیكردنەوەی مرۆڤ، هەر خۆی خاوەنی هەموو بوونەوەرەو هەرچیش دەكات حیكمەتی تیایەو ئەوەش كە بۆ بڕوادارانی بڕیار دەدات خێرە هەر چەندە لە ڕواڵەتدا وا دەرنەكەوێ، بۆیە بڕواداری بەئەمەك و دامەزراو دەڵێت :﴿قل لن يُصيبنا إلاَّ ما كتب الله لنا﴾ واتە: پێیان بڵێ ئێمە تووشی هیچ شتێك نابین مەگەر ئەوەی كەخوا بۆ ئێمەی نووسیوە... دیارە ئەوەی ئەو زاتە پایە بەرزەش بۆ ئێمەی بڕیار بدات هەر خێرە، چونكە هەرچی خێرە بەدەست ئەوەو لەوەوەیە : ﴿قُلِ اللهم مالكَ المُلك تؤتي الملك من تشاء وتنزع الملك ممن تشاء وتعز من تشاء وتذل من تشاء ، بيدك الخير﴾ حەزرەت (ص) جەخت دەكاتە سەر ئەم مەسەلەیەو دەفەرموێت : ﴿إن الله ليتعاهد عبده المؤمن بالبلاء، كما يتعاهد الوالد ولده بالخير، وإن الله ليحمي عبده المؤمن من الدنيا كما يحمي المريضَ أهل الطعام﴾ (٦٨١٨) كنز العمال...

واتە : خوای پەروەردگار بەندەی بڕواداری بەبەڵاو موسیبەت بەسەر دەكاتەوە، هەروەك چۆن باوك و دایك منداڵیان بەخێر بەسەردەكەنەوە، وە بەڕاستی خوا بەندەی بڕواداری خۆی لەدنیا دەپارێزێت هەروەك چۆن كەس و كاری نەخۆش نەخۆشەكەیان دەپارێزن لەهەندێ خواردن ( لەبەرئەوەی زوو چاك ببێتەوە )...

یان دەفەرموێت :﴿ إن الله تعالى ليحمي عبده المؤمن كما يحمي الراعي الشفيق غنمه عن مواقع الهلكة ﴾ ٦٨٢٦ كنز العمال : واتە بەڕاستی خوا بەندەی بڕواداری خۆی دەپارێزێ هەروەك چۆن شوانێكی بەبەزەیی و بەئەمەك مەڕەكانی لەشوێنی تیا چوون دەپارێزێ....هەروەها دەفەرموێت : ﴿ إن الله إذا أحبَ عبداً حَماهُ عنِ الدُنيا كَما يظل أحدكم يحمي سقيه الماء﴾ واتە : بەڕاستی خوا ئەگەر عەبدێكی خۆش ویست دەیپارێزێت لەدنیا هەروەك چۆن یەكێك لە ئێوە كشتوكاڵەكەی دەپارێزێت لەئاوی زۆر كە زیانی لێبدات....

عومەری كوڕی عبدالعزیزیش دەڵێت (ئەو دوعاو ویردانەی كە دەیخوێنم وایان لێكردووم ئەوەم لاچاك بێت كە خوا تەقدیری دەكات بۆم)... زۆر جارنزای دەكردو

دەیووت : خوایە رازیم بکە بە(قەزا)ی خۆت و، بەرەکەت بخەرە (قەدەر)تەوە بۆم ، تاوەکو پەلە نەکەم لەشتێك کە بۆم دوا دەخەیت و، حەز بەدواخستنی شتێك نەکەم کە بۆم پێش دەخەیت ...

تێگەیشتن لەوەی کەخوای گەورە(مولی)ی ئێمەیەو چاکترین دۆست و سەرخەرو پاڵپشتە، وادەکات کەزیاتر دڵنیا ببین و ڕازی ببین بەقەزاو قەدەری خوایی، هەر لەبەر ئەوەشە حەزرەت(ص) دوعای دەکردو دەیفەرموو( اللهم انی أسألك الرضا بعد القضاء ) وەدەیفەرموو : ( ومَن رضـــيَ فلـــه الرضـــا )... واتە: ئەوەی هەوڵی خۆی بدات و چ هۆکارێك بتوانێ بەکاری بهێنێ و دوایی پشت بەخوا چی لێ سەوز بوو ڕازی بێت، دڵنیایی و خۆشی و دڵئارامی دەست دەکەوێت ...

ڕازی بوون بەقەزاو قەدەر مانای دەستەوسانی و کۆڵدان نییە، بەپێچەوانەوە، کاتێ قەدەری نەخۆشی دێت، بەقەدەری دەرمان هەوڵ دەدەین چارەسەری بکەین، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو چاك دەبین، ئەگەر چاکیش نەبووین دڵنیاین کە حیکمەتێکی تیایەو خوای گەورە دەیەوێت زیاتر پاك ببینەوە لەگوناهو، تاقیکردنەوەیە ...

هەژاریش قەدەرێکە و هەوڵدان بۆ دەوڵەمەندبوون پێویستەو ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بوو دەوڵەمەند دەبین و، ئەگەر نەشبوین دیارە خێری تیایە وخوا چاکتر دەزانێت ...

بەمەش موسوڵمان هاوسەنگی خۆی لەدەست ناداو چی بەسەر بێت خۆی دەتەکێنێ و بەعـــزم و ئیرادەیـــەکی تـــازەوە دەســـت پێدەکاتـــەوە و هەڵدەســـتێتەوە ... ( ســـەیری دواوتەی بەشی سێیەمی ژیانەوە بکە ).

## هەرکەسەو ئەجەلێکی هەیە

بڕواداری ڕاست دڵنیایە لەوەی کەئەجەلی بەدەست خوایە، بۆیە لەکەس ناترسێ و ئازاو نەبەردەو هەوڵی خۆی بەو پەڕی چاو نەترسییەوە دەدات ...

( أحمد قطان) ووتار بێژێکی کوەیتی یە، دەڵێ لەبەرئەوەی بەردەوام قسەی هەقم دەکردو باسی ستەم و خراپەی فەرمانڕەواکانم دەکرد . دیارە ئەمەش بە زۆر کەس نامۆ بوو، بۆیە لەلایەکەوە پیلان دانرا کەسێ کەس لە نوێژی هەینیدا تیرۆرم بکەن..

به قەدەری خوا ئەو هەینی یە کە بەتەما بوون بێنە مزگەوتەکەوە بۆ دیاری کردنی ڕێ و شوێنی پێویست بۆ کارەکەیان ، من لە موسوڵمانانی (بەریتانیاوە) داوەتنامەم بۆهات کە بچم بۆ ووتاردان و، ئەو هەینی یە لەوێ نەبووم ، ئەوەی بەتەما بوو بە کارەکە هەستێ لەگەڵ دوانی تردا کە هاتبوومنی نەدی بوو، ترسابوو وای زانیبوو کە پیلانەکەیان ئاشکرا بووە ، بۆیە خۆی ئاشکرا کردبوو گوایە بۆ کارێکی وا هاتووە لەگەڵ دوو کەسی ترداو چەکەکەشی تەسلیم کردبوو...بەم شێوەیە قەدەری خوا وا بوو کە پیلانی دوژمنان نەیەتەدی و خوا پاراستمی... ئنجا بیرمان کردەوە بۆ حاڵەتێکی ئا لەو جۆرە چەند گەنجێك مەشق پێ بکەین لەسەر کاراتی... بەڵی چەند گەنجێکمان بۆ ئەو کارە ئامادە کردوو لە پێشەوە دادەنیشتن ...

ڕۆژێکی هەینی ووتارم دەدا ، کابرایەك قوتویەکی بە دەستەوە بو هات بەرەومینبەرەکە منیش دەم ووت :أیها الناس أتقوا الله ، سوودی نەبوو، برادەرەکان گەرم بووبوون و خەیاڵیان هەمووی لای ووتارەکە بوو ، کابرا هاتە بەر مینبەرەکەو (دیارە پیاوێکی سادە بوو) ووتی قوربان من تۆم خۆش دەوێ و ئەم دیاریەم بۆ هێناوی... ئنجا برادەرەکان هاتنەوە هۆش خۆیان ...ئیتر وازمان لەوەش هێناو وتمان پشت بە خوا ،إن شاء الله خوا دەمان پارێزێت...

ئەمە بۆ ئەوە ناڵێین کە بڕوادار ئاگای لە خۆی نەبێ و خۆی نەپارێزێ ، بە پێچەوانەوە دەبێ هەموو هۆکارێکی پێویست بگیرێتە بەر بۆ سەلامەتی موسوڵمانان ئنجا دڵنیاش بن لە قەزاو قەدەری خێری خوایی و بزانن کە هەرکەسەو بە ئەجەلێك دەڕوات و کەس ناتوانێ پێش و دوای بخات...

## شیرینی ئیمان

پێغەمبەر(ص) لە چەند فەرمودەیەکدا باسی تامی شیرینی ئیمان دەکات بۆ نمونە:

١. ﴿ذاقَ طَعم الایمان مَن رَضیَ بالله رباً و بالاسلام دینـاً و بمحمـد رسـولاً﴾ کنز العمال٩ واتە: تامی ئیمانی چەشتووە کەسێك ڕازی بێت بەوەی کە خوا پەروەردگاری بێت و ئیسلام دینی بێت و محمد (ص) پێغەمبەری بێت... بۆیە سوننەتە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك سی جار بڵێین( رضیت بالله رباً و بالاسلام دیناً و بمحمد نبیاً و رسولاً) .

٢. هەروەها دەفەرموێت :﴿ثلاث من كُنّ فيه وجد حلاوة الايمان أن يكون الله و رسوله أحب اليه مما سواهُما، وأن يُحب المرء لا يُحبه إلا لله ، و أن يكره ان يعود في الكفر بعد اذ أنقذه الله منه كما يكره أن يُلقى في النار﴾ كنز العمال(٤٣٢١٢). واتە : سێ شت لە هەر كەسێكدا بێت شیرینی ئیمان دەچێژێت :

یەكەم: خواو پێغەمبەری لا خۆشەویستر بێت لە هەموو شتێك .

دووەم: ئەگەر یەكێكی خۆشویست لەبەر خوا خۆشی بوێت .

سێیەم:پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ كوفر پاش ئەوەی خوا ڕزگاری كرد هەروەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە .

٣. لە فەرمودەیەكی تریشدا دەفەرمۆێت: هەركەس چاوی گێڕایەوە لە سەیركردنی ئافرەتی نامەحرەم ئەوە لەزەتی ئیمان دەچێژێت...

بەڵێ... ئیمان و بڕوا لە دڵی بڕواداردا شیرینە ، بەرزە ، بەنرخە و ئەوەندەی بەلاوە مەبەستە، سەرو ماڵی دەكا بە قوربانی و بە هیچ جۆرێك دەست بەرداری نابێت.

كاتێك پرسیار كرا لە (بلال)، كە چۆن بەرگەی ئەو هەموو سزایەی دەگرت لەبەر گەرمای هاوین و لەسەر لمی سوورەوەبوو، چۆن ویردی سەر زمانی(أحد،أحد) بوو تا حەزرەتی ابو بكر كڕیەوە و سەرفراز بوو، ووتی (من شیرینی ئیمانم تێكەڵی تاڵاوی سزاكە دەكردو ، شیرینی ئیمان زاڵ دەبوو بەسەر تاڵاوی سزاكەداو، هەستم بە ئازار نەدەكرد)..ل ٧١ ( وقفات تربویه/ عبدالحمید البلالي )...

هەوڵ و تێكۆشان بۆ خوا شەونخوونی و ماندووبوونی دەوێ ، ئارام گرتنی بەردەوامی دەوێ ، تا بەئاسانی دەستبەرداری ئیمان نەبین پێویستە تامی شیرینی ئیمان بچێژین...

ئیمان وبڕوا شیرینە و بڕواداریش حەز دەكا خەڵكی ئەو شیرینیە بچێژن بۆیە بەردەوام لە خەمی ئەوەدایە چۆن كەسێك زیاتر بێنێ بەرەو ئەم ئاینەو ئەگەر كەسانێكیش نەهاتن و سەرگەرمی خراپەو خراپەكاری بوون و دوای شەیتان و هەواو ئارەزوو كەوتن ، خەمیان لێ دەخواو زۆر بە پەرۆشە بۆ ڕزگار كردنیان...

حەزرەت(ص) مامۆستای مرۆڤایەتی ئاوابوو، ئەوەندە خەمی بوو ، ئەوەندە سوور بوو لەسەر ڕزگاركردنی خەڵكی خەریك بوو تیا بچێ ، خوای گەورە لە چەند ئایەتێكدا

ڕێنمایی کردو ئاگاداری کردەوە کە ئەگەر کار وا بڕوات تیا دەچی وئێمەش تیاچوونی تۆمان ناوێت:﴿ طه، ما أنزلنا علَيكَ القُرآن لتشقَى،إلاَّ تذكِرةً لمَنْ يَخشى ﴾(طه:١) واتە طا، ها، ئەی پێغەمبەر(ص) ئێمە ئەم قورئانەمان دانەبەزاندۆتە سەر تۆ تا تووشی خەم و خەفەت و پەژارە ببیت، بەڵکو یادخەرەوەیە، بۆ ئەو کەسەی کە لە لێپرسینەوەی پەروەردگار دەترسێت

هەروەها دەفەرموێت ﴿ فَلَعَلَّكَ باخعٌ نفسَك على آثارِهم إن لَم يُؤمنوا بِهذَا الحديث أسفا ﴾ (الكهف:٦)واتە تۆ لەوانەیە لەخەم و پەژارەی ئەو بێباوەڕانە کە بڕوا بەم فەرموودەیە ناهێنن خۆت لەناو بەریت و لەداخ وخەفەتدا بمریت

بڕوادارانی ڕاستەقینەش کە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرەن(ص)، بەهەمان شێوە خەمیانە کە تۆوی خراپەو خراپەکاری نەمێنێت ، خەمێك کە شەوو ڕۆژ پێوەی دەتلێنەوە، تەنانەت لای هەندێ لە پیاوباشان دەگاتە ئەوەی کە لەداخا نەخۆش دەکەون، ئەوەتا لەژیاننامەی (سوفیان الثوری)دا هاتووە کە( ئەگەر خراپەی بدیایە میزی دەبوو بەخوێن و نەخۆش دەکەوت )... دیارە ئەمە لوتکەی هەستکردنە بە مەسئولیەت... ئاشکرایە بڕوادار ئەگەر خراپەیەکی بینی نابێ بێدەنگ بێ و هەروا دانیشێ بەڵکو ئەگەر توانی بەدەست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بەزمان بیگۆڕێت، ئەگەر ئەمەشی بۆ نەکرا بەدڵ پێی ناخۆش بێت کە ئەمەش لاوازترین ئیمانەو دوای ئەم پلەیە پلەی تر نییە و ئەوەی بەدڵ پێی ناخۆش نەبێت ئیمانی نییە !!!

## بزانە خەریکی چیت !

ئیبن جوزی بانگخواز فێرمان دەکات کە چۆن پلەو پایەی خۆمان بزانین و دەڵێت (ئەگەر دەتەوێت بزانیت پلەو پایەت لای خوا چۆنە، سەیرکە خوای گەورە لەچیدا خستویتیە کارو، چ کارێکی پێ سپاردوی) ئەوەتا خوای گەورە بەحەزرەتی موسا دەفەرموێت: ﴿ وأنا أخترتُكَ فاستَمع لما يُوحى ﴾ (طه:١٣) واتە: من تۆم هەڵبژاردووە بۆ گەیاندنی پەیامی خۆم، گوێ بگرە بۆ ئەو وەحیەی پێت ڕادەگەیەنرێ

خوای گەورە لەبارەی هەڵبژاردنی گەلی موساشەوە دەفەرموێت ﴿ ولقد اخترناهُم على علمٍ علَى العَالَمين ﴾ (الدخان:٣٢) واتە ئێمە ئەو کاتە نەوەی ئیسرائیلمان

هەڵبژارد لەڕووی ئاگایی و زانیارییەوە و ڕێزی ئەوانماندا بەسەر خەڵکی ئەو سەردەمەدا (کەپەیامی خوا بگەیەنن ) ...

ئاشکرایە دوای ئەوان خوا ئوممەتی ئیسلامی هەڵبژارد کە پەیامی خوا بگەیەنن هەروەك دەفەرموێت : ﴿ وجَاهِدوا في اللهِ حَقَّ جِهادِهِ هوَ اجتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيكُم فـي الدّينِ مِن حَرَجٍ مِلَّةَ أبيكُمْ إبراهيمَ هوَ سمّاكُمُ المسلمينَ من قَبلُ وفي هذا ليكون الرسولُ شَهيداً عَلَيكُم وتَكونوا شُهَداءَ على الناسِ فأَقيموا الصّلاةَ وآتوا الزّكاةَ واعتَصِموا بالله هوَ مَولاكُمْ فَنِعمَ المَولَى وَنِعمَ النّصيرُ ﴾ (الحج:٧٨ ) واتە : تێبکۆشن و هەوڵ بدەن بۆ خوا بەوشێوەیەی کەشایستەیەتی، ئەو زاتە بۆ ئەوە هەڵی بژاردوون کەکاربکەن بۆ بەرنامەکەی، لەئاین و بەرنامەکەشیدا هیچ جۆرە قورسی و گرانیەکی لەسەر دانەناون کەنەتوانن بیکەن، جا ئەم بەرنامەیەش ڕێوشوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی باواتانە کە پێشتر هەر خوای گەورە ناوی ناون موسڵمان و لەم قورئانەشدا بەموسوڵمان ناوی بردوون، تا پێغەمبەر ببێتە شایەت بەسەرتانەوە کەپەیامی خوای پێ ڕاگەیاندوون و ئێوەش بەگەیاندنی ئەو پەیامە ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، کەواتە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش لەماڵتان دەربکەن و پشت بەخوا ببەستن، چونکە هەر ئەو یارو یاوەرتانە، جا دڵنیا بن کەخوا چەندە یارمەتیدەرێکی چاکەو چەندە پشت و پەنایەکی بەهێزە...

بەڵێ (جیهادی هەق)و هەوڵ و کۆششی بەردەوام بۆ دینی خوا ئەو کارەیە کەخوا موسوڵمانی بۆ هەڵبژاردووە، بۆیە ئەگەر بەو کارە هەڵنەسا ئەوە خۆی لەو مەقام و پلەوپایە بەرزەوە دێنێتە خوارەوە بۆ پلەیەك کە ئیبن جوزی لەبارەیەوە دەڵێت (مەقامی زاهیدەکان کە لەخەڵکی دابڕاون مەقامی شەمشەمە کوێرەیەو، مەقامی ترسنۆکە، بەلاَم مەقامی ئازاو نەبەردەکان مەقامی پێغەمبەرانە کە خۆیان ڕۆشنبیر دەکەن و هەوڵیش لەگەڵ خەڵکیدا دەدەن بۆ ئەوەی فێر ببن) ل١١٠ مواقف تربویە ...

کەسانی هیممەت بەرز هەن کە زۆر بەچاکی ڕۆڵی خۆیان دەبینن لەژیاندا ئەوە ( یوسف بن تاشفین ) کە تەمەنی نەوەد ساڵێك دەبوو سوپای کۆکردەوەو شەش مانگ جەنگاو سێ سەد ساڵ کەوتنی ئەندەلوسی دواخست ...

حەزرەت (ص) بەیانیان دوعای دەکرد( اللهم هَبْ لِي عملاً صالِحاً يُقربنـــي اليــك ) خوایە کارێکی چاکە بکە بەنسیبم کە لە تۆم نزیك بکاتەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەو پێغەمبەر بوو، خۆشەویستی خوا بوو، لەخوا نزیك بوو، ئەی ئەبێ ئێمە بڵێین چی و چۆن نەگەڕێین بەدوای کاری چاکدا تا لەخوا نزیك بینەوە، وەك وتیشمان بانگەواز و هەوڵ و کۆشش بۆخوا باشترین کارە بۆ نزیك بوونەوە: (ومن أحسن قولاً ممن دعـــى الـــى الله وعمـــلَ صالحاً وقال انني من المسلمين ).

یەکێکی تریش لەوکارە چاکانە خزمەتکردنی خەڵکییە، کە لە دواتردا باسی دەکەین ..

## گەیاندنی بانگەوازو کاری بەکۆمەڵ

بەڵگە نەویستە کە گەیاندنی بانگەواز هۆکاری زۆری دەوێت، گرنگترین هۆکاریش کاری بەکۆمەڵە، دیارە ئەوەی بەکۆمەڵ دەکرێ و تواناکانی پێ کۆدەبێتەوە بە تاکە کەس ناکرێت...

نوورسی (بەرەحمەت بێت ) دەڵێت: ئەگەر پێنج یەك بهێنین ، هەریەکەیان بەتەنها نرخی یەکە بەلاّم کاتێك دوانیان دەخەینە پاڵ یەك دەبێ بەیانزە ، کاتێك یەکێکی تر دەخەینە پاڵ یانزە دەبێتە سەدو یانزە ، کاتێك یەکێکی تر دەخەینە پاڵ سەدو یانزە دەبێتە هەزارو سەدو یانزە، کاتیك یەکەکەی تردەخەینەپاڵیان دەبێتە یانزە هەزارو سەد و یانزە...لەژیانی مرۆڤیشدا هەروایە کاتیك کۆمەڵێ کەس دەکەونە یەك، بەو لەیەك نزیك بوونەوەیە توانایان زیاد دەکات هەروەکو ژمارەکان ...

جا لەبەرەبەیانی پێغەمبەرایەتیەوە هەتا ئەمڕۆ کێشمەکێش هەیە لەنێوان هەق و ناهەق دا، پێغەمبەران کۆمەڵی خوابوون(حزب الله) و خراپەکارانیش کۆمەڵی شەیتان بوون(حزب الشيطان)، ئەم دوو دەستەواژەیەش لەقورئاندا هاتووە: لەبارەی یەکەمیانەوە دەفەرموێت :﴿ ومن يَتَولَّ الله وَرَسولَهُ والَّذينَ آمَنوا فإنَّ حـــزبَ الله هُـــمُ الغـــالِبونَ﴾ (المائدە:٥٦) واتە: ئەوەی خواو پێغەمبەرو بڕواداران بکابە پشتیوان و دۆست و خۆشەویستی ئەوە بادڵنیا بێت کەکۆمەڵ و دەستەو تاقمی خوا زاڵ و سەرکەوتووە ...

لەبارەی دووەمیشەوە دەفەرموێت: ﴿استحوَذَ عَليهِمُ الشَيطانُ فأنساهُم ذِكر الله أولئك حِزبُ الشَيطانِ ألا إنَّ حزبَ الـــشَيطانِ هُـــمُ الخاسِـــرونَ﴾ (المجادلە:١٩) واتە: ئەوان

شەیتان زاڵ بووە بەسەریانداو یادی خوای بیربردوونەتەوە ، ئائەوانە دەستەو تاقم و حیزبی شەیتانن ، ئاگادارو دڵنیابن کەدەستەو تاقمی شەیتان خەسارەتمەندن .

ئەهلی شەڕو ناهەق لە دێر زەمانەوە بە کۆمەڵ ئیشیان کردووە، قورئان ئاماژە بەم ڕاستیە دەکات و دەفەرموێت: ﴿كَذَّبت قَبلَهُم قَومُ نوحٍ والأحزاب من بَعدِهِم وَهَمَّت كُلُّ امَّةٍ برَسولِهِم لِيأخُذُوهُ وَجَادَلوا بالباطِلِ لِيُدحِضوا بهِ الحَقَّ فَأَخَذتُهُم فكَيفَ كانَ عِقاب﴾(غافر:٥) واتە: پێش کافرانی مەککە قەومی نوح و حیزبەکانی دوای (نوح)یش باوەڕیان بەپێغەمبەرەکانیان نەکرد... کەواتە کفر بەکۆمەڵ ئیشی کردووەو دژایەتی پێغەمبەرانیان کردووە، چۆن دژایەتیەك، (وهمت كل أمةٍ برسولهم ليأخذوه) هەر گەل و کۆمەڵێك هەوڵی داوە پێغەمبەرەکەی لەناو بەرێ و ڕێی لێ بگرێ، نەك هەرئەوەندە بەڵکو (وجادلوا بالباطل لِيُدحضوا به الحق ) دەمەدەمێ و موجادەلەشیان کردووە تا هەق داپۆشن و نەیهێڵن، تائەو کاتەی خوای گەورە لەناوی بردوون (فأخذتهم فكيف كان عقاب) ..

ئاشکرایە کفری ڕێکخراو (مـنظم) بەهەقی پەرتەوازە چارەسەرناکرێ، دەی ئەگەر هەقن چۆن دەبێ پەرتەوازە بن و بەتەنها کار بکەن، مەگەر خوا ئەوانەی خۆش ناوێ کە بەکۆمەڵ و بە •صف ) کاری بۆ دەکەن ( ان الله يحب الذين يقاتلون صفا كانهم بنيان مرصوص ) الصف / واتە : بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لە پێناوی ڕێبازەکەیدا بەیەك ڕیزو یەك پارچەو یەك دڵ و، هەروەك کۆشکێکی بەرزی قایمی دارێژراون کە خشتەکانی یەکیان گرتبێ ...

بەڵێ ...( يد الله مع الجماعة ) دەستی قودرەتی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە و، کۆمەڵ ڕەحمەتەو پەرتەوازەیی عەزابە (الجماعة رحمة والفرقة عذاب) و (شەیتان لەیەکێکەوە نزیکەو لەدوانەوە دوورەو لەسیانەوە دوورترە) هەروەك پێغەمبەر(ص) دەفەرموێت...

پێشینان چاك لەمە تێگەیشتبوون ، ئەوە(مُطرف کوڕی الشخير)ی تابیعی دەڵێت (من زیاتر لەبێوەژنێك پێویستم بە کۆمەڵ هەیە ، چونکە من لەناو کۆمەڵ و جەماعەتدا گوناهەکانی خۆم هەست پێدەکەم ) ..مەگەر موسوڵمان بۆ موسوڵمان وەك ئاوێنە نیە ؟!

چۆن ئافرەتێکی بێوەژن (بەتایبەتی جاران کە نەیانتوانیوە بژێوی پەیدا بکەن ) پێویستی بەیارمەتی کەس و کارو کۆمەڵ هەبووە ئاواش موسوڵمان پێویستی بەکۆمەڵ و جەماعەت هەیە چونکە لەواندا خۆی دەبینێتەوە (ل١١٨مواقف تربویە) .

باوکێك حەوت کوڕی دەبێت ڕۆژێك کۆیان دەکاتەوەو وانەیەکی کرداریان پێ دەڵێ بەوەی کەحەوت دار دێنێ و هەر یەکەیان دارێکیان ئەداتە دەست و ئەڵێ بیشکێنن، جاهەریەکەیان بەئاسانی دارەکەی دەستی دەشکێنێ، ئینجا حەوت داری تر دێنێ و ئەیانبەستێ بەیەکەوەو داوایان لێ دەکات کە بیشکێنن، هەرچەندە هەوڵ دەدەن بۆیان ناشکێ ...جابۆیە داوایان لێ دەکات یەك دەست و یەك دڵ بن بۆ ئەوەی وەك ئەو دارانە دوژمن نەیان شکێنێ...

جا بەڕاستی پێویستە باش لەو وانەیە تێبگەین بۆ ئەوەی دوژمنی هەق و ڕاستی نەمان شکێنێ و بتوانین بەکۆمەڵ بەچاکی پەیامی خوا بگەیەنین کەئەرکی سەرشانی هەمووانە و یەکێکە لەکارە مەزنەکانی ئەم ئوممەتە ...

**خوایە گوناهو کەم و کوڕیمان بپۆشە !**

چەند ڕاستیەك هەیە کەهەموو دەبێ بیزانین تا شەیتان و پیاوانی شەیتان زەفەرمان پێ نەبەن .. ناحەزان بۆ ئەوەی ساردمان بکەنەوە لەکاری کۆمەڵ دەڵێن :

١- دینداری و حیزبایەتیان نەوتووە، ئەمەتان لەکوێ هێنا ؟؟! دەڵێین حیزبایەتی و کاری بەکۆمەڵ هۆکارێکە و بەهۆیەوە دینی خوا بلاّودەکەینەوەو خزمەتی بەرنامەی خوا دەکەین...

٢- باشە خۆ کەم و کوڕی هەیەو فلاّن وای کردو فیسار وای کرد، دەڵێین: خۆئێمە نەمان وتووە بێ عەیبین دەڵێین : خوایە گوناهو کەم و کوڕیمان بپۆشە...دیارە ئەم کاری بەکۆمەلە کاری مرۆڤەو مرۆڤیش گوناهکارە وبێجگە لە پێغەمبەران کەس معصوم نییە، بەلاّم سوورنین لەسەر گوناهو کەم و کوڕی و، چەند بتوانین چارەسەری دەکەین و چاوەڕێی ڕەحمی خواین...

٣- دەڵێن ئێوە نەرم و نیانن، دەڵێین لەم کۆمەڵگا موسوڵمانەدا نەرم و نیانیمان هەڵبژاردووە و شێوازی خۆمان هەیە، مامۆستا عومەر تەلمەسانی ڕابەری سێیەمی برایان دەڵێت: ئێمە بەحاکم ناڵێین درۆ دەکەیت، بەڵکو دەڵێین : ڕاستت نەوتووە. هەروەها ناڵێین : بێ ئینسافیت ، دەڵێین : ئەگەر ئینسافت هەبێ بۆمان ... خۆ هەر هەمان مەبەست

دەگەیەنیٚ بەلاٚم بەجۆرێکی تر... ئەمەش بۆ ئەوەی کۆمەڵگا بەتوندو تیژی هەڵنەوەشیٚ و دانوستان و حیوار جێی ململانێی نادروست بگرێتەوە ... دیارە کۆمەڵگا وەك کەشتیە دوو قاتەکەیە ئەوەی لەسەرەوەیە و ئەوەی لەخوارەوەیە وەك یەك نقوم دەبن ئەگەر خوانەخواستە کونی تیٚ بوو !!

بیرمان نەچیٚ کە ئەمر بەچاکەو جڵەو گیری لەخراپە لەئیسلامدا سنووری خۆی هەیەو بەرنامەی تایبەتی هەیە، ئەگەر جڵەو گیری لەخراپەیەك بووە مایەی سەرهەڵدانی خراپەیەکی تر ئەوە نابێت بیکەین، هەروەك وتراوە : چاکی مەکە با خراپ نەبێت ...

دەڵێن : ئیبن تەیمیەو قوتابیەکی بەلای چەند تەتارێکدا دەڕۆن مەی دەخۆنەوە، قوتابیەکەی دەیەویٚ ڕێیان لیٚ بگریٚ و نەهێڵیٚ، ئیبن تەیمیە دەفەرمویٚ : وازیان لیٚ بێنە سەرخۆش بن باشترە لەوەی بەئاگا بن و موسوڵمانان بکوژن !

ئەزموونی سالاٚنی ڕابردووش ئەوەیان سەلماندووە کەتوندو تیژی شەڕو بەلاٚی گەورەتری لیٚ دەکەوێتەوە ، چونکە دوژمنان ئەو هەلە دەقۆزنەوە بۆ ناشرین کردنی موسوڵمانان، دیارە ئەوان لەبواری ڕاگەیاندندا دەستێکی بالاٚیان هەیەو بۆ هەل دەگەڕێن....

لەجەزائیردا جەبهەی (الإنقاذ) ویستیان بدەنە شاخ و بەچەکداری شتیٚ بکەن، یەکسەر دەزگای مخابرات کەسێکی خۆیانی ناردە دەرەوە بەناوی (جمال زەیتون)و کۆمەڵێکی ئیسلامیان بۆ دروستکردو یەکی بستیٚ ڕیشیان پیٚ هێشتنەوەو کەوتنە سەربڕینی خەڵك و زۆر بەئاسانی دەیانهێنا بەسەر(جەبهە)دا، تاناچاربوون دەست هەڵگرن لەو کارە، بەهەمان شێوەش کۆمەڵی جیهادی میسریش پاش توندو تیژی و کوشتارێکی زۆر بەخۆیانا چوونەوەو وازیان لەو شێوازە هێناو، بەمەش شێوەی کاریان وەك شێوەی کاری برایانی لیٚ هاتەوە کە لەوەو پێش مەناعەتیان نەبوو برایان کافر بکەن لەسەر شێوازی کاریان!

## غەیبەتی کەس مەکە !

کۆمەڵێك بۆ خوا کاردەکا و لەهەزاران کەس پێك هاتووە ، چ پێویست دەکات، غەیبەتیان بکرێت و پشتیان بشکێنریٚ ، ئاشکرایە ئەگەر غەیبەتی کەسێك حەرام بێت ئەوا غەیبەتی کۆمەڵێکی چەند هەزار کەس ، ئەوەندە هەزار جار گوناهە...

باشە بۆ خۆمان گوناهبار بکەین، ئەگەر دەڵێی ئەوان نازانن کاربکەن بۆ خواو ئیجتیهادەکەیان هەڵەیە، فەرموو تۆ باشتری بکە ...

مامۆستا (راشد)دەڵێت: ئێمەی برایان لەم عەرزی خوایەدا بینایەکمان بۆ خۆمان دروستکردووە لەژێر سێبەریا دەژین و کاردەکەین بۆ خواو دڵمان پێی خۆشە، ئەگەر تۆ خەریتەکەیت بەدڵ نیە بۆ دەیڕوخێنی بەسەرماندا، ئەوە ئەرزی خوا زۆرە، فەرموو بینایەکی تر دروست بکە بەو خەریتەیەی کەخۆت دەتەوێ و خەڵکی خوا زۆرە بانگیان کە بۆ ئەو شێوە کارەی کەبەچاکی دەزانی !!.. ئەوەشمان بیر نەچێت، ئەوەی کەم و کوڕی موسوڵمانێك بپۆشێ خوا لە دنیاو قیامەتدا گوناهو کەم وکوڕی ئەو دەپۆشێ (من ستر مسلماً ستره الله في الدنيا والآخرة) ..

مەسەلەیەکی تریش هەیە گرنگەو یەکێکە لەو مەبەستانەی ئیسلام کەئەیەوێ بیهێنێتە دی، ئەویش برایەتی موسوڵمانانە، چونکە﴿ إنَّما المؤمنونَ إخوةٌ فأصلِحوا بينَ أخَـــــويكُم﴾(الحجرات:١٠ ) دەکرێ بۆچوونمان لەمەسەلەیەکدا جیاواز بێت و دوو ئیجتیهادی جیاوازمان هەبێت و براش بین... ئیمامی شافیعی لەگەڵ هاوەڵێکیدا ڕای جیاوازی دەبێت و زۆر دانوستان دەکەن ناگەنە ئەنجامێك و، پاشان بۆ ئەوەی دڵی گەرد نەگرێ و شەیتان دڵی کرمێ نەکات، ئیمامی شافیعی بەهاوەڵەکەی دەڵێ: ( يا أبا موسى الا يستقيم ان نكون اخواناً وإن لَم نتَّفِق ) ( ل١٤٢. مواقف تربويه ) . واتە: ئەی باوکی موسا ناکرێ برابین هەرچەند لەسەر یەك ڕاش ڕێك نەکەوین ...

بەڵێ ... دەکرێ و سەدجار دەکرێ ! دەبا برابین و شەیتان بەخۆمان خۆش نەکەین، قورئان دەفەرموێت : ﴿ وقُل لِعبادِي يَقولوا الَّتي هي أحسَنُ إنَّ الشَّيطانَ يَنزَغُ بَيــنَهم إنَّ الشَّيطانَ كانَ للإنسانِ عَدوّاً مبيناً﴾ (الإسراء :٥٣ ) واتە: ئەی محمد(ص) بەبەندەکانم بڵێ : چاکترین قسە بکەن، چونکە شەیتان بەڕاستی دەیەوێت نێوانیان تێك بدات، بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئینسانە ...(جابەداخەوە هی واهەیە نەك هەر چاکترین قسە ناکات بەڵکو خراپترین قسە دەکات، دەی ئیتر چۆن پەیوەندیەکان باش دەبن ؟!).

## هاوسەنگی لەژیاندا

ژیان وەکو قوتابخانەیە، چۆن دەبێ لەهەموو وانەیەکدا پلەی دەرچوون بهێنرێ، بەهەمان شێوەش مرۆڤ لەژیاندا دەبێت گرنگی بدات بەهەموو لایەنێك و هەقی خۆی بداتێ و تیادەرچێ، ئەمەش لەو حیکمەتەوە دێت کە قورئان باسی دەکات :﴿ يـؤتي الحكمةَ مَن يَشاءُ ومَن يُؤتَ الحِكمةَ فقَد أُوتيَ خيراً كثيراً وما يذَّكَّرُ إلاَ أُولُواْ الألبـاب﴾ (البقـرة:٢٦٩ ) واتە: خوا بەهەرکەس بیەوێت و شایستە بێت حیکمەت ودانایی دەبەخشێت و هەرکەسیش حیکمەتی پێ ببەخشرێت، ئەوە بێگومان خێرێکی زۆری پێدراوە، جا بێجگە لە ژیرو هۆشمەندەکان کەسانی تر لەو بەهرەیە تێناگەن و پەند وەرناگرن.

پێغەمبەر(ص) دەفەرموێت ل﴿ إنَّ لِرَبِّكَ عليكَ حقًا، وإنَّ لِجَسَدِكَ عليكَ حقًّا، وإنَّ لِعَينَيكَ عليكَ حقًا، وإنَّ لأهلِكَ عليكَ حقًا ... أعطوا كل ذي حَقٍّ حقَّه ﴾ بەڵێ کۆمەڵێ هەق هەن کە دەبێ جێبەجێ بکرێن و بدرێن :

**یەکەم ... لاشەی خۆت و ئەندامەکانت هەقیان لەسەرتە**، بۆیە دەبێت گرنگیان پێ بدرێت، مرۆڤ پێویستە بەشی پێویست بخەوێت و، هیچ نەبێ هەفتەی جارێ دووجار خۆی بشوات و جلی پاك و ڕێك و پێك لەبەربکات و....هتد، پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ص) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گرنگی بدەم بە سەرو قژم(بیشۆم، دای بهێنم...هتد)، حەزرەتیش(ص) فەرمووی نەك هەرئەوەندە کە بیشۆیت و دای بهێنێ، بەڵکو ڕێزی قژت بگرە ...بەڕاستی بڕواناکەم لە فەرهەنگی هیچ گەلێکدا بگەڕێیت دەستەواژەی ئاوا جوان هەبێت (ڕێزی قژت بگرە) !

**دووەم/ هەقی ماڵ و منداڵ**، دەبێت ڕزق و ڕۆزیان بۆ پەیدا بکرێت و ژیانیان بۆ خۆش بکرێت، یاریان لەگەڵ بکرێت، بەچاکی پەروەردە بکرێن و ....هتد... حەزرەت(ص) دەفەرموێت ( چاکترینتان چاکترینتانە بۆ ماڵ ومناڵی ومن چاکترینتانم بۆ ماڵ و مناڵم)... حەزرەت(ص) پێشبڕکێی دەکرد لەگەڵ عائیشەداو ڕێزی زۆری لەکچەکانی دەگرت و لەبەریان هەڵدەستاو یاری دەکرد لەگەڵ مناڵەکانیان...

**سێیەم/ ڕێزگرتنی دایك و باوك** و خزمەتکردنیان هەقێکەو، ئەوەش مایەی دەستکەوتنی بەهەشتەو خراپەکردنیش لەگەڵیان لەگوناهە گەورەکانە...

**چوارەم/ هەقی ڕێگا**، ئیسلام ئەوەندە مەزنە باسی هەقی ڕێگا دەکات بەوەی ئەگەر شتێك ڕێی خەڵکی گرتبوو لابرێت ( إماطة الأذى عن الطريق )وە ئەمەش دانراوە بەبەشێك لە ئیمان کە زیاتر لەحەفتا بەشە (بضع وسبعون شعبة)...

**پێنجەم/ هەقی خوا** کە لەپێش هەموو هەقەکانەوەیە( إن لربِّكَ عليكَ حقاً ) بۆ ئەمەش بڕوادار هەوڵ دەدات فێری زانستی شەرعی ببێ و خواپەرستی زۆر بکات و بانگەواز بکات و تێبکۆشێ بۆ ئاینەکەی و ...هتد .

جابڕوادار لەبگرەو بەردەو کێشمەکێشی جێبەجێکردنی ئەم هەقانەدا ماندوو دەبێت، کە لە ڕاستیشدا لەززەتی ژیان لەو هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونەدایە.

ئیبن جوزی باسی ئەم حاڵەتەمان بۆ دەکات و دەڵێت :

( سەیری هیممەت بەرزی خۆمم کرد سەرم سوڕما، چونکە من حەزدەکەم زۆر شت فێربم وکەم زانین بەبێ هیممەتی دەزانم، هەرچەند ڕەنگە تەمەنیش بەش نەکات ئەو هەموو زانستەی تیا بەدەست بهێنم ...

ئنجا حەز دەکەم کاربکەم بەو زانستەی هەمەو ئەمەوێ وەك (بيشر كوڕی حارث الحافي) وەرعم هەبێ و وەك (معروف الكرخي) زوهدم هەبێ و...هتد....ئەمە بەبێ ئەوەی لەخەڵکی دابڕێم، بەڵکو بەردەوام سوود بەخەڵکیش بگەیەنم...

پاشان دەمەوێ کارو کاسپیەکیش بکەم تا ئاتاجم بەکەس نەبێ و دەست لەخەڵکی پان نەکەمەوە و کەس منەت نەکا بەسەرما... دیارە ئەوەی هیممەتی بەرز بێت هەروا دانانیشێت... دیسان حەز دەکەم مناڵم هەبێ و لەدەورم بن....

ئەمە بێجگە لەوەی کەحەز دەکەم بنوسم و نووسراوەکانم دوای خۆم سوودیان لێ وەرگیرێ و ناوم بمێنێ ... دیارە کۆکردنەوەی ئەمانە هەمووی کۆکردنەوەی کۆمەڵە شتێکی دژ بەیەکەو ،جۆرێك ماندوێتی و شپرزی و ئازار دروست دەکات ، بەڵام هەرچۆن بێت تەسلیمی بووم، ڕەنگە (تهذيب)و چاکبوونم لەو هەوڵ و کۆشش و ماندوو بوونەدا بێت، ئەگەر گەیشتمە ئەو هەموو شتانەی لەنیەتمدایە ئەوە باشە ئەگەر نەشگەیشتم ئەوا نیەتی بڕوادار لە کارەکەشی گرنگترەو خێری خۆمم دەست دەکەوێت ...(صيد الخاطر)

ئەم حاڵەی ئیبن جوزی لای زۆر لە بڕواداران هەیەو هەرکەس بەجۆرێك هەقەکان ئەدات...

**هاوسەنگی و چەند تێبینیەك :**

١- ئاشكرایە ئیسلام ئاینێكی جیهانیەو تارۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، بۆیە گرنگی بەهەموو بوارێكی ژیان دەدات و هانی موسوڵمانانیش دەدات كە گرنگیان پیٚ بدەن.

هەرلەكۆنەوە موسوڵمانان كەمتر لەلایەنەكانی تر گرنگیان داوە بەبواری پزیشكی، ئەمەش وای لەپێشەوا شافیعی كردووە كەبڵێت ( وانازانم هیچ زانستێك پاش حەلاڵ و حەرام گرنگتر بێت لەزانستی پزیشكی، كەچی بەداخەوە ئەهلی كیتاب زاڵ بوون بەسەرماندا لەو بوارەدا و پێشمان كەوتوون )....

هاوەڵێكی شافیعی دەڵێت( پێشەوا شافیعی زۆر خەمی بوو كەموسوڵمانان گوێیان نەئەدا بەپزیشكی و، دەیووت : پزیشكی كەیەك لەسەر سێی زانستەكانە پشت گوێ خراوەو جوولەكەو گاور تیا بالاْ دەستن).

ئەگەر سەیرێكی خێرای مێژووی ئیسلامی بكەین، دەبینین كە ئەم گوێ پێنەدانە چەند زیانی گەیاندووە بەكۆمەڵگای ئیسلامی، زۆر لەخەلیفەو كاربەدەستان پزیشكی تایبەتیان جوولەكەو گاور بوون و دیارە ئەوانیش نكوڵی ناكەن لەزیان گەیاندن بەموسوڵمانان... وەك دەشزانن كە (محمد الفاتح) نزیكەی چواردە جار هەوڵی تیرۆر كردنیان دا بۆیان نەكرا تاپزیشكێكی تایبەتیان ناردە(استنبول)و وای كرد كە نزیك ببێتەوە لەكۆشك و پاشان ببێتە پزیشكی تایبەتی سوڵتان و كەم كەم زەهری بۆ دەكردە خواردنەوە تاسەرەنجام ژەهر رێژەكەی زۆر بوو لەلەشیاو كوشتی... ئنجا هەموو ئەوروپا دەستیان هێنا بەدڵیاناو وتیان (هەڵۆی بەرزە فری ئیسلام تیاچوو)....

زۆر زانستیش هەیە هەر لەكۆنەوە رۆژئاوا نایانەوێ دەست موسوڵمانان بكەوێ، سوڵتان عبدالحمید چەند كەسێكی نارد زەمانی خۆی كە ببنە پسپۆر لەبواری نەوتدا، رۆژئاوا نەیانهێشت فێر بن و ئاستەنگیان هێنایە بەردەمیان... كەچی خۆیان پسپۆریان دەنارد بەخاكی ئیسلامدا دەگەران بۆ نەوت لەژێر پەردەی گەران بەدوای(ئاثار)دا، جا بۆزیاتر چاوو‌راوكردن شمشێرێك و هەندێ شتی كۆنیان برد بۆ سوڵتان عبدالحمید گوایە دۆزیویانەتەوە... (ئەمەش سوڵتان لەیادەوەریەكانیدا باسی كردووە !)

كاتێك وولاّتە ئەوروپیەكان قەرزێك ئەدەنە ولاّتە بەناو ئیسلامیەكان مەرجیان لەسەر دادەنێن كەبیكەن بەچی ؟! بۆئەوەی هەر بەقەرزاری بمێننەوەو پارەكە بەفیڕۆ بچێت...

یان قەرزیان دەدەنێ و یارمەتیان دەدەن بەمەرجێ سەرکوتی ئیسلامیەکان بکەن، هەروەك مەرجیان دانا لەسەر ولآتی یەمەن، گوایە بەمەرجێك یارمەتی دەدەن و قەرزیان دەدەنێ کەئیسلامیەکان لەبەشداریکردن لەحوکمدا دووربخاتەوە ؟!

گرنگیدان بەبواری پزیشکی و ئەندازیاری و ئەتۆمی و... هتد بەشێکە لەو خواپەرستیەی(عبادە)کە ئێمە بۆی دروس بووین.... چونکە هەرکارێك کە بۆ خوا بکرێت عیبادەتە....ئەمەش بۆ ئەوەی دانەمێنین بۆ پسپۆڕی تایبەت لە هەر بوارێکدا ولآت پێویستی پێی بێت .ئەوەتە لەولآتی سودان کەدەیەوێت بەرنامەی ئیسلام پەیڕەوی بکات جاری واهەیە دائەمێنن بۆ پسپۆڕی تایبەت ...

٢- ئەم مەسەلەی هاوسەنگیە هاوەلآنیش نالآندویانە پێیەوە و حەزرەت(ص) بەردەوام کاری لەسەر کردووە....

کاتێك موسوڵمانان کۆچیان کرد لەمەککەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ص)، کۆچکەرانی دابەشکرد بەسەر ماڵە (انصار)ەکانداو کردنی بەبرا، (سلمان)ی فارسی بوو بەبرای (ابی درداء)، کە(سلمان) سەردانی کرد، خێزانی (ئەبو درداء)ی بینی شڕۆڵەیەو هیچ گوێ بەخۆی و جل و بەرگی نادات، سەلمان لێی پرسی: بۆ ئاوایت؟ ئەویش وتی : ئەبو دەردائی برات کاری بەدنیا نەماوە...

کاتێك نان دانرا ئەبو درداء وتی: تۆ نان بخۆ من بەڕۆژووم(ڕۆژووی سوننەت)، سەلمان وتی : تانان نەخۆی لەگەڵما نان ناخۆم، ناچار ئەبو درداء لەبەر میوانەکەی ڕۆژووەکەی شکاند... کاتێك شەو داهات چەند جار ویستی هەستێ بۆ شەو نوێژ سەلمان پێی دەووت بنوو جارێ، تاسێیەکی دوایی شەو ئنجا سەلمان هەڵی ساند و وتی: ئنجا دەهەستە بابەیەکەوە نوێژ بکەین....

بەیەکەوە نوێژیان کردو ئنجا سەلمان پێی وت :﴿ إن لربك عليك حقا، ولنفسك عليك حقا، و لأهلك عليك حقا، فاعط كل ذي حقٍ حقَّهُ﴾...دوایی هاتن بۆ پێغەمبەریان(ص) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی : سەلمان ڕاست دەکات...( بوخاری گێڕاویەتیەوە ).

٣- هاوسەنگی لەنێوان بانگەواز کردن و جێبەجێکردنی و سوننەتەکاندا پێویستە، تا بانگخواز زیاتر لەخوا نزیك ببێتەوە، پیاو باشێکی تابیعین دەڵێ (کێ پیاوێکم پیشان

دەدات کە بەشەو لەشەو نوێژدا بگری لەترسی خواو لەڕۆژیشدا بەدەم خەڵکەوە پێبکەنێت)... دیارە ئەو کەسانەی ئەو هاوسەنگیە ڕادەگرن کەمن....

شێخ عبدالقادری گەیلانی بەڕەحمەت بێت، لەگەڵ ئەو هەموو خواپەرستیەی دەیکرد بانگەوازیشی دەکردوبووە مایەی هیدایەتی خەڵکێکی زۆر وجارێکیان وتی: (خوای گەورە ویستی وابوو کەسوود بەخەڵکی بگەیەنم، سوپاس بۆ خوا زیاتر لەپێنج سەد کەس لەسەر دەستما موسوڵمان بوون وزیاتر لەسەد هەزار کەسیش لەسەردەستما تەوبەیان کردووە) ل ٥١ التنازع والتوازن (د.محمد موسى الشريف) .

٤- هاوسەنگی کردن لەنێوان تێکەڵاوی خەڵك و سەردانیان و گرنگیدان بەخۆفێرکردن... (بەڕاستی کات کەمە، یارمەتی براکەت بدە سوود لەکاتەکانی وەربگرێ )...

ئیمام یوسف القاضی کە لەساڵی ٢٩٧ ز دا مردووە، بەزانای پایەبەرز ئیبراهیمی حەربی کە لە (٢٥٨)ی کۆچیدا مردووە دەڵێت (باوکی ئیسحاق ئەگەر بەپێی پێویست بێین بۆ لات و سەردانت بکەین، ئەوەندە هەقت لەسەرمانە دەبێت هەمیشە لەلات بین و لەخزمەتتدا بین)، ئەویش وتی( هەموو نەهاتنێك لەخراپی ووشکی وبێ سەلیقەییەوە نیەو هەموو هاتنێکیش لەخۆشەویستیەوە نییە، گرنگ ئەوەیە دڵەکان نزیك بن لەیەکەوە)...

بەڕاستی ئەمە کێشەی ئەم زەمانەیە، هەریەك لەئێمە خەڵکانێکی زۆر دەناسێت و شار فراوان بووە، کەس و کار (ماشاء الله) زۆرن ، وەرە هەقی هەموان بدە ، بزانم کاتت دەمێنێتەوە بۆ خۆت شتێك فێر ببی، یان شتێك بنووسی، بۆیە بادەم بەگلەیی نەبین و عوزر بۆ یەك بهێننەوەو سوود لەکاتەکانمان وەرگرین بەباشترین شێوە، سابەڵکو بەفەزڵی خوا بەهەموو لایەکمان کاروانی ئەم بانگەوازە هەنگاوێ زیاتر لەسەر دەستمانا بچێتە پێشەوە...

٥- ڕێگای دنیاوڕێگای ئاخیرەت دووریی جیاواز نییە ، ئەگەر دنیات ویست بەڕێگایەکدا بڕۆیت و ئەگەر ئاخیرەتت ویست بەڕێگایەکی تردا بڕۆیت ، بەڵکو دەتوانێ بەڕێی دنیادا بڕۆیت و ئاخیرەتیش بەدەست بێنێت بەوەی کە نیەتت ڕاست بکەیتەوە بۆ خوا...

خوای گەورە نایەوێ دنیا فەرامۆش بکەین و پشت گوێی بخەین، قورئان دەفەرموێت ﴿ وَيَسألونَكَ مَاذَا يُنفِقونَ قُلِ العَفوَ كَذلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمُ الآياتِ لَعَلَّكُم تَتَفَكَّرونَ في الدّنيا

والآخِرَة ﴾ ( البقرة:٢١٩ ) واتە: پرسیارت لێدەکەن چی ببەخشن لەڕێی خوادا، بڵێ: ئەوەی زیادە لەخۆتان و ماڵ و منداڵتان، ئابەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، تاوەکو بیر بکەنەوە لەدنیاو ئاخیرەتتان....

هەروەها قورئان فێرمان دەکات کە بپاڕێنەوە لەخوا کەچاکمان بۆ بکات لەدنیاو لەئاخیرەتدا:﴿ ومِنهُم مَن يَقولُ رَبّنا آتِنا في الدّنيا حَسَنَةً وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّار،أولئكَ لَهُم نَصيبٌ ممّا كَسَبوا واللهُ سَريعُ الحِساب ﴾ ( البقرة:٢٠٢ )

دیارە ژیان لەدنیادا هەوڵی دەوێ بۆ پەیداکردنی بژێوی و ئا لێرەوە مەسەلەی ماڵ و سامان دێتە ئاراوە، کە ئەمەش ئیسلام بەگرنگ گرتویەتی و پارەی داناوە بەمایەی ڕاگیر بوونی ژیان، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك نەفام و بێ عەقڵ بێت و (سفیه)بێت بۆ ئەوەی پارەکانی کەپارەی کۆمەڵگایە تیا نەچێ، ئەبێت بۆی سەرپەرشتی بکرێت و بخرێتە ئیشەوەو بەوە بەخێویش بکرێت ، قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَلا تُؤتوا السّفَهاءَ أموالَكُمُ التي جَعَلَ اللهُ لَكُم قياماً وَارزُقوهُم فيها وَاكسُوهُم وقُولوا لَهُم قَولاً مَعروفاً ﴾ (النساء:٥) واتە: پارە خوا کردویەتی بەمایەی ڕاگیرکردنی ژیان( التي جعَل الله لكـم قيامـاً ) بۆیە نابێت بەفیڕۆ بدرێن و بەخۆڕایی تەخشان و پەخشانی پێ بکرێت ... هاوەڵانی پێغەمبەر(ص) کاروکاسپیشیان دەکردو لەڕێی بازرگانییەوە پارەی باشیان پەیدا دەکردو پارە بەدەستیانەوە بوو نەك لە دڵیانا، بۆیە زۆر بەدڵفراوانی دەژیان و دەستیان نەقوچاندبوو لەعاستی بانگەوازی خوادا... تەنانەت شەش کەس لەو دە کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدرا بوومليۆنەر بوون...

ئەوەش (سعید کوڕی المسیب)کە یەکێکە لەتابیعین دەڵێ: (خێرنیە لەکەسێکدا کەنەیەوێ پارەی حەڵاڵ کۆبکاتەوەو هەقی خوای لێ بدات و موحتاجی کەس نەبێت).

(سوفیان الثوري)کە لە١٦١ کۆچیدا مردووە دەڵێت( جاران پارە زۆر مەبەست نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ قەڵغانی موسوڵمانە )...باشە لەسەدەی دووەمی کۆچیدا پارە قەڵغان بووبێت ئەی ئەمڕۆ کەسەدەی پانزەی کۆچییەو دنیا دنیای پارەیەو جولەکەو گاور بەپارە حوکم دەکەن و خەڵك دەکڕن و دنیا هەڵدەسوڕێنن، تەنانەت لەهەڵبژاردنەکاندا بەپاردو پڕوپاگەندە کێیان بوێ دەیهێننە سەر حوکم لەگەورەترین دەوڵەتدا کە ئەمریکایە...

کەواتە دەبێت بەچاوێکی تر سەیری دنیاو ماڵ و سامان بکەین و لێی نەترسین، بەڵکو ئازایانە هەوڵی بۆ بدەین لەرێی حەلاڵەوەو ئازایانەش خزمەتی بانگەوازی خوای پێ بکەین تاوەکو لە قیامەتدا سەربەرزو سەرفراز بین، ئەوەندەش بەسە کەحەزرەت (ص) پەنای گرتووە بەخوا لەفەقیری و داوای دەوڵەمەندی کردووە لەخوا : ( اللهم إني أعوذ بك من الكفر والفقر) (اللهم إني أسألك التُقى والغِنَى) یان دەفەرموێت (نعم المـال الـصالح للرجل الصالح)... هەروەها دەفەرموێت : (نعم العون على تقوى الله المـال)واتە: پارە یارمەتیدەرێکی چاکە بۆ پارێزکاری ...كنز العمال، ٦٣٤٢ /الديلمي.

لەفەرمودەیەکی تریشدا هاتووە( الدراهم والدنانير خواتيم الله في أرضه من جاء بخاتم مولاه قُضيت حاجته) كنز العمال ٦٣٣٢ واتە: درهەم و دینار مۆری خوان لەسەر زەوی، هەرکەس مۆری پەروەردگاری پێبێ کاری جێبەجێ دەبێت.

٦- راستە مرۆڤ هەمیشە لە هەڵپەدایەو چاوی تێر نابێت و رەنگە پەلاماری چەند ئیشێك بدات و هەقی هیچیشیان بەتەواوی نەدات و باش فریایان نەکەوێت، ئەمەش دیارە دەیبات بەرەو ئەوەی کە وەعدی ناراست بێت و نەتوانێت قسەی خۆی بباتە سەر...

بڕوادار کار دەکات بەڵام هاوسەنگی دەبێت لەنێوان کارەکانیدا، تاوەکو خاوەنی وەعدو پەیمانی خۆی بێت و بتوانێ بەچاکی پیاڕابگات...

کات گرنگەو رێکخستنی کاتەکانیش بەهەمان شێوە گرنگە، بەتایبەت کەئێمە لەقوتابخانەی ئیسلامدا خوێندومانە، ئاشکرایە لەئیسلامدا نوێژو رۆژوو حەج و زەکات کاتی تایبەتیان هەیە، بۆنمونە نوێژ ( إنّ الصَلاة كَانَت عَلَى المؤمنينَ كِتابـاً مَوقوتـاً ) (النساء:١٠٣) راستگۆیی لەوەعدو لەمەوعیدا سیفەتی پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێ بێت ، ئەوە حەزرەتی ئیسماعیل کە قورئان لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ واذكر في الكتابِ إسمَاعيلَ إنَه كَانَ صادِقَ الوَعدِ وكَانَ رَسولاً نَبيّاً﴾ (مريم:٥٤) رێزگرتن لەکاتی خۆت و خەڵکی سیفەتێکی جوانەو کاتیش بریتیە لە ژیان، ئەو سەعات و خولەکانەی دەڕوات ناگەڕێتەوەو مرۆڤ لە قیامەتدا خەفەت لە بەفیڕۆیانی دەخوات...

زانای پایە بەرز علي طنطاوي زۆر گرنگی دەدا بەکاتەکانی و لەژوورەکەیدا بەرامبەر خۆی کاتژمێرێکی گەورەی دانابوو، هەموو کات پێش مەوعید خۆی ئامادە دەکرد بە دە خولەك و چاوەڕوانی میوانی دەکرد، رۆژێك خۆی ئامادە دەکات و چاوەڕێی برادەرێکی

دەکات کەچی بیست خولەك دوادەکەویت، ئەمیش دەیباتە ژووری میوان و بەتەنها بیست خولەك بەجێی دێڵێ ئنجا دەچێتەوە بۆلای و خزمەتێکی باشی دەکات بۆئەوەی تێی بگەیەنێ چاوەڕێی چەند ناخۆشە !

ئەمە بێجگە لەوەی کەکاتی تایبەتی خۆی هەبووە بۆ خواردن و بۆ نووستن و... هتد دیارە ئەم ڕێکخستنی کاتەو تەمەنی درێژی وای کرد کە بەهەزاران پەڕاو بخوێنێتەوە و بەهەزاران لاپەڕەش بنووسێت و لەچەندەها ئێستگەو لەچەندەها کەناڵەوە وتاربدات و خزمەتێکی باش بە بەرنامەی خوا بکات...ل٨٥ ظاهرة التهاون بالمواعيد.

**چاکەکاری**

قورئانی پیرۆز داوا لەبڕواداران دەکات کە خواپەرستی خۆیان بکەن و چاکەکاربن بۆ ئەوەی سەرفرازی دنیاو قیامەت بن : ﴿ يا أيها الذين آمنوا أركعوا وأسجدوا وأعبــدوا ربكم وافعلوا الخير لعلكم تفلحون ﴾٧٨ الحج.

بڕواداری ڕاستەقینە خێر خوازەو خێرو خۆشی بۆ خەڵکی دەوێت، خوای گەورەش هانی دەدات کە بۆ هەموو خێراتێك پێشبڕکێ بکەن :﴿ أولَئِكَ يُسارِعونَ فــي الخَيــرَاتِ وَهُم لَها سَــابِقونَ ﴾ (المؤمنون:٦١) بەڵێ چاکەکاری و چاکەخوازی مایەی ڕەزامەندی خوایەو مسقاڵە زەڕەیەك چاکە تەرازووی قیامەت دەیخوێنێتەوەو، پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت (فمن يعمل مثقال ذرة خيراً يره)ل ١٧٨ لەخزمەت قورئاندا( نووسەر ).

**نموونەیەك لەکوردستانەوە :**

لەپێش شەڕی عێراق – ئێراندا، لەیەکێ لەگوندەکانی خۆمان لەسنووری ئێران لای چوارتاوە، لە دەمەو ئێوارەیەکی زستانی ساردا ، پیاوێکی گوندەکە تارمایی سەربازێك دەبینێ کە لە (ئیجازە)گەڕاوەتەوەو لەسەرمادا لەوەدایە ڕەق ببێتەوەو دیارە ناتوانێ بگاتەوە( ڕەبیەکەیان ) کە لەسەر چیاکە دەبێت...

ئەو پیاوە دەچێت بەدەم سەربازەکەوەو دەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوەو ئەو شەوە خزمەتی دەکات و بەیانی لەگەڵ کوڕەکەیدا بەولاخێك دەینێرێتەوە بۆسەر چیاکە بۆلای سەربازەکانی تر، پاش ماوەیەك شەڕی عێراق – ئێران دەست پێدەکات و گوندەکە تووشی ڕاگواستن دەبێت...

پاش چەند ساڵێك و پێش ڕاپەڕین ئەو پیاوە هەندێ ولاخ و مەڕو ماڵاتی خۆی و خەڵکی تر دەبات بۆ موسڵ و دەیفرۆشێت بە سی هەزار دیناری سویسری و پارەکە قایم دەکات لەجلەکانیداو دەیشارێتەوە ، کە دەگەڕێتەوە لەسەیتەرەی کەرکوك هەولێردا دەیگرن و پارەکەی لێدەسەنن و دەڵێن : ئەوە پارەی پێشمەرگەیەو، لەو بەر سووری هەتاوە ڕایدەگرن و کەلەبچە دەکەنە دەستی ، ئەمیش چی قسە دەکات گوێی لێناگرن و بێسوود دەبێت..

ئالەم کاتەدا کوردێکی ئاوا بەو پارەیەوە بەردەست جەندرمەکانی بەعس بکەوێ، ئاشکرایە بەئاسانی وازی لێناهێنن، بەلاّم دیارە خوای گەورەش بەرەحمەو ئەوەندەی پێناچێت سەیارەیەکی عەسکەری دەوەستێ و ئەفسەرێکی پلە بەرزی لێ دادەبەزێت کەحیمایەیەکی زۆری دەبێت و بەدارەکەی دەستی دەکەوێتە گیانی سەربازەکانی سەیتەرەکەو دەڵێ ئەم پیاوەتان بۆ لەم گەرمایەدا ڕاگرتووە ، ئەڵێن : گەورەم ئەوە پارەی ( مخربین )ی پێیەو گرتومانە ، ئەڵێ : شتی وانیەو پارەکەیان لێ دەسێنێتەوەو کابرا لەگەڵ خۆیدا سەردەخات....

لەڕێ بەکابرا دەڵێت : نامناسی ؟ دەڵێ :نەخێر، دەڵێ: باش بیرکەرەوە چ خێرێکت کردووە ! هەرچی بیر دەکاتەوە ئەو چاکەیەی زووی بیر ناکەوێتەوە...

تومەز ئەو ئەفسەرە سەربازەکەیە کەکاتی خۆی پێش زیاتر لە دەساڵ ئەم چاکەی لەگەڵ کردووەو لەمردن و ڕەق بوونەوە ڕزگاری کردووەو بەهۆی ئازایەتیەوە لەشەڕی ئێران – عێراق دا (نوط شجاعة)ی وەرگرتووە و ئاوا پێشکەوتووە وبووە بەو ئەفسەرە.

ئنجا دەڵێ بۆ کوێ دەچی، دەڵێ: دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، دەڵێ: بابتگەیەنین، ئەویش دەڵێ : ماڵت ئاوابێت تەنها بم گەیەننە نەقلیاتی کەرکوك خۆم دەگەڕێمەوە .... ئەفسەرەکەش دەیباتە نەقلیات و سەیارەی حیمایەکانی لەگەڵ دەنێرێ تالەسەیتەرەی کەرکوك بەسەلامەتی دەری دەکەن ... بەڕاستی ئەمە وانەیەکی گەورەیە کەئەو کابرایە بۆ ئاسیاوێکی منی گێڕاوەتەوە لەدوای ڕاپەڕین کەگەڕاوەتەوە بۆ گوندەکەی خۆی ...

## با نیه تمان بۆ خوا بێت

گرنگیــدان بەنیــەت و پاکردنــەوەی ئــەرکی سەرشــانی هــەموو بڕواداڕێکــی ڕاســتە، پێغەمبەر(ص) دەفەرموێت (إنّما الاعمال بالنيات)....

لە هەموو غەزاکاندا موسوڵمانان کەمتربوون چەند قات لەدوژمن کەچی بەفەزڵی خواو بەنیــەتی بــۆ خواســوڵحاویان ســەردەکەوتن، لــە فــەتحی (مــەدائین)دا لەســاڵی شەشــەمی کۆچیدا، کاتێـك ســەعدی کــوڕی ئــەبی وەقــاص ســەرکەوت بەســەر فارســەکاندا ویستی بپەڕێتــەوە بــە دیجلــەدا و دوای دوژمــن بکــەوێت تــاوەکو شــاری مــەدائینیش فــەتح بکــات، دیارە ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە کەشتی و هۆکاری تری پەڕینــەوەیان نــەبوو، ســەعد ووتارێکیــدا بــۆ ســوپاکەی و ووتــی : دوژمنتــان بــەهۆی ئــەم دەریایــەوە خۆیــان بــۆ مــەلاس داون، دەســتان نایانگــاتێ و ئــەوانیش کــەی بیانــەوێ پــەلامارتان دەدەن بــەهۆی کەشتیەکانیانەوە ، جائێوەش شتێ نیە لەپشتەوە لێی بترسن وخــەمی دنیاتــان نیــە، بۆیــە وادەبینم کــەجیهادی دوژمنەکــەتان بکــەن بەنیــەتتان پــێش هۆکــاری دنیــایی، بەڕاســتی من دەمەوێ بەم دەریایەدا بپەڕمەوە بۆیان، جانازانم کێ دێت لەگەڵما ؟!

هەموو هاواریان کرد، خوا بەخێری بگێڕێ و خێر بێنێتە ڕێمان...

نزیکــەی شــەش ســەد ســوار دایــان لــە ئاوەکــە بەولاخەکانیانــەوەو بەفــەزڵی خــوا نقوم نەبوون و پەڕینەوە کە بەئاشکرا موعجیزەیــەکی گــەورە بــوو خــوا بــۆ هــاوەڵانی هێنایــەدی، ئــەو شــەش ســەد کەســە لەوبــەر ئاوەکــەوە ســوپای فارســیان دوورخستەوە، تاســەعدیش بەباقی سوپاکەوە پەڕیەوە، لەناو ئاوەکەدا سەعد لەبەر خۆیەوە دەیووت( حسبنا الله ونعمَ الوَكيل والله لَينصرن الله وليه، وليظهرن دينه، وليَهزمن عدوه، إن لم يكن في الجيش بغي، أو ذنوب تغلب الحسنات ) واتە:پشتمان بەخوا بەستووەوهەر ئەومان بەسە، بەخوا خــوای گەورە دۆستانی سەردەخات و دینەکەی بەرز دەکاتەوە و، دوژمنەکانیشی تێك دەشکێنــێ، بەمەرجێ لەسوپاکەدا تاوانکار نەبێ یان گوناه زاڵ نەبێ بەسەر چاکەکاندا....

کەپەڕینــەوە ســەعد جــەختی کــردەوە ســەرئەم مانایــەو وتــی ( وام بەچــاك زانــی کــە دەستپێشخەری بکەن لەجیهادی دوژمنتاندا بەنیەتتان، کەئەوەش چەکێکە خوا بەتایبــەت داوێتــی پێتــان و، بــەوە فــەزڵی داون بەســەر کەســانی تــردا، وەبــەوە پێــشینانتان سەرکەوتوون، وە بەوە دوژمنتان دەشکێنن و دەگەنە ئاواتەکانتان.)

( گۆڤاری المجتمع/١٤١٢ -٨/٨/٢٠٠٠ )

**دواوتە**

**(یاالله.. یاالله.. یاالله)**

﴿یَسأَله مَن في السّماوات والأرضِ كلّ یومٍ هوَ في شَأن﴾ **(الرحمن:٢٩)**

**هەموو گیانلەبەرو زیندەوەران، هەرچی هەن لە ئاسمانەکان و زەوی، هەموو کات بەگوتار و بەزمانی حاڵ، داوای پێویستیەکانیان لەخوا دەکەن، هەموو ڕۆژێك و هەموو کاتێك ئاگاداریانەو دەچێ بەهانایانەوەو کاریان بۆ جێبەجێ دەکات و ملیارەها ملیار کار تاوتوێ دەکات بە(کن فیکون)لەبوونەوەرو لەجیهانی ئادەمیزاد و پەری و فریشتەکان.**

**ئەگەر لەدەریادا ڕەشەبا هەڵی کردو شەپۆل هات،**

**سەرنشینانی کەشتی هاوار دەکەن : یا الله ...**

**ئەگەر کەسێك لەبیاباندا ونبوو، یان کاروان لەڕێ لایداو سەرگەردان بوون...**

**هاوار دەکەن : یا الله...**

**ئەگەر دەرگا بەڕووی داواکارێکدا داخراو هیچ کەس لای لێ نەکردەوە،**

**هاوار دەکات : یا الله...**

**ئەگەر هیچ دایی نەداو هەموو ڕێگاکان داخران، هیوا بڕاو دەست بەهیچا نەگەیشت...**

**هاوار دەکرێ : یا الله...**

**ئەگەر سەری دنیات لێ هاتەوەیەك و دڵت تەنگ بوو، تروسکایی نەما ئالەوێدا**

**هاواربکەو بڵێ : یا الله...**

**باش بزانە هاوارەکان بۆ لای خوا بەرزدەبنەوەو لەو کاتەدا کە کەس نیە لەم بوونەوەرەدا بێت بەهاناتەوە، خوا هەیە کە دێت بەدەم داواتەوە، دەتبینێ و شەکوای حاڵت دەبیستێ**

﴿وإذا سَألكَ عبادي عني فإني قريب أُجيب دعوةَ الداع إذا دعان، فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون﴾ **واتە : ئەگەر بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی، ئەوا من نزیکم و وەڵامی داواکەران دەدەمەوە کاتێك داوایەکیان لێم دەکەن، دەبا ئەوانیش هەروەك من چۆن وەڵامیان دەدەمەوە ، باوەڵامی من بدەنەوەو بڕوام پێ بهێنن، بەڵکو ڕێیان پیشان بدرێت و سەرفراز بن**...(لا تحزن/ عائض القرني).

**مامۆستا محمد حامد کە لەمزگەوتی گەیلانی لای عەلوەکە لەسلێمانی پێشنوێژی دەکات بۆی گێڕامەوە کە لە دوای ڕاپەڕین لە (گوندی باریکە)دەبن لەسلێمانی و، باوکی**

تووشی نەخۆشیەکی سەخت دەبێت و چەند جار دەیهێنێت بۆ لای دکتۆر بۆ سلێمانی و پارەو پولیان بەدەستەوە نامێنیٚ، ئێوارەیەکیان پیاوێکی ناسیاویان سەردانیان دەکات و بەباوکی دەڵێت : تۆ زۆر زەرووره گۆشت بخۆیت بۆ ئەوەی چاك ببیت...

باوکیشی بەمامۆستا محمد دەڵێت کورم بەڵکو گۆشت بکری، دەڵێن بۆ من باشە...

مامۆستاش زۆر خەمبار دەبێت چونکە دەمەو ئێوارەیەو نەهیچی پێیەو نەکەسیش شك دەبات لێی قەرز بکات، بۆیە دەچێتە ژوورەکەی ئەو دیویان و تێر دەگری لەداخی بیٚ وەزعی وبیٚ دەسەلاتیان... ئەوەندە ناخایەنێت کە کۆمەڵیٚ قازوقولنگ بەئاسمانا تێدەپەڕن و هەندیٚ چەکدار کە لەو ناوچەیەدا دەبن تەقەیان لیٚ دەکەن، بەقەدەری خوا دانەیەکیان دەکەوێتە ماڵی مامۆستاوە خێرا سەری دەبڕیٚ و بۆ باوکی لیٚ دەنیٚ و، خوای گەورە بەفەزڵی خۆی دڵیان خۆش دەکات... قورئان دەفەرموێت :﴿ أمَّن يجيبُ المضطرُّ إذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الارضِ ءَ إله مع الله؟؟ قليلاً ماتذكرون...﴾ النمل/٦٢ واتە: ئایا کێیە جگە لەخوا کەبێت بەهانای لێقەوماوو بێدەرەتانەوە، کاتێك لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە جێنشین لەزەویدا، ئایا خوا هاوەڵو هاوبەشی هەیە؟؟ کەمێك بیرکەنەوە و یاداوەری وەرگرن...

سەرچاوەکان

١- رێبەری مەشقی سەرکردەیی/

٢- كنز العمال

٣- وقفات تربويه/ عبدالحميد البلالي

٤- صيد الخاطر/ابن الجوزي

٥- التنازع والتوازن/ د. محمد موسى الشريف

٦- مجله المجتمع - ١٤١٢ - ٢٠٠٠/٨/٨

٧- لاتحزن/ عائض القرني

## ناوەرۆك

# ژیانەوە

بڵاوبوونەوەی ئیسلام پاش کارەساتی ١١ی سێپتەمبەر

بەرگی شەشەم

# پێشەکی

پێغەمبەر (ص) دەفەرموێ( إن الله زوى لي الارض فرأيت مشارقها ومغاربها , وإن مُلك أمتي سيبلغ ما زوى لي منها ) مسلم ..

ئەم فەرموودەیە وەلامە بۆ هەموو حالەتێك كەموسلمانان تیایا تووشی نارەحەتی و نەهامەتی دەبن, خوای گەورە ڕۆژهەلات و ڕۆژ ئاوای هێناوەتە بەرچاوی حەزرەت (ص)و هەوالی داوەتێ كەبەدلنیایی مولكی ئیسلام و قەلەم ڕەوی ئیسلام ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دەگرێتەوە ..

بڕواداران كەدوژمنان دەبینن كۆن لەسەر دژایەتیان , دلنیان كەئەوە پەیمانی خوایەو هاتۆتەدی ﴿ولما رأى المؤمنون الاحزاب قالوا هذا ماوعدنا الله ورسُولهُ ومازادَهُمْ إلا إيماناً وتسليما﴾(الاحزاب/٢٢).واتە : كاتێك بڕواداران كۆمەلی (الاحزاب)یان بینی كە كافرانی مەككەو هاوكارانیان بوون هاتبوونە سەر مەدینە , وتیان : ئەمە ئەوەیە كە خوا و پێغەمبەرەكەی هەوالیان داوینێ و پێیان ڕاگەیاندوین كە دوژمنان كۆل نادەن و پەلامارمان دەدەن و, خواو پێغەمبەرەكەی ڕاستیان فەرمووە , ئەمەش بووە مایەی بڕوای زیاتر و تەسلیم بوونی زیاتر بۆ خوا ...

جاكاتێك خەلكی دەیانەوێ موسلمانان ساردبكەنەوە و پێیان دەلێن :دوژمنان لەهەموو لایەكەوە هاتوون بۆتان , دەیانەوێ ترس بخەنە دلیانەوە لەوەلامیاندا دەلێن :﴿الذين قال لهُمُ الناسُ ان الناس قَدْ جَمَعُوا لكم فاخْشَوهُمْ فزادَهُمْ إيماناً وقالوا : حَسْبُنا الله ونعم الوكيل﴾(آل عمران : ١٧٣ ) واتە: كاتێك خەلكی بەبڕوادارانیان وت : ئەوە لە هەموو لایەكەوە هێرش دەكرێتە سەرتان و خەلكی كۆبوونەتەوە لە دژتان , بترسن , ئەمە بڕوایان پتەوتر دەكات و دەلێن : ئێمە خوامان بەسە هاوكارو سەرخەرمان بێت وهەرئەویش باشترین وەكیلمانە.

بەلێ .. ئەمڕۆش وەك دوێنێ و وەك هەزارو چوارسەد سال لەمەوبەر دوژمنان بەئاشكراو بەنهێنی دژ بەم دینە دەوەستن و پیلان دادەنێن و یەكتری ئاگادار دەكەنەوەو یەكتری هەلدەنێن لەسەر كوژاندنەوەی نووری ئیسلام ..

﴿يريدون لِيُطفِئوا نور الله بأفواههم والله مُتِمُ نوره ولو كره الكافرون ﴾(الصف)دەیانەوێ نووری خوا بەفوو بکوژێننەوە , خوای گەورەش نووری خۆی تەواو دەکات و بەردەوام دەبێت هەرچەند کافرەکانیش پێیان ناخۆش بێت ...

گڕی مۆمێك بەفوویەك دەکوژێتەوە , بەڵام ئاگرێکی گەورە بەفوو ناکوژێتەوە بەڵکو زیاتر کڵپەدەسێنێ ... هەندێ شتیش کە هەر مرۆڤ دایهێناوە فووکاری تێناکا , کەسێ بیەوێ ڕووناکی گڵۆپێك نەهێڵێ دەبێ لەسویچی تایبەتیەوە بکوژێنێتەوە , ئەگەر وانەکات ئەوا ڕەنج بەخەسارە و هەتا تەمەنی هەیە فووی لێبکات هیچ بەهیچ ناکاو شێتێتی یە !

ئەگەر گڵۆپێ کەدەستکردی مرۆڤە بەفوو نەکوژێتەوە , دیارە نووری بەرنامەی خوا بەقاڵەی دەم و بەفووی فوو کەران و بەهەوڵی کافران هیچی لێنایەت هەروەك مەحوی دەڵێت :

(وصلّى الله على)ئەو حەزرەتەی صاحێب کەمالآتە
کەئەعلا موعجیزەی , قوربانی بم من , نوری قورئانە
لەتاریکی شەوی کوفرا بەیەك دەم لەمەعەیکی دا
هەزارو سێصەدو بیست و دوە , دنیا چراخانە
چرایەك نووری بێچوونی مومیددی بێت , دەبێ وابێ
چرایەك دەستی قودرەت خۆشی کا , بۆ تائەبەدمانە
ل ٤٢٠ دیوانی مەحوی (مەلا عبدالکریم مدرس)

ئەگەر خوا ئەم ئاینەی نە پاراستایە ئەوا هەر زوو ڕۆژی هیجرەت تەواو دەبوو, یان لەشەڕی خەندەق دا هەرەسی دەهێنا , یان بەوەفاتی حەزرەتت خاموش دەبوو , یان بەفیتنەی ناو موسڵمانان لەناو دەچوو , یان بەهێرشی خاچپەرستان و تەتەرەکان کەسەدانساڵیان خایاند ریشەکێش و بنەبڕدەبوو ..

﴿يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ.هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (التوبە:٣٢) واتە : دەیانەوێت نووری بەرنامەی خوا بەقاڵەی دەم بکوژێننەوە , (خەیاڵیان خاوە) خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتەدی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوەی ئاین و نووری خۆی سەربخات هەرچەند کافران سەغڵەت ببن . هەرئەوزاتە بۆیە پێغەمبەرەکەی هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و

ڕێنمووییی و ئـاینی ڕاسـت و دروسـتدا ڕەوانـە کـردووە تاسـەری بخـات بەسـەر هـەموو بەرنامەو ئاینەکانی تردا , هەرچەندە موشریکان پێی دڵتەنگ بن ...

بەرنامەی قورئان بۆ هەموو مرۆڤایەتی یە تاقیامەت , قورئان دەفەرموێت ﴿وما أرسلناك إلا كافةً للناسِ بشيراً ونذيراً﴾(سبأ :٢٨), هەروەها پێغەمبەر (ص)خۆشی دەفەرموێت (وكان النبي يُبعث الى قومه خاصة , وبُعثت للناس كافة).. واتە هەر پێغەمبەرێك بۆ گەلەکەی خۆی نێرراوە , بەڵام من بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێرراوم ...

بۆیە دەبێ نووری ئیسلام بەسەر چوارقورنەی دنیادا پەخش ببێت ئەمرۆ بێت یان سبەی , ناحەزانیش ئەمە باش دەزانن بۆیە دەیانەوێ ئاستەنگ و بەربەست بهێننەڕێ ی , بـۆ نموونـە : سـەرۆکی ڕووسـی(پـۆتین) بـەوڵاتانی ئـەوروپاو (أرثـوذكس ) دەڵـێ (ئوسـوڵیەتی ئیـسلامی تاکـە مەترسـی یـە کـە هەڕەشـە لەعالـەمی پێـشکەوتوو دەکـات و ئاشتی و ئاسایشی جیهانی دەخاتە مەترسییەوە , ئەوان دەیانەوێ خەلافەتی ئیسلامی بگێڕنەوەو یەك دەوڵەتی گەورە دروست بکەن لە (فلیپین)ەوە بۆ (کۆسـۆفۆ), ئەگەر جیهان ڕووبەڕوویان نەبێتـەوە دەگەنـە ئامـانج , ڕووسـیاش پێویـستی بەیارمـەتی ماددی یـە تـا ئوسوڵیەت نەهێڵێ لەباکووری قوقازدا) ل ١٦٣ الاسلام المعجزة المتجددة.

لەپـەڕاوی ( الفرصـة الـسانحة) دا سـەرۆکی ئـەمریکی (ریتـشارد نیکسون) بەئاشـکرا دەڵێـت (تـەیاری سـێ یـەم نموونەیـەکی ترسـناکە –مەبەسـتی ئیـسلامە–ئـەو ئوصـولیانە لـەڕابردووەوە (انطلاق)دەکـەن , بـەڵام لـەڕابردوودا نـاژین ) هـەروەها دەڵێـت ( ئێمـە هـەرگیز ڕازی نابین دەوڵەتێکی ئیسلامی هەبێ لە عێراق )دا ل١٤٤ .

( ئەوانـە چـاویان لەسـەر داهـاتووە , ئەوانـە (محـافظ)نـین , ئەوانـە شـۆڕش گێـڕن و ئیـسلامێکیان دەوێ کـەدین و دەوڵەتـەو دەیانـەوێ شـەریعەتی ئیـسلامی (تطبیـق)بکـەن و دەیانەوێ شارستانیەتی ئیسلامی سەرلەنوێ زیندووبکەنـەوە ), ئنجا نیکسون دوای ئـەم قسانەی داوا لـە (حلف الاطلسي) دەکات کـەڕوو بـەڕووی ئـەم تـەیارە ببێتـەوەو ئاسـتەنگ بهێنێتەڕێ ی و نەیەڵێ سەر زیاد بکات .. هـەروەها وەزیـری دیفـاعی ئـەمریکی رامسفیلد دەڵـێ (نـا , نـا , نـاتوانم بەرگـەی ئـەوە بگـرم عێراقێکـی ئوسـوڵی ئیسلامی ببیـنم ) هـەمان سەرچاوە (ل١٢) . . .

پیلان بەردەوامە و خوای گەورەش پیلانەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە , هەروەك قورئان دەفەرموێت : ﴿ویمکرون ویمکرُ الله والله خیرُ الماکرین﴾( لأنفال :٣٠)واتە :ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و خواش پیلانی خۆی دەخاتە کار (بەپووچ کردنەوەی کارەکانیان) دڵنیابن کەخوای گەورە چاکترینی هەموو پلانسازو نەخشە سازانە ...

یان دەفەرموێ ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ (لأنفال:٣٦)واتە :بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن , ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەربەست دانێن و ڕێگری بکەن لەبەردەم ئاین و بەرنامەی خوادا , جاماڵ و سامانیان لەئایندەدا بەخت دەکەن , پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ و حەسرەت بۆیان و شکست دەخۆن و ژێردەکەون و پاشان کافران بۆ دۆزەخیش ڕاپێچ دەکرێن ...

بەڵێ ... چی خەرج دەکەن بابیکەن , سەرەنجام لەلایەن خواوە دیاری کراوە کە ( والعاقبە للمتقین)پاشەڕۆژو سەرەنجام هەربۆ پارێزکارانەو دوژمنان دوابڕاوو ژێرکەوتوو ڕیسوان لەدنیاداو، لەئاخیرەتیش دا دۆزەخ جێیانە

## هاتن بەرەو ئیسلام

هەروەك لە نامیلکەکانی ژیانەوە و پێش ژیانەوەشدا باسمان کرد, بەردەوام خەڵکی بەویژدان و ژیر دێن بەرەو ئیسلام و نموونەی زۆرمان باسکرد , کەئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرزی و پیرۆزی بەرنامەی خوا کە دڵان کەمەندکێش دەکات ...

یەکێکی تر لەو نموونانە , ڕاوێژکاری ڕامیاری نووسینگەی سەرۆکی حکومەتی (بافاریا) یە لە ئەڵمانیا, کەپێش بیست ساڵ لە نوسینگەی دکتۆر علی جریشە لە (میونخ)موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند ... دکتۆر علي داوای لێکرد کە ئیسلامەتی یەکەی جارێ بشارێتەوە لەبەرئەوەی تووشی نارەحەتی نەبێت و ئاستەنگ نەهێننە ڕێی , کەچی پاش دوومانگ لە کۆنفرانسێکی گەورەدا لەژێر ناونیشانی (فەلەستین بەرەو کوێ ؟ )چووە سەر (منصە) کە وتەی حکومەتی ئەڵمانیا بخوێنێتەوە , پێش وتەکەی بەعەرەبی‌یەکی نیوە ناچڵ وتی (الحمد لله والصلاة والسلام علي رسول الله , ثم أما بعد فإني أعلن اني مسلم واني أشهد أن لا إله إلا الله وان محمداً رسول الله وأعلن أن الاسلام دين و دولة )...

بەمەش موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو جەختی کردەسەر ئەو ڕاستی یەی کەئیسلام دین و دەوڵەتە !! ئنجا وتەی دەوڵەتی ئەڵمانیای بەزمانی ئەڵمانی خوێندەوە ! ل٢٥ الاسلام المعجزة المتجددة .

## گەشەسەندنی ئیسلام پاش کارەساتەکەی ئەمریکا

١١ ی سێبتەمبەر کارەساتێکی گەورە بوو , هەرچۆن بێ و هەرکەس لەپشتیەوە بێت گرنگ نیە بەهێندەی ئەوەی کە چۆن زۆر لێزانانە سوودی لێوەرگیرا بۆ دژایەتی ئیسلام و ڕێگرتن لە ڕابوونی ئیسلامی ...

لەگەڵ ئەو هەموو تەنگ پێهەڵچنینە بەموسڵمانان و بانگخوازان لەگەڵ ئەو هەموو ملیار دۆلارەی خەرج دەکرێ , کەچی لەجیاتی ئەوەی ئیسلام بەرەو دوابچێ , بەرەو پێش دەچێ و ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر گەشە دەکات و پەرە دەسێنێ ! ئەمەش ئەو ڕاستیەیە دەسەلمێنێ کەقورئان فەرمووی (فسينفقونها ثم تكون عليهم حسرة ثم يُغلبون)...

قەشە زویمر کە خەریکی کاری مژدەدان بوو لەسەرەتای سەدەی بیست دا , لەساڵی ١٩١٦ دا ڕایگەیاند (ئیسلام لە گیانەڵادایە , جا کاتێ هیلال دەکەوێو حاچ سەر دەکەوێت )... ل٩٨ هەمان سەرچاوە . ئەوە سەدەی بیستیش ڕۆیشت و ئیسلام هەر پایە دارە و ئاواتیان نەهاتەدی !

## تۆماس کارلیل بەویژدان بوو

ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی تۆماس کارلیل بەویژدان بوو کە وتی (موسڵمانان کە تادوێنێ شوان بوون , ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان بەناوی ئاینی تازەوە دەست بەسەردا گرت و , لەماوەی سەدەیەکدا توانیان زلهێزەکان لەناوبەرن و ببنەخاوەنی موڵك و ماڵیان کە ئەمەش (موعجیزە)یە ...ئەگەر ئەوە بەڕاستی نەهاتایەتەدی دەمووت خەیاڵە!!

هاوارو بانگەکەی محمد وەك پریشکێکی ئاگر بوو , نەکەوتە سەر شاخێکی لم , بەڵکو کەوتە سەر شاخێکی باروت , کە هەمووی بەیەکجار تەقیەوەو نوورەکەی لەشاخەکانی هیندەوە گەیشتە دەشتەکانی ئەندەلوس ...

بەڕاستی عەرەب زەلیل ترین گەل بوون . بوونە گەورەی دنیا . بێنرخترین کەس بوون , بوونە چاکترین لەڕەوشت و زانین و تێگەیشتن دا . لەهەموو کەسیش پەرتەوازەتربوون , بوونە ئیمپراتۆری یەتێك کە لەمێژوودا نموونەو هاوشێوەیان نیە . ئەمانەش هەمووی بەهۆی ئەو ئاینەوە بوو کەپابەندی بوون ) ل١٠٠ هەمان سەرچاوە .

## وەزیری دادی پێشووی ئەمریکا

لەئەنجامی دووری لە دین و فەسادی کۆمەڵگای ڕۆژئاواوە , ژمارەیەکی بێ ئەندازە لەلاوو تازە پێگەیشتوان سەریان کردۆتە مەی و مادده بێهۆشکەرەکان و تاوان و خراپەکاری زۆر زیادی کردووەو ژمارەیەکی زۆریشیان دەگیرێن و لەبەندیخانەکان توند دەکرێن ... لەم لاشەوە ئیسلام لەڕێی بانگخوازانەوە چۆتە ناو بەندیخانەکانەوە و توانیویەتی زیاتر لە سێ سەد هەزار تاوانباری ناو بەندیخانەکانی ئەمریکا بهێنێ بەرەو ئیسلام و نزیکەی هەزار کەسیشیان قورئانیان لەبەرەو خەریکی بانگەوازن ... ئەمەش وای لە (رمزی کلارك) کرد کە وەزیری پێشووی دادی ئەمریکایەکە لەڕۆژنامەکاندا بڵێ (بەڕاستی ئیسلام ڕزگارکەری ئەم عالەمەیەو گەورەترین ئامانجی بەشەریەتیش ئەوەیە کە هێزو گەورەیی ئیسلامی پێبگات پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ , بەڕاستی ئیسلام تاقە فرسەتە بۆ ڕزگاربونمان لەقوڕولیتەی ماددیەت , بەڕاستی ئیسلام تاکە دینە کەتوانی بگاتە ناو بەندیخانەکانی ئەمریکاو ژمارەیەکی زۆر لەبەندکراوەکانی تاوان و مادده بێهۆشکەرەکان ڕزگار بکات )...

## موسڵمان بوونی سەرۆکی کۆمەڵەی پارێزەرانی ئەمریکا

(ڕۆبەرت دیکسن)سەرۆکی کۆمەڵەی پارێزەرانی ئەمریکا , کەسایەتیەکی سیاسی دیارو بەناوبانگە لەئەمریکاو , کاتێ خۆی ڕاوێژکاری ڕامیاری بوو لە زۆر لە ناوەندە سیاسی یەکان تاکۆتایی هەشتاکان و، موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و ناوی خۆی گۆڕی بۆ (فاروق عبدالحق) لە ئەنجامی ئەوەوە بێبەشکرا لەهەموو تایبەتمەندییەکان و ، پێش ماوەیەك براکەشی موسڵمان بوو کە ئەندامی کۆنگریسی ئەمریکیە.

(فاروق) لەوتارێکی دا کە لەم دواییەدا بڵاوکرایەوە باس لە ئەزموونی خۆی و ئەو هۆکارانە دەکات کەبوون بەمایەی موسڵمان بوونی و , دەڵێ : دوای ئەوەی موسڵمان بووم کەسانێکی زۆر لەپیاوانی ئاینی مەسیحی و ئەوکەسانەی کەشارەزاییان هەبوو لەئاینی مەسیحی هاتن , وتیان : بیستوومانە کێشەت هەیە ؟

منیش لەوەڵامدا وتم : نەخێر هەموو کێشەکانم بنەبڕبوون بەموسڵمان بوونم , بەڵکو پێش موسڵمان بوونم کێشەم هەبوو ..چونکە نەم دەتوانی تێبگەم کە(کوڕو باوك و روح القدس)دەبێتە یەك خوا , باوکیش دەبێتە خوایەکی بێ سنوور ئەوانی تریش سنووردار.

وتیان :پێمان باشه , بەڵام مەرج نیە پەنابەری بۆ موسڵمان بوون , چونکە ئێمەش ئەم کێشەیەمان هەیە وەکو تۆ, سەرەڕای ئەوەش لەسەر بیروباوەڕی خۆمان هەرماوین , بەڵام من قەناعەتم نەکرد بەو قسانە، چونکە بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو دەگەڕام بەدوای پێناسەی وشەی (الله) دا کە لەدڵی خۆم دا بۆخۆم پێناسەم کردبوو , خۆشم دەپاراست لە ئیسلام و دژایەتیم دەکرد , وام دانابوو کە ئیسلام ڕاستیەکان چەواشە دەکات , پیاوە ئاینی یەکانی مەسیحی ئەم بۆ چوونەیان لەدڵ و دەروونمدا چاندبوو , دەیان وت : موسڵمان دینەکەی کامڵ و تەواو نابێ ئەگەر مەسیحی یەك نەکوژێ , هەروەها ئیسلامیان واپیشان دەدا کەباس لەبەهەشتێك دەکات کەتەنها ڕابواردنەو ڕووبارەکانی (ئارەق)ن , قەت بەخەیاڵمدا نەدەهات خوا لەبەر ئەو شتانە بپەرستم ..

من دەگەڕام بەدوای پێناسەی وشەی (الله) دا ... چی گەڕام پێناسەم نەدی جوانتربێت لە (الله نور السماوات والارض)...موسڵمانان لەزیادکردن و گەشەسەندنان لەئەمریکادا زیاتر لەهەموو وڵاتانی دیکە , بەتایبەت دوای ١١ی سێبتەمبەر !

بۆیە ئەبێ تێبگەین لەو بەرپرسیارێتی یەی لەئەستۆماندایە , بۆگۆڕانکاری لەژیان دا , ئێمە کە قورئان دەخوێنین تێدەگەین کە گۆڕانکاری لەجیهاندا زۆر گرنگە و , بەڕاستی ئێمە بێئاگاین لەجوانی ئەم ڕاستی یە ...

کاتێ هەورەکان کۆن و ڕەشەبا بڵاویان دەکاتەوە , کاتێ دنیا خامۆشەو تاریکی دنیای داپۆشیوەو خۆر هەڵدێ , ئەوانە هەمووی گۆڕانکارین , جوانن ...

لاشەی خۆشمان گۆڕانکاری زۆری بەسەرادێ , کاتێ لەمناڵی یەوە دەچین بەرەو لاوێتی و لەوێشەوە بەرەو پیری , ئەمەش هەر گۆڕانکاری جوانە ئەگەر بەجوانی دیقەت بدرێ ...

ئەو هەموو گۆڕانکاری یە ئامانجی هەیە , بەهەمان شێوەش هاتن و نەمانی شارستانێتی یەکان ویستی خوای گەورەی لەسەرە و ئامانجی خۆی هەیە , (ئێمەش بەشێکین لەم گۆڕانکاری یە وەك ئوممەتی ئیسلامی )...

من موسڵمان بووم چونکە بۆ خۆم لەسەر ڕەوشت و خوویەکی بەرز بووم و ئیسلامیش بانگەواز دەکات بۆ ئەو ڕەوشت خووە جوانانە . بۆ موسڵمانان بوونیشم تەنها شایەتمانم پێویست بوو (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)...

بەڕاستی ئیسلام ئاینی فیترەتە و ئاینی یەکتاپەرستی و خۆش و ئاسوودەیی دەروونی یە ... ئیسلام ئاینی داد پەروەری یە ...

بەلأم بۆچی خوامنی هیدایەت دا , وەلأمەکەی مەگەر لەقیامەت دا دەرکەوێت , ئەو ڕۆژەی کەلەهەموو ڕۆژێکی تر زیاتر لێ ی دەترسم , ئەو ڕۆژەی کەدەچمەوە بەر بارەگای پەروەردگار بەکۆڵێ گوناهەوە . ڕۆژنامەی یەکگرتوو / ٤٩١ / ١ / ٦ / ٢٠٠٤..

## پاش پێنج سەدە بانگ دەبێژرێ لەغرناطة

پاش پێنج سەدە لەغرناطة لە ئەندەلوس لە ١٠ی یولیوی ٢٠٠٣ دا دەنگی بانگ بەرزبووەوە , لەو مزگەوتەی کەموسڵمانان دروستیان کرد , پاش زەحمەتێکی زۆر کە بیست و دووساڵی خایاند.

موسڵمانان پێش بیست ساڵ زەوی یەکیان کڕی و بەنیازی مزگەوت , مەجلیسی شارەوانیش کە بەمەی زانی بوو بە بەربەست لەڕێیداو دەیویست بیکاتە ناوچەیەکی نیشتەجێ بوون و دەیویست نەکرێ بەمزگەوت .

پاش نۆساڵی مەحکەمەو مەحکەمەکاری , موسڵمانان کێشەکەیان بردەوەو کرا بە مزگەوت و پەیمانگای لەبەرکردنی قورئان , کەئەمەش مژدەیە بەهاتنەوەی ئیسلام بۆسەر شانۆی گۆڕانکاریەکانی ژیان ./ ل ١٥٠ المعجزه المتجدده

## قەشە دافید مکلورین

مەجلیسی پەیوەندی یەکانی ئیسلامی ئەمریکی دەڵێ : پاش ڕووداوی ١١ی سێبتەمبەر , ژمارەی هاتنی ئەمریکی‌یەکان بەرەو ئیسلام بووە بەچوار ئەوەندەی جاران .. تەنانەت لەدوو هەفتەی دوای ڕووداوەکەدا نزیکەی سێ هەزار کەس موسڵمان بوون , کەمامۆستای زانکۆو خاوەن شەهادەو پلەو پایە بوو لە ئەمریکا ..

لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەی کە جوولەکەکانی ئەمریکا دایان بۆ ناشرین کردنی ئیسلام کەلە (١٩٨١) ەوە لیژنەی تایبەتیان هەیە بۆ (قەلأچۆکردنی ئیسلام), کەچی زیاتر و زیاتر ئیسلام جێ بۆ خۆی دەکاتەوە .. ئەمەش وای لەقەشەی کاپولیکی (دافید مکلورین )کرد لەگۆڤاری بەناوبانگی بەریتانی (صندای تلگراف)دابڵێ (ئیسلام تواناو ڕوونی یەکی هەیە کەلە مەسیحیەتی سەردەم دانیە )...

هەروەها وتی (ئەگەر ڕۆژ ئاوا بەهێزی سەربازی سەربکەوێ لەئەفغانستان و چی دەوێ بیکا, لەڕاستی دا هەر دۆڕاوە لەلایەنی ڕەوشت و ( قِیمَ )داو , ناتوانێ سەرکەوێ بەسەر ئیسلام دا ) ...پاشان وتی (هێزی کێشکردنی ئیسلام ئەوەندە زۆرە کەدەتوانێ خەڵکێکی زۆر بهێنێ بەرەو لای خۆی , ئەوەتا ڕۆژنامەی (ربیابلیکا)ی ئیگالی دەڵێ : پاش ڕووداوەکانی ئەم دوایی یە حەفتا هەزار ئیتالی موسڵمان بوون). ل١٥٩ هەمان سەرچاوە

## سەرۆکی کۆمەڵەی موسڵمانان لەهاوای

سەرۆکی کۆمەڵەی موسڵمانان لەهاوای دەڵێ :جاران سێ کەس لەمانگێکدا موسڵمان دەبوون , کەچی وا لەماوەی سێ هەفتەی دوای ١١ی سێپتەمبەر (٢٣)کەس موسڵمان بووم کە زۆربەیان ئافرەتن .. یەکێ لەوانە وتی (من ئەمڕۆ بێ یان سبەی دەمرم , بۆیە دەمەوێ بەموسڵمانی بمرم) ..

(کرومویل کروفورد)سەرۆکی بەشی دین لە زانکۆی هاوای دەڵێ :

(ڕووداوەکان کاریگەریان هەیە لەسەر دەروونی ئەمریکی‌یەکان و ئێستا زیاتر تێدەگەن کە ژیان کورت وکەمە , ئەمەش وای لێکردوون زیاتر لەیەك نزیك ببنەوەو بەیەکەوە بژین ...هەروەهاخەڵکێکی زۆریش بەرەو ئاین دێنەوە)ل١٦١ هەمان سەرچاوە .

## چەند ڕۆژێ لەمێژووی ئەمریکا و ئیسلام

دکتۆر وەلید فتیحی کە لەئەمریکا پزیشکە باسی چەند ڕۆژێ دوای کارەساتی ١١ی سێپتەمبەر دەکات و دەڵێت : بەیانی ١١ی سێپتەمبەر پێش نوێژی بەیانی خەوێکم بینی , لەخەوما شاخ و چیای ڕووتەن لە دەورم بوون دەلەرانەوە وەك ئەوەی کە بوومەلەرزەیەکی گەورە هەبێت , منیش لەخەوەکەمدا ئەم ئایەتەم دەخوێند (وماقدروا الله حق قدره).. ئەو بەیانی یە وەك عادەتی چووم بۆ عیادەکەم , یەکەم نەخو ‌ ‌ ‌ بینی باسی یەکەم فڕۆکەی کرد کە بەر بینای بنکەی بازرگانی جیهانی کەوتبوو .. ئنجا کە دووەم نەخۆشم بینی ئەویش باسی دووەم فڕۆکەی کرد کە خۆی دابوو بەبینای دووەم دا ...

هەر لەسەرەتاوە دەزگاکانی ڕاگەیاندن کەجوولەکە دەستی بەسەر زۆربەیاندا گرتووە کەوتنە تاوانبارکردنی موسڵمانان .

لەسـەعات دوانـزەی ئـەو ڕۆژەدا لیژنـەو بەڕێوەبەرایـەتی مەرکـەزی ئیـسلامی لـە (بوسـطن)کۆبوونەوەیـەکی نائاسـایی بەپەلـەیان ئەنجامـداو منـیش لـەڕێی تەلەفونـەوە بەشداریم کرد لەگەڵیاندا ..

بڕیارمان دا کەلیژنەیەك دروست بکەین بۆ پەیوەندی و کاری ئینسانی , داواشمان لە ڕاگەیاندن کرد کەچالاکی‌یەکانمان بڵاوبکەنەوە , پاشان داوامان لەدەسەڵاتدارانی شار کرد کەبنکەکەمان بپارێزن ئەوانیش ئاسایشیان بۆ ناردین تامرکزی ئیسلامی بپارێزن لە کەسانی تێکدەرو ئاژاوەچی .

بەڕاستی ڕۆژێکی قورس بوو لەسەر هەموومان و خوا خوامان بوو هەواڵێك ببیستین کە دەستی موسڵمانی تیانەبووە ...

لە ڕۆژی دوانزەی سێپتەمبەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و ڕادیۆ لەهەموو لایەکەوە دەهاتن بۆلامان و چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا تۆمار دەکردین و ئێمەش وەڵامی پرسیارەکانیانمان ئەدایەوە .. بەڕاستی ئێمە ئەوەندەش دڵخۆشبووین کەئیسلام پەنجا ساڵ لەئەمریکادا هاتۆتەدواوە.

لە ڕۆژی سیانزەی سێپتەمبەردا , لەگۆڕەپانی بەرامبەر بارەگای (عُمدە)ی شاری بوسطن هەزاران کەس کۆبوونەوە و , چەند کەسایەتیەکی ئاینی قسەیان کرد لە گاورو موسڵمان و , باسی بنەماکانی ئیسلام کراو بە ملیۆنەها کەس بینی و ئەم کۆبوونەوانەش لەسەر تاسەری ئەمریکادا ئەنجامدرا ..

لە ڕۆژی جومعە چواردەی سێپتەمبەردا , بانگکراین بۆ بەشداری کردن لە کۆمەڵێ بەرنامەی تەلەفزیۆنیدا .. هەروەها بۆ نوێژی جومعەش کە لە خێمەیەکی تایبەتدا ئەنجام درا لەلای مرکزی ئیسلامی لە بوسطن , سەرۆکی کڵێسەکانیش ئامادەبوون و پاش نوێژ لەگەڵ موسڵماناندا بەشداریان کرد بە ڕێپێوانێك بۆ بەردەم بارەگای عومدەی شاری کامبردج لەوێش باسی ئیسلاممان بۆ ئامادەبوان کردو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا هەموو ئەوانە بڵاوکرایەوە ... لە ڕۆژی پانزەی سێپتەمبەردا چووم بۆ گەورەترین کڵێسەی شاری بوسطن کەبانگهێشت کرابووین بۆ باسکردنی ئیسلام و گەورە پیاوانی شارو کۆمەڵێ ڕۆشنبیر و مامۆستای زانکۆش ئامادەبوون کە زیاتر لە هەزار کەس دەبوون , هەروەك سەفیرەکان پێشوازیان لێکردین و گەورەترین قەشەی کڵێسەکە و تاری داو دیفاعی لە ئیسلام کردو ڕایگەیاند کە ئیسلامیش ئاینێکی ئاسمانی‌یە ...

**ئنجا منیش بەیاننامەی زانایانی ئیسلامم خوێندەوەو باسی مەوقفی ئیسلامم کرد لە بارەی تیرۆرەوە ..پاشان ئەم ئایەتانەم بەدەنگەوە خوێند و بە ئینگلیزیش بۆم تەفسیر کردن :** ﴿مِنْ أجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرائِيلَ أنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً ﴾**(المائده:٣٢)**

**هەروەها ئایەتی :** ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ **(الحجرات:١٣) وەئایەتی :** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ **(المائدة:٨) خوێند ، ئەوەی کەهەرگیز بیرم ناچێتەوە گریانی ئامادەبوان بوو لەناو ئەو کەنیسەیەدا و, یەکێك لە ئامادەبووان وتی : (هەرچەند من هیچ لەزمانی عەرەبی تێناگەم , بەلاّم دیارە ئەوەی خوێندت بەڕاستی کەلامی خوایە)...**

**یەکێکی تر کە لە کەنیسە چووە دەرەوە وخواحافیزیمان لێکرد بەچاوی فرمێسکاوی یەوە کاغەزێکی دایە دەستم کە تیانوسرابو (لەڕابردوو ئێستامان ببورن دوعامان بۆ بکەن)...**

**یەکێکی تریش بەهەمان شێوە بەچاوی فرمێسکاوییەوە وتی ( ئێوەش وەك ئێمەن و بگرە چاکتریشن).زۆر کەسیش داوای ناونیشانی مرکزی ئیسلامیان دەکرد تائامادەیی وتاری هەفتانە ببن ...بەڕاستی ئەم مەشهەدانە ئەو ئایەتەی بیر خستمەوە کە دەفەرموێ** ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ......﴾ **(المائدة:٨٣)** ..

**بەڕاستی لەو ساتە وەختەدا بەچاکی تێگەیشتم کەخوای گەورە کارێکی بوێ دەیکات و حیکمەتی تیایە هەرچەند عەقلی کولی ئێمە پەی پێنەبات .**

**ڕۆژی یەك شەممەش شانزەی سێپتەمبەر بانگەوازێکمان کرد بۆ مەرکەزەکەمان لەوبڕوایەدا بووین سەد کەسێك ئامادە ببێ , کەچی زیاد لەهەزار کەس لە دراوسێ و پیاوانی ئاینی ومامۆستای زانکۆکان ئامادەبوون و باسی ئیسلام بەتێرو تەسەلی کراو قورئان خوێندرا .. هەرهەمان ڕۆژ لە هەمان کەنیسەی دوێنێ بانگکرامەوەو وتارم دا بۆ ئامادەبووان ...پاشان لەپێنج کەناڵی تەلەفیزیۆنیەوە بانگهێشت کراین بۆ پرسیارو وەلاّم و قسەکردن ...**

ڕۆژی چوارشـەممەش ١٩ ی سـێپتەمبەر لەلایـەن عومـدەی شـارێکی دراوسـێمانەوە دەعوەت کراین بۆ باسکردنی ئیسلام لە بەردەم هەزاران کەس لەخەڵکی شار ...

ڕۆژی پێنج شەممە (٢٠)ی سێپتەمبەر ، سێ سەد مامۆستاو قوتابی زانکۆی هارفارد هـاوڕێ لەگـەڵ سـەفیری ویلایـەتی موتەحیـدە لـە ڤییـەننا هـاتن بـۆ سـەردانی مـەرکزی ئیسلامی و لـە گۆڕەپانی مزگەوتەکەدا دانیشتن و باسـی ئیسلاممان بۆ کردن و قورئان خوێندراو جارێکی تریش زۆریان فرمێسك بەچاوانیانا هاتە خوارەوە .. ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا کە لەسەرتاسەری ئەمریکادا دەبینـرا لەگەڵ پرۆفیسۆر ئالان دیرشوفیتز بەشداریمان کردو باسی هـەقی مەدەنی و ئینسانیمان کرد لەیاساکانی ئەمریکاداو خەڵکانێکی زۆریش بەتەلەفۆن بەشداری بەرنامەکەیان کرد.

ڕۆژی جومعەش (٢١)ی سێپتەمبەر موسڵمانان لەگەڵ حاکمی ویلایـەتی (ماستشۆستس) کۆبوونـەوەو قسە لەسـەر ئەوە کرا کەلەبەرنامـەی خوێنـدن دا وانەیـەك تـەرخان بکرێ بۆ دینـی ئیسلام تامایـەی هۆشیاری بێت و کـەس دژایـەتی نـاڕەوای موسـڵمانان نـەکات .

نوێـژی جومعـەش کـەناڵی (سـی إن إن) بـە تـەواوی بـڵاوی کـردەوە ، هـەروەها وتـاری هەفتانەی شەوی مەرکەزەکەشمانی بڵاوکردەوە .. بەڕاستی ئەمەی لەشاری بوسطن دا ڕوویدا لەشارەکانی تری ئەمریکاش بەهەمان شێوەبوو ، بۆیە بۆمان دەرکەوت کە ئیسلام هەرگیز پاشەکشە ناکات و ئەوەی ئێمـە وامـان دەزانـی ئیسلام پـەنجا ساڵ لەئەمریکادا هاتـە دواوە ، وا دەرنەچـوو بـەڵکو لەسـایەی خـواوە بـەو پـانزە ڕۆژەی دوای پـانزەی سێپتەمبەر ئیسلام پانزە ساڵ چووە پێشەوە .. ل١٦٦ هەمان سەرچاوە .

## قەشەیەك و دەئەمریکی موسڵمان بوون

مەرکەزی ئادەم لە فرجینیا پێشوازی کرد لـە قەشـەیەك و دە ئـەمریکی کەپاش چەند ڕۆژێ لە ڕووداوی ١١ی سێبتەمبەر موسڵمان بوون ، هەروەها خۆبەخشەکانی دراوسـێ ی مزگـەوت و دراوسـێکانی مەرکـەز هەڵمـەتێکی پـارە کۆکردنـەوەیان کـرد بـۆ چـاکردنەوەی مزگەوت کـە لەسەردەستی هەندێ توندڕەوی جوولەکەو گاور تووشـی زەرەرو زیـان بـوو بوو .. ل١٦٧ هەمان سەرچاوە .

## هاوسۆزی ئەمریکیەکان لەگەڵ موسڵمانان دا

ئەمـەش چیرۆکی هاوسـۆزی کەسـانی بەسـۆزی ئەمریکیـە بەرامبـەر موسـڵمانان کـە موسڵماناتی ئەمریکا بۆمان دەگێڕنەوە :

١-ڕۆژێ لەگەڵ کۆمەڵێ هاوەڵم دا چوین بۆلای نەنکی کچێکی هاوەڵمان لە ویلایەتی فرجینیا و , تەنها من پۆشاکی ئیسلامیم لەبەردا بوو, لەرێ لەچێشتخانەیەك نانی ئێوارەمان خواردو زۆر حەزەرم دەکرد کە کەسێك ڕەفتارێکی ناشرین بکات بەرامبەرم (بەتایبەت کەهەندێ کەس لە(رد فعل)ی ١١ی سێپتەمبەردا پەلاماری موسڵمانانیان دەدا ) پاش دەخولەك پارەکانمان دا بە کارگوزارێك , کەچی پاش تۆزێك هێنایەوە , ترسام وتم: بەخوائێستا کەمن بالاپۆشم و لەچك بەسەرم هەربەپاڵ دەمانکەنە دەرەوە , کەچی تەواو بەپێچەوانەوە بوو , ئیدارەی چێشتخانەکە پارەکەیان داینەوە وەك هاوسۆزیەك لەگەڵماند , ئەوەش کە زیاتر کاری تێکردم ئەوەبوو , کارگوزارە کە ئافرەتێك بوو , چاوی فرمێسکی تیاقەتیس مابوو پێی وتم : من شانازی دەکەم بەو ئازایەتیەتەوە کە تۆ ئاوا بەجل و بەرگی ئیسلامییەوە هاتویتە دەرەوە ...ئەمەش زۆر دڵخۆشی کردم و تێگەیشتم کەخەڵکی ژیرو عاقڵ لەهەموو شوێنێك هەن .

٢-ڕۆژێك دەترسام کە بچم بۆ مزگەوت , بەتایبەت من ساڵێك بوو موسڵمان بووبووم , لە شەودا دوعام کرد کەخوا ترس لەدڵما نەهێڵێ ... بەهەر حاڵ چووم بۆ مزگەوت ئەوەی سەیر بوو , دەرگای مزگەوت بەچەپکە گوڵ ڕازابووەوە لەلایەن دەرو دراوسێ ی مزگەوتەوە , کەوەك دەربڕینی هاوسۆزی یەك ئەو گوڵانەیان هێنابوو بۆ بەر دەرگای مزگەوت , کەبەڕاستی ئەمەش مژدەی داهاتوویەکی ڕۆشنە بۆ ئیسلام لەئەمریکا و جیهاندا .

٣-من بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی ئیسلامیم زۆر دوودڵ و بێتاقەت بووم لەو بارو وەزعەی هات بەسەر ئەمریکادا , ڕۆژێك بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی حکومی کە لە پشتمانەوە بوو , هات بۆلام و وتی : زۆر شادمانم کەبتوانم هاوکاریت بکەم و هیوادارم ئەم زروفەی دوایی ناڕەحەتی نەکردبن.

## ڕۆژنامەی نیویورك تایمز

ڕۆژنامەی ناوبراو لەژمارە (٢٢)ی (٢٠٠١) دا باسی چەندحاڵەتێکی موسڵمان بوون دەکات : **یەکەم** / ئنجیلا دافیز کە تەمەنی (٢٧)ساڵە پێش شەش مانگ موسڵمان بووە و

تـەواو ژیـانی گـۆڕدراوە , وازی لـەگوێگرتنی گـۆرانی هێنـاوەو پەیکـەرەکانی ماڵەکـەی گۆڕیوە بۆ تابلۆی جوانی قورئانی .

پـاش ئـەوەی کـە لـە ڕۆژنامەیەکـەی نـاو خـۆدا بـەجل و بـەرگی ئیـسلامیەوە چـاو پێکـەوتنی لەگـەڵ کـرا لـە (٣٠)ی سـێپتەمبەردا , مێردەکـەی بـەنیازە تـەڵاقی بـدات و نەشیەڵێ چاوی بەمناڵەکانی بکەوێ کەیەکێکیان تەمەنی پێنج ساڵەو یەکێکیان تەمەنی دوو ساڵە .

ئنجیلا دەڵێ : (بەڕاستی ئەمەی تیا دەژیم تاقیکردنەوەی خوایە تا دەرکەوێ ئیمان و بڕوام پتەوە یان نا)

ئنجیلا لـەڕێی ئینتەرنێتـەوە لەئیسلام شارەزا بوو لە ساڵی (٢٠٠٠)داو , ئێستا لە باخچەی ساوایاندا مامۆستایە لەسانت لویس لە ویلایەتی میسوری .

ئنجیلا دەڵێ( داوام لێدەکەن واز لە دینەکەم بێنم لەبەر ماڵ ومێردومناڵەکەم , منیش هەرگیز شتی وا ناکەم , چونکە ئەوانە هیچی لە قیامەتدا فریام ناکەون و لەگەڵما نابن)...

بەڕاستی ئەو ئافرەتانەی لەڕۆژئاوا موسڵمان دەبن قوربانی‌یەکی گەورە دەدەن بەوەی کـە لـەمێردەکانیان حـەرام دەبـن ئەگـەر موسـڵمان نـەبن , هـەروەها زۆر جـار لـە مناڵەکانیشیان مەحروم دەکرێن کەدیارە ئەمەش لەسەر دەروونی دایك زۆر گرانە ..

سوننەتی خوایەو گەورەیی ئەم ئاینەیە کە مێژووەکەی خۆی دووبارە دەکاتـەوە، تادوێنێ بوولە نیوە دوورگەی عەرەبدا قوربانی بۆ دەدراو سەرو ماڵ دەکرا بەقوربانی .. ئەمڕۆش لەئەمریکاوە موسڵمانە تازەکان واز لەهەموو شتێك دێنن و دنیا هەموو دەخەنە ژێر پێوەو دەڵێن : واز لەبڕواکەمان ناهێنین .

**دووەم/** خالید یحیی بلانکشیب , سەرۆك بەشە لەزانکۆی تەمبڵ و, لە ساڵی ١٩٧٣ دا موسڵمان بووەو دەڵێ : زیاتر لە سەد کەسم بینیوە موسڵمان بوون لەدوای ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەرەوە , زۆر گرنگ و پێویستە ئیسلام بڵاوبێتەوە , چونکە موسڵمان حەز بە ڕزگار کردنی خەڵکانی تر دەکات هەروەك چۆن خۆی ڕزگار بووە .

یەکێ لەشارەزایانیش دەڵێت (ساڵانە بیست و پێنج هەزار کەس لەئەمریکا موسڵمان دەبوون , کەچی پاش ڕووداوی ١١ی سێبتەمبەر ئەو ژمارەیە چوارقات بووە)

یەکێکی تریش دەڵێ : هێزی کێشکردنی ئیسلام لەوەوەیە کە ئاینێکی جیهانیە و بە بڕوای موسڵمانان خەڵکی هەموو بە موسڵمانی و لەسەر فیترەت لەدایك دەبن و, کاتێ موسڵمان دەبن گەڕانەوەیە بۆسەر فیترەت و ئیسلامەتی خۆیان .. ل ۱۷۲ هەمان سەرچاوە . .

**سێ یەم** / ژنێك بەناوی (سوزان سمیث)دوو منالی دەبێ و دۆستە تازەکەی مەرجی لەسەر دادەنێ کە دوومناڵەکەی لەناوبەرێ ئنجا پێی ڕازی دەبێ , ئەویش هەردوکیان لەسەیارەکەیدا دادەنێ و دەیخاتە سەر بۆش و پالی پێوە دەنێ بۆ ناو ئاوێك , مناڵە بەسەزمانەکانیش نەیان دەزانی کەئەمە تیاچوونیانە و (بای بای)یان دەکرد لەدایکیان .. بەڵێ .. ئەم ژنە لەئازاری و یژدانـدا سەرەنجام شێت بوو, ئەم ڕووداوە ماوەیەك کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی سەرقاڵ کردو باس و خواسی هەمووان بوو .. وە بووە مایەی هیدایەتی زۆرکەس , یەکێ لەوانە پیاوێکە کەناوی خۆی کرد بە (عبدالله رضا)لەشاری رستون لەویلایەتی فرجینیا) ...

بەڕاستی ئەم ئاینە تەنها ڕزگارکەری مرۆڤە و بەچاکی دەستی دەگرێ لەجاهیلیەتەوە بەرەو ئیسلام و لە تاریکاییەکانەوە بۆ ڕووناکی .. (الر كتاب أنزلناه إليك لتُخْرِجَ الناس من الظُلُماتِ الى النور , بإذن ربهم الى صراط العزيز الحميد)ابراهيم .

ئەوەی لەکفردایە وەك مردووەو دین زیندووی دەکاتەوە و نوورێکی ئەداتێ لەناو خەڵکدا ڕێی پێ دەرکات : ( أَوَمَنْ كَانَ مَيْتاً فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُوراً يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (الأنعام:١٢٢)

بەڵێ .. کافران لەتاریکی شەوی کوفران و چاوو گوێ و دڵ و عەقڵیان لەدەست دەدەن , بەڵام بەهۆی ڕازاندنەوەو خەڵەتانی شەیتانەوە بەخۆیان نازانن ..

ئەوانەی بڕوا ناهێنن سوود لەچاوو گوێ و دڵیان وەرناگرن و ئەوان وەك ئاژەڵن و بگرە خراپتریشن قورئان دەفەرموێ : ( أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً )(الفرقان:٤٤)

یان دەفەرموێ : ( وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِنَ الْجِنِّ وَالْأِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ) (الأعراف:١٧٩)

ڕەنگە یەکێ لای سەیربێ کەچۆن کافران لە ئاژەڵان سەرگەردان ترن , ئاخر لەجیهانی ئاژەڵاندا چ گیانداریێ بێچووەکانی خۆی ناپارێزی , تەنانەت دڕندەترین گیانلەبەر وەك شێرو پڵنگ بەزەیی و سۆزی هەیە بۆ بێچووەکانی , کاتێ ئافرەتێ بە دەستی خۆی لەبەر مێردێکی کاتی دوو منداڵەکەی بەو شێوەیە لەناو بەرێ , ئایا ئەم ئافرەتە لەئاژەڵ خراپتر نیە ؟!

یان کەسێك پارەی خۆی سەرف بکا و خۆی سەرخۆش بکاو عەقڵی لەدەست بدات ناوی دەنێ ی چی ! کاتێ عەقڵ گەورەترین نیعمەتە کەخوا داویەتی بەمرۆڤ ..

**چوارەم** / (دیا ریتشاردسون) ئافرەتێکی ئەمریکی‌یەو وەك زۆر لە ئافرەتانی تر سەرگەرمی خواردنەوەو ژیانی دوور لەخوایی بوو , مامی کە قەشەبوو پرسیاری لێکرد کە بەبۆنەی (حەفلەی عشاء جەژنی شکر)ەوە چەند بوتڵ بیرە دەخواتەوە ؟ ئەویش وتی (چەند بتوانم دەخۆمەوە)!

ئەم ئافرەتە کوڕێکی هەبوو بەناوی (کریستوفر)کە لە باخچەی ساوایان بوو لەلای مامۆستایەك کە ناوی خەدیجە شاباز بوو , (خەدیجە)کەموسڵمان بوو منداڵەکە خۆشی دەویست و(بسم الله)ی لێوە فێربوو بوو ..

ڕۆژێ (خەدیجە)(دیا ریتشاردسون)ی بانگ کرد بۆ ئاهەنگی شووکردنی لەمزگەوتی ( شا فەهد ) لە لوس ئەنجلوس , ئەمەش کاریگەری هەبوولەسەر دڵ و دەروونی (دیا)و سەرەنجام لە ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەردا پاش گەڕانێکی چەند ساڵی باش بۆ تێگەیشتن لەئیسلام موسڵمان بوو لە کاتێکدا کەتەمەنی لە (٢١)ساڵدا بوو ...

(دیا)دەڵێت : بۆ یەکەم جار ئەوکاتەی موسڵمان بووم هەستم بەئارامی دەروون کرد .. ل ١٧٩ هەمان سەرچاوە..

**پێنجەم**/ (مارثا الیت جونس) ئەندازیارەو شووی کردووە بەپیاوێکی میسری کەئیش دەکات لە بەڕێوەبردنی پێشانگای ( فنونی تشکیلی ) لە زۆر ناوچەی ئەمریکادا ..

ئـەم ئافرەتـە ئـەمریکی یـە لـەبارەی موسـڵمان بـوونی یـەوە دەڵـێ (زۆرم لـەبارەی ئیسلامەوە خوێندۆتـەوەو پرسیاری زۆرم لـەزانایانی ئیسلام کردووە تاھـەموو ئـەو گرێ کوێرانەم بۆ کرایـەوە کە بـەھۆی پڕوپاگەندەی دوژمنـانی ئیسلامەوە دروست بـوو بـوو , تاقەناعەتی تەواوم بۆ دروست بوو کە ئیسلام ئاینی ھەقی خوایە ) ..

ھەروەھا دەڵێ (بەھۆی ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەرەوە زیاتر ھەوڵی تێگەیشتنم بوو لە ئیسلام کەئاینی ئاشتی و ئاسایشە بۆ ھـەموو مرۆڤایـەتی و , من دڵنیام کەئیسلام پاش ١١ی سـێبتەمبەر ھــەموو جیھــان دەگرێتــەوە بەتایبــەت ئــەمریکا)،شــایانی باســە (مارثـا)لەسەردەسـتی شێخ (فرحـات المنجـی)دا موسـڵمان بـوو نـاوی خۆشـی گـۆڕی بـۆ (مریم)... ل١٨٤.

**شەشـەم** / دکتـۆر ( الفین گلبرت ) گـەنجێکی فەڕەنسیـیەو ھاتـە میسر تـا کاربکـات وەك (محلل)ی مالی لـە بورصەی (أوراق المالیة)دا .. شایانی باسە دکتـۆر سیێ ھـەم کەسە کە لەو بوارەدا پسپۆڕە لەسەر ئاستی جیھان ھەمووی .

لـەبارەی موسـڵمان بوونیـەوە دەڵـێ (بـۆم دەرکـەوت کـە لـە نیزامـی مـالی ئیسلامدا گەورەترین شێوەی ھاوکاری کۆمەڵایەتی ھەیە کە ئەگەر پـەیڕەوی بکرێت برسـی و ڕووت و ڕەجـاڵ نـامێنی لـەدنیادا , بـەھۆی نیزامـی زەکـات وخێـرو (صـدقات)و دابەشـکردنی میراتـەوە , ھـەروەھا بـۆم دەرکـەوت کە لـە ئیسلام دا کـەس ئەڵقـەی گەیاندن نیـە لـەنێوان بەندەو خوادا و, کاتێ زانیم ئیسلام داوای چیم لێ دەکات ئاسان بوو چونکە خۆم لەسـەر خـوو ڕەوشتێکی بـەرز بووم و ھـەرگیز گۆشتی بـەرازو ئارەقم نـەخواردووەو تـەنھا نوێـژو ڕووژووم نوقسان بوو کە بیکەم ..ل ١٨٥ المعجزە ..

## موسڵمان بوونی ئەکتەری بەناوبانگی سینەمایی ئەمریکی ( ویل سمیث)

(**ویــل سمیــث** )دەوری (محمــد علــی کــلای)بینــی لــە فیلمێــك دا کــەباس لــەژیانی (کلای)دەکات , جاکاتێك دەگاتـە ئـەوەی کـە ( محمد علی کلای ) لەفلیمەکەدا شایەتمان دێنـێ , ئەکتەرەکـەش کـە دەوری دەبینـێ بەڕاسـتی ئـەمیش شـایەتمان دێنـێ و ئەوەنـدە مەشھەدەکان کاری تێدەکەن موسڵمان دەبێت .

فلیمەکە باس لە ژیانی کلای دەکات کەناوی (کاسیوس)بوو , کەئەم ناوەش کۆیلایەتی دەگەیاند ,چونکە باوکی ڕەش پێستێکی کوێلەبوو , لەخزمەت سپی پێستەکاندا هەڵئەسوڕاو ئەوانیش چۆن بۆیان بکرایە دەیان چەوساندەوە ...

(کاسیوس)ناوی ئەو کەسەیە کەباوکی خزمەتکاری دەکرد , (کلای)ئەو ناوەی گۆڕی بۆ (محمد)مامۆستای هەموو مرۆڤایەتی , ئەو پایە بەرزەی کەجیاوازی نەهێشت لەنێوان ڕەش و سپی دا و یەکسانی هێنا بۆ بەرەی ئادەمی . (کلای)داوای لەبرادەرێکی کرد بیبات بۆ مزگەوت , تاشتێك لەبارەی ئیسلامەوە ببیستێ , ئەویش دەیبات و کلای لەبارەی ئەم چوونەیەوە بۆ مزگەوت دەڵێت ( برادەرێکی موسڵمانم لەویلایەتی میامی ئەمریکی بردمی بۆ مزگەوت تابۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٦٠ دا گوێم لەباسی ئیسلام بێت لە دەمی وتاربێژی مزگەوتەکەوە , کە بەڕاستی باسی مەسیحیەت و ئیسلامی دەکرد .. تێگەیشتم کەئیسلام ئاینی یەکسانی یەو , جیاوازی نیە لەنێوان عەرەب و عەجەم دا مەگەر بەپارێزکاری ...)

کلای دەڵێت : (ئەمە یەکەم شارەزا بوونم بوو لەئیسلام , پاشان کەوتمە خوێندنەوەی تەفسیری قورئان و هەر دیڕێکم خوێندبێتەوە زیاتر قەناعەتم بۆ دروست بووە کەئەم ئاینە ڕاستی‌یەکە لەخواوە هاتووەو ئەستەمە هیچ مرۆڤێك بتوانێ دروستی بکات ..

سەرەتا ژیام لەگەڵ سوورەتی (فاتیحە)داو یەکەم سوورەت بوو کەفێری بووم , گەشتی ئیسلامم دەست پێکرد , کە گەشتی خۆشی و دڵئارامی بوو , گەشتی بڕوا بوو .. من هەقیقەتی مرۆڤم نەدەزانی , حەڵاڵ و حەرامم نەدەزانی , بەڕاستی ئیسلام هەموو ئەوانەی پێناسانم و فێری خۆشەویستی خەڵك و لەخۆ بردوویی کردم) ..

(کلای)هەروا موسڵمانێکی سادە نەبوو , ناوبانگ و پاڵەوانێتی لەجیهاندا دەنگی دابۆوە , ئەمەش وای کرد کە زۆر کەس چاوی لێبکەن و بیکەنە سەرمەشقی خۆیان , ئەویش لەهەموو شوێنێك دا بانگەوازی دەکرد , بۆیە دوژمنان بەتایبەت جوولەکە , دژایەتی یەکی زۆریان کردو پروپاگەندەی زۆریان بۆ بڵاودەکردەوە .

(کلای)لەهەریەکێ لەویلایەتەکانی ئەمریکادا دەیویست مزگەوتێك بکاتەوەو زۆریش هەوڵی ئەدا پەڕاوی ئیسلامی چاپ بکات ...

لەگەڵ ئەوەشدا کە تووشی نەخۆشی بووە , کەچی کۆڵ نادات لەبانگەوازکردن بۆیە بەچالاکترین بانگخواز دادەنرێت لەئەمریکادا ...

کلای لەبەرئەوەی پاڵەوانی جیهان بوو لەیاری مستەکۆڵەدا (بۆکسێن)دا , ناویان نابوو ( الاعظم ) کە موسڵمان بوو , وازی لەم ناوە هێنا , چونکە بەڕاستی هەر خوایە کە (اعظم)ە بەڕاستی و لەهەموو گەورەیە گەورەترو لەهەموو دەسەڵاتدارێك بەدەسەڵاتترە .. ل١٩٣ (المعجزه المتجدده في عصرنا) ..

## دەرهێنەر و بەرهەمهێنەری فلیمی ژیاننامەی پێغەمبەر (ص)

فلیمی ژیاننامەی پێغەمبەر (ص)پێش ڕووداوی ١١ی سێبتەمبەر کەم کەس لای لێ دەکردەوەو زۆر ئاستەنگ هاتە ڕێی , کەچی دوای ئەو ڕووداوە زۆر کەس کەوتنە یارمەتی دانی ئەو فیلمە , بۆ ئەوەی لەژیاننامەی حەزرەت (ص)شارەزا ببن , بەڕاستی ڕووداوەکە لەبەرژەوەندی فلیمەکە بوو , کەئەمەش هەرگیز بەخەیاڵی کەسدا نەدەهات ...
شایانی باسە پاش بەهەمهێنان و پیشاندانی فلیمەکە , دەرهێنەری فلیمەکە (مایکل شوارتز)و (مایکل وولف)و (الکسندر کرونمر)موسڵمان بوونی خۆیان لەبەرچاوی خەڵکێکی زۆر ڕاگەیاند .. ل ١٩٤ هەمان سەرچاوە ..

## ڕۆژی کراوەی مزگەوت

لەم ڕۆژەدا مزگەوتەکانی ئەمریکا کراوەن بۆ هەرکەسێك کە لە هەرکاتێکدا بێتە ناو مزگەوتەوە , پێشوازیان لێدەکرێت و لە نزیکەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی بۆ باسدەکرێت.
بە ئاشکراش بە هەموان دەوترێت ئێمە بە هیچ پرسیارێك قارس نابین و وەڵامی گشت پرسیارەکانتان دەدەینەوە ..
هەوڵ و کۆششی موسڵمانان هاتۆتە بەرهەم و ژمارەی ئەوانەی موسڵمان دەبن چوار ئەوەندەی ئەوانەن کە لەپێش ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەردا موسڵمان دەبوون .
تەنانەت ئێستا لە هەندێ مزگەوتی ئەمریکا دووسێ جار نوێژی هەینی دووبارە دەکرێتەوە چونکە نوێژ خوێنان زۆرن و جێگا نابێتەوە ...
دەزگای (مخابراتی مرکزی ئەمریکی)لە ئامارێکدا دەڵێت : (ئیسلام لە هەموو ئاینەکانی تر خێراتر بڵاودەبێتەوە و ژمارەی موسڵمانان دەگاتە سێ یەکی دانیشتوانی جیهان , واتە لە هەرسێ کەسێك یەکێکیان موسڵمانەو ڕێژەی موسڵمان بوونیش دوای کارەساتی سێپتەمبەر زیادی کردووە ) .

هەروەها دەزگای ناوبراو ناڕەحەتی خۆی دەربڕی لە بڵاو بوونەوەی ئیسلام بەتایبەت لە ئەمریکا وئەوروپا وئوستراليادا .. ل ٢٠٩ هەمان سەرچاوە .

## هەوڵی ڕێکخراوە ئیسلامیەکانی ئەمریکا

ڕێکخراوە ئیسلامیەکانی ئەمریکا چەندەها کۆنفرانسیان بەست بۆ یەکخستنی هەوڵەکان و بەرپەرچ دانەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزان ,پاش ڕووداوی سێپتەمبەر , هەروەها (اتحاد المنظمات الاسلامية)لە ئەمریکای باکور بە هاوکاری مەجلیسی کەنائسی قەومی ئەمریکی پلانێکیان دانا , بۆ ڕوونکردنەوەی ئیسلام بۆ پەنجا ملیۆن ئەمریکی کە شوێنکەوتەی کەنیسەی کاثولیکین و سەر بەو مەجلیسەن کە ژمارەی ئەو کەنیسانە (١٤٢)هەزار کەنیسەیە ..

بەرپرسانی موسڵمان لەگەڵ بەرپرسانی کەنیسەی کاثۆلیکی ئەمریکی ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بگەڕێن بە دوای خاڵە هاوبەشەکانداو زیاتر زمانی گفتوگۆو لەیەك حاڵی بوون فەراهەم بهێنن , تاباشتر پێکەوە ژیان بێتە ئاراوە ...

بۆ ئەمەش جێگری سەرۆکی( اتحاد المنظمات الاسلامية )دکتۆرە ( ئینگراد ماتسون ) چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ زیاتر لە سەد پەیامنێری ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەمریکی لە کۆنفرانسێکدا و وەڵامی هەمووپرسیارەکانیانی دایەوە و بۆچوونی هەڵەی لەبارەی ئافرەت و جیهادو شەڕو ئاشتی لە ئیسلامدا ڕاست کردەوە بۆیان ..

ئەم هەوڵانە بەگشتی سوودی زۆریان گەیاندو خەڵکانی بەویژدان کەوتنە خۆیان بۆ دەربڕینی هەست و سۆزو هاوکاریان بۆ موسڵمانان ..

تەنانەت لە (واشنتۆن)چوار هەزار ئافرەتی ئەمریکی بەبێ ئەوەی موسڵمان بن , جلی بالاپۆشیان لەبەر کرد بۆیەك مانگ بۆ دەربڕینی هاوسۆزی و پشتگیری بۆ ئافرەتە بالاپۆشە موسڵمانانەکان بۆ ئەوەی کەس ڕەفتاری ناشرین نەنوێنێ بەرامبەریان ، کە بەڕاستی ئەمەش ئەو پەڕی پێکەوە ژیان و ڕەفتاری شارستانیە ...

هەروەها لەسەر ئاستی دەوڵەتیش , پێنج ویلایەت کە (کالیفۆڕنیاو نیوجرسی و الینوی و مینوسوتا و میشیگان)ن یاسای خواردنی حەڵاڵیان دەرکرد , تاکەس نەتوانێ فێڵ لەموسڵمانان بکات و خواردنێك کە حەڵاڵ نەبێ و شەرعی نەبێ , بەحەڵاڵ پێیان بفرۆشێ ... دیارە ئەمەش جێی سوپاس و پێزانینی موسڵمانان بوو...

## سەدەی بیست ویەك سەدەی ئیسلامە

جۆن مۆران ئەندامی لیژنەی کاروباری دەرەوەی کۆنگرێسی ئەمریکیی‌یە , بەویـژدان و قەناعەتی تەواوە دەڵێت : (بە ڕاستی پێویستە لەسەر ئەمریکییەکان کە بزانن زۆر گرنگە زانیـاری تـەواوو قوڵیـان هـەبێت لـەبارەی ئیـسلامەوە , چـونکە وەك مـن بـۆم دەرکـەوتووە ئیسلام هانی شوێنکەوتوانی دەدات لەسەر هەوڵ و کۆشش و نیزام و ئیلتیزام , هـەروەها پڕە لەخۆشەویستی .

جائەگەر ئەمڕۆ ئیسلام لەچاوی ئەمریکییەکاندا ئاینێکی غـەریب بێت , ڕۆژێك دێت بۆیان دەردەکەوێت , کە ئیسلام بیروبۆچوونی زۆر جوان و ڕێنمـایی بـەرزی تیایـە , بۆیـە دەبێت بیەڕینەوە بەو پردەی لـە نێوان ئێمـەو ئیـسلامدایە , ئەگـەر ئەمـەمان کـرد ئـەوا زۆر سوودمەند دەبین و نەوەکانی داهاتووش زۆر سوودی لێ دەبینن .

مـن هـانی منالـەکانم دەدەم کـە قـووڵ ببنـەوە لـە شـارەزایی لـە ئیـسلامداو داوایـان لێ دەکـەم کـە (محمـد)پێغەمبـەر (ص)بناسـن کـە دائـەنرێ بەگـەورەترین مـرۆڤ لەسـەر زەوی , تەنانەت دەتوانم بڵێم : ئەو گەورەترین مرۆڤە مێژوو ناسیبێتی , ئەم مەسـەلەیە لای مـن خـیلاف تیانیــە , بۆیــە بەڕاســتی پێویــستە لەســەرمان هــەموو لایەنــەکانی گــەورەیی ئەوپێغەمبەرە و زۆر لە هاوەڵانی بزانین , ئەمەوێ منالـەکانم ئـەوە بـزانن , هـەروەها بـەلای منەوە هەقە هەموو گەلانی دنیا ڕێنماییەکانی (محمد)(ص)بزانن, هەرچەند ئەمە نەهاتۆتـە دی لەبەر دووهۆ :-

یەکـەم :غـەیرە موسـڵمانەکان هەڵوێستێکیان گرتـووە بەرامبـەر ئیـسلام کـە لـە نەفامییـەوە سەرچاوەی گرتووە . .

دووەم :هەوڵ نەدانی موسڵمانان بۆ خستنە ڕووی گەورەیی ئیسلام بۆ غەیری خۆیـان .

هـەروەها جـۆن مـۆران دەڵێـت (حەزناکـەم ئەوانـەی کـۆچ دەکـەن بـۆ ئـەمریکا و لەعالـەمی ئیـسلامی‌یەوە هــاتوون , واز لــە ئــاین و زمــان و ڕۆشــنبیری خۆیــان بهێــنن بــەڵکو بەپێچەوانەوە حەزدەکەم ئەوانەی دێن ئیسلام بڵاوبکەنـەوە لـەناو دەرودراوسـێ و منـاڵانی قوتابخانـەدا و, مـن داوا دەکـەم کـە ئـەوە وەرگـیرێ و ڕێـزی لێ بگـیرێ , مـن وا دەزانم کـە سـەدەی بیست و یـەك سـەدەی ئیسلام دەبێت و بـەوەش ئاشـتی و خۆشـگوزەرانی زیـاتر باڵ بەسەردنیادا دەکێشێ . (ل٢٢٦)هەمان سەرچاوە.

## موسڵمان بوونی ئەمریکی و ئەورووپی لەکوەیت

لیژنەی ناساندنی ئیسلام لەکوەیت ڕایگەیاند کە ژمارەی ئەو ئەورووپی و ئەمریکی یانەی لەکوەیت موسڵمان بوون لەساڵی (٢٠٠٢) دا زیاترە لەدوو هەزار و چوارسەدو پەنجا کەس ..

هەروەها ئاماژەی کرد بەوەی کە زیاتر لەبیست و دووهەزار کەس لەساڵانی ڕابردوودا لەئەمریکی و ئەورووپی یەکان موسڵمان بوون و ساڵی (٢٠٠٣) ش دا پرۆژەی (بەهاری دڵانی)دانا بۆ ئەوەی ئەو نۆ موسڵمانانەی کەتەمەنیان لەشەش ساڵەوە تابیست و یەک ساڵە فێری قورئان و فەرموودە بکرێن ...ل٢٣٢ هەمان سەرچاوە .

## دەربەدەرو بیٚ لانە لەئەمریکا

لە وڵاتە ئیسلامی‌یەکاندا دیاردەی دەربەدەری و بیٚ لانەیی کەمە , بەپێچەوانەی ڕۆژئاوای ماددی‌یەوە کە هەموو شتێك لەڕوانگەی بەرژەوەندی و سوودو ماددەوە تەماشا دەکرێت .. لە ڕۆژئاواو ئەمریکا بەندایەتی ماددەو دۆلار بە ئاشکرا دیارە , مامۆستا محمد قطب دەڵێت (کاتێك سەید قطب لە ئەمریکا بوو , ڕۆژێك لەباخێکدا دانیشتبوو, کابرایەکی ئەمریکی هاتە لایەوەو وتی : تۆ ئەمریکیت , ئەم پرسیارەشی بۆ ئەوە کرد ئەگەر ئەمریکی بێت و مادام سپی پێست نیە , لای دانەنیشیٚ ! ئەویش وتی : من میسریم , بۆیە کابرا لایەوە دانیشت و کەوتە پرسیارکردن لەبارەی میسرو ئیسلامەوە , سەیدیش باسی ئیسلامی بەجوانی بۆ کرد ..کەچی کابرا لەکۆتایی دا نیشتنەکەدا دۆلارێکی لەگیرفانی دەرهێناو لەبەردەم سەیدا دایناو بەوپەڕی جورئەتەوەو وتی ( هەموو ئەوانەی وتت دەربارەی ئیسلام ڕاستە , بەڵام ئێمە لە ئەمریکا ئەم دۆلارە دەپەرستین ) کابرا ڕۆیشت و سەیدیش لەبەرخۆیەوە فەرموودەکەی حەزرەتی (ص)وتەوە ( تعس عبد الدرهم , تعس عبد الدینار )..

بەڕاستی هەروایە , ئەم دیاردەیە ڕەنگی داوەتەوە لەهەموو ژیانیان دا , ئەوەتە ئەگەر بەرووبوومی گەنم زۆر بێت , دەیکەنە دەریاکانەوە بۆ ئەوەی نرخی لەبازاڕەکاندا دانەبەزێت !

بەڵیٚ .. ژمارەیەکی زۆر بێکارەو بیٚ لانە شەو لەسەر جادەو شۆستەکان ڕۆژدەکەنەوە وئەوە دەخۆن کە ئەیدزن یان خێریان پێدەکرێت ...

بزوتنەوەی ئیسلامی لە ئەمریکای باکور گرنگی دا بەم مەسەلەیە و لەڕێی چەند پرۆژەیەکی هاوکاری کۆمەڵایەتییەوە کەوتنە هاوکاری و فریاکەوتنی ئەو کەسە دەربەدەر و بێ لانانە , بەپێدانی خواردن وجل وبەرگ و زۆرشتی تر لە شارە گەورەکانی وەك نیویورك دا ....

لەگەڵ هاوکارییەکاندا بڵاوکراوەی تایبەت بە ئیسلامیش ئەدەن بەوکەسانە تابزانن ئەوە کاری موسڵمانانەو بەمەش ڕووی گەشی جوانی ئیسلامیان بۆ دەرکەوێت .

ئەو بەرنامە خێرخوازی یەش بە سەرپەشتی (خطیب اکبر جهاد)ە کە لەساڵی (١٩٨٧)ەوە خەریکن , ناوبراو لە بەندیخانەدا ئیسلامی ناسی و پاش بەربوونی زۆر گەڕا بەدوای جێ و ڕێی نوستن داو لەپەناگەی گەڕەکی بروکلین لەنیویورك گیرسایەوە بۆ ماوەیەك , ئنجا هەوڵیدا کە لەڕێی ئیشێکەوە هەندێ پارە پێکەوە بنێ و بەسەیارە کۆنەکەیەوە لەگەڵ دووخۆبەخشی تردا کەوتنە کۆکردنەوەی خواردن و جل و بەرگ و دابەشکردنی بەسەر لێقەوماوو بێ لانەو دەربەدەرەکاندا ...ئەم هەوڵەی (خطیب)نرخێنرا لەلایەن ئەڵقەی ئیسلامی ئەمریکای باکورەوە و کەوتنە کارئاسانی بۆ ئەو خێرخوازانە و بەمەش کارەکەیان زۆر بەرەوپێش چوو ...

شایانی باسە لە بەریتانیاش کوڕی وەزیری تەندروستی بەریتانی موسڵمان بوو ناوی خۆی گۆڕی بۆ (ئەحمەد)و بەهەمان شێوە کەوتە یارمەتیدانی هەژار و بێ لانەکان ..

## ڕاپۆرتەکەی وەکالەتی رویترز

وەکالەتی ڕۆیتەرز ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی (ڕووکردنە ئیسلامی ئەمریکییەکان بێ وێنەیە) تیایاوتی : گۆڤاری هەفتانەی منالان لەلایەن کۆمپانیای گەورەی ئەمریکی یەوە دەردەکرێت , کە ئیسلام بەمنالان ئاشنا دەکات و ژمارەیەکی زۆر زۆری لێ بڵاودەبێتەوە ... هەروەها دار نشری ئەتلەنتیك لە ویلایەتی ماساشویتس ڕایگەیاند کە داواکاریەکی زۆر هەیە لەسەر قورئانی وەرگێڕدراو بەزمانی ئینگلیزی و پەڕاوی تری ئیسلامی .

## خوا هێناو یەتیە قسە !

لەمونتەدای دوبەی ئیستراتیجی, لە موحازەرەیەکیدا ڕۆشنبیری ناوداری ئەمریکی (صموئیل هنتنگتون)کە خاوەنی بیرۆکەی بەیەکادانی شارستانێتییەکانە وتی (ئەبێ

دان بەوەدابنێین کەقورئان زۆرترین پەڕاوە کە دەفرۆشرێت لەئەمریکادا , ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەئەنجامەکان پێچەوانەن ) واتە لەجیاتی ئەوەی کەس نەهاتایە بەلای قورئاندا لە ئەمریکا , کەچی بەپێچەوانەوە خەڵکێکی زۆر عەودالْی تێگەیشتن و شارەزابوونن لە قورئان و لە ئیسلام . هەروەها وتی (ئاین ڕۆڵێکی گەورەو دیاری هەیە لەپاراستنی ناسنامەی ڕۆشنبیری وژیاری , کەئەمەش لەجیهانی ئیسلامیدا دیارە)هەروەها دانی بەوەدانا کە (ڕابوونی ئیسلامی بەهێزە و نموونەی بەجەزائیرو تورکیا هێنایەوە, هەروەها دانی بەوەشدا نا کە دیموکراسیەت نیە لەسای سێبەری ئەو نیزامانەی کە دۆستی ئەمریکان , یان ئەمریکا دروستیان دەکات)ل ٢٥٥ هەمان سەرچاوە .

## زانکۆی ئیسلامی ئەمریکی

پاش ١١ی سێبتەمبەر زانکۆی ئیسلامی ئەمریکی دەستی کرد بەدانانی وەقفێك بۆخۆی بەبڕی (١٥)ملیۆن دۆلار تاوەکو کارەکانی زیاتر بەرەو پێش بچێت , شایانی باسە زانکۆی هارفارد وەقفی خەیری هەیە بەبڕی (١٩)ملیاردۆلار کە کارەکانی خۆی پێ بەڕێوە دەبات , جائەم وەقفانە سوودی زۆر دەگەیەنن لە بەرەو پێش چوونی زانست و کارە خێرخوازیەکاندا , بەتایبەت کەزانکۆی ئیسلامی ئەیەوێ ئەوانەی کەتازە موسڵمان دەبن بواریان بۆ بڕەخسێنێ تا زیاتر بەرەو پێش بچن و خوێندن تەواو بکەن ... هەروەها هەوڵ دەدات فێری زمانی عەرەبیان بکات و قورئان بەباشی بخوێنن و تێی بگەن ...

بۆ ئەمەش پرۆژەی پەیمانگای قورئانی دامەزراندووەو پرۆژەی بەخشین (منحە)ی خوێندنی هێناوەتە کایەوە بۆ موسڵمانە تازەکان و پرۆژەی کتێبخانەی زانکۆشی بە دەستەوەیە تاباشتر موسڵمانان شارەزابن ...

لەکەنەداش کۆنگرێسی ئیسلامی کەنەدی بانگەشەی بۆ کردنەوەی کۆلێژی دیراساتی ئیسلامی کرد , کە سەر بەیەکێ لەزانکۆ گەورەکانی کەنەدا بێت و بانگخوازو ئیمام تیا پێبگەن بۆ کەنەدا , کە ئێستا زیاتر لەدووسەد مزگەوتی تیایە .. هەروەها کۆنگرێسی ناوبراو پرۆژەیەکی خستۆتە بەردەم وەزارەتی فێرکردنی کەنەدی تائیسلام لە قوتابخانەکانی کەنەدادا بخوێنرێ . ل ٢٥٨ .

## موسڵمانان لەئەڵمانیا

لەئــەڵمانیا نزیکــەی (١,٧)ملیــۆن موســڵمان هەیــەو ,(٣٩)هــەزاریان لــە حیزبــە ئەڵمانیەکاندا کاردەکەن و مەجلیسی شورای ئیسلامیش لەئەڵمانیا لەم ساڵانەی دواییدا ڕاگەیەنرا و نووسینگەی خۆی کردەوە لەشاری (بۆن)ی پایتەختدا ...

کاتی خۆی شاعیری ئەڵمانی بەناوبانگ گۆتە وتی (هیچ شەریعەتێك نیە لەسەروو ئەو شەریعەتەی کەبە (محمد)(ص)دا نێردراوە و, لە داهاتووش دا هیچ کەس ناتوانیٚ پێشی بکەویٚ , جائەگەر ئەوەی هێناویەتی ئیسلامە , ئەوە هەموومان موسڵمانین)...

لەئەڵمانیا زۆر هەوڵ درا بۆ دان نان بەئیسلام دا, لەوەدا بوو کە ئەوە بێتەدی و لە قوتابخانەکاندا وانەی تایبەت بە ئیسلام بخوێنریٚ , کەچی لەژێر فشاری زۆری ناحەزان دا ئەو کارە وەستێنرا، بەتایبەت دوای ١١ی سێبتەمبەر ..دکتۆر (موراد هوفمان) کەدیبلۆماسێکی بەناوبانگی ئەڵمانیەو موسڵمان بووە و خاوەنی پەڕاوی (الأسلام کبدیل)ە داوا لە حکومەتی ئەڵمانی دەکا کە لەئیسلام تێبگات باشترە لەوەی کە عینادی بکات .. هەروەها دەڵێت (جیهان لەموسڵمان دادپەروەرتری نەدیوەو چوو بێتە هەر وڵاتێکەوە ڕەگەز پەرستی نەهێشتووە).... ل ٢٦١ .

ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی بەناوبانگیش (انا ماری شمیل)داوا لەحکومەتی ئەڵمانی دەکات کە ڕیٚ بدریٚ بە موسڵمانان حیزبێك دابمەزرێنن و بتوانن بچنە پەرلەمانی ئەڵمانیەوە..

هەروەها دکتۆر ئەیوب کوهلر کەئابووری ناسێکی ئەڵمانی موسڵمانە دەڵیٚ (بەڕاستی ئیسلام کێشەی هەژاری چارەسەر دەکات و ئەڵمانیاش خەڵکانێکی تیا دەژین کەزۆر هەژارن بەهۆی نیزامی سەرمایەداری یەوە کە هەژار هەژارترو دەوڵەمەند دەوڵەمەند تر دەکات ).... شایانی باسە ناوبراو داوا لەحکومەت دەکات کە بەشی ئابوری ئیسلامی لەزانکۆ کان و دەزگا ئابووری یەکانی ئەڵمانیادا بکرێتەوە ... ل ٢٦٢ .

## سەرپۆش و بەرگی پۆلیسی

وەکالەتی قدس پرس لەیولیو ٢٠٠٢ بڵاوی کردەوە کە بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرتی (کوك)لەویلایەتی ئەلینۆی ئەمریکی بڕیاری دا کەڕیٚ بدریٚ بەجێگری بەڕێوەبەر سەرپۆش لەسەرکات لەکاتی دەوامی ڕەسمیدا , چونکە جێگری بەڕێوەبەر موسڵمان بووەو پێشتر ڕێی پێنەدرا بوو بەسەرپۆشەوە دەوام بکات .. ئەم بڕیارەش بۆخۆی

سەرکەوتنێکە بۆ موسڵمانان و دان پیانانێکە بەپۆشاکی ئیسلامی دا .... هەمان سەرچاوە ل ٢٦٤ .

## دادگای ئیسلامی

هەندێ جار دادگای ئەمریکی کە کێشەیەکی موسڵمانانی دێتە بەردەست ڕووبەڕووی خۆیانی دەکاتەوە کە بەپێی شەرعی خوا کێشەکە یەکلایی بکەنەوە , وەك ئەو ڕووداوەی کە لە (بروکلین)ڕووی داو ئەمەش ڕێ خۆش بوونێکە بۆموسڵمانان کەبتوانن پەیڕەوی شەریعەتیان بکەن و بەپێی شەرعی خوا ژیانی خۆیان ڕێکبخەن و کێشەکانیان یەکلایی بکەنەوە ...

ئەمەش وای لەپێشەوای پێشووی مزگەوتی تەقوا کرد لە (بروکلین)کەداوا لە موسڵمانان بکات هەوڵبدەن کاریگەریان هەبێت لەسەر کۆمەڵگا و خۆیان ڕێکبخەن تابتوانن بگەنە کونگریس و مەجلیسی شیوخ و لەو دوانگانەوە دەنگی خۆیان بگەیەنن بەخەڵکی و کاربەدەستان ... ل٢٦٣ المعجزە .

## نوێژ چارەسەری نەخۆشی یە

لەئەمریکا کۆنفرانسێکی پزیشکی بەسترا بە سەرۆکایەتی ( دکتۆر ڕۆبرت بینسون ) مامۆستا لەزانکۆی هارفرد و سەرۆکی پەیمانگای دیکونیس بۆ لێکۆڵینەوەی عەقل و لەش لە بوسطن ..

ناوبراو پوختەی کۆنگرەکەی بەم جۆرە ڕاگەیاند (ئەوەی تازەیەو ئێمە لەم کۆنفرانسەدا پێی گەیشتوین ئەوەیە کە کاتێ مرۆۃ بەجۆرێکی تایبەت بیردەکاتەوەو نوێژو دوعاو نزا دووبارە دەکاتەوە گۆڕانکاری (سایکۆلۆجی)لەناو لەشیدا پەیدا دەبێت و بەرەو چاك بوونەوەو هێمنی دەبات , نوێژ بەشێکە لەحاوبوونەوەو پشوودان و یارمەتی چاك بوونەوە دەدات , لە کاتێکدا کە لە سەدا شەست تا لە سەدا نەوەدی ئەوانەی سەر لەعیادەی پزیشکەکان دەدەن نەخۆشی یەکانیان پەیوەندی بە دڵەڕاوکێ و باری دەروونی یەوە هەیە کە ئەمەش کەمتر دەرمان چارەسەری دەکات ...

ئەوانەی کە بڕواداری ڕاستن بڕواکەیان کاریگەری باشی دەبێت لەسەر نەخۆشی پەستانی خوێن ونەخۆشی یەکانی دڵ وشێرپەنجەو ئایدزو ....هتد . ئەبێ ئەوەمان لە یاد

نەچێت کەخوایەکی باڵادەست هەیە کەیارمەیتمان دەدات لەسەرچاك بوونەوە) ل ٢٦٦ المعجزە.

## کۆنفرانسێکی نهێنی جولەکە

لەئەنجامی ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەرەوە , موسڵمانان و گاورەکان , نزیك بوونەوەو گفتوگۆیەکیان بۆ دروست بوو کە زۆر ئیجابی بوو بۆ لەیەك گەیشتن و بەرچاوڕوونی هەردوولا , ئەمەش بووە ڕق وقین لەلای جوولەکەو بەئاشکرا ڕۆژنامەی ( بوسطن جلوب ) پاش بیست ڕۆژ لە ١١ی سێپتەمبەر وتی (جەختی زۆر دەکرێتە سەر دانوستانی نێوان مەسیحیەت و ئیسلام لەڕووداوی ١١ی سێبتەمبەرەوە , ئەم دیاردە نوێ یەش زیان دەگەیەنێ بەدانوستان و پەیوەندی نێوان ئێمە (جوولەکە)و مەسیحیەکان) .

هەروەها نووسەری ئیسلامی فەهمی هوەیدی ئاشکرای کرد کە دەنگ و باسی پێگەیشتووە کە گەورە پیاوانی جوولەکەی ئەوروپا کۆنگرەیەکی نهێنیان بەستووە لە (مدريد)لە ئیسپانیا پاش ڕووداوی ١١ی سێبتەمبەر وباسەکەشیان لەسەر بڵاوبوونەوەی ئیسلام بووە لە ئەوروپادا ودیارە دیراسەی ئەوهۆکارانەشیان کردووە کەچۆن بەربەست و ئاستەنگ بهێننە ڕێی .

لەمانگی (٦)ی (٢٠٠١)دا لەژمارەی (١٤٥٧)دا گۆڤاری المجتمع ڕاپۆرتی کۆنگرسی جوولەکەی جیهانی بڵاوکردەوە کە تیایا دەڵێن :

(لەئەنجامی دیراسەو ڕووپێوکردنی ( زیاد بوونی ئیسلام لەئەوروپادا ) بۆمان دەرکەوتووە کە لەم دەساڵەی دوایی سەدەی بیست دا, گۆڕانکاریەکی گەورەی دیموگرافی لە بەرژەوەندی موسڵمانان لە ئەوروپادا هاتۆتەکایەوە , ئەمڕۆ مەددی ئیسلامیبە ڕێژەیەکی گەورە ڕوو لەزیادیيە لەئەوروپادا , کەنزیکەی بیست ملیۆن کەس لەئەوروپادا خۆیان بە موسڵمان دەزانن.

موسڵمانانی ئەوروپا ئەمڕۆ هێزێکی سیاسین کە دەبێ حسابیان بۆ بکرێت , جا ئەگەر ئەم زیاد بوونە بەردەوام بێت لە ساڵی (٢٠٢٠)دا دەبنە (١٠٪)ی هەموو دانیشتوانی ئەوروپا) ..

ڕاپۆرتەکە بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر مەترسی زیادبوونی موسڵمانان دوونموونەی باسکردووە :

یەکەم / موسڵمانان لەبەریتانیادا لەساڵی ١٩٦١ دا هەشتاودوو هەزار کەس بوون ,لەساڵی (٢٠٠١)ز دا بوون بە یەك ملیۆن , کە ئەمەش زیادبوونە بەڕێژەی (١٢٠٠٪).

دووەم / لەفرنسادا ئێستا چوار ملیۆن و دووسەد هەزار موسڵمان هەیە , ئەمە بێجگە لەسەدان هەزار کەس کە بە نایاسایی کۆچیان کردووە بۆ فەڕەنسا .

هەروەها ڕاپۆرتەکە دەڵێ کەزیاد بوونی موسڵمانان لەداهاتوودا کاردەکاتە سەر کێشەی عەرەب- ئیسرائیل و پاشان زیاد بوونی موسڵمانان لەئەورووپادا وا دەکات هەڵوێست و ڕای حکوماتی ئەوروپی بگۆڕێت و پشتگیری جوولەکە نەکەن ...

بۆ ئەمەش ڕاپۆرتەکە نموونە دێنێتەوە بە هەڵبژاردنەکانی بەریتانیا کەبەهەزاران بڵاوکراوە دابەش کرا لەناو موسڵماناندا بۆئەوەی ئەوکەسانە هەڵنەبژێرین کەلایەنگری جوولەکەن ...

هەروەها ڕێکخراوەکانی موسڵمانان لەبەریتانیا داوایان کرد کە کۆگاکانی (مارکس اندسبنسر ) شت نەکڕن ,چونکە بەشێك لە قازانجەکەی یارمەتی جوولەکەی پێدەدات ... بەڵێ .. بەم جۆرە جوولەکە لەکەمین دایە بۆ سەر زیادکردنی موسڵمانان و بەهەموو شێوەیەك پیلان دادەنێن بۆ نەهاتنە پێشەوەی موسڵمانان ...ل٢٧٤ المعجزە.

## ئیسلام گیانێکی تازەیە بۆ نیزامی عالەمی

لەسەروتارێکدا ( ناشان جارولز )بەناوی ( روح النظام العالمي )دەڵێت (بەڕاستیئیسلام دەبێتە گیانی سەدەی بیست ویەك و دەبێتە تاکە چارەسەری کێشە قورسەکان کەعیلمانیەتی شارستانی ڕۆژئاوا دروستیان کردون)...

هەروەها دەڵێت (ڕەنگە ڕووبەڕووبوونەوەو دژایەتی ئیسلام بووبێتە مایەی هاتنەکایەی سەردەمی دوای عیلمانیەت لە ڕۆژ ئاوادا , کە بەمەش ڕێ خۆش دەبێت بۆ چوون بەرەو گرنگیدان بە ڕۆحیەت , پاش ئەوەی بەتەواوی پشت گوێ خرابوو, ئەم چوون بەرەو ڕۆحیەتەش وادەکات بەچاوێکی تر سەیری بەها ئیسلامیەکان بکرێتەوە کە هاوسەنگی و ئینساف و بەرچاوو ڕوونی تیا بێت)..

ڕاوێژکاری پێشووی سەرۆکی ئەمریکی لە کۆشکی سپی (روبرت کرین)کە سوپاس بۆ خوا موسڵمان بووەو ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ (فاروق عبدالحق)دەڵێت : (بوونی زانایانی ئیسلام لە ئەمریکادا زۆر گرنگە , چونکە تەنها ئەوان دەتوانن تاکە چارەسەر بێنن بۆئەو حاڵەی کەئێمە تیاین و , فێری ئیسلاممان بکەن , ئەوان لێهاتوون بۆسەرکردایەتی جوڵانەوەیەکی ڕاستی ڕەسەن بۆ گۆڕینی عالەم , من داوای دوعای خێرتان لێدەکەم تابتوانم ئیسلام بگەیەنمە وڵاتەکەم ...

ئەمریکی یەکان وا دەزانن کەخوا دەیەوێت پێشەوای جیهان بن , ئێستاش زۆر کەس لەجیهان دا چاوەڕێی پێشەواو سەرکردەیەکی نوێیە , ئێمەش ئەرکی شەرشانمانە کەهاوکاریئەو بۆچوونە بکەین بە شوێن کەوتنی بەرنامەی خوا کەبەڕەحمەتی خۆی ناردویەتی ..

ئەگەر ئەمریکییەکان ڕوونەکەنە ئیسلام هەرچیان هەیە بەرەو تیاچوون دەچێت , بە ڕاستی مەسیحییەتی هاوچەرخ ئەو هەقەی پێ نیە کە محمد (ص)هێناویەتی لەفێرکردنی پەراوی خواو پاکردنەوەی دەروون , بۆیە سەرکەوتوونەبوو لە گوتاریا بۆ کۆمەڵگای لەبەریەك هەڵوەشاوی ڕۆژئاوا...) ل ٣١٢ المعجزە .

## دکتۆر موراد هوفمان

دکتۆر هوفمان یەکێکە لەو ڕۆشنبیرە ڕۆژئاواییانەی کە خوا هیدایەتی داوە , پاش گەڕانێکی زۆر بەدوای ڕاستیدا , لەکاتێکدا کە بۆماوەیەکی زۆر سەفیری ئەڵمانیا بوو لەجەزائیر و مەغریب , ناوبراو چەند پەراوێکی گرنگی نووسیوە کەچەند جار چاپ کراونەتەوەو زۆر سوودی لێ بینراوە , وەك (الاسلام هو البدیل) و (طریق فلسفي الی الاسلام )و (الاسلام عام ٢٠٠٠ م) هەروەها یادەوەرییەکانی گەشتەکەی بۆ ئیسلامی تۆمار کردوە لەپەراوێکدا بەناوی (یومیات ألمانی مسلم – الطریق الی مکة)...

هەموو پەراوەکانی ئیسلام دەخاتەڕوو کە ژیارێکی جیهانیە جێی هەموو ئەوبەرنامەو ژیارانە دەگرێتەوە کە دنیایان نقومی دەریایەك لەکێشەو دەردەسەری کردووە ..

لەو ڕۆژەوە کەوازی لەکارەکەی هێناوە وەك سەفیرێك , بووە بەسەفیری ئیسلام و دەگەڕێ بەچوار قوڕنەی دنیاداو بانگەواز دەکات بۆ ئیسلام ..

دکتۆر دەڵێت (کاتێك چووم بۆ عومرە لە ساڵی ١٩٨٢داو , پەساپۆرتەکەم دایە دەست ئەفسەری جەوازات , زۆر سەیری کردو دوایی کەزانی موسڵمان بووم باوەشی پیاکردم و وتی تۆ برامی لەئیمان وئیسلامەتی‌دا کە ئەوەش بەڕاستی زۆر کاری تێکردم ).

هەروەها دەڵێ ( ئیسلام نورو هیدایەتێکە خوا دڵ و عەقڵی پێ ئارام دەکات , هیوادارم ئەم زستانەی ساڵی (٢٠٠٢)کەسەر لەکوڕەکەم دەدەم کە سەرقاڵی بازرگانی‌یە , ئەویش خوا هیدایەتی بدات و بێت بەرەو ئیسلام , هەرچەند دڵنیاشم کەخوا ئاواتەکەم دێنێتەدی )...

لەبارەی بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلامیشەوە دەڵێت (داهاتووی ئیسلام بەرێوەیە لە ڕۆژئاواداو , ئیسلام زۆر بەخێرایی بڵاودەبێتەوە , جارقی خەڵکی لە ژیانی ماددی ڕۆژئاوا کەوایان لێ دەکات ڕقیان لەهەموو شتێك بێت , دەیان بات بەرەو گەڕان بەدوای (بدیل)ێکدا کە ئەویش ئیسلامە ) .

( ڕۆژ ئاوا ئیسلام بە تیرۆر تۆمەتبار دەکات , ئەمەش پاڵ بەخەڵکەوە دەنێت کە بگەڕێن بە دوای ئیسلامدا و تێی بگەن , کەئەمەش فرسەتە و دەگەنە قەناعەت کەئیسلام هەقە) .

(ئەمریکاو وڵاتانی ڕۆژئاوا خاکێکی تینوون بۆ ئیسلام کەساڵ لەدوای ساڵ زیاتر بڵاودەبێتەوە , ژمارەی موسڵمانان لەئەمریکا زیاترە لەحەوت ملیۆن کەس و هیچ ویلایەتێك نیە موسڵمانی تیانەبێت , تەنها لە لوس ئەنجلوس دا (٦٢)مزگەوت هەیە و پلەوپایەو شوێنە زانستی‌یەکانیش موسڵمانان خەریکن بۆی دەچن , ئێستا لە (٢٠٪)ی مامۆستایانی کۆلێژی پزیشکی لە ئەمریکادا موسڵمانن ولاوانیش لەڕۆژئاوا زیاتر دێن بۆلای ئیسلام و بوار ڕەخساوە بۆ ئیسلام کە ببێتە یەکەم ئاین لە سەدەی نوێدا لەهەموو جیهاندا ) ...

(شارستانێتی ڕۆژئاوا ماددی و مولحیدەو ئەوروپا مەسیحی نین , ئەم شارستانێتی یەش زۆر دیاردەی ترسناکی هێناوەتەکایەوە وەك هەڵوەشانی خێزان و خۆپەرستی و خۆخۆیی , جانەگەر بەها باڵاکان و بەرنامەی خوایی فریای نەکەوێ ئەوا ئەو شارستانێتی‌یە دەڕوخێ لەناو خۆی دا )....

(شایانی باسە کە قورئانی وەرگێڕاو بۆ ئینگلیزی لەسەدا هەزار چاپکردنی زیادی کردووەو کتێبەکانی دکتۆر هوفمان زۆر داوای لەسەرەو لەم بارەیەشەوە دکتور دەڵێت :

ئیـــسلام زۆر بەئاشـــکرا لـــەهۆکارەکانی ڕاگەیانـــدنا دەبینرێـــت و دەبیـــسرێت و, بەسەیرکردنێکی قووڵ و وردبوونەوە من زۆر گەشبینم کەئیسلام تاقە (بدیل)ە ) ..ل٣٢٥

## مه طرانی گەورەی ئیتاڵیا

قەشـــەی نـــاوداری ئیتـــاڵی مـــەترانی گـــەورەی شـــاری بولونیـــا ی ئیتـــاڵی (جیاکوموبیفی)کەتەمەنی حەفتاو سێ ساڵە بە ئەوروپییەکان دەڵێت (بەڕاستی ئیسلام سەردەکەوێ بەسەر ئەوروپادا, ئەگەر ئەوروپا بەچاکی نەبێتەوە بەگاور ).

نـاوبراو ئـەم قـسانەی چـەند جـار وەك ئاگـادار کردنەوەیـەك داوەتـەوە بـەگوێی ئەوروپیەکانداو زۆر جەختی کردۆتە سەرئەوەی کە گاورە (کاثولیکە کان) لە ئەوروپاوە , (لەپۆڵەنداو فلیپین )ەوە کۆچ بکەن بۆ ئیتاڵیا لەجیاتی ئەوەی کەخەڵکی لە ئەلبانیا و ئەفریقیا و مەغریبەوە هیجرەت بکەن بۆ ئیتاڵیا بەمەبەستی پاراستنی (ناسنامەی مەسیحی لە ئیتاڵیادا)...ل ٣٢٦ المعجزە .

## موسڵمان بوونی بەردەوام

لەشاری مەدینەی پیرۆز لەساڵی (٢٠٠٣)زدا (٧٥٠)پیاوو ژنی بیانی موسڵمان بوون دیارە ئەمانەش کە دەگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان و پەیوەندی دەکەن بەکەس و کاریانەوە ڕۆڵێکی باشیان دەبێت بۆ ناساندنی ئیسلام بەخەڵکانێکی زۆر ....

جانەك هەر لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا بەڵکو لەزۆر لەوڵاتەکانی تری دنیاشدا ئیسلام بەچاکی بەرەوپێش دەچێت , ئەوەتا کاردینال کورمال میرفی پێشەوای کومەڵەی ڕۆمی کاثولیك لە ئینگلترا و ویلز دەڵێت ( لەبەریتانیا مەسیحیەت لەپاشەکشەدایەوئیسلام لەوپەڕی بەرەو پێش چووندایە )..

پاش (٥٠)ساڵ حوکم لەبەریتانیادا , شاژنی بەریتانیا(الیزابیث)ی دووەم پێڵاوەکانی داکەندو چووە مزگەوتەوە لە ٣١ ی یولیو (٢٠٠٢)دا لەسەرووی بەریتانیادا، دیارە ئەمەش ڕێزێکی گەورەبوو بۆ سێ ملیۆن و نیو موسڵمان کە لەبەریتانیادا دەژین , موسڵمانانیش قورئانێکی وەرگێردراو بۆسەرزمانی ئینگلیزیان پێشکەش کرد ...

شایانی باسە کۆنگرەی ئیسلامی لەبەریتانیا داوایان لە شاژن و سەرۆك وەزیران و ئەندامانی مەجلیسی نواب کرد کەموسڵمان بن پێش ئەوەی کار لە کاربترازێت .

ئامادەبوانی ئەو کۆنگرەیەش گوێیان گرت لەوتەی (٤٢)کەس کەپاش ١١ی سێبتەمبەر موسڵمان بووبوون ...

یەکێکیش لەوتاربێژانَ وتی (کاتێك حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێبێت دێتەوە سەرزەوی لەدوای ئیمامی ئێمەوە نوێژ دەکات و بەشەرعی ئێمە ڕەفتار دەکات , بۆیە وەرن لەگەڵ ئێمە بن بۆ پێشوازی لەو زاتە پایە بەرزە) ل٣٣٤ المعجزه.

## ئەمیر چارلز

ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)وتارەکەی ئەمیر چارلزی بەریتانی بڵاوکردەوە , کە لە ٢٤ ی نیایری ٢٠٠٣ لەپەیمانگای ئیسلامی دای لە (بیسترشایر)لەناوەڕاستی بەریتانیا , کە دەڵێن (بەڕاستی ئێمە ئەمڕۆلە هەمووکات زیاتر پێویستمان بەوەیە لەئیسلام شارەزا بین ) ، هەروەها لەساڵی ١٩٩٥ یش دا ئەمیر چارلز لەبەردەم (٧٠٠)کەسایەتی بەریتانی و دووسەد ڕۆژنامەنووسی ئەورووپی و جیهانی دا لەهۆڵی پەیمانگای مەلەکی دا وتی (حەزدەکەم هەموو.دەزگا ئەکادیمیەکانی بەریتانیا هاوکاری بکەن بۆ دروستکردنی پردی لەیەك گەیشتن لەنێوان ڕۆژئاواو ئیسلام دا ) ...شایانی باسە لە زانکۆی (اکسفورد)دا وتارێکی تری لەم شێوەیە بۆ ئامادەبوان دا . ل٣٣٦ المعجزه .

## یارمەتی دانی قوتابخانە ئیسلامی یەکان

موسڵمانی بەریتانی یوسف ئیسلام قوتابخانەی (الفرقان)ی لە برمنگهام و قوتابخانەی ئیسلامی لە لەندەن دامەزراندووەو داوای لەحکومەتی بەریتانیا کرد کەیارمەتی ئەو دوو قوتابخانەیە و قوتابخانە ئیسلامیەکانی تر بدات , حکومەتی بەریتانیاش ڕازی بوو بەیارمەتی دانیان , ئەم هەنگاوەش ڕۆژنامەی گاردیان لەبارەیەوە وتی (ئەم هەنگاوەی حکومەت دانانی سنوورێکە بۆ ئەو ستەمەی لەجالیاتی ئیسلامی بەریتانی دەکرا)...

شایانی باسە هۆڵەندە زۆر زیاتر یارمەتی قوتابخانە ئیسلامیەکان دەدات و بە قوتابخانەی حکومی دادەنێ و هیچ بەرپرسێك دەست ناکێشێتە ناو ئیش و کاریانەوەو هەروەها گاردیان دەڵێت (خەڵکی پۆل پۆل دەچن بەرەو ئیسلام و موسڵمان دەبن )...
ئەمەش وای کردووە کەزۆر مزگەوت دووجار نوێژی هەینی تیا دوبارە بکرێتەوە لەبەرئەوەی بچووکن و جێی هەموو نوێژ خوێنانی تیا نابێتەوە ... المعجزه ل٣٤١ .

## کوڕی وەزیرەکان موسڵمان دەبن

ئـەبو زەکـەریا یحیـی رسـام سـەرۆکی تـەحریری گۆڤـاری (الحـوار)کەلـە برمنگهـام دەردەچـێ دەڵـێ : کـوڕی وەزیـری دەوڵـەت بـۆ کاروبـاری دەرەوەی بـەریتانی پێـشوو (دوگـلاس هێـرد) و (جـۆ)کـوڕی وەزیـری تەندروسـتی پێـشوو (فرانـك دوبـسون)و کـوڕی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی لە (میدلاند)موسڵمان بوون ...

(جـۆ)کـە کـوڕی وەزیـری تەندروسـتیـیە نـاوی خـۆی گـۆڕی بـۆ (ئەحمـەد)وتەمـەنی (٢٦)سـاڵەو لـەبارەی موسـڵمان بوونیـەوە دەڵێـت (لەگەڕەکێکدا گـەورەبووم کەژمارەیـەکی زۆر موسـڵمانی تیایـە و قوتابخانەکـەشمان موسـڵمانی تیـابوو , لـە شـانزە سـاڵی دا قورئـانێکی ڕاڤـەکراو بـەئینگلیزیم خوێنـدەوە کـە بـرادەرێکم بـۆی هێنـابووم بـەناوی (سامی)کە بەئەسڵ بەنگلادیشی بوو ... من ئاواتە خوازم بچم بۆحەج و عومرەو ئـەوەش کە زۆر هـانی دام بۆ ئیسلام ژیـانی موسـڵمانانی ئەندونیـسیا بـوو کـە لەتەمـەنی بیـست ساڵی دا سەرم دا ....

مـن بـەختم باشـە , دایـك و بـاوکم ڕۆشـنبیرن و هـیچ ڕێگرییـەکیان لێ نـەکردم وتـا ئێستاش باوکم لەجەژنی لەدایك بوونم دا پەڕاوی ئیسلامیم بە دیاری ئەداتێ , ئیتر نازانم ڕەنگە خۆشـی بیانخوێنێتـەوە . من ئێستا لـە چەند کۆمەڵێکی ئیـسلامی خێرخوازی دا کاردەکـەم و سـەرۆکایەتی لیژنـەی پەرەپێـدانی ژیـانی موسـڵمانان دەکـەم کەسـەر بـە مەجلیسی ئیسلامی بەریتانیـیە , هەروەها سەرەو کاری دروستکردنی مزگەوتی (ایست لندن)دەکەم لەڕۆژهەڵاتی پایتەخت دا , کەچەند پرۆژەیەکی تریشی لەخۆگرتووە (ئەمەش بۆئـەوەی ئەگـەر کەسێك هـات بۆمزگـەوت تـەنها نوێژەکە نـەبێت ,بـەڵکو ئەگـەر پێویـستی بەدکتۆر و دەرمان هەبوو بۆی دابین بکرێت)... شایانی باسە ئەحمەد ئافرەتێکی بەنگای موسڵمانی هێناوەو پێکەوە ژیانێکی هاوسەر موسڵمانانە بەسەردەبەن. ل ٣٤٥المعجزە .

## کۆمەڵەی هاوەڵانی ئیسلام

لە٢ی یولیو(٢٠٠٢)ز کۆمەڵەی هاوەڵانی ئیسلام ڕاگەیاندرا لەئاهەنگێکدا لەمەجلیسی عمومی بـەریتانی , کۆمەڵەکە حـەفتا نائیـب و کەسـایەتی سیاسـی لـەخۆ گرتـووە , ژنـە

نائیبی بەریتانی ماکفاتی وتی (بەشداری کردنی گەورەی موسڵمانان لەبەریتانیادا , دەوڵەمەندکردنی کۆمەڵگای بەریتانییە)...

ئەم کۆمەڵەیە هەوڵ دەدات کە ئەڵقەیەکی گەیەنەر بێت بۆ بەیەکگەیشتنی موسڵمان بەریتانی یەکان و بڕیار بەدەستە سیاسی یەکانی بەریتانیا ....

هەروەها ماکفاتی وتی (ئێمە وەك ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانی کەموسڵمان نین هەقە زیاتر لەبارەیئیسلامەوە بزانین و ئەم دوانگە تازەیەش زیاتر بوار ئەڕەخسێنێ بۆ تێگەیشتنی زیاتر ودۆزینەوەی چارەسەری ئەو کێشانەی کەتووشی موسڵمانان دەبن).

هەروەها نائیبی بەریتانی (دنکان)کەبەرپرسە لەمەلەفی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەحکومەتی ( ظل ) دا جەختی کردەسەر ئەوەی کەئەم کۆمەڵەیە ئەتوانێ وابکات کۆمەڵگای بەریتانی و موسڵمانان زیاتر لەیەك بگەن و , هیوای خواست کەئەم کۆمەڵەیە بتوانێ پەیامی خۆی بگەیەنێت کەدانوستانێکی شارستانی یەو وەبتوانێ ئەم ئەزموونەش بگوازێتەوە بۆ ولاتانی تری جیهان , کەئەمەش دیارە دەبێتە پردێك بۆلەیەك گەیشتن لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژ ئاوادا . ل ٣٤٧ المعجزه .

## بوونی ئیسلام لەئەوروپادا لەدێرزەمانەوەیە

گۆڤاری (الأوروبیة)کە تایبەتە بە کاروباری ئیسلامی لە ئەوروپا داوای کرد کە مێژووی پەیوەندی ئیسلام و ئەوروپا کورت نەکرێتەوە تەنها لەلایەنی بەیەکدادانی سەربازیدا , چونکە پەیوەندی هەردولا زۆر لایەنی ڕۆشنبیری وزانستی وئابوری و ئاینی لەخۆ گرتووە بەدرێژایی سەدان ساڵ , کەئەمەش ڕەنگی داوەتەوە لە شارستانییەتی ئەمڕۆدا , تەنانەت زۆر وشەی عەرەبی و ئیسلامی چۆتە ناوزمانی ئەوروپییەکانەوە و , کاریگەی هونەرو تەلارسازی ئیسلامیش بەئاشکرا بەسەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپییەوە دیارە ...

نموونەش بۆئەمە زۆرە , لەوانە , پاشای ئەنگلۆسەکسۆنی (ئەوفا)کە فەرمانڕەوا بووە لە نێوان ساڵانی (٧٥٧ ك تا ٧٩٦ ك )لەپارەی ئاڵتونی سەردەمی خۆی لە دیوێکیدا بەعەرەبی هەندێ عیبارەتی نووسیوە کە هەمان ئەو نوسینەیە کە لەسەر دیناری ئیسلامی زەمانی خەلیفەی عەباسی (منصور)بووە , هەروەها ئەسکەندنافییەکان لەڕێی

کەشـــتیە بازرگـــانی یەکانیـــەوە هـــەرزوو موســـڵمانانیان ناســـیوەو , شـــاری (کروجینیاتی)پۆڵەندیش بەڵگەیە کە لە سەدەی هەژدەوە مزگەوتی تیایە ....

بەڕاستی موسڵمانان لەتاڵ و شیرینی وڵاتەکانیاندا بەشداریان هەبووەو بەشی خۆیان باجیـان داوە , ئـەوە موسـڵمانانی بۆسـنە و هەرسـك كـەزیاتر لەیـەك لەسـەر سـێ ی ملیۆنێکیان لێ شەهید کرا ...

شایانی باسە کەسەرژمێریەك لەهۆڵەنـدە ئاشـکرای کـرد کـەپاش ١١ی سێبتەمبەر ئیسلام یەکـەم ئاینـە لەئەمسـتر دامـی پایتـەخت داو ئـەم سـەرژمێری یەشـی ڕۆژنامـەی (مترو)ی ڕۆژانـە لـە ٢٩/ ٢٠٠٢ یولیـو ڕایگەیانـد کـە ١٣٪ دانیـشتوانی شاری ئەمستردام موسڵمانن و ڕێژەی کاپولیك یش ١٠٪ یـەو پروتـستانتیش ٥٪ و ڕێـژەی جولەکەش ١٪ ن ... ئەمـەش وای کـردووە کـەزۆر لـەدەزگا ئاینیـەکان دەرگاکانیـان دابخـەن و کـەل و پەلەکانیان بفرۆشن ....ل٣٥١ المعجزە.

**هۆڵەندی یەکان و ئیسلام**

هۆڵەندیەکانیش پاش ورد بوونەوەو دیراسەی تەواودێت بەرەو داو ئاینی ئاسمانی ئیسلامی پیرۆزو , ڕێکخرلوێکی ئافرەتانی موسڵمانیشیان هەیە بەناوی (النساو)کەلە ئەمستردام دەمـەزراوە لەسـاڵی (١٩٨٠)ز داو گرنگـی دەدات بەئافرەتـە هۆڵەندیـیەکان و دەنگـی ئیسلامی هۆڵەنـدیش هەیـە (nmo)کەلەسـاڵی ١٩٨٦ ەوە بەرنامـەکانی پـەخش دەکـات وهـەروەها هەفتانـەش بەرنامـەی تەلـەفزیۆنیان هەیـە کەبینـەری تایبـەتی خۆیـان هەیە.

**باس و لێکۆڵینەوە نەکراوە لە سەر موسڵمانبوون**

تائێستا بـاس و لێکۆڵینـەوەی تـەواو نـەکراوە لەسـەر دیـاردەی بەردەوامی موسڵمان بـوون ,ڕۆژهـەڵات ناسـی ئـەمریکی (سـتیڤن همفریـن)کـەخاوەنی پـەڕاوی (التـأریخ الاسلامی)یەو بەدەساڵ هەوڵ و ماندوو بوون دایناوەو لەزانکۆکاندا دەخوێنرێت , لەم بارەیـەوە دەڵێـت (مەسـەلەی موسـڵمان بـوون لەلێکۆڵینـەوە ئیـسلامیەکاندا پـشتگوێ خراوەو , ئەوەی لەبارەیەوە نووسراوە ڕەنگە لەلاپەڕەیەکدا کۆبکرێتەوە)...

هـەروەها دەڵێـت (کـاتی خـۆی ڕۆژهەڵاتناسـەکان لـە دڵـەوە ڕقیـان لەئیـسلام بـوو بۆیـە خـوار دەجولانـەوە و گـوێ یـان بەباسی موسـڵمان بـوون نەئـەدا, کـە لەڕاستیدا دیـاردەی موسڵمان بوون واتە ئیسلام زاڵە و لەپێشترە لە مەسیحیەت و یەهودیەت)...

## ئیسلام دووەم بیروباوەرە لەسوید

(یان ساموێلسون)کەیەکێکە لە لێکۆڵەرە سویدیەکان لەکاروباری ئیسلامی دا ڕایگەیاند کەئیسلام بووە بە دووەم بیروباوەڕی ڕەسمی لە (سوید)پاش مەسیحیەت ...

پاش ١١ی سێپتەمبەر سویدیەکان زیاتر لەجاران سەر لەمزگەوتەکان دەدەن و پرسیار دەکەن دەربارەی ئیسلام, لەم بارەیەوە ئیمامی مزگەوتی (أوبسالا)دەڵێت (بەئاشکرا دەڵێم کەجوڵەیەکی ئاشکرا و کاریگەر هەیە لەناو سویدی‌یەکاندا بەرەو ئیسلام , ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەریش کاریگەری‌یەکی گەورەی هەبوو لەسەر شارەزابوونی سویدی‌یەکان لەئیسلام و , لەماوەی دوومانگی دوای ئەو ڕووداوەدا ژمارەیەکی زۆر لەپیاوان و ئافرەتانی سویدی هاتن بۆ مزگەوت بۆ پرسیارکردن لەبارەی ئیسلامەوەو بەمەش زۆریان موسڵمان بوون . زۆربەی پرسیارەکانیشیان لەبارەی سەیرکردنی ئیسلام بۆ ئافرەت و مەسەلەی جیهاد و حەرامکردنی مەی و گۆشتی بەراز و هەڵوێستی ئیسلام لەبەرامبەر گاوروجولەکەوە بوو ...

موسڵمانبوونی سویدی‌یەکان لە قەناعەتەوەیە بەجۆرێك یەکێکیان کە تازە موسڵمان بوو بوو زۆربەگەرمی دیفاعی لە ئیسلام دەکرد و ئیدانەی ئەو هێرشەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوای دەکرد کە دەکرێتە سەر ئیسلام و بە تیرۆر ناوی دەبەن , لەکاتێکدا هەق بوو باس لە تیرۆری جیش الجمهوری الایرلندی و تاوانەکانی‌ئیسرائیل بکرایە لەفەلەستیندا ! ئافرەتێکی لاڵی سویدیش هاتە مزگەوتی (استوکهولم)و بەئیشارەت دەیویست موسڵمان ببێ , جالەبەرئەوەی تێنەگەیشتین لێی , لەسەر کاغەزێك ئەوەی دەیویست نووسی بە زمانی سویدی‌و موسڵمان بوو ) ..

شایانی باسە تەلەفیزیۆنی سویدی ڕێی دا بەئافرەتی باڵاپۆشی موسڵمان کە بەئازادی لەسەر شاشە دەربکەوێ و بەرنامە پێشکەش بکات کە ئەمەش نیشانەی ژیری و حیکمەتی سویدە کە ڕێز لەهەموو بیروبۆچوون و ئاینێك دەگرێت . لەیاسای سویدی دا ئافرەتان ئازادن بەلەچکەوە وێنە بگرن و لەهەموو(معاملات)یاندا بەکاری بهێنن و، هەر باڵاپۆشێکیش تووشی کێشەیەك ببێ بەهۆی بەرگەکەیەوە بۆی هەیە شکات بکات ,هەروەك ئەو ئافرەتە باڵاپۆشەی کە لەکۆگایەکی گەورەی جل و بەرگدا کاری دەکرد ,

لەبەرئـەوەی کـە لەسـەرکار لابـرا لەبـەر سەرپۆشـەکەی , شـکاتی کـردو گەڕێنرایـەوە سەرکارەکەی و باربووی چاکیشی وەرگرت. ل ۳٥۸ المعجزە .

لەسویددا ئێستا زۆر بەئاسایی کەسانی ڕۆشنبیر و خاوەن بڕونامەی بەرز وەك دکتۆر و مامۆستایانی زانکۆ دەبینرێن کە دێنـە مزگەوتـەوە و پرسیار دەربارەی ئیسلام دەکەن ... شتێکی ئاسایشە کە قوتابیان ناوبەناو سەردانی مزگەوتـەکان دەکن بۆ شارەزا بوون لەئاینەکان و چاوکرانەوەیان بەسەر ژیان دا ...

جێی باسەکە (انا لین)وەزیری دەرەوەی سوید وتبووی (ئیسلام دووەم ئاینی ڕەسمی یە لە سوید و یەکێکە لەو ئاینانەی کە داهاتوویەکی گەورەی دەبێت لەسویددا)..

حکومـەتی سویدی لـەپارەی شارەوانی یارمـەتی قوتابخانـە ئیسلامیەیەکان دەدات و دەست ناخاتە بەرنامـەی خوێندنیانـەوە , ئـەوەی کـەجێی سـەرنجە ئەوەیـە کەدەستنوسی دیار هەیە لەمێژووی ئیسلامدا لەسوید کە دەگەڕێتەوە بۆ هەزار ساڵ لەمەوبەر ...

لەبەرئـەوەی کـە بـەزمانی سـویدی بابـەت ونوسـراوی ئیـسلامی کەمـە موسـڵمانان کەوتونەتـە خۆیـان کـە لـەتۆڕی ئینتـەرنێت دا بـەزمانی سـویدی بابـەتی چاك دابـەزێنن , تابتوانن ئەو کەلێنە پڕبکەنەوە , بەتایبەت کەماوەیـەك لەمەوبـەر (٥٠٠)سـویدی موسڵمان بوون ...ل ۳٦۲ المعجزە .

## ئیسلام لەکۆریا

پڕۆفیـسۆر (جـەمیل هیـسولی)لەگـەڵ کۆمـەڵێ زانـای تـردا پـەڕاوێکیان هەیـە بـەزمانی کـۆری بۆناسـاندنی ئیـسلام , کەچـی کۆریـەکان زۆر گرنگیـان پـێ نـەدا تاکارەسـاتی ۱۱ی سێپتەمبەر ,کەئەم ڕووداوە وای لێکردن بکەونە بەدەستهێنان و خوێندنەوەی ئـەو کتێبـە بۆ شارەزابوون لە ئیسلام و لەچەند هەفتەیەکدا سەدهەزار لەوکتێبە فرۆشرا .

پڕۆفیـسۆر جـەمیل هیـسولی دکتـۆرای لەسـاڵی ۱۹۸٦ دا هێنـاوەو نامـەی دکتۆراکـەی بریتـی بـوو لـە ( بڵاوبوونـەوەی ئیـسلام لـە (شـرق الاقـصی)دا بـەهۆی عوسـمانیەکانـەوە ) ولەتەمەنی (۲۲)ساڵیدا موسڵمان بوو لەکاتێکدا کـەقوتابی بـوو لەسـاڵی ۱۹۷٦ دا بـەهۆی ڕەوشت بەرزی مامۆستای ڕۆشنبیری ئیسلامیەوە کەناوی دکتور الخولی بوو ...

لەسەرەتاوە باوك و دایکی نارازی بوون ,چونکە خێزانێکی کاسۆلیکی بوون, ئەویش بە نەرمی تێیگەیاندن و پێی وتن (من لە بازنەی ئیمانەوە ناچمە بازنەی ئیلحادەوە , بەڵکو ڕێگەیەکی ترم گرتووە بۆ ئیمان)،ئەوانیش بەم (منطق)ە جوانەی دڵخۆش بوون.

ڕەوشتی جوان و ڕەفتاری شیرینی جەمیل وای لێکردن کەزیاتر بەڕێزەوە سەیری ئیسلام بکەن و پێی قایل بن ...

پرۆفیسۆر جەمیل دەڵێ : ١١ی سێپتەمبەر کاری کردە سەر حکومەتی کۆری و وای لێکردن کە لیژنەیەکی بەر فراوان پێك بهێنن بۆ دیراسەکردنی کارەساتی ١١ی سێپتەمبەر و ڕەنگدانەوەی لەسەر جیهان وهەروەها سندوقێکیشیان دروستکرد بۆ دیراسەی جیهانی ئیسلامی و کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەسەر کۆریا ...

لیژنەی ناوبراویش پاش لێکۆڵینەوەی زۆر داوایان لەحکومەتی کۆری کرد کە (منحەی ئەکادیمی)زیاتر بدات بۆ دیراسەی ئیسلام ... ل ٣٦٥.

## ئیسلام لە ئوستralیا

(ئەدوەی جیهانی لاوان) لەڕێگەی نوێنەری یەوە لە ئوسترالیا و خواروی باسیفیك ڕاپرسییەکی کرد لەگەڵ ئەوانەی موسڵمان بووبوون لەبارەی موسڵمان بوونیانەوە , هەموو یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە لە ئیسلامدا چارە سەری کێشەکانیان دۆزیوەتەوە .

یەکێ لەوئافرەتانەی موسڵمان بوو بوو بەناوی (أمة الله)وتی :لەپێش موسڵمان بوونمدا لەفەراغ دا دەژیام و , نەمدەزانی چیدەکەم و چی بکەم , کەموسڵمان بووم ئێستا تەواو بێ کاتم و فریای کارەکانم ناکەوم چ دینی و چ دنیایی ...

هەروەها خوشکێك بەناوی (مەی)وتی : لە ئیسلامدا ژیانی ڕاستەقینەم دۆزییەوە , کە ئەویش فەرمانبەری خواو نزیکبوونەوەیە لێی بەعیبادات و دوعاکردنی زۆر ، ئافرەتێکی تر بەناوی (کریمە)دەڵێ :ئیسلامم هەڵبژارد پاش دیراسەیەکی قووڵ لەڕێی ئینتەرنێتەوە , من لەژیانم دا پابەند بووم بەکەنیسەوە بەڵام هەمیشە دوودڵ بووم و. کۆمەڵە پرسیارێك هەبوو وەڵامم دەست نەدەکەوت , لەڕێی ئینتەرنێتەوە گفتوگۆی زۆرم کردو لەئیسلامدا وەڵامی پرسیارەکانم دەست کەوت لە هاوەڵێکی موسڵمان و موسڵمان بووم .

زۆر ئافرەتی تریش لەرێی شووکردن بەموسڵمان و ژیانی هاوسەرێتیەوە لەئیسلام تێگەیشتبوون وموسڵمان بوون ..

شایانی باسە ڕاگەیاندنی ناحەزان , لەناشرینکردنی ئیسلام و موسڵمانان بەربەستێکی گەورە یە لەرێی هاتنی خەڵکی ئوستڕالیادا بەرەو ئیسلام کەئەمەش ئەرکی زیاتر دەخاتە سەرشانی موسڵمانان کە زیاتر ڕۆڵی خۆیان ببینن بەهەمووهۆکارێکی گونجاو بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئیسلام و بەرپەرچ دانەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزان .

## موسڵمان بوونی یاریزانە ناودارەکان

یاریزانی جیهانی نیکولاس ئەنیلکا ی فەڕەنسی کە هێرش بەری یانەی مانشستری ئینگلیزی یە موسڵمان بوو, لە ڕەمەزانی (٢٠٠٢)ز داچوو بۆ عومرەو لەگەڵ ملیۆنەهاموسڵماندا تەراویحی کردولەچاوپێکەوتنێکدا وتی : بەهۆی عەدنانی هاوەڵمەوە کەخەڵکی سعودیەیە موسڵمان بووم , هەرچەند زۆرم لەبارەی ئیسلامیشەوە خوێندۆتەوەو سەردانی زۆری مەرکەزە ئیسلامیەکانی فەڕەنسام کردووە بۆزیاتر شارەزابوون لەئیسلام ..جوانی ئیسلام سەرمەستی کردبووم و نەم ئەوێرا ئەو بڕیارە بدەم وموسڵمانێتیم ئاشکرا بکەم ... کەموسڵمانیش بووم ئەوەندە سەرسام بووم بەکەسایەتی (بیلال)بۆیە ناوی خۆم گۆڕی بۆ (بیلال)...

لە (کینیا)ش یاریزانی جیهانی تۆپی پێ (کمارا)موسڵمان بوو ,هەرچەند تووشی زۆر ناڕەحەتی هات و ناچار بوو لەیانەی (ویست هام)ی ئینگلیزی وازبهێنی پاش ئەوەی کە هێرشی ئیعلامی زۆری کرایە سەر و بەمەش بەملیۆنەها دۆلار زیانی لێکەوت , ناوبراو لەساڵی (٢٠٠٢)زداچوو بۆ حەج تا لەنزیکەوە شاد بێت بەبینینی ماڵی خوا کەڕۆژی پێنج جار موسڵمانان ڕووی تێدەکەن ...

هەروەها یاریزانی بەناوبانگی بەرازیلی ( سیزار )خۆی و ژنەکەی لەسەردەستی ڕاهێنەرە تونسیەکەی دا موسڵمان بوو ... ل ٣٧٢ المعجزە.

### بانگخوازێك دووهەزارکەس زیاتر موسڵمان دەکات

(محمد عباس ندیم)مامۆستای زانکۆیە و پسپۆڕە لە نەخشەی شارو کێشەی ژینگەداوخەمی یەکەمی بانگەوازەو تائێستا لەسەر دەستیا زیاتر لەدوو هەزار کەس موسڵمان بوون ...

یەکێ لەوانەی موسڵمان بووە قەشەیەکی فەڕەنسی یە کە لەڕێی ئینتەرنێتەوە گفت و گۆی لەگەڵدا کردووە و سەرەنجام موسڵمان بووەو ناوی خۆی کردووە بە (عبدالرحمان)...

یەکێکی تریش کە ئەکتەرێکی تەلەفزیۆنی ئەمریکییە بەناوی (لیندکن) لەڕێی ئینتەرنێتەوە وە موسڵمان بووە لەکالیفۆرنیا و ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ (مصطفی)...

هەروەها کۆمەڵێك (صینی)یش کەهاتبوون بۆ (مدینە)لەسەر دەستیان موسڵمانبوون و، هەروەها زۆربەی ئەندامانی تیپی سێرکی ڕووسیش موسڵمان بوون لەسەر دەستیا کاتێك سەردانی کردن وباسی ئیسلامی بۆکردن , کە ژمارەیان حەڤدەکەس بوو , هەندێکیان عومرەیان کردوئنجا بەموسڵمانی گەڕانەوە وڵاتەکەی خۆیان . المعجزە٣٧٥ .

**موسڵمان بوونی ئەندازیارێکی سویسری**

ئەندازیاری سویسری (ریموشایی) تەمەن (٥٤)ساڵ موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند لە بەردەم موفتی وژمارەیەکی زۆر لە ئامادەبوان لەگۆڕەپانی مزگەوتی شاری کالیسیا لە بۆسنە , لەکاتێکداکە سەردانی بۆسنەی کرد , , شایانی باسە ئافرەتێکی بۆسنی موسڵمانی هێناوە بەناوی (فاطمە) وئیسلامەتی لەسەردەستیا فێربووە ...

(ریمو)دەڵێت : لە ئیسلامدا ونبووی خۆمم دۆزییەوە وتێگەیشتم لەتەفسیری ڕاستەقینەی بوونی ئینسان , کە لە دینەکانی تردا دەستم نەکەوت .

هەروەها وتی: لەنزیکترین فرسەتدا سەردانی شوێنە پیرۆزەکان دەکەین . ل المعجزە٣٧٦

**سەرۆکی ژووری بازرگانی لە پاریس موسڵمان دەبێت**

لەم یەك دووساڵەی دوایدا , سەرۆکی ژووری بازرگانی لەپاریس (بییر بونارد)موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندو ،هەروەها خاتوو (برین)لە بنەماڵەی دەسەڵاتداری فەڕەنسا موسڵمان بوو ناوی خۆی کرد بە (خەدیجە محجوب)و هەردوکیان چاویان بەئەمین عامی رابیتەی عالەمی ئیسلامی کەوت و یەکی قورئانێکی ڕاڤەکراوی فەڕەنسی بە دیاری دانێ و هانی دان لەسەر پابەندبوونی تەواو بەئیسلامەوە . ل ٣٧٩ المعجزە.

**موسڵمانبوونی حەوت بەندکراوی کرواتی**

پێش ئەوەی یاسای جەنگ و مافی مرۆڤ بێتە کایەوە بەزیاتر لەهەزار ساڵ ئیسلام ڕێزگرتنی دیلی هێنایە کایەوە , قورئان هەرزوو دای بەگوێی مرۆڤایەتیدا (ویطعمون

الطعام على حُبِّه مسكينا ويتمياً وأســيرا)(الانسان ٨)ئەمەش وای کرد کەزۆر لەوانەی بەدیل دەگیران لەلایەن موسڵمانانەوە پاش بینیی ڕەفتارو مامەڵەی جوانیان موسڵمان دەبوون ...

بەهەمان شێوەش حەوت کەس لەو کرواتیانەی کە گیرابوون ولە بەندیخانەی بۆسنەدا بوون , پاش تێگەیشتن لەڕەفتاری جوانی موسڵمانان و هەڵسوکەوتی بەرزیان , موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و وتیان: ئێمە کەس هیچ زۆرێکی لێ نەکردوین و بەڕەزامەندی خۆمان موسڵمان بووین و حەزیش ناکەین بگوێزرێینەوە بۆ بەندیخانەی ترو , بەڕاستی ئیسلام نوورەکەی بەردەوام دەبێت و دڵان گەش و ڕۆشن دەکاتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت. ل ٣٧٨ المعجزە.

### موسڵمان بوونی دکتۆرێك وئەندازیارێك لەیەمەن

دکتۆر لی خوان چینی یە و پسپۆڕە لەنەخۆشی یەکانی چاودا لەخەستە خانەی (القطن)کاردەکات لەشاری تریم لەحەزرەموت , پاش موسڵمانبوونی ناوی (سلێمان)ی بۆ خۆی هەڵبژارد وتی( بەڕاستی ئاینی هەق و مامەڵە و هەڵسو کەوتی ڕاستم لەئیسلامدا دۆزیەوە کەخوا فەرمانی پێداوە , کەدوورە لەزیادەڕەوی وتوندوتیژی).

هەروەها ئەندازیار (فونتشانوب سلونی)ی فلیپینی کە لەکۆمپانیای نەوتی (صقر)کاردەکات لەیەمەن لەساڵی (٢٠٠٢)دا موسڵمان بوو وناوی ئەحمەدی بۆخۆی هەڵبژارد ,پاش ئەوەی پەڕاوی (مفتاح الجنە)ی عەللامە الحبیب ئەحمەدی خوێندەوە بەزمانی ئینگلیزی ...

لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گۆڤاری (الضیاء)ی ئیسلامیدا وتی : من لە نائارامی وشپرزی دا دەژیام و ئێستا هەست دەکەم کە ونبووی خۆمم دۆزیوەتەوە لە بەرنامەیەکی ڕاست و دروست دا کە دڵنیام ژیانم ڕێکدەخات وئەم گەیەنێتە بەهەشت بە ئیزنی خوا . ل ٣٨١المعجزە.

### کۆمەڵێ هندۆس موسڵمان دەبن

لە مانگی حەوتی ساڵی (٢٠٠٢)دا لە ڕۆژئاوای پاکستان لەدێی (شاکار جارا) ئاهەنگێك ...کرا بە بۆنەی موسڵمان بوونی (٢٦)هندۆسەوە و (شێخ ئەنیس علی)فێری

شایەتمانی کردن و هندۆسە تازە موسڵمانەکان وتیان , پەنجا هندۆسی تریش بڕیاریان داوە دوای دوو هەفتەی تر ئەوانیش پێکەوە موسڵمان بن . ل ٣٨٢ المعجزە.

## ئیبراهامی ڕاستگۆ

گۆڤاری هەفتانەی (الأسرة الدينية الأسرائيلية)بلاوی کردەوە , کەدەنگ و باسێکی گەرم هەیە لەناو تایەفەی (الحرديم)دا کە لەجوولەکە توندڕەوەکانن کەپیاوێکی خواناس و پارێزکار لەماڵێك لەجوولەکەنیشنی (جوش ئیمونیم)پەیدا بووە لە (قودس), خەڵکەکە وتیان ڕەنگە ئەوە (مەسیح)بێت کە دنیا هەمووی چاوەڕێیەتی و لە (قودس)ەوە دا بەزیبێ , بۆیە خەڵکێکی زۆر بەیانیان لەدەوری ماڵەکەی کۆدەبوونەوە بۆ بەرەکەت و ئامۆژگاری و دوعای خێر ...

ئەو کەسەش ناوی (ئیبراهام)بوو , لەماڵ نەدەهاتە دەرەوەو گوێی پێ نەئەدان , خەڵکەکەش ناویان نا (ئیبراهامی ڕاستگۆ)...

پاش ماوەیەك خزمێکی لەبەردەرگا بەئامادەبووانی ڕاگەیاندا کە ئیبراهام چەند مانگێکە موسڵمان بووەو لەماڵەوە خەریکی خواپەرستی یە , کە بەڕاستی ئەمەش بووە جێی سەر سوڕمانی خەڵکی ...

ڕۆژنامەکە ئۆباڵی ئەم حاڵەتەی خستە گەردنی زانا جوولەکەکان کە نەیانتوانیوە فەراغی ڕۆحی خەڵکی جوولەکە پڕبکەنەوە بۆیە ئەوخەڵکە لێ یان دەچی بەرەو ئیسلام و خەڵکانێکی زۆریش لە دووریان لە ئاینەوە لەکۆمەڵگای جولەکەدا سەرگەرمی مەی و فەسادو تلیاك خواردنن ....

پاش بلاوکردنەوەی ئەم هەواڵە گۆڤارەکە پەیامنێرێکی خۆی نارد تاچاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەن , کەچی (ئیبراهام)لەترسی پیلانی جوولەکە ئەو جوولەکەنشینەی بەجێ هێشتبوو بۆ شوێنێکی نادیار ... ل ٣٨٥المعجزە .

شایانی باسە حاخامێکی جوولەکەی ئەمریکی کە ناوی یوسف کۆهێن ەولە توندڕەوەکانی کۆمەڵەی (شاس)ە , لەگەڕانی دا بەتۆڕی ئینتەرنێت دا, ڕێی دەکەوێ لەبانگخوازێکی ولاتانی کەنداو و پاش گفت و گۆیەکی زۆر لەسەر ئاین و فەلسەفە ,یوسف کۆهین موسڵمان بوو لەساڵی (٢٠٠١) داو ئەمەی بە (لونا)ی هاوسەری کەتەمەنی ٣٤ساڵە وت و ئەویش کەوتە دیراسەی ئیسلام و سەرەنجام موسڵمان بوو ... بەهۆی

موسڵمان بوونیانەوە دژایەتی گەورە کران لەلایەن جوولەکەوەو ئێستا ژیانێکی سادە دەژین لەشوقەیەکی پەڕپووت دا لە گەڕەکی موسڵمانەکاندا.

لەمەلەفێکی تایبەتیش دا کە گۆڤاری الوسط ئامادەی کردبوو , وە لەکەناڵی (الجزیرة)بەرنامەی (بین السطور)دا ئاماژەی پێکرا , هەواڵێك بڵاوکرایەوە لەبارەی (١٤٥)جوولەکەوە کە لەفەلەستین موسڵمان بوون لەساڵی (٢٠٠٢)زداو، شایانی باسە ئەو موسڵمانانە تووشی هەڕەشەو تەنگ پێهەڵچنینی زۆربوون لەلایەن دام و دەزگاکانی جوولەکەوە و , تەنانەت وەزارەتی ناوخۆی جوولەکە دان نانێ بە ئاینە تازەکەیاندا و توندڕەوەکانیش هەندێکیان دەفرێنن تاناچاریان بکەن کەپاشگەز ببنەوە , بەتایبەت ئەو ئافرەتانەی کەموسڵمان بوون ...

(یوسف خطاب)دەڵێ : بەلامەوە زۆر گرنگە کە وەزارەتی ناوخۆ بە موسڵمان تۆمارم بکات , چونکە من خەمی داهاتوومە ئەگەر مردم لە کوێ بنێژرێم ...

یەکێ لەو (١٤٥)کەسەی موسڵمان بوون لاوێکی تەمەن (٢٨)ساڵە کەپێی دەڵێن (سعید)و دانیشتووی خوارووی ئیسرائیلە , دەڵێ (هەرچەند دایکم زۆری پێناخۆش بوو موسڵمان بووم پاش ئەوەی هەواڵی موسڵمان بوونی (یوسف کوهین)م بیست , وەڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر وای لێکردم زیاتر بەدوای ئیسلامدا بگەڕێم ) .

لاوێکی جوولەکەی ڕووسیش بەناوی (غینادی یوغین)کەتەمەنی (٢٨)ساڵە لە ڕووسیاوە کۆچی کرد بۆ ئیسرائیل و دیارە حکومەتی ئیسرائیلی هەموو ئاسانکاری یەکیان بۆ کرد , بەڵام پاش تێپەڕبوونی چوار ساڵ , کۆمەڵێ لاوی موسڵمانی ناسی لەگوندی(شعب)سەربە (جلیل)ی ڕۆژئاوا .. پەیوەندیان پتەوبوو بەجۆرێك کە (غینادی)چوو لەو گوندەدا بژی لەگەڵ هاوەڵانی داو موسڵمان بوو ...

ئەمەش دەزگا بەرپرسەکانی جوولەکەی بێتاقەت کردو بەکۆمەڵێ تۆمەتی جۆراو جۆر (غینادی)یان گرت و کەوتنە لێپێچینەوە لەگەڵیدا . ل ٣٩٨ المعجزە.

## گەورە حاخامی داغستان موسڵمان دەبێت

پاش ١١ مانگ لەڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر گەورە حاخامی داغستان موسڵمان بوو , ئەمەش کێشەیەکی گەورەی نایەوە لەناو جوولەکەکانی داغستان دا , ئەمەش لەبەرئەوەی ئەمە دووەم حاخام بوو کەموسڵمان ببێت , بۆیە ناچار بوون حاخامێکی تر لەجوولەکەکانی مۆسکۆ بهێنن بۆ ناوچەکەیان .

ئەوەی سەیرە لەچیرۆکی موسڵمان بوونی ئەم حاخامەدا ئەوەیە کەئافرەتێکی موسڵمانی داغستانی قورئانێکی دایە کە بەزمانی خۆیان تەفسیر کرابوو , داواشی لێکرد کە لەگەڵ تەورات دا بەراوردی بکات , پاش ئەوەی حاخامەکەش دیراسەی قورئانەکەی کرد بەقەناعەتەوە موسڵمان بوو ...

لەوکاتەشەوە کە موسڵمان بوو بەردەوام ئامادەی مزگەوتی گەورەی داغستان دەبوو , هەرچەند هەموو جوولەکەکانی داغستان دەنگیان لێ دابڕی و دژایەتیان کرد , ناوبراوگوێی پێ نەدان و سوور بوو لەسەر ئیسلامەتی‌یەکەی ...

حاخامەکەی پێش ئەمیش لەساڵی ۱۹۹۹ زدا پاش گفت و گۆو دانوستانێکی زۆر بەدرێژایی دووساڵ لەگەڵ موسڵمانێك دا , گەیشتە قەناعەت و موسڵمان بوو , لەبەر هەڕەشەی زۆر و تەنگ پێهەڵچنینی زۆری جوولەکەکان گەڕایەوە (مۆسکۆ), چونکە کاتی خۆی لەوێوە هاتبوە داغستان , شایانی باسیشە کەجوولەکەکانی داغستان لەوەدان کە قڕببن چونکە ڕێژەی لەدایك بوونیان لەچاو مردنیان دا زۆر. ل المعجزە٤٠٠.

### هەزاران ئەفریقی موسڵمان دەبن

هەر لەساڵی (۲۰۰۲)دا لە ئثیوبیا (حەبەشە )شانزە هەزارکەس موسڵمان بوون کەهەموویان دانیشتوانی دێ یەك بوون لەسەردەستی بانگخوازەکانی کۆمەڵەی بانگەوازی ئیسلامی جیهانی .

لە (بنین)یش دێیەك هەموویان موسڵمان بوون لەگەڵ جێگری سەرۆکی پەرلەمان .. هەرلە(اثیوبیا)پەنجا گاور موسڵمان بوون لەنوسینگەی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیا ,هەروەها لەتشاد (۲۹۰۰)کەس موسڵمان بوون و بنکەی ئیسلامی (عمر المختار)یان بۆ دامەزراندن لەچەند شارێکدا تا فێری ئیسلامیان بکات .. ل ٤٠١ المعجزە.

### سەرۆکی هۆزی ئوراماو هۆزەکەی هەموو موسڵمان بوون

(دندوب ماندو هیسا)سەرۆکی هۆزی ئوراما کە لقێکن لەهۆزی (البورنا)کەنزیکەی ملیۆنێك دەبێت , موسڵمان بوو , پاش پانزە ڕۆژ لەموسڵمان بوونی چوو بۆ عومرەو زیارەتی مەدینەی پیرۆز لەسێپتەمبەری (۲۰۰۲)زدا . گۆڤاری (المستقبل الاسلامی)چاوپێکەوتنی لەگەڵ سازداو ناوبراو وتی :

کۆمەڵێ لەبانگخوازانی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیا سەردانیان کردم و باسی ئیسلامیان بۆ کردم و قەناعەتم لا دروست بوو کەموسڵمان ببم ...

کاتێ موسڵمان بووم خاوخێزانم کۆکردەوە و داوام لێکردن ئەوانیش موسڵمان بن , جاکەگەڕامەوە لەپێنج شەممەدا دەچمەوە ناوچەکەی خۆمان کەڕۆژی کۆبوونەوەیانە و لەناویاندا موسڵمانێتیم ڕادەگەیەنم و پشت بەخوا هەموو موسڵمان دەبن چونکە لای ئێمە هەموو هۆزێك دوای سەرۆکەکەی دەکەوێت .

لای ئێمە ئافرەتێکی ئەوروپی تەمەن (٧٥)ساڵ پانزە ساڵە کاردەکات بۆ مەسیحیەت نەیتوانی بەهێندەی موسڵمانەکان خەڵك بگۆڕێ کەتەنها سێ ڕۆژ مانەوە ..

ئیسلامەتی لای ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ(٥٠٠)ساڵ لەمەوبەر و باو باپیرانمان لەچوار دێر هۆنراوەدا هەرلەکۆنەوە ئامۆژگاریان کردوین دوای ئیسلام بکەوین و گوێ نەدەین بەمەسیحیەت ....

گاورە (بروتستانت)ەکان لاوو هەرزەکارەکانیان کۆدەکردەوە لەکەنیسەکەیانداو بەگۆرانی و سەماکردن کوڕوکچیان تێکەڵ دەکردو (مەی)یان دەرخوارد دەدان و ئیتر هەرچی فاحیشەش ڕووی بدایە ڕووی دەدا .. ئێمەش ڕقمان لێ یان بوو ,چونکە ئەوە پێچەوانەی داب و نەریتی هۆزەکەمان بوو ، ئەوان دەیان ویست سەرۆك هۆزەکان بەدیاری زۆر بکڕن و ڕایان کێشن بەلای خۆیاندا دیارە ئەمەشیان بۆنەچووە سەر .. ل ٤٠٩ المعجزە .

## موسڵمان بوونی سوڵتانی هۆزەکانی قولای تشاد

سوڵتانی هۆزەکانی قولای لەشاری دونامنجەی تەشادی موسڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند لەمانگی ڕەمەزانی (٢٠٠٣)دا , کەحەفتا هەزار شوێن کەوتووی هەیە یەکەم کەسە کەلەو هۆزەدا موسڵمان دەبێ و ناوی خۆی لە (موسنقار)ەوەکرد بە (محمد), هەروەها هاوکارەکەشی موسڵمان بوو ناوی خۆی گۆڕی بۆ (موسی)...ل ٤١١ المعجزە.

## موسڵمانانی خوارووی ئەفریقیا

لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەیەکی زۆر خەڵکی لەخوارووی ئەفریقیا لەپیاوان و لە ژنان ڕوویان کردۆتە ئیسلام , یەکێ لەوانە (عمر خامبول)ە کە دەڵێ : ئەوەی هێنامی بەرەو ئیسلام ئەوەیە کە ئیسلام یەك خوا دەپەرستێ و مایەی ڕزگاریە لەجەردەوتلیاك خۆرەکان , بەڕاستی ئیسلام موسڵمانان فێری ڕەفتاری جوان دەکات , بۆیە منیش سەرفرازبووم لەڕێی چەوت و ڕەفتاری بەدو دوورکەوتمەوە لەچەتەکانی تلیاك و ئێستا لەگەڵ موسڵماناندا ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبم لە مزگەوت ....

ئافرەتێکی تریش کەناوی (لیلی)یە دەڵێ (خەڵکی وا هەیە پێمان دەڵێن : هیندی ، چونکە ئیسلام بەئاینی هیندیەکان دەزانن ، کەئەمەش بەڕاستی قورس بوو لەسەرمان). (ئەمڕۆش نزیکەی دووهەزار ئافرەتی موسڵمانی بالاپۆش ڕوودەکەنە مزگەوت و خەڵکی زیاتر لەجاران لایان ئاسایی بووەو بەچاوێکی تر سەیر دەکەن ).ل٤١٧ المعجزە .

**خۆری ئیسلام هەڵدێ بەسەر ڕۆمانیادا !**

موفتی ڕۆمانیا (حاجی عثمان نەجاتی)لەچاوپێکەوتنێك دا لەگەڵ ڕۆژنامەی (المسلمون)دا جەختی کردەسەر ئەوەی کەخەڵکی ڕۆمانیا ئامادەییان تیایەو حەزدەکەن بەگوێگرتن لەباسی ئیسلام هەرچەندە هێشتا کاریگەری نیزامی کۆمۆنیستی پێشویان لەسەرماوە ...

لەگەڵ ئەوەشدا کەچالاکی یەکی گەورەی کەنیسە هەیە کەچی خەڵکی لەفەراغێکی ڕۆحی گەورەدا دەژین و بەشێوەیەکی ترسناك دەردەکۆمەڵایەتیەکانیان تیادا بڵاوە . ئامارەکان دەڵێن : کەحاڵاتی لەباربردن لەساڵی (١٩٨٩)دا گەیشتە ملیۆنێك و هەشت سەد هەزار حاڵەت و، بەڕەسمیش ڕاگەیاندرا لەساڵی ١٩٩٣ دا کەلەجیهاندا ڕۆمانیا لەهەموو وڵاتان زیاتر نەخۆشی ئایدز لەناو منالاندا بڵاوە ...

خۆری ئیسلام واهەڵدێ بەسەر ڕۆمانیادا و جاری واهەیە خیزانێك هەر هەموویان بەیەکەوە موسڵمان دەبن .. لەگەڵ ئەوەشدا کە پەڕاوی ئیسلامی بەزمانی ڕۆمانی زۆرکەمە ...

یەکێتی گشتی قوتابیە موسڵمانەکانی ڕۆمانیا کەیەکەم دەزگای ئیسلامی یە دامەزراوە ، توانی مانای قورئان بەزمانی ڕۆمانی بڵاوبکاتەوەو سێ بنکەی ئیسلامی بکاتەوە لەسێ شاردا و خەریکی خۆئامادەکردنیشن بۆ بیناکردنی گەورەترین بنکەی ئیسلامی لەڕۆمانیادا . ل ٤٤٩ المعجزە .

**یەکەم مزگەوت لە پایتەختی مەجەڕ**

لە ڕەمەزانی ساڵی ١٩٩٧ دا دروستکردنی یەکەم مزگەوت لەپایتەختی مەجەڕدا (بۆدابست)ڕاگەیەندرا ، کە دەبێتە بنکەیەکی ئیسلامی وسەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ڕۆشنبیری لەئەوروپای ڕۆژهەلات دا ...

شایانی باسە دوای ڕووخانی شیوعیەت نزیکەی سێ هەزار کەس موسڵمان بوون و ئەم ژمارەیەش ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لەزیادیە . ل ٤٤٩ المعجزە .

## گەڕانەوەی هیواو شادی بۆ موسڵمانانی هیمالایا

لەم بارودۆخە تازەیەی جیهاندا و بەدەرچوونی یاسای تازەی ئازادی ئاینی لە نیپاڵ لەشاخە گەردن کەشەکانی هیمالایا , ملیۆنێك موسڵمان هیواو شادی و ئازادیان بۆ گەڕایەوە , ئیتر دەتوانن بەئازادی خواپەرستی خۆیان بکەن و لەمزگەوتەکانیاندا سەربەست بن .

موسڵمانان بەهۆی حوکمی ( بوذ )ی یەکانەوە لەوپەڕی ناڕەحەتی و ناخۆشی دا بوون و لەهەموو بوارەکانی ژیان دوور دەخرانەوە , تەنانەت ڕێیان نەئەدرا کەحیزبێکی سیاسی بۆ خۆیان پێك بهێنن , لە کاتیکدا کەنیپاڵ دەوڵەتێکی پەرلەمانی یە ...

لەم یاسا تازەیەی ئەم دواییەدا ڕێ دراوە کە کۆنگرە ببەستن و دەزگاو ڕێکخراوی تایبەتی بۆ خۆیان پێك بهێنن کەئەمەش چاوەڕوانی دواڕۆژێکی گەشی لێ دەکرێت ...

## هەزار مزگەوت لە پاریس

لەئامارێکی ١٩٩٨ ز دا دەرکەوت کە سەد هەزار فەڕەنسی موسڵمان بوون و نزیکەی حەوت سەد کۆمەڵەی خێرخوازی ئیسلامی یارمەتی موسڵمان و غەیرە موسڵمان دەدەن و توانیویانە ژمارەیەکی زۆر خەڵك ڕزگاربکەن لەدەردی تلیاك و بەدڕەوشتی ...

هەروەها لەدەوروبەری پاریس نزیکەی سێ هەزار فەڕەنسی موسڵمان بوون , لەوانە (کلیمون توران)ە کە کوڕەزای ئەمینداری پێشووی حیزبی شیوعی فەڕەنسی یە و ناوی خۆی کردووە بە (عبدالرحمان), وە گۆرانی بێژی فەڕەنسی (دانیا یوسف)ە کەتوانی فیدراڵیەتی ئیسلامی فەڕەنسی دابمەزرێنێ و ڕۆژنامەیەکیش دەردەکات کەهەوڵ دەدات مافی موسڵمانان دەستە بەر بکات , ئەمە بێجگە لەوەی کە لەڕێی تەلەفزیۆن و سەتەلایت و مانگە دەست کردەکانەوە نوێژو بانگ و حەج دەچێتە ماڵە فەڕەنسیەکانەوەو بەمەش زیاتر دێن بەرەو ئیسلام ..

ئەمڕۆ ئیسلام لەفەڕەنسادا دووەم ئاینەو نزیکەی پێنج ملیۆن موسڵمان هەیە لەو وڵاتەداو , لەساڵی ١٩٧٦ دا مزگەوتەکان نزیکەی (١٤٠)مزگەوت بوون و لەپاش هەشت ساڵ لە ١٩٨٤ دا بوو بە (٥٨٠)مزگەوت و ئێستاش بووە بەنزیکەی هەزار مزگەوت , ئەمە بێجگە لە (٩٠٠) هۆڵ کە بۆنوێژ کردن بەکاردێن . ل٤٦٥ المعجزە.

## ئیسلام دوا بـــەرنــامەی خوایی یە

ئیسلام دوا بەرنامەیـەو دەبـێ بـەرەی ئادەمی تـەنها شـوێنی ئـەو بەرنامەیـە بکـەون و بێجگە لەئیسلام هیچ شتێکی تر لەکەس قبوڵ ناکرێت :

( وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْأِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِـي الْـآخِرَةِ مِـنَ الْخَاسِـرِينَ) (آل عمران:٨٥)ئیسلام گەورەترین نیعمەت و فەڕو بەرەکەتە کەخوا داویـتی بەموسڵمانان و کافرانیش ئەمە باش دەزانن بۆیە لەداخ و حەسەددا دژایەتی دەکەن :

﴿ مَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلا الْمُشْرِكِينَ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْكُمْ مِنْ خَيْرٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ (البقره:١٠٥) واتـە : كـافرانی خـاوەن پـەڕاوو هاوبـەش پەیداكـەرانیش حەزناكـەن كـە خێرتـان لـەخواوە بـۆ دابـەزێت , هەرچەند خوا خۆی خێر دەدات بەهەرکەس کەمەیلی لێبێت ...

ئنجـا حـەز نەکردنەکـە هەربەوەنـدەوە ناوەسـتێت و دەبێتـە کێـشمەکێش و تەنانـەت شەڕکردن بۆ دوورخستنەوەی موسڵمانان و خەڵکی لە ئیسلام : وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَداً مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَـيَّنَ لَهُـمُ الْحَـقُّ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (البقرة:١٠٩)

واتە : زۆر لەئەهلی کیتاب حەزدەکەن کەبتانگێڕنەوە بەرەو کوفر پاش موسڵمان بوونتـان , بـەهۆی ئـەو حەسـادەتەی هەیانـە بەرامبـەرتان پـاش ئـەوەی بـاش لەهـەق و ڕاسـتی تێگەیشتوون و چاك دەزانن کە ئیسلام هەقەو لەخواوەیە ...

دوژمنان هـەرگیز لێتـان ڕازی نـابن تاشوێنیان نەکـەون : وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّـذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا نَصِيرٍ (البقرة:١٢٠)

واتـە : هـەرگیز جوولەکـە و گـاور لێـت ڕازی نـابن تـاوەکو دوای میللـەت و دینیـان نەکـەویت , جائەگـەر دوای هـەواو ئارەزوویـان بکـەویت پـاش ئـەوەی کـەئاگادار کرایـت و زانیاریت بۆ هات , ئەوە لەخواوە دۆستایەتی وخۆشەویستی و سەرخستنت نابێت ...

دوژمنان كۆڵ نادەن و دەجەنگن , بەهەموو جۆرێكی جەنگ , سابەڵكو موسڵمانان لە دین وەرگێڕن : وَلا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ (البقرة:٢١٧) واتە: بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا لەدین وەرتانگێڕن ئەگەر بۆیان بكرێت , جارهەركەس لەئێوە پاشگەز ببێتەوە لەئاینەكەی و بەكافری بمرێت , ئائەوجۆرەكەسانە كارەكانیان پووچەڵ دەبێتەوە لەدنیاو لەقیامەت دا وئەوانە (أولئك اصحاب النار هم فيها خالدون)هاوەڵ و هاودەمی دۆزەخن و تیایا بەهەمیشەیی دەمێننەوە

ئەوئایەتانەی باسمان كرد گەورەترین موعجیزەن , ئەوەتاكافران كۆڵ نادەن و، پاش زیاتر لەچواردە سەدە بەئاشكرا دەبینین چۆن ناحەزان و نەیارانی ئەم بەرنامەیە شەوو ڕۆژ لەكاردان بۆ دژایەتی موسڵمانان ...( ئەگەر خوانەبێت كێ دەزانێت دوژمنایەتی كافران ئاوا بەردەوام دەبێت )

## ڕاپۆرتەكەی دكتۆر ولیەم

لەكۆتایی حەفتاكاندا , جامیعەی عەرەبی كۆمەڵێ كۆنفرانسی بەست بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ نەهێشتنی تاوان , لەدانیشتنەكاندا نوێنەری نەتەوەیەكگرووەكانیش ئامادە دەبوو كەناوی (دكتور ولیەم كلیفۆرد)بوو , ناوبراو بەڕێوەبەری زانستی تاوانە لە زانكۆیەكی ئوسترالی پاش تەواو بوونی كۆبوونەوەكان كەچەند ساڵێكی خایاند (ولیەم)ڕاپۆرتێكی بیست لاپەڕەیی نارد بۆ نەتەوەیەككرتووەكان و بۆئەو شوێنانەی كە دژی ئیسلام كاردەكەن

ناوبراو لە ڕاپۆرتەكەیدا دەڵێت (لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامی دا پەیوەندی یەكی لام سەرلایی هەیە بەئیسلامەوە كە هیچ ترسی نیەو , ئیسلام تەنها لەسەر ڕەفە دانراوە و كاری پێناكرێت , بەڵام وادەردەكەوێت كەبیرو بۆچوونێك وا لەخەیاڵی هەندێ لەدەسەڵاتداراندا , كە دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام و (چارەسەری كێشەكانیان بەئیسلام بكەن)...

بەڕاستی وادەردەكەوێت بانگەوازێك هەبێت بەنهێنی بۆ ئاوێتە بوونەوە لەگەڵ ئیسلام دا كە پێویستە ڕەچاوی ئەوە بكەین , ئەگەر هێزی ماددی نەوت و هێزی ئیسلام یەك بكەوێ و موسڵمانان هۆشیار ببنەوە , ئەوا شارستانیەتی ڕۆژئاوا لەمەترسیدا دەبێت

بۆیه (دکتۆر ولیهم)پێشنیاری کرد کەئەو ڕابوونه ئیسلامی یه ڕێی لێبگیرێت و ئاستەنگ بهێنرێته ڕێی ..

ئەم ڕاپۆرته که له (١٩٧٩)دا نێردرا پێشنیاری گرتنی بیره نەوتەکان دەکات لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە داوای ڕێگرتن دەکات لەگەڕانەوە بۆئیسلام کەئەم پیلانانەش بەردەوام کاری بۆ دەکرێت ... (بەرنامەی الجدید في اعجاز القران /د. البوطی)بۆئەمەش ڕێ لەبانگخوازان دەگیرێت و تەنگیان پێهەڵدەچنرێت , ئەوەتا لەمیسردا عەمر خالیدێك پەیدا بوو , هەرزوو لەوڵات ئاوارەیان کردو تەنگیان پێهەڵچنی کاتێك بۆیان دەرکەوت لەسەر خەڵکی بەگشتی و چینی لاوان بەتایبەتی کاریگەری هەیە ...

عەمر خالید لەپێشەکی پەڕاوی (اصلاح القلوب)دادەڵێت (لەسەرەتاوە لەمزگەوتی (الحصری)دەستمان پێکرد کەجێی دووسەد کەسێك دەبێتەوە , خوا کردی کەدەنگمان بگاتە هەزارەهاو نزیکەی پانزە هەزار کەس دەهاتن بۆ وتارەکانم ,ڕەنگە بڵێی چۆن جێ دەبۆوە ؟!!

لەدەوروبەری مزگەوتەکە پێشانگای فرۆشتنی سەیارە هەبوو , هەموو سەیارەکانیان پێنج شەممان دەبردە دەرەوە تاجێی خەڵکی ببێتەوە , هەروەها خاوەن چێشتخانەکان لافیتەیان هەڵدەواسی کەپێنج شەممان ڕۆژی پشووەو خواردن نافرۆشن تاخەڵکی بتوانن لەناو چێشتخانەکانیشدا دانیشن , تەنانەت خاوەن ماڵەکان و خاوەن شوققەکان دەرگایان دەخستە سەرپشت بۆهەرکەسێ بچێ دانیشێ و گوێ بگرێ لەبڵندگۆکان کەوتارەکەیان دەگەیاندە گوێی هەزاران ...

چەندەها لاوی خواناس ڕاخەریان بەسەرشان دەهێناو دەبردو دایان دەخست , چەندەها ئافرەت بەڕووی سوورەوە ئەو ناوەیان پاك دەکردەوەو ئامادەیان دەکرد بۆ کاتی وتارەکە , تەنانەت (یاسمین)ی کچی حوصەری کەلەتەمەندایە , وەك تەمەن بیست ساڵێك هەڵدەسوڕا, بەچاکی هەستت پێدەکرد کە دوای ئەجرو پاداشت و ڕەحمەتی خوا کەوتووە ...

ئەگەر دەپرسیت نهێنی ئەم سەرکەوتنە لەکوێدایە ؟! دەڵێم لە (ئیخلاص)دایە , ئیخلاصی هەموونەوانەی بەوکارە هەڵدەستان) ....

بەڵێ .. عەمر خالید زیاتر ناوبانگی بڵاوبۆوەو لەکەناڵی (اقرأ)ەوە وتارەکانی هەفتانە بڵاودەکرانەوە , فشارێکی زۆر خرایە سەر ئەوکەناڵەش کەرێی پێ نەدات و وتارەکانی بڵاونەکاتەوە ...

هەروەها شێخ (الحبیب الجفری)کەخەڵکی یەمەنەو ماوەیەك لەمیسر وتاری داو هەرئەوەندە زانیان خەڵکی سوودی لێدەبینن و بەرەو لای خوا دێنەوە هەربەشەو لەمیسر دەریان کرد !

بەڵام خوا باڵادەستەو چی بوێت ئەوە دەبێت (والله من ورائهم محیط)خواوەند چوار دەوری کارەکانیانی گرتووەو نایەڵێ لەسنووری دیاری کراو دەرچن و نایەڵێ مەرامیان و ئاواتیان بێتەدی , هەروەها : (والله غالب علی أمرهِ ولكنَّ اكثر الناس لا یعلمون)(یوسف: ٢١)خوای گەورە زاڵە بەسەر کارو فەرمانەکانی خۆی دا و چی بوێت دەیکات , هەرچەند زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستی یە نازانن .

دوژمنان هەمیشە لەخەمی ئەوەدان کەچۆن قورئان لەبەرچاوی موسڵمانان سووك بکەن تا هۆکاری بیرخستنەوەو هۆشیار کردنەوەیان لەدەست دەربێنن .. چونکە هەرکەس بەچاوی ئینسافەوە سەیری قورئان بکات دان ئەنێ بەوەدا کەقورئان موعجیزەیە ....

دکتۆر **بوطی** دەڵێ : ئەگەر پێت بڵێن جوتیارێك کەهەموو ژیانی جوتیاری بێت و لەسنووری دێکەی زیاتر نەچووبێت بەهیچ لایەکدا و هیچ زانست و زانیاریەکی وەرنەگرتبێت ,پەڕاوێکی نووسیوە باس لەزانستی ئەستێرەکان و زانستی پزیشکی و یاسای شەڕو ئاشتی و بواری ئابووری و .. هتد دەکات . چۆن بڕوا دەکەیت بتوانێ شتی وابکات ؟! هۆکەشی ئەوەیە کە بابەتەکان بڕواناکرێت کەسێکی ئاوا دوور لەزانست و زانین پەی پێ بەرێت ...

**قورئانی پیرۆزیش ئەگەر سەیری بابەتەکانی بکەیت** , بەهیچ جۆرێك لە توانای کەسێکی وەك حەزرەتدا نیە درودو سەلامی خوای لەسەر بێت . بۆ نموونە :

**<u>یەکەم / سەیری ئەم ئایەتە بکە</u>** : ﴿یَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْداً عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ إِنَّ فِي هَذَا لَبَلاغاً لِقَوْمٍ عَابِدِينَ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الانبیاء:١٠٧)

واتـە : ڕۆژێك دێـت ئێمـە ئاسمـان دەپێـچینەوە , وەکـو چۆن کتێبـی کـراوە دادەخرێـت و دەپێـچرێتەوە , هــەروەك چــۆن لەســەرەتاوە دروســتمان کــرد وەك ئەوســای خــۆی لێ دەکەینەوە , جائەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە , بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین .
سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەکتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمان داوە کە : بێگومـان بەنـدە شـیاوو چاکەکانم دەبنـە خـاوەنی زەوی , بەڕاسـتی ئالـەم باسـەدا مژدەو ئاگـاداری هەیە بۆ بەنـدە خواپەرست و چاکەکان ,ئەی (محمد)ئێمـە تۆمـان ڕەوانـە نـەکردووە تـەنها بۆئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆهەموو جیهان ..
جارێکی تر ئایەتەکە بخوێنەرەوە , ئاخر کێ دەتوانێ قسەی وابکات :
أ-ئێمە ئاسمانەکان دەپێچینەوە هەروەك پێچانەوەی کتێب .
ب- چۆن دروستمان کردوە لەسەرەتاوە وای لێ دەکەینەوە .
ج- ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە و ئێمە ئەنجامی دەدەین .
د- سوێند بەخوا ئێمە لە زەبووردا پاش تەورات بڕیارمانداوە کەبەنـدە چاك و شـیاوەکان دەبنە خاوەنی زەوی و باڵادەست دەبن ...
هـ- ئەمە بەلاغ و ئاگاداری یە بۆ بەندە خواپەرستەکان ...
و-ئەی (محمد)ئێمـە تۆمـان ڕەوانـە نـەکردووە تـەنیا بۆئـەوە نـەبێت کـە ببیتـە ڕەحمـەت بـۆ هەموو جیهان ... .
ئەگەر جوان لێی بکۆڵیتـەوە ئەمـە فەرمایشتێکی هـەروا سـادەو ئاسـان نیـە وترابـێ و تەواو .. نەخێر .. باسی پێچانەوەی ئاسمانەکان تازەترین و تەواوترین بیردۆزی زانستی یـە لـەبارەی کۆتـایی ئاسمانـەکان . چونکە زانایـان بەئاشـکرا فـراوان بـوونی بـەردەوامی ئاسمانەکانیان دۆزیوەتەوەو دەڵێن ئەم فراوان بوونـە بـەردەوام دەبێـت تائەگاتـە حاڵـەتێك کەئیتر لەوەزیاتر زیاد ناکات و دەچێتەوە یەك و وەك سەرەتای لێدێتەوە ...
هەروەها کێ دەزانێ سەرەتا ئاسمانەکان چۆن بووەو وەکو خۆی لێ دێتەوە پاشان کێ دەتـوانێ پـەیمانی وا گـەورە بـدات و بڵـێ پـەیمانمان دەبەینـە سـەرو زانسـتی سـەردەمیش دان بنێ بەو ڕاستیەدا !
ئنجا ئەو یاسا گرنگەی کە سەرەنجام بۆچاکانە , کـێ دەتـوانێ بێجگـە لـەخوا دەسـتی بـەو مەسـەلەیەوە بێـت و دنیـا بـەجۆرێك بگێـڕێ کەچاکەکاران و خواناسـان ببنـە (وارث)و جێنشین و دەسەڵاتداری سەرزەوی ...

دووەم/سەیری ئەم ئایەتە بکە کە دەفەرموێ: ﴿وإنْ تَتَوَلَّوا يَسْتَبْدِلْ قوماً غيرَكُمْ ثمَّ لايكونوا أمثالَكُمْ﴾ (٣٨محمد)

واتە: ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لەم ئاینە , خوا کەسانی چاکتر لەئێوە دەهێنێتە مەیدان , کە وەك ئێوە نابن و زیاتر خزمەت بەم ئاینە دەکەن .

ئەگەر باش سەیری ئەم ئایەتە بکەیت و لێی وردبیتەوە , ئەمە قسەی مرۆڤێکی چواردە سەدە لەمەوبەر نیە , کە بوێری شتێکی ئاوا بڵێت , کێ دەتوانێ ئاوابێ منەت بێت و , بڵێت فلان کەس , فلان گەل و میللەت , ئێوە ئەگەر مەشخەڵی ئەم بەرنامەیە هەڵنەگرن , کەسانی تر دێنم چاکتر لەئێوە مەشخەڵدارو سەرمەشق و پێشەوابن , ئنجا بەدرێژایی مێژووش ئەمە ڕاست دەرچێت و بڕوانە ڕۆژان و ساڵانی ڕابردوو ...

عەرەبی دانیشتووی مەککە نەیانکرد , خوا لەمەدینەوە خەڵکی هێناو بوونە پەروانەی دەوری چرای ئیمان و خواناسی !

کاتێ عەرەب نەیانتوانی و شایانی ئەو مەشخەڵداری یە نەبوون , خوا کوردێکی قارەمانی وەك سەلاحەدینی هێنایە مەیدان و قودسی پێ ڕزگار کرد تەنانەت سەلاحەدین خۆی دەیزانی کەخوا هەڵی گرتووە بۆ کارێکی گەورەو مەزن, بۆیە کاتێك لەشەڕی (الرملة)دا شکا , کاغەزێکی نارد بۆ خەلیفە لەبەغداو تیایا وتی : (لقد أشرفنا على الهلاك غير مرة وما أنجانا إلا الله لامْرٍ يُرِيدُهُ هو سُبحانه)واتە : بەڕاستی چەندەها جار هەق بوو تیا بچوومایە , خوا نەیهێشت تیا بچم بۆکارێك کەخۆی دەیەوێت و هێشتومێتیەوە بۆ شتێك کەخۆی دەیزانێت ..

ئەوەبوو خوا هێشتیەوە بۆ ڕزگارکردنی قودس و پاش نزیکەی ساڵێك لەڕزگارکردنی قودس کۆچی دوایی کرد!

ئاشکراشە کەچەند سەدە ئاڵای ئیسلامەتی چووە دەستی تورکەکانەوەو خەلافەتی عوسمانیان دامەزراند .. ئەوانیش بوونە پیاوە نەخۆشەکەو خوا لەوانیشی سەندەوە ...

ئێستاش ڕابوونی ئیسلامی سەرتاسەری جیهانی گرتۆتەوە , کەسانی غەیری عەرەب زۆر گەرمن لەسەر دینداری , تەنانەت دکتۆر سعید رمضان بوطی کەتەمەنێکی زۆری لەخزمەتی ئیسلام دا بەخت کردووە دەڵێت : ساڵی (٢٠٠٤)لەئەمریکاوە بانگکرام بۆ کۆنفرانسێك لە سان فرانسیسکۆ لەئەمریکا , لەلایەن موسڵمانە ئەمریکیەکانەوە ,

بەڕاستی ئەوەندە گورج و گۆڵ و خەمخۆر و گەرم بوون لەبانگەوازدا کەلەدڵی خۆم دا وتم : خۆزگە خوای گەورە یەك لەسەردەی هەوڵ و چاکەو کۆششی ئەوانی بۆمن بنووسیایە !

## موسڵمانبوونی ئافرەتێکی بەریتانی

هەروەها دکتۆر بوطی دەڵێت : لەم ساڵانەدا ئافرەتێکی ئینگلیز موسڵمان بوو هەر زوو هەوڵی دا لەگەڵ باوکی دا موسڵمانی کرد ,پاشان زۆر خەریك بوو لەگەڵ دایکیشیدا , تاگەیشتە ئەوەی کەدایکی نەخۆش کەوت لە خەستەخانەو لەگیانەڵادا بوو , ئەو ئافرەتە هەر کۆڵی نەئەداو دەیویست قەناعەتی پێبکات و شایەتمان بێنێت ...

لەوکات و ساتەدا کە دایکی پێیەکی لە دنیادایەو پێ یەکی لەقیامەت دایە لەوە دەچوو قەناعەتی کردبێت , خێرا کچەکە تەلەفونی کرد بۆ بنکەی ئیسلامی لە لەندەن کەخێرا دووکەس بنێرن تاشایەت بن لەسەر شایەتمانی دایکی و موسڵمان بوونی بۆ ئەوەی لە قەبرسانی موسڵمانان دا بنێژرێ , کەچی لەبنکەکە تەنها کارمەندێکی پاکستانی لێبوو ...هەرچۆنی بوو هات بۆلایان بۆ خەستەخانە , کە دێتە ژوورەوە کچەکە دەبینێ کە لە ژوورسەری دایکێتی و لەلای ڕاستیەوە دەمی لەگوێی نزیك کردۆتەوەو شایەتمانی فێر دەکات , کابراش دەچێتە لای چەپیەوە و دەمی نزیك دەکاتەوە لەگوێی و شایەتمانی پێ دەڵێت : پاش تۆزێك دایکەکە بەهەر حاڵێك دەبێت چاو هەڵدەبڕێ و بەدەنگێکی نزم دەڵێ : سەلامتان لێ بێ مەلائیکەتەکانی خوا , (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله), پاشان گیان دەسپێرێ ! هەرچەندە ئەمە شایەتمانی سەرە مەرگە , بەڵام (إن شاء الله)خوا بۆی نووسیوە ...بەڕاستی ئەمە بەڵگەیە کەخوا بەردەوام گەلانی تریش هیدایەت دەدات بەرەو ئەم ئاینەو پاشەڕۆژیش هەر بۆئیسلامە ...

**موسڵمان بوونی زیاتر لەسێ هەزار کەس لەسەردەستی ئافرەتێکی ئەمریکیدا** :بانگخوازی ئەمریکی (أمينة السُلَمي) باسی موسڵمانبوونی خۆی دەکات و دەڵێت : لە ڕۆژی ٢١ ی مایو ١٩٧٧ دا چووم بۆ زانکۆی (دنفر) لە کۆلۆرادۆ بۆئەوەی کە ماددەکانی فەسڵی خوێندنی تازە دیاری بکەم , سەرسام بووم کەبینیم لە کۆمپیوتەردا بەهەڵە ناوم لەوانەی (شانۆ)دا دەرچووە , بەناچاری و نابەدڵی چووم بۆ خوێندنی فەسڵێك لە شانۆ , ئەوەش کەزیاتر ڕقی هەستانم ئەوەبوو کە لە پۆلەکەدا قوتابیەکی عەرەبی موسڵمانم لەگەڵدا بوو, چونکە بیستبووم موسڵمانان ترسناکن !

لەبەرئەوە ، زۆر لەو قوتابیە doورە پەرێز دەبووم و لەولایەشەوە دانەئەنیشتم کەئەوی لێ دادەنیشت .. کەچی ڕۆژ بەڕۆژ هەستم بەڕەوشتی جوان و پاك وتەمیزی دەکردو وێنەکەی لەبەرچاوم دەگۆڕدرا ، پاش چەند مانگێك ئەو قوتابیەیە قورئانێکی دامێ کە بەزمانی ئینگلیزی ماناکانی لێکدرابۆوە .. کەوتمە خوێندنی قورئانەکەو هەموو ئەو وەڵامانەم دەست کەوت کە بەدوایدا وێڵ بووم ...

دواتر لەگەڵ دوو هاوڕێی تری دا هاتن بۆ ماڵمان و لەگەڵ من و مێردەکەمدا دانیشتن و قورئانیان بۆ دەخوێندم و بۆیان تەفسیر دەکردم .. پاشان نزیکەی پەنجا پرسیارێکم لێ کردو زۆر بەجوانی وەڵامی دامەوە ، هەرلەو دانیشتنەدا موسڵمان بووم و ئەویش هەفتانە سەری لێ دەداین و باسی ئیسلامی بۆ دەکردین ...

بەڕاستی ئەو ژنەی کەموسڵمان دەبێ لەکۆمەڵگای ئەمریکی دا لەوەزیفەکەیدا بەچاوێکی تر سەیری دەکەن و خراپ مامەڵەی دەکەن ، (کەچی لەگەڵ موسڵمانی تردا واناکەن و ڕێز لەڕاو بۆچوونی دەگرن ، بەڵام ئەمریکی یەك موسڵمان بێت بەتایبەت ئافرەت ئەوا مامەڵەیان دەگۆڕێ لەگەڵیا) ...

هەروەها ئەگەر مێردی هەبێت و موسڵمان نەبێت ئەوا ناچارە جیابێتەوە لێی چونکە ئەوە ئەمری خوایە کە نابێ ئافرەتی موسڵمان شووبکات بەپیاوی کافر ...

ئەمەش کێشەی منالی بۆ دروست دەکات چونکە باوکەکە نایەڵێ چاوی بەمناڵەکانی بکەوێ و دژایەتی دەکات ..

پاش ماوەیەك کە زیاتر لە ئیسلام تێگەیشتم خۆم داپۆشی و داوام لەمێردەکەم کرد کە ئەگەر موسڵمان نەبێ جیادەبینەوە ، دیارە ئەویش موسڵمان نەبوو ، واشی دەزانی کەمن دەمەوێ شوو بەیەکێکی تر بکەم کە لە ڕاستیش دا وانەبوو ، من هیچ کێشەم لەگەڵیدا نەبوو ، تەنها مەسەلەی ئیمان نەبێت ..

هەرچۆنی بوو جیابووینەوەو پێنج ساڵ نەیهێشت کوڕە بچوکەکەم ببینم کەتەمەنی سێ ساڵ بوو ، لەسایەی خواوە دانم بەخۆمدا گرت و ئامادەبووم دەست لەهەموو شتێ هەڵگرم لەبەر ئاینەکەم .

بەڕاستی تەنها ئیسلامە کە هەقی ئافرەتی بەتەواوەتی داوەو هەرکەس بەویژدانەوە سەیری ئیسلام بکات هەست بەم ڕاستیەیە دەکات ...

له وتارێکدا له زانکۆیەکی واشنتۆن کەیەکێتی قوتابیانی موسڵمان ڕێکیان خستبوو , (امینه)باسی ئیسلام و ئازاد کردنی ئافرەتانی کرد و تیشکی خسته سەر هەڵبژاردنی مێردو میرات و یەکسانی و تەڵاق و هێنانی زیاتر لەیەك ژن و زۆر بەجوانی هەموو لایەنەکانی ڕوون کردەوە , ناوبراو وتی ( ئیسلام یەکەم بزوتنەوەیە کە هەوڵی ڕزگار کردنی ئافرەتانی داوەو داکۆکی کردووە لەمافەکانی پێش زیاتر لەهەزار و چوارسەد ساڵ .

هەروەها باسی ئەو هەوڵانەی ڕۆژ ئاوای کرد لەبارە ئازاد کردنی ئافرەتانەوەو وتی : ئەو هەوڵانە کە لەژێر پەردەی ئازادکردن و دەستەبەرکردنی مافەکانی ئافرەت دا دەدرێن , ئافرەتیان ئاسوودە نەکردووە , بەڵکو بە پێچەوانەوە نەگبەتی و ناڕەحەتی ئافرەتیان زیاد کردووە ...

لەبارەی.باڵاپۆشیشەوە وتی : حیجاب نیشانەی ڕێزو داوێن پاکی و شانازی یە لە ئیسلام دا و هەرگیز نیشانەی چەوساندنەوەو زۆر لێکردن نیە ) ...

لەپاش شانزە ساڵ واتە لە ساڵی ١٩٩٣ دا مێردی (امینه)موسڵمان بوو کە لێیان پرسی بۆچی موسڵمان بووی وتی , چۆن موسڵمان نەبم , لەکاتێکدا شانزە ساڵە (ئەمینە)دامەزراوە لەسەر ئاینەکەی و نموونەی ڕەوشت بەرزی و داوێن پاکی‌یە ...

لەیەکێ لە کۆنفرانسەکانی موسڵمانان دا لە ئەمریکا کوڕی ئەمینە کە تەمەنی بۆتە نۆزدە ساڵ شایەتمانی هێناو موسڵمان بوو , ئەمەش وای لە ئامادەبوان کرد کە هەموو بەیەك دەنگ بڵێن (الله اكبر)..

شایانی باسە (امینه)لەسەرتاسەری ئەمریکادا خەریکی بانگەوازەو شەوو ڕۆژی خستۆتە سەریەك وسەرۆکی(یەکێتی جیهانیئافرەتانی موسڵمان) لقیئەمریکای باکورە.

لێیان پرسی چەند کەس لەسەردەستا موسڵمان بوون, وتی : بەڕاستی نازانم ژمارەیان چەندە , بەڵام تائێستا سێ هەزار نامەم پێگەیشتووە لەوانەوە کەلەسایەی خواوە بەهۆی منەوە موسڵمان بوون ... ل ٥٧٩ / المعجزه .

## موسوڵمانبوونی قەشەیەکی هۆڵەندی

قەشەیەکی هۆڵەندی موسڵمان بووەو دەڵێت (من سەرپەرشتیاری کۆمەڵایەتی بووم لەکانێکی خەڵوزدا کەمەغریبەکان کاریان تیا دەکرد , ڕۆژێك هەندێکیان بوورا بوونەوەو

بـران بـۆلای پزیـشك , كەهاتنـەوە هـۆش خۆیـان , ڕازی نـەبوون هـیچ بخـۆن و بخۆنـەوە, لەبەرئەوەی بەڕۆژوو بوون, ئەمەوای لێكردم دیراسەی ئیسلام بكەم ..

پـاش چـەند سـاڵێكیش لـەمانگی ڕەمەزانـدا چـووم بـۆ میـسر و عـادەتی خـەڵكی وایـە كەلەسـەر شـەقامەكانیش بـەربانگ دادەنـێن وبەڕاسـتی زۆر ڕێزیـان لێ دەگـرتم و بـەلای هەركەسـدا دەڕۆیـشتم زۆر بەخۆشـی یـەوە بـانگی دەكـردم بـۆ بـەربانگ هەرچـەند نەشـیان دەناسیم , بەڕاستی ئەم مامەڵەو ڕەفتارە جوانە وای لێكردم كەموسڵمان ببم )...

## ئاینێك ئاوابێت هەقە ڕێزی لێبگیرێت

یەكێكی تریش كە موسڵمان بووە دەڵێت (كۆچم كرد بۆ خوارووی ئەفریقیا و , ڕەش پێستێك بووە هاوەڵم , زۆر توڕەو كەلەشەق و سەرخۆش بوو , پاش ئەوەی چەند سـاڵێك لـێ دابڕاین , بینیمـەوە تـەواو گـۆڕدراوە , لەسـەرخۆ , نـەرم و نیـان , ڕەوشـت بـەرز, كـە لـەهۆكاری گـۆڕانیم پرسـی زانـیم موسـڵمان بـووە , بەڕاسـتی ئەبلـەق بـووم كەئـەو گۆڕانـە مەزنـەم بینـی لـەژیانی دا , بۆیـە وتم : بەڕاستی بیرو ڕایـەك ئەوەنـدە بـەهێز بێت بتوانێت ئاوا كەسێك بگۆڕێت ,شایانی ئەوەیە ڕێزی لێبگرێت ,ئەمەش وای لێكردم موسڵمان ببم ) ل ٣٥٥ المعجزه. ..

<u>سێ یەم / سەیری ئەم ئایەتە بكە</u> :- ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُمْ بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ أَلا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَاءِ رَبِّهِمْ أَلا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطٌ﴾ (فصلت:٥٤)

واتە: ئەی پێغەمبەر (ص)پێیان بڵێ : باشە , ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت , پاشـان ئێـوەش بڕواتـان پێـی نـەبێت , دەزانـن چ سـەرەنجامێكی سـامناك چـاوەڕێتانە ؟ جائیتر كێ هەیە سەرسەختو نەگبەتتر لەوەی كەڕێگەی جیاو دوور لەڕاستیگرتبێتە بەر. ئێمـە لـە ئاینـدەدا بەڵگـەو نیـشانەی سـەر سـوڕهێنەریان نیـشان دەدەیـن لەئاسـۆكانی بوونەوەرداو لەخودی خۆشیاندا , ئەمەش بۆئەوەی چاك بۆیـان ڕوون بێت و دڵنیا بـن كـە ئەو زاتە هەقە , ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیە كە بێگومان ئاگادارو زانایە بەهـەموو شتێك ؟!

لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەیەدا ئەوانە هەر گومانیان هەیە لەبەیەکگەیشتنەوەو ئامادەبوونی بەردەم پەروەردگاریان , ئاگاداربەو دڵنیابە کەخوا ئاگادارەو زانایە بەهەموو شتێك و هیچی لێ ون نابێت و هیچ لەدەستی دەرناچێت .

جارێکی تر سەیری ئەو ئایەتە بکەرەوە , ئەگەر خوا نەبێ کێ زەمانەتی داهاتوو دەکات کە بەردەوام بەڵگەو نیشانەکان دەربکەون ...

## بەڵگەو نیشانەکان زۆرن

ئەمڕۆ لێکۆڵینەوەوە و تاقی کردنەوە لەسەر هەرشتێ دەست بیگاتێ دەکرێت وبەمەش زیاتر موعجیزەی ئیسلام دەردەکەوێت... بۆنموونە :

**یەکەم/** لەسالآنی پەنجاکاندا بەریتانیا ئەفسەرێکیان فێری عەرەبی کرد بەحەوت ساڵ و ناردیان لەڕێی مەغریبەوە وەك حاجیەیەك کە بچێتە میسر و پاشان بۆ مەککەی پیرۆز , ئەمەش بۆئەوەی پارچەیەك لە بەردە ڕەشەکە بکاتەوە تاتاقی کردنەوەی لەسەر بکەن , بەهەرحاڵ کابرا کە ناوی (ریچارد)ە , فرسەت دێنێ و پارچەیەك لەبەردە ڕەشەکە دەکاتەوە لەکاتێکی چۆڵی داو دەیباتە سەفارەتی بەریتانیا و ئەوشەوە لە خۆشیدا ئاهەنگ دەگێڕن , پاشان بەخێرایی دەگەڕێتەوە بەریتانیا و لەمەتحەفی بەریتانی فەحسی بەردەکە دەکرێ لەلایەن پرۆفیسۆر (ڕید) ەوە ...

سەرەنجام ڕایدەگەیەنن کە ئەو بەردە بەردی سەر ئەم زەوی یە نیە , کەئەم ئەنجامە بە ریچارد دەڵێن یەکسەر دەبورێتەوە ! پاشان ناوبراو ئەمەی لە پەڕاوێکدا بەناوی (گەشتێك بۆمەککە)لەدوو بەرگدا تۆمار دەکات ...

کەبەڕاستی ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە و بەڵگەو نیشانەیەکی دیارو ئاشکرایە ...

**دووەم/** (دکتۆر عبدالباسط محمد السید) کە زانایەکی میسری پسپۆڕە لەبواری پزیشکی و (طب النبوی)دا لەبەرنامەی (ساعة حوار)ی کەناڵی (المجد)دا لەم شەوانەی مانگی یەکی ساڵی (٢٠٠٥)دا ڕایگەیاند کە (دکتۆر کارنەر) لەمەتحەفی بەریتانی پارچەیەکی بچوکی بەردە ڕەشەکەی وەرگرتووەو تاقیکردنەوەی لەسەر کردووە و پاشان ڕایگەیاندووە کە ئەم بەردە وەك (أشباه الموصلات) یێك وێنەی نیە لە سەر زەوی و لە (کۆمەڵەی خۆریش)دا چونکە دەتوانرێ دوو ملیۆن خەتی تەلەفۆنی لێ ببەسترێ ...

**سێ یەم** /ئاشکرایە کە لە فەرموودەدا باس لەئاوی زەمزەم کراوە کەئاوێکە خوا بەتایبەت هەڵی قوڵاندووە بۆ ڕزگارکردنی هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کوڕی و ئەم ئاوە بۆ هەرمەبەستێك بخورێتەوە بەسوودە ...

لێکۆڵینەوەی زۆریش لەسەر ئاوی زەمزەم کراوە , یەکێ لەو لێکۆڵینەوانە ئەوەبوو کە (د. عبدالباسط)لەهەمان بەرنامەدا باسی کرد کە نزیکەی سەد ئافرەتی دووگیان کە ئاوی دەوری کۆرپەلەی سکیان کەم بوو , خستیاننە بەر لێکۆڵینەوە بەوەی کە بۆماوەیەك ئاوی زەمزەمیان دانێ , سەرەنجام بۆیان دەرکەوت کەئەو ئاوەی دەوری کۆرپەلەیان دروست بۆتەوەو بۆیان بۆتە (شیفا)... ئەمەش سێ ساڵ دووبارە کرایەوە لەگەڵ ئافرەتانی دووگیانی تردا و هەمان سەرەنجامی دا بەدەستەوە , کەئەمەش ڕاستی فەرموودەکانی سەلماند ...

**چوارەم** / (ڕۆبەرت کانزی)زانایەکی پسپۆڕە و دەڵێت : هەرکەسێك بهێنی بەئامێری تایبەت فەحسی بکەی دەبینی ڕووناکییەك بەدەوری لەشیا هەیە کەپێی دەوترێت (الجسم الاثیری), جائەو ڕووناکییە لەکاتی تاواندا ڕەنگێکەو لەکاتی خوا پەرستی دا ڕەنگێکی ترەو لەکاتی نەخۆشی دا لاوازەو لەکاتی ساغی دا بەهێزە ...

ڕۆبەرت کانزی تاقیکردنەوەی کرد لەسەر زۆرکەس لەئەوروپا بۆی دەرکەوت ڕەنگەکان وەك پێویست نین و شێواوییەکی تیایە , کەچی موسڵمانێکی فەحس کرد بینی ڕەنگەکان هاوسەنگی و ڕێك و پێکی تیایە , تەنانەت لەکاتی دەستنوێژدا زۆر زیاتر بەرەو سپێتی دەچێ و زیاتر هێمنی و دڵنیایی و پاکێتی لەکەسەکە و ڕەنگەکەی دا دەردەکەوێ ...

پاشان دکتۆر ڕۆبەرت لەسەر سی و حەوت کەس تاقیکردنەوەی کرد لەمەککە پێش ئەوەی عومرە بکەن , بۆی دەرکەوت , هەندێکیان ڕەنگی ڕووناکییەکەی دەوری لەشیان قاوەیی تۆخەو هەندێکی تریان ڕەش و هەریەکی بەجۆرێك ... پاش عومرە کردن فەحسی کردنەوە ڕەنگی ڕووناکییەکەی دەوری لەشیان هەمو بوو بەسپی ...کەبەمەش سەلماندی تاکوێ عومرە ڕۆڵی خۆی هەیە لەپاك بوونەوەی ماددی و مەعنەوی دا !

**پێنجەم** / ئەگەر سەیری فەرموودەکانی حەزرەتیش بکەین دروودی خوای لەسەر بێت ئەوا بەئاشکرا پێغەمبەرێتی حەزرەتمان بۆ دەردەکەوێت ...

لەسەردەمی حەزرەت (ص), فارسەکان دەسەلاَتداربوون وهەموو حسابێکیان بۆ دەکرا , تەنانەت کە (بنی الشیبان) هاتنە لای حەزرەت و بانگی کردن بۆ ئیسلام و سەرخستنی ئەم پەیامە وتیان : ئێمە ناتوانین شەڕ لەگەلْ فارس دا بکەین , چونکە هاوپەیمانین لەگەڵیاندا . حەزرەتیش (ص)کەبینی شەرت وشروتیان هەیە لەموسڵمان بووندا , فەرمووی ئێوە هەقی خۆتانە , بەلاَم ئەم ئاینە کەسێك ناتوانێ سەر ببخات و پێی هەستێ مەگەر گشتگیر بێ و بەهەموو فەرمانەکانی هەستێت , (واتە : ناکرێ بەرامبەر هەندێ بجەنگیت و بەرامبەر هەندێکیش نەجەنگی)...

ئنجا حەزرەت فەرمووی (ئەگەر ماوەیەك چاوەڕێ بکەن دەبینن کەخوا موڵك و ماڵ و خاکیان دەدا بە ئێمە!!)

ئەگەر ئەوزاتە پێغەمبەر نەبێت , ئەم قسەیەی لەکوێ هێنا ؟!

کیسرایەك کە هەرچی بچوایە بۆلای لە دووری (١٥)مەترە وە لەخزمەتیا دەوەستاو پەڕۆی سپی دەبەست بەدەمیەوە نەوەکو هەناسەی لە دووریشەوە کار لەکیسرا بکات ... کێ لەوبڕوایەدا بوو لەسەردەستی موسڵماناندا شکت بخوا ! ئەوەتا (بنی الشیبان)هەرجورئەتیان بە خۆیان نەدا کە لە گەڵیاندا ڕووبەڕوو ببنەوە !

هەرواش دەرچوو کەحەزرەت (ص)فەرمووی و زۆری نەخایاند (مثنی کوری حارثە ی شەیبانی)بوو بەسەر لەشکری موسوڵمانان و , خواش فەتحەکەی لەسەردەستی ئەوا کرد ,ئەوەی کەجاران خۆی و هۆزەکەی لێ یان دەترسان و زاتی ئەوەیان نەدەکرد خۆیان بدەن لەقەرەیان ئەمڕۆ لایان ئاسان بوو , بەفەزڵی خوا پیرۆزی و سەرکەوتن بۆ بەرنامەکەی خوا بوو ! .

سەرچاوەکان:

١-الاسلام المعجزة المتجددة فی عصرنا /ابی عبدالرحمان صالحبن حلیس الشافعی
٢-بەرنامەی ساعة حوار کەناڵی المجد
٣-بەرنامەی الجدید فی اعجاز القران/د .محمد سعید رمضان البوطی
٤- دیوانی مەحوی / مامۆستا مەلا عبدالکریم المدرس
٥-ڕۆژنامەی یەکگرتوو

# ناوەرۆك

## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگارەو درووردو سەلامیش لەسەرگیانی پاکی حەزرەت(ص)و یارو یاوەران و شوێن کەوتوانی ...

حاڵی موسڵمانان لەم سەردەمەدا سەیرەو ژیانێکی نائاسایی نامۆ دەژین کە هەرگیز وانەژیاون لەسەدەکانی ڕابردوودا ..

موسڵمانان زۆریان لەئیسلام دوورکەوتوونەتەوە، هەریەکە و بەڕێژەیەك، هەندێکیان هەرلەئیسلام چوونەتە دەرەوەو هەندێکی تریشیان لە (إزدواجیەت)ێکی سەیرو سەمەرەدا دەژین ، ئیزدواجیەت لەفیکرو لەهەڵس وکەوت دا ،لەبڕوا و لە کردەوەدا ، کە بەڕاستی ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە کە گلەیی دەکات بەئاشکرا ودەفەرموێت :﴿یا أیها الذین أمنوا لم تقولون مالا تفعلون ، کَبُرَ مقتاً عند الله أن تقولوا مالا تفعلون﴾(الصف).واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆ شتێك دەڵێن کەخۆتان نایکەن و قسەو کردارتان یەك نیە ، خەشم و ڕقێکی گەورەیە لای خوا ئەوەی کە دەیڵێن و نایکەن .

ئالەمەوەحاڵەتێکی ناساغیو نەخۆشی لەناو نەوەی نوێی موسڵماناندا سەری هەڵداوە ، کەبەناو موسڵمانن و لەڕاستیش دا بەتەواوی پابەندی ئیسلام نین... ئەمەش ڕێ لەوە ناگرێ کەبڵێین موسڵمانی چاك لێرەو لەوێ هەیەو ڕابوونێکی ئیسلامیش سەری هەڵداوەو بەڕێوەیە ...

دوژمنانیش سەرکەوتووبوون لەوەدا کە ئیسلام دابڕن لەواقیعی ژیانی موسڵمانان و کەسانێك پەیدابوون کەبڵێن :ئیسلام کەلەپورێکە و بەکەڵکی ژیانی سەردەم نایەت و، ڕۆژئاوا بەوەپێش کەوتوون کە وازیان لە ئاین هێناوەو زۆری تر لەم قسانە کە ئەگەر وردبکرێنەوە خۆیان ناگرن لەبەر ڕاستیەکاندا ...

بەپیلانی دوژمنان خەلافەتی ئیسلامی ڕووخا و ئنجا هەر لەم سەدەیەدا چەند جەنگێکی گەورەش بەرپابوو کە سەرەنجام ئینگلیز و فەرەنسا و ئیسپانیا و هۆڵەنداو ڕوسیا و زۆر وڵاتی تر خاکی ئیسلامیان پارچە پارچە کردو خاکی فەلەستینیشیان دا بەجوولەکە ، کە بووە خۆرەو بەربۆتە خوێن و گۆشت و لاشەی موسڵمانان ..

موسـڵمانانیش لـەتاو گیـانی خۆیـان و بـەڕێنمایی دوژمنـان پـەنایان بـردە بـەر فیکری نەتەوایەتی و عەرەبچێتی و تورکچێتی ولاسایی کردنـەوەی ڕۆژئاوا بـە هیـوای ئـەوەی بـەرەو پـێش بچن کـە دیـارە ئەوانـەش هـەمووی خـەوو خـەیاڵێك بـوون و،پـاش چەندەها ساڵ ڕەنج و ماندوو بوون مایە پووچ دەرچوون...

ئـەم مایەپووچـیەش وای کـرد کـە زۆر لەموسـڵمانان بـێ هیـوا بـبن و بڵـێن ئـاخر زەمانـە و کـار لـە کـارترازاوەو کـەس هیـچی پێناکرێـت ، لەکاتێکـدا کـە قورئـان و فەرمایـشتەکانی پێغەمبـەر (ص )بـە دەیـان مـژدەیان تیایـە و بەئاشـکرا بەموسـڵمانان دەڵـێن کـە بـە هـەوڵ و کۆشـش و گەڕانـەوە بـۆ ئیـسلام سـەرفرازو سـەربەرزی دنیـا و قیامەت دەبن...

لەم سەدەیەدا چەندەها پەڕاو بڵاوکرانەوە بۆ چارەسەری ئەو بـێ هیـوایی و ڕەش بینیەیەو ، مژدەیان ئەدا بە موسڵمانان کەپاشە ڕۆژێکی گـەش چاوەڕێیانە و پاشەڕۆژ بـۆ ئیـسلامە ، وەك پـەڕاوی (المستقبل لهذا الـدین)ی مامۆسـتای شـەهید (سـەید قطب) و (المبـشّرات بانتـصار الاسـلام) ی دکتـۆر یوسـف القرچـاوی و (وعودالاسـلام) ی بیریـاری فەڕەنـسی موسـڵمان ڕۆجیـەگارودی و(الاسـلام کبـدیل)ی بیریـاری ئـەڵمانی موسـڵمان دکتۆر موراد هوفمان  و زۆری تریش .

بەڵێ .. قورئان و فەرمووده زۆر پەیمان و مژدەی تیایە بەداهاتوویەکی گەش بۆ ئیسلام ، ئەو وادەو پەیمانانەش زۆریان هاتوونەتە دی و ئەوەی ماویشە بێ گومان دێتە دی ..

## خوا پەیمانی خۆی دەباتەسەر

ئەمە ڕاستیەیەکەو قورئان زۆر جەختی دەکاتە سەر ، تابەتەواوی لەدڵ و بیروهۆشیموسڵمانانداجێگیر ببێت و لەواقیعی ژیانی ڕۆژانەشیاندا ڕەنگ بداتەوە ، بۆ نموونە دەفەرموێت :

١)﴿ولا يزالُ الذين كفروا تُصيبُهُم بما صَنَعُوا قارعةٌ أو تَحُلُّ قريباً من دارهِمْ حتّى يأتيَ وَعْدُ الله ، إنّ الله لا يُخْلِفُ الميعادَ﴾(الرعد: ٣١ ).. واتە : بەردەوام ئەوانەی کە بێباوەڕبوون بەڵای سەخت و ناخۆشیان تووش دەبێت بەهۆی ئەو کارو پیشەیەوە کە ئەنجامیان داوە ، یاخود ئەوبەڵا سەختانە لە نزیك ماڵەکانیانەوە دادەبەزێت و

سەرهەڵدەدات هەتا بەڵێنی خوا دێتە دی ، بەڕاستی خوا پەیمانی ناشکێنێت و دەیهێنێتە دی .

بەڵێ .. کافران چی دەکەن بابیکەن ، وەعدو پەیمانی خوایە ، سەرەنجام بۆ چاکەکارانەو تیاچوونیش بۆ خراپەکارانە ..بەڕاستی وەعدو پەیمانی خوا دێتەدی ئەمڕۆ بێت یان سبەی ، لە دنیادا بێت یان لە ئاخیرەت خۆ ئەوەتە لە دنیادا وازی لێ نەهێناون بەردەوام بەڵاو موسیبەت بۆ خۆیان و دەوروبەریان دەنێرێت سابەڵکو وریاببنەوەو بگەڕێنەوە ..

٢)﴿ويستعجلونك بالعذاب ولن يُخلِفَ الله وَعْدَهُ ، وإنَ يوماً عند ربِّكَ كألف سنةٍ مما تَعُدُّون ، وكأين من قريةٍ أمليْتُ لها وهي ظالِمة ثمَّ أخذْتُها وإلي المصير﴾(الحج:٤٨). واتە : خوانەناسان پەلەت لێدەکەن کە ئەو سزایە زوو بەخەیان پێ بگرێت،بێگومان هەرگیزخوا لە بەڵێنی خۆی لانادات و لەسەر داخوازیئەفامان پێش و دوای ناخات ، بەڕاستی ڕۆژێك لەلای خوای پەروەردگارت وەکو هەزار ساڵ وایە لەوەی کە دەیژمێرن .. واتە : مرۆڤ بەحسابی خۆی ئەگەر پەلەبکات ، ئەوە لەتەمەنی کورتی چەند ساڵەی خۆیەوە سەیر دەکات ، بۆیە ئارام ناگرێ و سەری دنیای لێ دێتەوە یەك ، بەڵام خوا (حليم) ەو بەئارامەو خاوەنی (ازل و أبد)ە وهەربووەو هەردەبێ ، هەزار ساڵی مرۆڤ لای خوا وەك ڕۆژێك و بگرە کەمتریشە ،خۆی دەزانێ چی دەکات ، هەرچییش بکات بەحسابەو حیکمەتی زۆری تیایە .. جا بابزانن ، کەچەندەها شارو شارۆچکە هەبوون کە من مۆڵەتم داون لەکاتێکدا کە دانیشتوانیشی ستەمکاربوون ، دوای ماوەیەك ، بەوئەجەلەی کە بۆم دانابوون لەناوم بردن ، سەرەنجام و گەڕانەوەش هەربۆلای منە ..

باشە کافرانی مەککە ، پاش سیانزە ساڵی پێغەمبەرایەتی ،خوا لە شەڕی بەدردا سزای بۆ نەناردن و حەفتا گەورەو دەسەڵاتداریان کە لە هیچ سڵیان نەدەکردەوە نەبوون بەپەندی زەمانەو گیانی خراپەکاریان بەدۆزەخ شادنەکرا ؟؟؟

کاتێ تانەو تەشەریان لەپێغەمبەر (ص)دەدا کە کوڕی نیە ودوا بڕاوە ، خوا نەیفەرمووئەوان دوابڕاون ؟﴿ إنا أعطيناك الكوثر ، فصل لربك وانحر ، إن شانئك هو الابتر ﴾ ... باشە کافران بەچ دەردێك چوون لە دنیادا زۆربەی ئەو کوڕانەش کە هەیانبوو شانازی یان پێوە دەکردن ، نەبوونە موسڵمان ، کەئەوەش هەر دوابڕاوی یە

بۆ باوکەکانیان چونکە لەڕێبازی ئەوان وازیان هێناو بوونە شوێنکەوتەو شاگردی محمد(ص)..کە ئاشکراشە بەوموسڵمانبوونەیان هاوسەرەکانی حەزرەت(ص)بوونە دایکیان و حەزرەتیش بۆخۆی بووە باوکێ مەعنەویان، نەك هەرباوك بەڵکو لەباوکیش زۆر زیاتر ،هەروەك ئایەتەکە دەفەرموێت بووە پێشترو خۆشەویستر لە نەفسی خۆشیان( النبی أولی بالمؤمنین من انفسهم وأزواجه أمهاتهم ) .. دەی کێ دوابڕاوە .. کێ ناوی زیاتر لەهەزار و چوارسەد ساڵە ماوەو ئێستاش لەڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات بەملیۆنەها کەس ناوی (محمد)و (ئەحمەد ) لە منالآنیان دەنێن و شانازیش بەو ناوەوە دەکەن !

٣)﴿ الم ، غُلِبَتِ الروم في أدنى الارض ، وهم مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سيغلِبون في بضع سنِين ، لله الأمر من قبل ومن بعد ،ويومئذ يَفْرَحُ المؤمنون بنصرالله ينصُرُ مَن يشاء ، وهوالعزيزالرحيم ، وعدَ الله لا يُخلِفُ اللهُ وعْدَهُ ولكن أكثر الناس لا يعلمون ﴾ الروم: ٤-٦

واتە:ئەلیف لام میم ، ڕۆمەکان تێکشکێنران بەدەستی فارسەکان ، لەنزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا ، بەڵام لە ئایندەدا نۆرەیان دێتەوە ، ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە ، لەچەند ساڵێکدا (٣تا٩)ساڵ ، هەموو کاروفرمانێك تەنها بە دەست خوایە ،لەوەوپێش و لەوەو دوایش لەهەمووکات و شوێنێکدا ، جائەو ڕۆژە موسڵمانان دڵخۆش دەبن بە سەرکەوتنی خوا ﴿کە موسڵمانان سەرکەوتن لەشەڕی بەدردا لەهەمان ئەو کاتەدا کە ڕۆمەکان سەرکەوتن بەسەر فارسەکاندا ﴾ ، هەرکەسێك یان هەر دەستەیەك ئەو زاتە بیەوێت ، سەری دەخات ، هەر ئەو خوایەش خاوەنی دەسەڵاتی بێ سنوورەو زۆریش میهرەبانە ، بێگومان ئەوە بەڵێنی خوایە ، خوا لە بەڵێنی خۆی لانادات ، هەرچەند زۆربەی خەڵکی عەقڵی لەچاویایەتی و لەهاتنەجێی وەعدی خوا تێناگات .. ئەوانە تەنها ڕوو کەشێکی کەم لەژیانیدنیادەزانن لەئاخیرەت بێ خەبەرو بێ ئاگان:﴿ يعلمون ظاهراً من الحياة الدنيا وهم عن الآخرة هم غافِلون﴾...

جابۆئەوەی لەو ڕاستی یە و لەئەجەلی خوا تێ بگەن ئەوە بیربکەنەوە :

﴿ أولَمْ يتفكروا في أنفسهم ، ماخلق الله السماوات والآرض وما بينهما إلا بالحق وأجلٍ مُسمًّى ، وإنّ كثيراً من الناس بلقاء ربهم لكافِرون﴾(الروم : ٨)واتە :ئەوە بیرێکیان

لەنەفسی خۆیان نەکردۆتەوە ، کەخوا ئاسمانەکان و زەوی و چی لەنێوانیاندایە دروستی نەکردووە بەهەق نەبێت و، هەرهەمووشیان ئەجەلی بۆ دیاری کردوون ، بەڕاستی زۆر لەخەڵکی بێباوەڕن بەقیامەت و گەیشتنەوە بەپەروەردگار .

٤) ﴿أفمن حقَّ عليه كلمةُ العذاب أفأنت تُنقذُ مَنْ في النار ، لكِن الذين اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَف مِن فوقِها غُرَف مَبْنية تجري من تَحْتِها الانهارُ وَعْدَ الله لايُخلِفُ الله الميعاد﴾(الزمر:٢٠)واتە: ئایا ئەوکەسەی کە بەهۆی خراپی وخوانەناسیەوە بڕیاری سزادانی درابێت ، ئایا تۆ دەتوانیت لەناو دۆزەخ ڕزگاری بکەی ؟! بەڵام ئەوانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسان و دیندار بوون کۆشك و تەلاری چەند نهۆم کە ژوورەکانی لەسەریەکن بۆیان ئامادەیە ، چەندەها ڕووبار بەژێرو بە بەردەم ئەو کۆشکانەداجاریە،ئەوەش بەڵێنیخوایە ، بێگومان خواش بەڵێنیخۆیدەباتەسەر .

٥) ﴿ربَّنا إنَّك جامِعُ الناس لِيَومٍ لا ريبَ فيه ، إنَ اللهَ لاَ يُخلِفُ الميعاد ﴾(آل عمران٩) واتە :پەروەردگارا بەڕاستی تۆ کۆکەرەوەی هەموو خەڵکیت لە ڕۆژێکدا کەهیچ گومانی تیانیە ، بێگومان خوا بەڵێنی خۆی دەباتە سەر .

## کێ لەخوا ڕاستگۆترە ؟!

خوای پەروەردگار هەموو فەرمایشتێکی ڕاست و دروستە و پەیمانی خۆی دەباتە سەر، (وعد الصدق )وەعدو پەیمانی ئەوەو لەقورئاندا جەخت دەکاتە سەری و دەفەرموێت :

١-﴿الله لا إله إلاهو لَيَجْمَعَنَّكم إلى يومِ القيامةِ لاريبَ فيه ، ومَنْ أصْدَقُ مِن اللهِ حديثاً﴾(النساء:٨٧) واتە: (الله)خوایەکە بێجگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە ، سوێند بەخوا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆتاندەکاتەوە کە هیچ گومانێکی تێدانیە ، جاکێ هەیە قسەی لەخوا ڕاستر بێت ؟.

٢-﴿والذين أمنوا وعَمِلوا الصالِحَاتِ سَنُدْ خِلُهُمْ جنَاتٍ تجرِي مِن تحتِها الانهارُ خالدين فيها أبداً ، وعْدَ الله حقاً ومَنْ أصْدَقُ مِن اللهِ قيلاً ﴾ (النساء:١٢٢).. واتە :ئەوانەش باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە،ئەوە لەمەودوا دەیانخەینە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کەچەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و بەبەردەم کۆشکەکانیدا

دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنەسەر ، ئەوە بەڵێنێکی نەگۆڕاوی خوایی یە ، جاکێ هەیە لەخوا ڕاستتر و دروستتر بەڵێنی خۆی بباتە سەر ؟!

٣- ﴿وقالوا الحمد للهِ الذي صَدَقَنا وَعْدَهُ وأَوْرَثَنا الارضَ نَتَبَوأُ مِنَ الجَنَّةِ حيثُ نشاء فنعم اجرُ العاملين﴾(الزمر:٧٤)واتە: کاتێ پارێزکاران دەچنە بەهەشتەوە دەڵێن : سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنی خۆی بۆمان بردەسەر و کردینی بە خاوەنی خاکی بە هەشت و لە هەرشوێنێك ولەهەرجێیەکدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر ، ئای چەند پاداشتی تێکۆشەران و خەباتکاران گەورەو چاك و بەنرخە.

٤- ﴿وما أرسلنا قبلك إلا رجالاً نوحي إليهم ، فسْئَلوا أَهْلَ الذِكْرَ إن كنتم لا تعلمون ، وما جَعَلْناهُمْ جَسَداً لا يأكلون الطعامَ وماكانوا خالِدين ، ثُمَّ صَدَقْناهُمُ الوعْدَ فأنجيناهُمْ وَمَنْ نشاءُ وأهلكنا المُسْرِفين﴾(الأنبياء: ٧-٩) . واتە: ئێمە پێش تۆ کەسانی ترمان ڕەوانە نەکردووە ، جگە لەپیاوانێك کە هەڵمانبژاردون و وەحی و نیگایان بۆ ڕەوانەدەکەین ، دەبپرسن لە خاوەنی کتێبەکانی پێشوو ئەگەر ئێوە ئەم ڕاستیانە نازانن،ئێمەوەنەبێت ئەوپێغەمبەرانەمان لەپەیکەرو لاشەیەك دروستکردبێت کەخواردن نەخۆن و ژیانی هەمیشەیشمان پێ نەبەخشیوون.. لەوەودوا بەڵێنی خۆمانمان بۆ بردوونەتەسەر ،جارزگارمان کردوون لەگەڵ ئەوانەداکەدەمانەوێت و باوەڕیان هێناوە ، سەرکەش و لەسنوور دەرچووەکانیشمان لەناو بردووە ..

## بەڵێنەکانی خوا هەقن

ئەم بوونەرە هەمووی ئەوەی زانراوەو ئەوەی نەزانراوە هی خوان ،بۆ یە خوای گەورە چیبوێت لەم بوونەوەرەدا دەیکات و هیچ شتێك نیەڕێگربێت، هەر بەڵێنێکی بوێت دەیباتە سەر ، قورئان دەفەرموێت :

١-﴿ ألا إنَّ للهِ مافي السماوات والارض ، ألا إنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ ولكنَّ أكثَرَهُمْ لا يعلمون ﴾(يونس : ٥٥) واتە : خەڵکینە ئاگاداربن و بیرتان نەچێت کە بەڕاستی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی بۆ خوایە ، ئاگاداربن کەبەڵێنی خوا ڕاست و دروستە ، هەرچەند زۆربەی خەڵکی لەم ڕاستیە بێئاگان و نایزانن .

٢-﴿ وأوحينا إلى أمِ موسى أن أرضِعيهِ ، فإذا خِفتِ عليه فألقيهِ في اليَمِّ ولا تخافي ولا تَحْزَني إنّا رادُّوهُ إليكِ وجاعِلوهُ مِن المُرسَلين ﴾(القصص٧)

**واته: ئێمه وه‌حیمان نارد بۆ دایكی موسا كه شیری بداتێ ، وه‌پێمان وت : ئه‌گه‌ر ترسایت له‌وه‌ی كه‌پێی بزانرێت فرێی بده‌ره ئاوی ڕووبای نیله‌وه ، نه‌بترسه له‌وه‌ی تووشی به‌لا ببێت ، نه‌خه‌فه‌تیشی بۆ بخۆ ، چونكه ئێمه به‌ڕاستی ده‌یگێڕینه‌وه بۆلات و له ئاینده‌شدا ده‌یكه‌ین به‌یه‌كێك له‌پێغه‌مبه‌ره په‌یامداره‌كان**

﴿ فالتَقَطَهُ آلُ فِرعون ليكونَ لَهُمْ عَدُوّاً وحَزَناً ، إنّ فِرعَونَ وهامانَ وجنودَهُما كانوا خاطئين﴾**ئه‌وسا ئیتر داروده‌سته‌ی فیرعه‌ون هه‌ڵیان گرته‌وه ، تاسه‌ره‌نجام ببێته دوژمن و خه‌فه‌ت بۆیان ، به‌ڕاستی فیرعه‌ون و هامان و سه‌ربازه‌كانیان گوناهكارو تاوانبارو هه‌ڵه‌بوون .** ﴿وقالتِ امرأتُ فِرعَونَ قُرَّتُ عينٍ لي ولكَ لا تَقتُلوهُ عسى أنْ يَنفَعَنا أو نَتَّخِذَهُ وَلَداً وهُمْ لا يَشْعُرُون﴾**كاتێك فیرعه‌ون موسای ساوای بینی فه‌رمانی كوشتنی ده‌ركرد،خێزانه‌كه‌ی نه‌یهێشت ووتی:هیوادارم ببێته‌مایه‌ی‌خۆشحاڵی و چاوڕوونی بۆ منیش و بۆتۆش ، مه‌یكوژن ، به‌ڵكو له‌ئاینده‌دا سوودمان پێبگه‌یه‌نێت ، یان ده‌یكه‌ینه كوڕی خۆمان ، ئه‌وان له‌م ته‌گبیرو ڕایه‌دا بوون به‌بێ ئه‌وه‌ی هه‌ست بكه‌ن و بزانن له‌سه‌رده‌ستی ئه‌و منداڵه‌دایه كۆتایی فیرعه‌ون ...**

﴿وأصبحَ فؤادُ أمِّ موسى فارغاً ، إنْ كادَتْ لتُبْدي بهِ لولا أنْ رَبَطْنا على قَلبِها لِتَكونَ مِن المؤمنين ، وقالت لأختِهِ قُصّيهِ فبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وهم لا يَشعُرون ﴾ **ئه‌وسا دایكی موسا هه‌ستی به‌بێتاقه‌تی و به‌بۆشایی یه‌كی زۆر كرد له دڵ و ده‌روونیدا ، به‌ڕاستی خه‌ریك بوو ڕازه‌كه بدركێنێ و كاره‌كه تێك بدات ، ئه‌گه‌ر ئێمه دڵمان دامه‌زراو نه‌كردایه تاله‌و كه‌سانه بێت كه بڕوایان به به‌ڵێنی خوا هه‌یه .. پاشان به‌خوشكه‌كه‌ی‌موسای وت : بڕۆ به‌شوێنیدا ، دوای تاوێك له كه‌نارێكه‌وه موسای به‌باوه‌شی ئافره‌تێكه‌وه بینی ، ئه‌وان نه‌یانزانی كه خوشكه‌كه‌ی چاودێری ده‌كات له دووره‌وه ..**

﴿وحَرَّمْنا عليه المَراضِعَ مِنْ قَبْلُ فقالت هل أدُلُّكُمْ على أهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلونَهُ لكم وَهُمْ لَهُ ناصِحون﴾**ئێمه پێشتر هه‌رچی ئافره‌تی شیرده‌ره له‌وومان حه‌رام كرد ، خوشكه‌كه‌ی**

بەمەی زانی ، هاتە پێشەوەو وتی :ئایا ناونیشانی ماڵێکتان پێ بڵێم کە ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکەن ، دڵسۆزو میهرەبانیش بن بۆی ...

﴿فرددناه إلى أمه كي تقر عينها ولا تحزن و لتعلم أن وعد الله حق ولكن أكثر هم لا يعلمون﴾(القصص:١٣)بەو شێوەیە گێڕامانەوە بۆلای دایکی تا دڵنیاو دڵئارام بێت و چاوی بەبینینی ئاسوودە بێت و ئیتر خەفەت نەخوات و لای ڕوون بێت کە بەڵێنی خوا هەق و ڕاستە ، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە نازانن و هەستی پێناکەن .

بەڵێ :ئەمە نموونەیەکی گەشە لەمێژووەوە کەخوا بۆ موسڵمانانی تۆمارکردووە لە قورئاندا ، تا لەڕوانگەی ئەو باسەوە جوانترو چاکتر لە بەڵێنی خوا تێبگەن کە بەڵێنەکانی هەمووی هەقن و ڕاستن .

## پەیمانی شەیتان نایەتەدی

لەقورئانی پیرۆزدا باسی پەیمانی شەیتان دەکات کە هەرگیز نایەتەدی و تەنها خەڵەتاندنەو هیچی تر ، قورئان دەفەرموێت :

١-﴿يعدهم ويمنيهم ومايعدهم الشيطان إلا غرورا﴾(النساء: ١٢٠) واتە:شەیتان بەڵێنیان دەداتێ و ئاوات و ئارەزوو دەڕازێنێتەوە بۆیان ، دیارە کە شەیتانیش هیچ بەڵێنێکیان پێنادات جگە لە فریودان وخەڵەتاندن نەبێت ..

٢-شەیتان لەئاخیرەتدا بەشوێن کەوتوانی دەڵێت:﴿وقال الشيطان لما قضي الامر إن الله وعدكم وعد الحق ووعدتكم فأخلفتكم﴾(ابراهيم:٢٢) واتە: کاتێك هەمووشت تەواو دەبێت و چاکەکاران دەچنە بەهەشت و خراپەکاران دەچنە دۆزەخ ، شەیتان بەدۆستانی خۆی دەڵێت :بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پێدابوون و منیش بەڵێنی دۆرو ناڕاستم پێدان و بەوەش سەرگەردانم کردن ...

٣- ﴿الشيطان يعدكم الفقر ويأمركم بالفحشاء ، والله يعدكم مغفرة منه وفضلا والله واسع عليم﴾(البقرە: ٢٦٨) واتە: کاتێ ئێوە لەماڵ و دارایتان دەبەخشن ، شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێدەدات و دەتانترسێنێت لەهەژاری و فەرمانتان پێدەدات بەگوناهو تاوان و خراپە و نەبەخشین ، خوای گەورەش بەڵێنی لێخۆش بوونێکی

تایبەتی خۆیتان پێدەدات لەگەڵ زۆری ڕۆزی و بەهرەی فراواندا و ، خوا فراوانگیرو زانایە ..

## گومانی دووڕووەکان بەرامبەر بەڵێنی پەروەردگار

کاتێک کافرانی قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان هاتنە سەرمەدینەو فشارێکی زۆریان خستە سەر شارو، لەپشت چاڵەکەوە مۆڵیان خوارد و ، هەوڵی هێرش هێنانیان بوو بۆسەر مەدینە ، ئالەو کاتەدا ئەوانەی دووڕو بوون و دڵیان نەخۆش بوو کەوتبوونە پڕوپاگەندەکردن و دڵ ساردکردنەوەی خەڵکی ، قورئان دەفەرموێت : ﴿یا أیها الذین امنوا اذکُرُوا نعمة الله علیکم إذ جاءَتکُمْ جنود فارسلنا علیهم ریحاً وجنوداً لم تَرَوها وکان الله بما تعملون بصیراً ، إذ جاءُوکُمْ مِنْ فوقِکُمْ ومِنْ أسفَلَ مِنکم وإذ زاغَتِ الابْصارُ وبَلَغَتِ القُلوبُ الحناجِرَ وتظنُّونَ باللهِ الظنونا ، هنالك أبْتُلِيَ المؤمِنونَ وزُلزِلوا زلزالاً شدیداً ، وإذ یقولُ المنافِقون والذین فی قلوبهم مَرَضٌ ماوَعَدَنا اللهُ ورَسولُهُ إلاّ غُروراً﴾(الأحزاب۹)

واتە :ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە کەخوای گەورە فریای ئیمانداران کەوت)، کاتێک سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان ، ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێزو سەربازانێکمان ناردە سەریان کە نەتاندەبینین ، خوای گەورە بینابوو بەهەوڵ و کۆششتان ، کاتێکیش دوژمنان لەسەروخوارتانەوە هاتنە سەرتان کاتێکیش چاوەکان ئەبڵەق بوون ، دڵەکان گەیشتبوونە گەروو ، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بەبەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسەرکەوتنی بڕواداران).

لەوێدا ئیمانداران تاقی کرانەوەو تووشی تەنگانەو سەختیەکی زۆر توندو بەهێز بوون و تووشی دڵەلەرزەیەکی زۆر سەخت کران .

کاتێکیش دووڕووەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی گومانی تیابوو دەیانووت : بەڵێنی خواو پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن نەبێ هیچی تر نەبوو ؟!

## بڕواداران و دڵنیایی بەرامبەر بەڵێنی خوا

قورئان لە بارەی هەڵوێستی بڕوادارە تەواوەکانەوە لەجەنگی خەندەق دا دەفەرموێت : ﴿ولمّا رَءا المؤمنون الاحزاب قالوا : هذا ماوعدَنا اللهُ ورَسُولُهُ وصَدَقَ اللهُ وَرَسُولُهُ ، ومازادَهُمْ إلاّ إیماناً وتسلیماً ، مِن المؤمنین رجال صَدَقُوا ماعاهَدوا اللهَ علیه ،

فَمِنْهُمْ مَنْ قضى نَحْبَهُ ومِنهم مَنْ يَنتظِرُ وما بَدَّلوا تبديلا﴾(الاحزاب٢٢-٢٣) واته :كاتێك بڕواداران ئەو هەموو دەستەو تاقمەیان بینی کەهاتبونە سەریان وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خواوپێغەمبەرەکەی بەڵێنیان پێداوین ، کەئاوا دژایەتی ئاینەکەی دەکرێت و کافران و دووڕووەکان نەخشەوپیلان دەکێشن بۆ ڕیشەکێشکردنی ، دیارە کەخواو پێغەمبەرەکەیڕاستیان فەرموو لە پێشهاتنیدا ، بێگومان ئەودژایەتیە باوەڕ و ملکەچی نەبێت هیچی تریبۆزیادنەکردن(واتە سوورتربوون لەسەرئیمان)...

پیاوانێکی زۆرهەن لەئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بەخوا ، ڕاستیان کرد ، لەسەری ژیان و پابەندبوون پێوەیولایان نەدا لێی، جاهەیانە پەیمانەکەی جێبەجێکردو مرد لەسەری ، هەشیانە چاوەڕوانە ، بەهیچ شێوەیەك نەگۆڕان و لاری ڕووی تێنەکردون ...

بەڕاستی ئەم دوو هەڵوێستە بەردەوام دووبارە ئەبێتەوە ، بڕوادارە ڕاستەکان دڵنیان لەوەیکەکێشمەکێشینێوان هەق وناهەق بەردەوامەوئەگەر بۆ ماوەیەکیش بەری خۆری ئیسلام بگیرێت ، ئەوە کاتیەو خۆری ئیسلام تاڕۆژی قیامەت ئاوا نابێت و خوای گەورەش دەیەوێ بڕواداران کاربکەن بەڕاستی بۆخواو سەرەنجامیش تەنها بەدەست خوایە کە بەڵێنی سەرکەوتنی داونەتێ ..

دووڕووەکانیش هەمیشە وان لە دوودڵی و ڕاڕاییداو گومانیان هەیەو گومانیش بۆ دەوروبەریان دروست دەکەن ، گوایە ئیسلام بەسەرچووەو جارێکی تر ناتوانێ ڕۆڵی خۆی لەژیاندا ببینێتەوە .

## بڕوادارو مژدەکانی قورئان

لە قورئانی پیرۆزدا چەندەها ئایەت مژدە ئەدەن بەبڕواداران ، بەئارامگران ، بەتێکۆشەران ، کەسەرکەوتووسەرفرازدەبن لەدنیاو قیامەتدا ، دیارە ئەمەش بەڵێن وپەیمانی خوایە بۆیان و بەڵێن وپەیمانی خواش بێگومان دێتەدی ... قورئان دەفەرموێت :

١-﴿إنَّ هذا القرأن يهدي للّتي هيَ أقْوَمُ ويُبَشّرُ المؤمنين الذين يعملون الصالحات أنَّ لهم أجراً كبيراً﴾(الأسراء٩) واته :بەڕاستی ئەم قورئانە هیدایەت بەخشە بۆ چاکترین ڕێگەو

ڕێباز وبەرنامە ، مژدەیش دەدات بەو ئیماندارانەی کە کاروکردەوە چاکەکان دەکەن ، بێگومان پاداشتی زۆرو بێ سنوور چاوەڕێیانە ..

٢-﴿ألا إنَّ أولياء اللهِ لا خوفٌ عليهم ولاهُمْ يَحْزَنون ، الذينَ امنوا وكانوا يَتَّقون ، لَهُمْ البُشرى في الحياة الدنيا وفي الآخرة ، لاتبديلَ لكلماتِ الله ، ذلك هو الفوزُ العظيم﴾(يونس ٦٤)واتە: ئاگاداربن کەبەڕاستی چاکان و خۆشەویستانی خوا ، نەترس ڕوویان تێدەکات لەسەرەمەرگ و ڕۆژی لێپرسینەوە داو ، نەغەم وپەژارەو دڵتەنگی دایان دەگرێت ، بەڵکو فریشتەکان بەڕووخۆشیەوە مژدەی سەرفرازی و خۆشنوودیان دەدەنێ ، ئەو بەختەوەرانە ئەو کەسانەن کە باوەڕی بەتین و دامەزراویان هێناوە بەپەروەردگار و پارێزکارن ، هەربۆئەوانە مژدەی کامەرانی و بەختەوەری لەدنیاو لەقیامەتدا ، بێگومان ئەو بەڵێنانەی خوا هەردێنەدی و هیچ گۆڕانێکیان بەسەردانایەت ، ئائەوەیە سەرفرازی و کامەرانی گەورەو مەزن .

٣-﴿ياأيها الذين امنوا هل أدُلُّكُمْ على تجارة تُنجيكم من عذاب أليم ، تُؤمِنون باللهِ وَرسُولِهِ وتُجاهِدون في سبيل الله بأموالِكم وأنفسِكُمْ ذالِكم خيرٌ لكم إن كنتم تعلمون ، يغفر لكم ذُنُوبَكُمْ ويُدخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تجري مِن تحتِها الانهار ومساكِنَ طَيِّبةً في جَنَّاتِ عَدْنٍ ذلك الفوز العظيم ، وأخرى تحبونها نصر من الله وفتح قريب وبشرِ المؤمنين ﴾ (الصف: ١٠-١٣).

واتە : ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ،دەستنیشانی بازرگانیەکتان بۆبکەم ،کە لە سزایەکی بە ئێش ڕزگارتان بکات ؟! سەرەتا باوەڕهێنانتانە بەخواو پێغەمبەرەکەی ، ئنجا هەوڵ و تێکۆشانتانە لە ڕێی خوادا بەبەخشینی ماڵ و سامانتان ، وەبەخشینی خۆتان (بەگیان فیداکردن)، بێگومان ئەو کارەتان چاکترو فەرترە بۆتان ئەگەر بزانن وتێ بگەن.

ئەوسا خوا لەگوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت و دەتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کەچەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا تێدەپەڕێت و جاریە ، هەروەها کۆشك وتەلاری خۆش و ڕازاوە وپاکوخاوێن لە باخەکانی بەهەشتی عەدن ، بەڕاست ئائەوەیە سەرکەوتنوسەرفرازی و دەستکەوتی گەورەو بێسنوور ، جاشتێکی تریش هەیە کەحەزی لێدەکەن ، ئەویش بەخشینی سەرکەوتنە لەلایەن خواوەو فەتحە ( فەتحی وڵاتان و دڵان) ، ئەو مژدەیە بدە بەبڕواداران .

## هاتنەدی مژدەکان بۆ نەوەی ئیسرائیل لەڕابردوودا

ئەو مژدانەی باسمان کردن لەهەموو سەردەمێکدا هەبوون بۆ بڕواداران ، ئەوەتە قورئان باسی سەردەمی حەزرەتی موسا دەکات ، کەمژدە دەدات بە بڕواداران و ئەو مژدانەش دێنە دی... ئەمەش بۆ ئەوەی وانە و پەند بێت بۆ بڕواداران ودڵنیابن لە هاتنەدی ئەو بەڵێنانە...

قورئان دەفەرموێت ﴿وأوحينا إلى موسى وأخيه أنْ تَبَوَّءا لِقومِكُما بمصرَ بُيُوتاً و اجعلُوا بيُوتَكُمْ قِبْلَةً وأقيمُوا الصلاةَ وبَشِرِ المؤمنين﴾(يونس٨٧)واتە : ئێمە وەحیمان نارد بۆ موسا (سەلامی خوای لێبێت)وبراکەی تالەمیسردا چەند ژوورێك ئامادەبکەن و ئەو ژوورانەش بکەنە شوێنی خواپەرستی و ڕووی تێبکەن و پێمان وتن: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن ، مژدەش بدە بەئیماندااران .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿قال موسى لقومه أستعينوا باللهِ واصبروا إنَّ الارضَ للهِ يُورثُها مَنْ يشاءُ مِنْ عِباده والعاقِبة للمتقين ، قالوا : أوذِينا مِن قبلِ أنْ تأتِينا ومِن بعدِ ما جئتنا، قال عسى ربُّكُمْ أنْ يُهلِكَ عَدُوَّكم ويَسْتَخْلِفَكُمْ في الارض فيَنْظُرَ كيف تَعْمَلُون﴾(الأعراف ١٢٨-١٢٩)

واتە :حەزرەتی موسا سەلامی خوای لێبێت بە گەلەکەی وت : داوای کۆمەکی و پشتیوانی لەخوا بکەن و ئارامبگرن ، بەڕاستی زەوی موڵکی خوایەو دەیسپێرێت بە هەرکەس کە بیەوێت لە بەندەکان ، سەرەنجامیش هەربۆ پارێزکارانە ... گەلەکەش وتیان : پێش ئەوەی تۆ بێیتە ناومان و دوای ئەوەش کە هاتوویت بارودۆخی ئێمە خراپەو ئازاردراوین ، موسا وتی : ئومێد وایە پەروەردگارتان دوژمنەکانتان لەناوببات و بتانکاتە جێنشین لە زەویدا ، ئەوسا سەیرتان دەکات کە ئێوە چۆن کاردەکەن...

سەرەنجام خوای گەورە مژدەکان و بەڵێنەکانی بۆ هێنانەدی و فیرعەون و دار دەستەکەی تەفروتووناکرد ، قورئان دەفەرموێت ﴿ وأورثنا القومَ الذين كانوا يُسْتَضْعَفون مشارق الأرض و مغاربها التي باركنا فيها ، وتَمَّتْ كَلِمَتُ ربِّكَ الحُسْنى على بني إسرائيل بما صَبَرُوا ، ودَمرْنا ماكان يصنَعُ فِرْعَوْنُ وقَوْمُهُ وماكانوا يَعْرِشون﴾(الاعراف١٣٧) واتە:ئەوسائەو گەلەی لاواز دەکران و دەچەوسێنرانەوە لەهەموو خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەو وڵاتەی کە فەڕو بەرەکتمان بەسەردا ڕژاندبوو کردە جێنشین و (وارث)و، بەڵێنی ڕاست و جوانی پەروەردگارت ( ئەی محمد (ص) هاتەدی بۆنەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەی کە ئارامیان نەسەرگرت ، ( کەواتە ئەگەر ئوممەتی تۆش ئارامبگرن هەمان سەرەنجامیان دەبێت )، هەرچیش فیرعەون و قەومەکەی دروستیان دەکردو ئەو کۆشك و تەلارسازیانەی کە دەیانکرد ، هەرهەموویمان کاول و وێران کرد ...

## چەند نموونەیەك لەسەر بەڵێن و پەیمانی قورئانی

لە قورئاندا ژمارەیەکی زۆر بەڵێن وپەیمان هاتووە ،کەهاتوونەدی یان لە داهاتوودا دێنەدی بۆ نموونە :

**یەکەم** /سوورەتی (الأنعام)مەکیە و باسی سەرەکی بیروباوەڕەو باسی تاك وتەنهایی خوا دەکات و وەڵامی پڕوپاگەندە و شوبهەکانی کافران دەداتەوە و ڕێنمایی بڕواداران دەکات لەو کێشمەکێشەی دەیکەن لەگەڵ ناهەقدا..

سورەتی (الانعام)لە کاتێکی ناسکدا هاتە خوارەوە ، لەکاتێکدا کەبانگەوازی ئیسلامی بەناخۆشترین قۆناغیا تێدەپەڕی ، کە ئەوەش ساڵەکانی دەنگدابڕان بوو کەموسڵمانان لەناو دۆڵی (أبي طالب)دا کەنارگیر کرابوون و دەنگیان دابڕیبوو لێیان وکڕین وفرۆشتنیان لەگەڵ نەدەکردن و ئابلووقەیان خستبووە سەریان ، پاش ئەوەش ساڵی خەم وخەفەت هات کە (أبو طالب)و (خاتوو خدیجە)وەفاتیان کرد ...هەر لەوماوەیەدا حەزرەت ڕووی کردە (طائف)و زۆر بەخراپی مامەڵەیان کردو بەردبارانیان کرد ، ئنجا ئەوەبوو (ئیسراومیعراج) بەپێغەمبەر کرا (ص)وەك دڵنەوایی و دڵدامەزراوییەك کەخوا بۆ پێغەمبەرەکەی فەراهەم هێنا ...

لەو بارودۆخەدا قورئان دڵنەوایی بڕوادارانی دەکردو بەڵێنی ئەدانێ کە کافران تێك دەشکێن وسەرکەوتن و پیرۆزی بۆیان دادەبەزێ لەخواوە ...

ئەوەتا لەسەرەتای سوورەتەکەوە دەفەرموێت : ﴿وماتأتيهم من آية منْ آيات ربِّهِمْ إلاّ كانوا عنها مُعْرضين ، فقد كذَّبُوا بالحَقِّ لَمّا جاءَهُمْ ، فسَوْفَ يأتيهمْ أنباء ماكانوا به يستهزءون﴾(الانعام٥)واتە :بێباوەڕان هیچ بەڵگەوموعجیزەیەکی پەروەردگاریان بۆ نایەت پشتی تێنەکەن و ڕووی لێوەرنەگێڕن ، بێگومان ئەوانە کاتێك ئەو هەق و ڕاستیەیان بۆ هات کە قورئانە بڕوایان پێنەکرد ، جالە ئایندەدا بۆیان دێت و پێیان دەگات هەواڵیئەوەی کە ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد ...

ئەمە هەڕەشەیەکی ئاشکرای خوایە کەلێیان دەکات و پەیمانیان بە لەناوچوون دەداتێ ، هەروەك گەلەکانی پێش خۆیان کە لە ئەنجامی خراپیانەوە خوا ڕیسوای دنیاو قیامەتی کردن ، دەی سەیری گەلانی پێش خۆتان بکەن و پەندی لێوەرگرن﴿ألَمْ يَرَوْا كم أهلكنا من قبلهم من قَرْنٍ مَكَّنّا هُمْ في الأرض مالَمْ نُمَكِّنْ لَكُمْ وأرسلنا السماءَ عليهم مدراراً وجعلنا الأنهارَ تجري من تحتِهِمْ فأهلكناهُمْ بذُنُوبِهِمْ وأنشأنا منْ بَعْدهِمْ قَرْناً أخرين﴾الأنعام٦

واتە : ئایا نەیانبینیوە و نەیانزانیوە چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە کەپایەدارمان کردبوون لەزەویداو بەشێوەیەك ئێوەمان ئاوا پایەدار نەکردووەو بارانی زۆرمان بەدەوام بۆ دەباراندن .چەندەها جۆگەو ڕووباریشمان لە ناو گێڵگە و باخ و شارەکانیاندا بۆ ڕەخساندبوون خوڕەمی دەکرد بەنێو درەخت و کۆشك و تەلاریاندا ، بەڵام بەهۆی لادان و گوناهو تاوانیانەوە لەناومان بردن و نەوەی ترمان لە دوای ئەوان هێنایە کایەوە ..

دووەم/ هەرلەسوورەتی (الانعام)ئایەتی ٢٦دا دەفەرموێت﴿وهم يَنْهَوْنَ عنه ويَنْأَوْنَ عنه ، وإن يُهْلِكُونَ إلا أنْفُسَهُمْ ومايَشْعُرون﴾واتە : کافران نایەڵن کەس گوێ بۆ قورئان بگرێت و خۆشیانی لێ دووردەخەنەوە ، جابەو کارەیان جگە خودی خۆیان کەس لەناونابەن و هەستیشی پێناکەن.

ئەوانە دوو تاوانیان هەیە ، یەکەم بەرامبەر نەفسی خۆیانە کە لەقورئان دووردەکەونەوە ، دووەمیش تاوانی دوورخستنەوەی خەڵکە ئەمەش بەو

مەبەستەی کە سەرکەون بەسەر ئیسلامدا ، بەلاّم بێگومانەو پەیمانی خوایە خۆیان لەناو دەچن ، هەرچەند هەستیشی پێناکەن ..

لە ئایەتی (٦٥)و(٦٧) یشدا دەفەرموێت( **قل هو القادر على أن يبعث عليكم عذابا من فوقكم أو من تحت أرجلكم أو يلبسكم شيعا ويُذيق بعضكم بأس بعض ، أنظر كيف نُصرف الايات لعلهم يفقهون ، وكذب به قومك وهو الحق ، قل لست عليكم بوكيل لكل نبأ مستقر وسوف تعلمون** ) واتە : پێیان بڵێ هەر ئەو زاتە بە توانایە دەتوانێت سزای سەختتان لە سەرووتانەوە بۆ بنێرێت یان لەژێر پێتانەوە یاخود بتانکاتە دەستە دەستەو پارچە پارچە وتالاّوی توندو تیژی هەندێکتان بکات بە گەرووی هەندێکی ترتاندا ، تەماشا بکە چۆن چەندەها بەڵگەی جۆراوجۆریان بۆدەهێنینەوە بۆ ئەوەی ئەوان تێبگەن لەگەڵ ئەوەشدا گەلەکەی تۆ ئەم بەرنامەوقورئانەیان بەدرۆزانی لەکاتێکدا هەر ئەوەیە هەق و ڕاستی ، پێیان بڵێ ئەوە ئیتر من دەسەلاّتی ڕزگارکردنی ئێوەم نیە ،وەمن پشتیوانی ئێوە نیم ئەگەر خوا بەلاّیەکتان بەسەر بهێنێت بۆهەموو هەواڵێك کە لە قورئاندا هاتووە کات و شوێنی بەدیهاتنی خۆی هەیە ، لەئایندەشدا دەیزانن ..

مەبەست لە هەواڵەکانی قورئان لێرەدا سەرکەوتنی ئیسلامە بەسەر کوفردا کەئەمەش لە جەنگی بەدردا هاتەدی پاش چەند ساڵێك .. هەروەها قورئان لە الانعام ئایەتی ١٣٣ بۆ ١٣٥ دەفەرموێت : ( **وربك الغنى ذو الرحمة ان يشأ يُذهبكم ويستخلف من بعدكم ما يشاء كما أنشأكم من ذرية قوم آخرين ، انما توعدون لآت وما انتم بمعجزين ، قل ياقومي اعملوا على مكانتكم اني عامل فسوف تعلمون ، مَن تكونُ له عاقبة الدار انه لايفلح الظالمون** ) واتە :پەروەردگاری تۆ زۆر دەوڵەمەندو بێنیازە ، هەروەها خاوەنی سۆزو میهرەبانیە ، ئەگەر بیەوێت ئێوە لەناودەبات و هەرکەسێکی بوێت دەیکاتە جێگری ئێوە هەروەك چۆن ئێوەی لەنەوەی کەسانێکی تر هێناوەتەکایەوە ، بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی کەدەتاندرێتێ بەڕێوەیەوبێگومان هەردێت و ئێوەناتوانن دەستە وسانمان بکەن وڕێبگرن لەهاتنەدی ..

ئەی محمد (ص) پێیان بڵێ ئەی گەل و هۆزم چیتان بۆ دەکرێت ئەنجامی بدەن لەسەر شێوازی خۆتان ئەوە بەڕاستی منیش بەردەوامم لەسەر کاری خۆم چونکە لە

ئایندەدا دەزانن کەسەرەنجامی ماڵی قیامەت بۆکێ دەبێت ، دڵنیاش بن کە ستەمکاران سەرفراز نابن ..

بەڵێ سەرکەوتنی ٣١٣ کەس بە کەلوپەلێکی کەمی جەنگەوە بەسەر هەزار جەنگاوەری تێروتەسەلی پڕتفاقدا لەجەنگی بەدردا بەڕاستی بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پەیمانەکانی قورئان بەتایبەت ئەگەر سەیری سوورەتی الانفال بکەین کەباسی دەستی قەدەرو یارمەتی پەروەردگار دەکات بۆ بڕواداران .

قورئان لە سورەتی القمردا هەر لە مەککە دەفەرموێت : ( **أكفاركم خير من أولـئكم أم لكم براءة في الزبر ، أم يقولون نحن جميع منتصر سيُهزم الجمع ويولـون الـدُبر بـل الـساعة موعـدُهم والـساعة أدهـى وأمـر** ) واتە : ئایا کافرانی ئێوە چاکترن لە ئەوانەی پێش خۆیان کە لە ناومان بردون؟؟ یان پەیمانتان دراوەتێ لەپەڕاوە ئاسمانیەکاندا کە تووشی لەناوبردنو تیاچوون نایەن ؟؟یان دەڵێن ئێمە هەموومان کۆین و سەرکەوتووین و ناشکێین ، لەئایندەیەکی نزیکدا لەشکرو کۆمەڵیان شکست دەهێنن وهەڵدێن ، جگە لەوەش قیامەت کاتی لێپرسینەوەیانە، کە ڕۆژێکی زۆر سەختترو تاڵترە .. کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە حەزرەتی عومەر پرسیاریکردلە حەزرەت (ص) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا چ کۆمەڵێك شکست دەخوات ؟؟

جا عومەر دەڵێت :کەلەشەڕی بەدردا حەزرەتم بینی (ص)ئەم ئایەتەی دەخوێند (**سيهزم الجمع ويولـون الـدبر** ) ئنجا تەئویل و مانای ئایەتەکە تێگەیشتم ، کەخوا لە بەدردا هێنایەدی ..

پێغەمبەر (ص)دەیزانی کەئەوە پەیمانی خوایە ، چونکە لە سورەتی ئەنفالیشدا هاتووە کەخوا پەیمانی کاروانەکە یان سەرکەوتن بەسەر کافرانای دابوویە بۆیە لەسەرەتای شەڕەکەدا دوعای کردو فەرمووی :( **اللـهم أنجـز لـي ماوعـدتني ، اللـهم آتـني ماوعـدتني ، اللهم ان تهلـك هـذه العـصابة مـن أهـل الاسـلام لاتعبـد في الارض** ) واتە : خوایە ئەوەی بەڵێنت پێداوم بۆم بهێنەرە دی ، خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لە ئەهلی ئیسلام لەناوبچن لەسەر زەوی ناپەرسترێیت ..

ئەوەندە پاڕایەوە ئەبوبەکر پێی فەرموو :ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو پاڕانەوەیەت بەسە ، خوای گەورە پەیمانی خۆییت بۆ دەباتە سەر ..

سێیەم / لەسورەتی ڕۆم دا قورئان ڕێنمایی حەزرەت وهاوەڵانی دەکات کەئارامبگرن چونکە بەڕاستی پەیمانی خوا دێتەدیو ، باکافران بێئارام ودڵساردیان نەکات (**فاصبر إن وعد الله حق ولا يستخفنك الذين لايوقنون** ) الروم ٦٠ ..

چوارەم / لە سورەتی (یونس)یشدا هەر لەمەککە خوای گەورە بە کافرانی فەرموو ( **فهل ينتظرون الا مثل أيام الذين خلوا من قبلهم ، قل فانتظروا اني معكم من المنتظرين ، ثم ننجي رسلنا والذين آمنوا كذلك ننجي المؤمنين** ) یونس١٠٣/واتە : ئەو بێباوەڕانە چاوەڕێی چی دەکەن ؟؟ مەگەرهەر چاوەڕێی ئەوە ناکەن کە ڕۆژگارێکیان بەسەر بهێنین وەك ئەوەیبەسەر ئەوانەی پێشیاندا هێنامان ؟؟بڵێ : جا ئێوە چاوەڕێ بن ، بەڕاستی منیش لەگەڵ ئێوەدا لەچاوەڕوانانم ، لەوەودوا کاتێك کافرانمان لەناوبرد ، پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ڕزگار دەکەین ، هەر بەو شێوەیە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین کە ئیمانداران ڕزگار بکەین ..

پێنجەم / کاتێك حەزرەت (ص) کۆچی کرد بۆ مەدینەو گەیشتە ( جوحفە )زۆر شەوقی هەبوو بۆ مەککە ، ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوارەوە ( **ان الذى فرض عليك القرآن لرادك الى معاد** )**القصص** ٨٥/واتە : بەڕاستی ئەو خوایەی کە گەیاندنی قورئانی لەسەر تۆ فەرز کردووە، سەرەنجام دەتگێڕێتەوە بۆ مەککە ....

ئەم وەعدەش پاش نۆ ساڵێك هاتە دی و بە سەربەرزی و سەرکەوتوویی گەڕایەوە مەککە و فەتحی کرد ..

شەشەم/ لە سورەتی نوریش دا پەروەردگارباسی وەعدی خۆی دەکات کە بڕواداران دەکاتە جێنشین و پایەداریان دەکات ، ئەگەر چەند مەرجێك لە خۆیاندا بهێننە دی( **وعد الله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم فى الارض كما استخلف الذين من قبلهم وليُمَكنن لهم دينَهُم الذى ارتضى لهم وليُبَدلنهم من بعد خوفهم أمنا يعبدوننى لايشركون بي شيئا ، ومَن كفرَ بعد ذلك فأولئك هم الفاسقون ، وأقيموا الصلاة و آتوا الزكاة وأطيعوا الله والرسول لعلكم تُرحمون ، لا تحسبن الذين كفروا مُعجزين في الارض ومأواهم النار ولبئس المصير** ) النور ٥٥-٥٧ واتە : خوا بەڵێنی داوە بەوانەی بڕوایان هێناوە لەئێوەو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت کە خوا خۆی پێی ڕازییە

، هەروەها ترسیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و هێمنی ، ئەو کاتە ئیتر بەتەواوی هەرمن دەپەرستن و هەرگیز هاوەڵ و هاوبەشم بۆ بڕیار نادەن ، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەدارییە بێباوەڕ بێت ، ئا ئەوانە تاوانبارو لە سنوور دەرچوون ، ئەی بڕواداران نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتی ماڵەکانتان دەرکەن و فەرمانبەرداری پێغەمبەرین بەڵکو ڕەحمتان پێبکرێت ..

وامەزانن ئەوانەی بێباوەڕ بوون لەدەست تۆڵەی خوا لەسەر زەوی ڕزگاریان دەبێت ، ئەوانە لە قیامەتیشدا شوێنیان ئاگری دۆزەخە ، ئای چ سەرەنجامێکی خراپە ...

حەوتەم /قورئان باسی کێشمەکێشی نێوان هەق و ناهەق دەکات و دەفەرموێ( **ان الذين كفروا يُنفقون أموالهم ليَصُدوا عن سبيل الله ، فسيُنفقُنها ثُم تكونُ عليهم حسرة ثم يُغلبون ، والذين كفروا الى جهنم يُحشرون ) الانفال** ٣٦ / واتە :بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی ڕێبگرن لە بڵاوبوونەوەی بەرنامەی خوا ، جا ماڵ و سامانیان لەئایندەشدا بەختدەکەن و دەبێتە داخ و حەسرەت بۆیان و لەدوایشدا شکست دێنن ، بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕن بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن ..

## بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی

ئەو هەواڵانەی پێغەمبەر(ص)داویەتی بۆ ئەوشتانەی کە ڕوویان داوە ، یان لە داهاتوودا ڕوودەدەن ، بەڵگەی ئاشکراو دیارن لەسەر پێغەمبەرایەتی حەزرەت (ص)، چونکە ئەوشتانە کەس ناتوانێ پەی پێبەرێت مەگەر پێغەمبەرێك کەخوا بەوەحی ئاگاداری دەکات ...

ئەوشتانە جۆرێکن لەغەیب و نهێنی و خواش کەعالیمی غەیبە ئەگەر بیەوێ پێغەمبەرەکەی لێ ئاگادار دەکات و، ئەویش کاتێ بەبڕواداران دەڵێت و دێنە دی دەبنە مایەی دڵدامەزراوی و یەقینی زیاتر ...

خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت :﴿**عالمُ الغيب فلايُظهرُ على غيبه أحداً ، إلامن إرتضى من رسول ...**﴾( **الجن:٢٧** )

واتە: خواوەند زانای نهێنی و شاراوەکانە ، کەسیش لەنهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات ، مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خوا خۆی ڕازی بێت بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت ... هەروەها دەفەرموێت :﴿**والنجم إذا هوى ، ماضلَ صاحبُكُمْ وما غوى ، ومايَنْطقُ عن**

**الهوى ، إنْ هو إلا وَحْيٌ يوحى﴾(النجم : ٤)**واتە : سوێند بە ئەستێرە کاتێك ئاوادەبێت و لەشوێنی خۆی دەترازێت ، هاوەڵ و هاوڕێی ئێوە محمد(ص)گومڕاو سەرلێشێواو نەبووە ، لە ڕێگەی ڕاست و ڕەوان نەترازاوە ، قسەو گوفتاری لە ئارەزووبازی و هەواوهەوەسەوە نیە ، ئەوەی کە ڕای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییە ...

هەندێ لەوهەواڵانەی کەپێغەمبەر (ص) داونی و هاتوونەتە دی :

**یەکەم/ هەواڵدانی حەزرەت ( ص )بەتیاچوونی سەرانی قوڕەیش :**

لەپێش ئەوەدا کەجەنگی بەدر دەست پێبکات ، حەزرەت(ص)هاوەڵانی ڕێکخست بۆ جەنگەکەو ڕێنمایی کردن ، ئنجا مژدەی تیاچوون و کوژرانی سەرانی قوڕەیشی دانێ و فەرمووی : ئەمە شوێنی فلانە کەسە لێرەدا دەکوژرێ و ئەوەش شوێنی فلانە کەسەو، بەو جۆرە ، ئەنەس دەڵێ : بەخوا حەزرەت (ص)چۆنی فەرموو بوو ئاوا دەرچوو ، هەریەکە لەوانەی کەپێغەمبەر (ص)ئاماژەی بەشوێنەکانیان کردبوو لەوشوێنەدا مردن بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك لێی بترازێن ..ئەمەش ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە : (اخرج أبو يعلى في مسنده فقال : حدثنا هدية ثنا حماد عن ثابت عن أنس أن النبي (ص)لما ورد بدراً أومأ بيده الى الأرض فقال (هذا مصرع فلان)فو الله ما ماط أحد منهم عن مصرعه)( صحيح ) موسلیم لە (كتاب الجهاد والسير )دا و بوخاری لە (كتاب المناقب)دا ڕیوایەتیان کردووە، ئەم هەواڵە دووبەشە ، یەکەم : هەواڵدانە بە کوژرانی گەورەو سەرانی قوڕەیش ، کە ئەمەش دیارە خوا هەواڵی داوەتێ ئەگینا کێ وادەی مردنی کێ دەزنێ ، دووەمیش : هەواڵدانە بەشوێنی کوژرانی ئەوکەسانە کەدیارە ئەمەش هەر غەیبەو خوا پێغەمبەرەکەی لێ ئاگادار کردووە ... هەروەك قورئان دەفەرموێت :﴿**وما تدري نفس بأيِّ أرض تموت إنَّ الله عليم خبير**﴾( **لوقمان :٣٤** )

واتە: هیچ کەس نازانێت لەسەر چ خاکێك دەمرێت و کۆتایی بەژیانی دێت ، (هەروەك چۆن کاتی مردن و چۆنیەتیەکەشی شاراوەیە)، بەڕاستی خوا بە هەموو شتێك زاناو ئاگادارە .

**دووەم / هەواڵدانی حەزرەت ( ص )بەکوژرانی ( ئومەیەی کوڕی خەلەف ):**

سەعدیکوڕیموعاز هاوەڵیئومەیەیکوڕیخەلەف بوو،ئەگەر ئومەیە بچوایەتە مەدینە لای سەعد دادەبەزی و بەهەمان شێوەش ئەگەر سەعد بهاتایە بۆ مەککە لای

ئومەیە دادەبەزی ، جاکاتێ موسڵمانان هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە سەعد هات بۆ مەککە بۆ عومرە کردن و بەئومەیەی وت : بزانە کەی چۆڵە دەمەوێ تەوافی کەعبە بکەم ، ئەویش لەنزیك نیوەڕۆدا بردی بۆ تەواف ، لەڕێگا ئەبو جەهل گەیشت پێیان و وتی : ئەبو صفوان ئەوە کێ یە لەگەڵتا؟ ئەویش وتی : ئەوە سەعدە .. ئەبو جهل وتی : دەبینم بەدڵنیایی تەواف دەکەی لەمەککە لەکاتێکدا لەئاین وەرگەڕاوەکانتان داڵدە داوەو دەتانەوێ یارمەتیان بدەن و سەریان بخەن، بەخوا ئەگەر لەگەڵ (ئەبی صفوان)دا نەبوویتایە بە سەلامەتی نەدەگەڕایتەوە ناو کەسوکارت ، سەعد بە دەنگی بەرز وتی : بەخوا ئەگەر ڕێم لێ بگری لێرە ، لەشوێنێکی زۆر گرنگتر دەست دەهێنمە ڕێت وڕێی مەدینەت لێ دەگرم ئومەیە پێی وت : دەنگ بەرزمەکەرەوە ئەی سەعد بەسەر (ابی الحکم)دا گەورەی ئەهلی ئەم دۆڵەیە .

سەعد وتی: ئومەیە واز لەوەبێنە بەخوا من بەڕاستی گوێم لەپێغەمبەری خوا (ص)بووە کە دەیفەرموو (إنه قاتلك) ئەودەتکوژێ ،ئومەیە وتی:لەمەککە دەمکوژێ ؟ سەعد وتی : نازانم ... (صحيح:بخاري)

پاش نزیکەی دوو ساڵێك لە شەڕی بەدردا لەساڵی دووی کۆچیدا ، ئەم هەواڵە هاتە دی ، لەکاتی جەنگەکەدا بیلال چاوی بەئومەیە کەوت کەکاتی خۆی لەمەککە سزای زۆری دابوو ، هاواری کرد ئەی ئەنصاری خوا ئەوە سەری‌کوفرە، ئەوە ئومەیەی کوڕی خەلەفە ، هەرئەوەندە (ئەنصارەکان)گوێ یان لێ بوو ،هێرشیان کردە سەر ئومەیە و کوڕەکەی و هەردوکیانیان کوشت (السيرة النبويه لابن هشام) ..

## سێ یەم /هەواڵدانی پێغەمبەر (ص)بەکوشتنی (ئوبەی کوڕی خەلەف)

ئوبەی کوڕی خەلەف کەیەکێکە لەسەرانی قوڕەیش و دژایەتی حەزرەتی دەکرد (ص)، سوێندەخوات کە (محمد)دەکوژێت ، کاتێك حەزرەت (ص)ئەم هەواڵەی بیستەوە فەرمووی : (أنا أقتله إن شاء الله)من دەیکوژم إن شاء الله(الحديث حسن/صححه الحاكم والذهبي)..ئوبەی هەرکاتێ لەمەککە بەحەزرەت بگەیشتایە (ص)پێی دەووت : ئەی محمد من ئەسپێکم هەیە هەموو ڕۆژێك ئالیکی زەڕاتی ئەدەمێ و تۆی پێ دەکوژم ، حەزرەتیش (ص)پێی دەفەرموو : من تۆ دەکوژم إن شاء الله..

لەجەنگی ئوحودا ئوبەی درعی لەبەردا بوو ، بەسواری ئەسپەکەیەوە هاواری کرد ، کوا محمد خوا بمکوژێت ئەگەر نەیکوژم ،ئنجا هێرشی هێنا بەرەو لای پێغەمبەر (ص).. هاوەڵان وتیان : پێغەمبەری خوا با یەکێکمان بەری لێبگرین ؟ فەرمووی وازی لێ بهێنن ، کە لێی نزیك بۆوە پێغەمبەر (ص)ڕمێکی لە هاوەڵێك وەرگرت و ڕووبەڕوووی وەستاو ، لەنێو دەفەی شانی و زنجیربەندەکەیەوە کونێکی بەدی کرد ڕمەکەی تێگرت ، چەقیە شوێنی خۆی و لەسەر ئەسپەکە هەڵی دایە خوارەوە و لەخۆڵەکەدا گەوزاندی ، برینەکە گەورەنەبوو ، تەنها ملی ڕووشاندبوو ، خوێنی زۆری تێزا، وتی : وەڵڵاهی محمد کوشتمی ، پێیان وت : وەڵڵاهی زەنەقت چووە لە محمد ، برینەکەت وانیە .. وتی : لەکاتی خۆیدا لەمەککە پێی وتووم : من دەتکوژم ، وەڵڵاهی ئەگەر تفی لێ بکردمایە دەیکوشتم ... دوژمنی خوا لە کاتی گەڕانەوەدا بەرەو مەککە لەڕێگا مرد ...

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەڵێت : ئوبەی وەکو گا دەیبۆڕاندو دەیووت : سوێند بێت ئەو ئازارەی بەمنەوەیە ئەگەر بەهەموو خەڵکی (**ذی المجاز**)ەوە بوایە دەمردن ... (ل٣١٥ گوڵاوی سەرمۆر)

**چوارەم/ هەواڵدانی حەزرەت(ص)کە قوڕەیش دوای جەنگی ئەحزاب هێرش ناهێننە سەر موسڵمانان:** بوخاری دەگێڕێتەوە کە حەزرەت(ص)لەجەنگی ئەحزاب دا فەرمووی ئیتر ئێمە هێرش دەبەینە سەریان و ئەوان ناتوانن بێنە سەر ئێمە (**نغزوهم ولا يغزوننا**).. ئەم هەواڵەش کەغەیبەو خوای گەورە حەزرەتی(ص)لێ ئاگادار کردبوو ، هەرواش دەرچوو ، (ابن حجر)دەفەرموێ : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکە لەبەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی حەزرەت (ص)، چونکە پاش ساڵێك حەزرەت (ص)چوو بۆ عومرە بۆ مەککەو ڕێیان لێگرت و سوڵحی حودەیبیە هاتە کایەوە ، لەساڵی دواترا عومرەیان کرد،لەپاش ئەوەش فەتحی مەککە کراو ، بەمەش دەوری قوڕەیش و مەککە تەواو بوو لەهاتنە سەر مەدینە لەپاش جەنگی (ئەحزاب)...

**پێنجەم /هەواڵدانی پێغەمبەر(ص)بەفەتحی خەیبەر :**

بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوەکە لە ڕۆژی خەیبەردا حەزرەت (ص)فەرمووی (سبەینێ ئەم ئاڵایە ئەدەم بەپیاوێك کە خوا فەتحی خەیبەری لەسەر دەستا دەکات ،

خواو پێغەمبەری خۆش دەویٚ و، خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت)ئەوشەوە خەوو خەیاڵی خەڵکی ئەوەبوو کە کێ بیٚ ئەو ئاڵایە وەرگریٚ ، هەمووان حەزیان دەکرد وەری بگرن ، بۆ بەیانی حەزرەت (ص)فەرمووی: کوا عەلی ؟! وتیان چاوی یەشیٚ ! کە هات (تفی)موبارەکی دا لەچاوی و چاك بوویەوە بەجۆرێك هەروەك هیچی نەبوو بیٚ وابوو ، ئنجا ئاڵاکەی دایە دەست ، عەلی وتی شەڕیان لەگەڵ دەکەم تاوەکو ئێمەیان لێدێت ، حەزرەتیش (ص)پێی فەرموو : لە سەرخۆ برۆ ، تادەڕۆیتە مەیدانیان ، پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام و پێیان بڵیٚ : ئەگەر موسڵمان بن ماف و ئەرکەکانیان چییە و چۆن دەبێت ، بەخوا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە هیدایەتی یەك کەس بدات بۆ تۆ باشترە لەموڵکی (حُمر النعم)...

شاری خەیبەر دووبەش بوو ، بەشێکیان پێنج قەڵای تێدابوو ، بەشی دووەمیشی سیٚ قەڵای تیابوو ، لەناو خەیبەردا قەڵاو شورای بچوکتریش هەبوون شەڕی خوێناوی لە بەشی یەکەمی قەڵاکاندا بوو ،کەپێشەوا عەلی و موسڵمانان زاڵبوون بەسەریاندا و بەشی دووەمی قەڵاکانیش کەچەکداری زۆریشیان تیابوو ورەیان ڕووخاو بەبیٚ شەڕ خۆیان دا بەدەستەوە....

جوولەکەکانی خەیبەر هانی کافرەکانیان دەدا بەردەوام و تیژیان دەکردن بۆ دژایەتی پێغەمبەر (ص)و بەردەوام خەریکی پەیمان شکێنی و ناپاکی بوون ، بۆیە پێغەمبەر (ص)پاش گەڕانەوەی لەسوڵحی حودەیبیە چووە سەریان و ڕەگ وریشەی دەرهێنان ، دیارە ئەمەش وەعدی خوا بوو بۆی لەقورئاندا ﴿ وَعَدَكُم اللهُ مغانمَ كَثيرةً تأخُذُونَها فعجلَ لكم هذه ﴾ (الفتح:٢٠) واتە : خوای گەورە بەڵێنی دەستکەوتێکی زۆری پێداون کە لە دوژمنانی دەستێنن ، بەڵام ئەمەی بۆ پێشخستن(واتە:سوڵحیحودەیبیە)،مەبەست لەدەستکەوتە گەورەکەش فەتحی خەیبەرە

بەڵیٚ ...کاتیٚ خواو پێغەمبەرەکەی وەعدو پەیمان دەدەن دێنەدی ، چونکەچی هەیە لەم بوونەوەرەدا بتوانیٚ ڕیٚ لەهاتنەدی ویستیخوا بکات ؟؟ دیارە هیچ شتێك نیە ، قورئان دەفەرمویٚ : ﴿ أولَمْ يسيروا في الأرض فَيَنْظُروا كيف كان عاقِبَةُ الذين من قَبْلِهِمْ

وكـانوا أشـدَّ مـنهم قُـوَّةً وماكـان اللهُ ليُعْجِـزَهُ مـن شـئ في الـسماوات ولا في الأرض ، إنّـهُ كـان عليمـاً قديرا﴾( فاطر:٤٤ )

واته: ئايا ئەوە نەگەڕاون بەزەویدا ، تاسەرنج بدەن و تەماشا بکەن ، چۆن بووە سەرەنجامی گەلانی پێش ئەمان و چیمان بەسەر هێنان ؛ ئەوانە هێزو دەسەڵاتیان لەمان زیاتر بوو ، وەنەبێت خوا هیچ شتێك دەستەو سانی بکات لەئاسمانەکان ، یان لەزەویدا ، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زانایەو بەدەسەڵات و توانایە ، یان دەفەرموێ :﴿وإنْ تَـوَلّيتُمْ فـاعْلَمُوا أنّكُـمْ غـيرُ مُعْجِـزي الله وبـشر الـذين كفـروا بعـذاب ألـيم ﴾( التوبه:٣ )واتە :خۆ ئەگەر یاخی بن و بەگوێی بەرنامەی خوا نەکەن ،ئەوەچاکبزانن بەڕاستی ئێوە دەسەوسانکەری خوانین و لەدەسەڵاتی دەرناچن و مژدە بدە بەوانەی کە بێباوەڕن بەسزایەکی پڕ ئازار.

**شەشەم /هەواڵدانی حەزرەت ( ص )کە ( قزمان ) لەئەهلی دۆزەخە :**

بوخاری وموسلیم بۆمان دەگێڕنەوە کە ئەبو هورەیرە دەڵێ : لەگەڵ حەزرەتدا بووین (ص)لە غەزایەکدا (کەغەزای خەیبەر بوو)، حەزرەت (ص)بەپیاوێك کە ئیدیعای ئیسلامەتی دەکرد فەرمووی (ئەوە لە ئەهلی دۆزەخە).. لە شەڕەکەدا کابرا شەڕێکی باشی کردو بەقورسی بریندار بوو ، هاوەڵان بەپێغەمبەریان وت(ص):ئەی پێغەمبەری‌خوا ئەوەی فەرمووت لە ئەهلی دۆزەخە ئەمڕۆشەڕێکی قورسی کردووەو مرد ، حەزرەت فەرمووی (ص)( بەرەو دۆزەخ )، ئەمە وای کرد خەریك بوو هەندێ کەس دوودڵی و گومانی بۆ دروست ببێت ، کاتێك لەم قسەو باسەدا بوون ، وترا: نەخێر نەمردووە بەڵام بەخەستی بریندار بووە ، لە شەودا کابرا خۆی نەگرت و بە شمشێرەکەی خۆی کوشت ؛ کەئەم هەواڵەیان دا بەحەزرەت (ص) فەرمووی (الله أكبر أشهَدُ اني عبدُ الله ورسوله).. الله أكبر شایەتی ئەدەم کەمن بەندەو نێرراوی خوام ..ئنجا فەرمانی‌دا بە بیلال کە لەناو خەڵکدا بانگەواز بکات ئەوەی‌موسڵمان نەبێت ناچێتە بەهەشتەوەو بەڕاستی خوا ئەم ئاینە بەکەسانی (فاجر)یش بەهێز دەکات (واتە خوا موسەخەریان دەکات بۆ ئیسلام )،شایانی باسە ئەو کابرایە کە ناوی (قزمان)بووە ، دووڕووبوو، دیارە دووڕوویش لە دڵایەو خواپێی دەزانێ و هەرخواش حەزرەتی بەوەحی ئاگادار کردووە ..

**حەوتەم/هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەخەلافەتی ئەبوبەکر:**

خاتووعائیشە دەفەرموێت پێغەمبەر (ص)لەنەخۆشی یەکەیدا پێی فەرموو **(ادعي لي أبابكر وأخاك حتى أكتُبَ كتاباً فإني أخاف أن يتمنى متمن ويقول قائل انا اولى ويأبى الله والمؤمنون إلا أبابكر )( بخاري)**...واتە:ئەبو بەکرو براکەتم بۆ بانگ بکە بانوسراوێك بنووسم بۆ ئەبوبەکر ، من دەترسم کە یەکێ ئاوات بەشوێنەکەی بخوازێ، وەیەکێ بڵێ من باشتر و لەپێشترم بۆ کاربەدەستێتی موسڵمانان لەئەبوبەکر،چونکەخواو بڕواداران ئەبوبەکر نەبێت کەسی تریان ناوێت

بەڵێ هەروا دەرچوو کەحەزرەت (ص)فەرمووی ، لە ساڵی یانزەی کۆچیدا کەپێغەمبەر (ص)وەفاتی کرد ، لە سەقیفەی بەنی ساعیدە خەریك بوو کێشە بکەوێتە ناو موسڵمانانەوە ، بەڵام خوا پاراستنی و سەرەنجام ئەبوبەکر بوو بەخەلیفە و بوو بەمایەی خێرو بەرەکەت بۆ موسڵمانان .

**هەشتەم /هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەشەهید بوونی (ثابت کوڕی قیس)**: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە سورەتی الحجرات دا : **(يأأيها الذين أمنوا لا ترفعوا أصواتَكُمْ فوقَ صوت النبي ولا تَجْهَرُوا له بالقَولِ كَجَهر بَعْضكُمْ لبَعْض أنْ تَحْبَط أعمالُكُمْ وأنتم لا تَشْعُرُون)** ، واتە ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ص)بەرزمەکەنەوە لەکاتی گفتوگۆدا ،هەروەك چۆن بەدەنگی بەرز قسە لەگەڵ یەکدا دەکەن ، نەوەکو کردەوەتان پووچ بێتەوە و هەستیشی پێنەکەن کە حەزرەت (ص)ئەم ئایەتەی بۆ هاوەڵانی خوێندەوە ماوەیەك (**ثابت** کوڕی قیس)ی نەبینی و ئەحواڵی پرسی ،هاوەڵێك وتی من هەواڵیت بۆ دەپرسم ئەی پێغەمبەری خوا (ص)، کاتێ پرسیاری کرد بۆی دەرکەوت لەماڵ نایەتە دەرەوە ، کەچوو بۆلای و ئەحواڵی پرسی ، لە وەڵاما وتی من حاڵم باش نیە و دەنگم بەرز کردۆتەوە بەسەر پێغەمبەرداو کارو کردەوەم پووچ بۆتەوەو لە ئەهلی دۆزەخم ، کاتێ ئەم قسانەیان گەیاندەوە پێغەمبەر (ص)، فەرمووی بڕۆن مژدەی بدەنێ ، کەئەهلی دۆزەخ نیە بەڵکو ئەهلی بەهەشتە(بخاری لەکتاب التفسیر ڕیوایەتی کردووە)... هەروەها بەیهەقیوحاکمیش بەسەنەدی صحیح ڕیوایەتیان کردووە، کەحەزرەت (ص)بە**ثابت** ی فەرموو **(ياثابت الا ترضى أن تعيش**

حميداً وتُقتَلَ شهيداً وتَدْخُلَ الجنة )واته : ئەی ثابت بۆ حەز ناکەی کە بەسەر بەرزی و سوپاسکراوی بژیت و بەشەهیدی سەربنێیتەوە و بچیتە بەهەشتەوە ؟! پابت وتی : بەڵێ حەزدەکەم . جەنگی یەمامە زۆر ناڕەحەت و قورس بوو ، موسڵمانان لەسەرەتاوە حاڵیان باش نەبوو ، ثابت کە ئەمەی دی وتی : ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ص)ئاوا نەدەجەنگاین ، ئێوە خراپ هاوەڵەکانتان ڕاهێناوە ، خوایە من بەریم لەوەی کە ئەو بڕوادارانە دەیکەن ، ئنجا زۆر قارەمانانە جەنگا هەتا شەهید بوو..

**نۆیەم /هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەوەی کە فاتمەی کچی یەکەم کەسە پێی دەگاتەوە لەدوای وەفاتی :** لەدوا ڕۆژەکانی تەمەنی پیرۆزی حەزرەت دا (ص)،کە نەخۆش بوو لەماڵی عائیشە ، حەزرەت (ص)ناردی بەدوای فاتمەی کچیداو شتێکی چرپاند بە گوێیدا ، فاتمە دەستی کرد بەگریان ، پاشان شتێکی تری چرپاندەوە بەگوێیدا ، دەستی کرد بە پێکەنین ، عائیشە دەڵێت : کە دوایی پرسیارمان کرد لە فاتمە لەبارەی ئەو پێکەنین وگریانەوە وتی : پێغەمبەر (ص)چرپاندی بەگوێمداو فەرمووی: لەم نەخۆشیەدا دەمرم ، منیش بەوە گریام ، پاشان چرپاندی بەگوێمدا و فەرمووی : کە من دوای خۆی یەکەم کەس دەبم پێی دەگەم ، بەم هەواڵەش دڵخۆش بووم ..

شایانی باسە فاتمە دوای پێغەمبەر (ص)شەش مانگێك ژیاو یەکەم کەس بوو لە ئەهلی پێغەمبەر (ص)کەپێ ی بگاتەوە ...(گوڵاوی سەرمۆر ل٥٥٥) ... ئیمامی نەوەوی دەڵێت : ئەمە موعجیزەیەکی دیاری حەزرەتە ، بگرە دوو موعجیزەشە ، یەکەم هەواڵی دایە کە فاتمە دەمێنی تا دوای حەزرەت (ص)، پاشان دووەمیش : کە فاتمە یەکەم کەس دەبێ دەگاتەوە بەحەزرەت (ص)...(شرح النووی لصحیح المسلم ١٢/٧٧)

**دەیەم/ هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەفەتحی مەدائین :**

موسلیم ڕیوایەتیکردووەکەحەزرەت(ص)دەفەرموێ : (**لتفتحن عصابة من المسلمين او من المؤمنين كنوز كسرى التي في القصر الأبيض**)(**حديث صحيح** ). واتە : کۆمەڵێ لەبڕواداران فەتحی(مەدائین)دەکەن و دەست دەگرن بەسەر زێڕو زیوو موجەوهەراتی کیسرادا کە لەکۆشکی سپیدایە ...

ئەم هەواڵەش هاتەدی لەساڵی شانزەی کۆچیدا ، کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص فەتحی شاری (مەدائین )ی کردو فارسەکانی شکاندو کۆشکی سپی‌کیسراش هەرچی‌تیابوولەسامانوزێڕو زیوو بووە غەنیمەتی موسڵمانان

**یانزەیەم / هەواڵ دانی حەزرەت (ص)بەشەهیدبوونی ئوم حیرام :**

ئوم حیرام دەڵێ گوێم لەحەزرەت بوو (ص)فەرمووی:**( أول جيش من أمتي يغزون البحر قد أوجبوا ، قالت أم حرام قلت يارسول الله أنا فيهم ، قال : أنت فيهم ، ثم قال النبي (ص): أول جيش من أمتي يغزون مدينة قيصر مغفور لهم ،فقلت أنا فيهم يارسول الله ، قال : لا )( اتفق عليه الشيخان )**.

واتە : یەکەم سوپایەك لە ئوممەتم کەغەزا دەکەن و دەچنە بەحرەوە ، بەهەشتیان بەدەست هێناوە ، ئوم حیرام وتی : منیان تیام ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ئەویش فەرمووی : بەڵێ تۆیان لە گەڵدای ..

ئنجا فەرمووی : یەکەم سوپایەك لە ئوممەتم کە هەوڵی گرتنی شاری قیصر دەدەن واتە (استنبول) خوا لێیانخۆش بووە،وتم:ئەی‌پێغەمبەری خوا (ص)منیان لەگەڵدام فەرمووی نەخێر...

<u>یەکەم</u> :ئەم فەرموودەیە هەواڵ ئەدات بەدروستکردنی کەشتی جەنگ و چوونە ناو دەریاوە کە ئەمەش لەسەردەمی معاویەی کوڕی ئەبوسفیان دا هاتە دی لەساڵی (٢٧)ی کۆچی کە چوون فەتحی قبرص بکەن ..

<u>دووەم</u> :هەواڵ ئەدات بەوەی کە (ام حرام)دەمێنی تائەوکاتەو بەشداری دەکات لەوچوونە ناو دەریایە ، بەڵێ .. ام حرام لەگەڵ عبادەی کوڕی صامت ی مێردی چوونە ناو ئەوکەشتیەوەو چوون بەرەو فەتحی (قبرص)،کە لە گوێ دەریاکە دابەزین (ام حرام)لەسەر وڵاخ کەوتە خوارەوەو شەهید بوو ، قەبرەکەشی تائێستا ماوە لەو شوێنەدا ...

<u>سێیەم</u>:هەواڵداذی‌تیایەبەغەزاکردنی(قسطنطنية/استنبول)کەئەمەشلەزەمانی یەزیدی کوڕی موعاویەدا هەوڵی بۆ دراو لە زەمانی (محمد فاتح)دا بەیەکجاری فەتح کرا .

**دوانزەیەم/هەواڵدانی حەزرەت (ص) بە ڕوودانی فیتنەوشەهیدبوونیعثمان :**

ئیبن عومەر دەڵێ : حەزرەت (ص)باسی فیتنەیەکی کردو فەرمووی (ئەمە(واتەعوسمان)تیایابەمەزڵومیدەکوژرێ...(حدیث حسن /ترمذی و أحمد ڕیوایەتیان کردووە ).. ئەم هەواڵەش هاتەدیلەساڵی ٣٥یکۆچیدا لەئەنجامی فیتنەو ئاشوبێك کەبەرپابوو،سەرەنجام حەزرەتی عوسمان شەهید بوو ، وە بەمەزڵومی سەری نایەوە ....

**سیانزەیەم /هەواڵدانی حەزرەت (ص) بەشەهید بوونی عەمماری کوڕی یاسر :**

حەزرەت (ص)بەعەمماری کوڕی یاسری فەرموو (ابشر عمار تقتلك الفئة الباغية)(حديث صحيح /ترمذی ڕیوایەتی کردووە)واتە:مژدەت لێبێت عەممار کۆمەڵ و دەستەی دەرچوو لە فەرمانی ئیمام شەهیدت دەکەن ...

ئەم هەواڵەش هاتەدی لە ساڵی ٣٧ ی کۆچیدا لەجەنگی صفين دا ، لە ئەنجامی ئەوەی کەحەزرەتی عوسمان لەلایەن ئاژاوە گێڕانەوە شەهید کراو پێشەواعلیبووەئەمیریموسڵمانان و کۆمەڵێ لەهاوەڵان لەژێر سەرکردایەتی (معاويه)دا داوای خوێنی (عوسمان )یان دەکردو دەیانویست بەپەلە تۆڵە لە تاوانباران بسەنرێ ، پێشەوا عەلیش ڕای وابوو کەئەو کارە بەپەلە نابێت و چاوەڕێی باروزروفیدەکرد ،سەرەنجام سوپای پێشەوا عەلیومعاويه بەهۆی ئاژاوە گێڕانەوە دایان بەیەکداو ژمارەیەکی زۆر موسڵمان شەهید بوون .

یەکێ لەوانە عەممار بوو ، جا لەبەرئەوەی هاوەڵان ئەم فەرموودەیەیان دەزانی ، بە شەهید بوونی عەممار کە لەگەڵ سوپای پێشەوا عەلی دا بوو ، خەڵکی دڵنیا بوون کەتاقمی معاويه باغین و لەفەرمانی ئیمام دەرچوون و ئیجتهادەکەیان هەڵەیە .. لە فەرموودەیەکی تریشدا حەزرەت (ص)بەعەممار دەفەرموێت:(آخر شربة تشربها من الدنيا شربة لبن)(حديث صحيح /ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە) واتە : ئەی عەممار دوا خواردنەوەت لە دنیادا شیرە کە دەیخۆیتەوە.

جاکاتێ لە (صفين)دا ، شیریان هێنا بۆ عەممار و خواردیەوە ، پێکەنی ، وتیان بەچی پێدەکەنی؟؟ ئەو فەرموودەیەی گێڕایەوە ، ئیتر چووە ناو شەڕەکەوەو

پاشماوەیەك شەهیدبوو،بەمەش هەواڵەکەیحەزرەت (ص)هاتەدی کە دواهەمین خوردنەوەی عەممار شیردەبێت لە دنیادا پێش شەهید بوونی .

**چواردەیەم / هەواڵدانی حەزرەت(ص)بەڕێکەوتنی نێوان حەسەن ومعاویە:** پێغەمبەر (ص)لەسەر مینبەر بوو ، حەسەنیش لەلایەوە بوو ، جارێك سەیری خەڵکەکەی دەکردوجارێکیش سەیری حەسەن و فەرمووی : (ابني هذاسيدولعل الله أن يُصلح به بين فئتين من المسلمين )(بخاري)واتە : ئەم کوڕەی من سەیدەو ڕەنگە خوا سوڵحی نێوان دوو دەستەی گەورەی موسڵمانانی پێبکات .

ئەم هەواڵەش هاتەدی لەساڵی چل ی کۆچیدا بەوەی کە کاتێك حەزرەتی عەلی شەهید کرا و پێشەوا حەسەن هاتەجێی ، ناوبراو دەستی لەخەلافەت هەڵگرت بۆ معاویە کە کاربەدەستی شام بوو ، ئەم ساڵەش ناونرا ساڵی یەکڕیزی موسڵمانان (عام الجماعة )...

**پانزەیەم /هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەماوەی خەلافەتی ڕاشیدین :**

حەزرەت (ص)دەفەرموێت : (خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم يؤتي الله الملك أو ملكه مَن يشاء)أبو داود /حديث حسن/ واتە : خەلافەتی نبوەت سی ساڵەو پاشان خوای گەورە موڵکەکەی دەدا بەهەرکەسێ بیەوێت ... ئەمەش هەروەك هەواڵەکانی تربەتەواوەتی هاتەدی، خەلافەتی ئەبوبەکر لە ساڵی یانزەی کۆچی یەوە دەستی پێکرد تاساڵی چلی کۆچی کەپێشەوا حەسەن کوڕی عەلی وازی هێنا لەخەلافەت بۆ معاویەی کوڕی ئەبی سفیان ..

ساڵەکانی حوکمڕانی خەلیفەکانی ڕاشیدینیش بەم جۆرە بوو :

ئەبو بەکر دووساڵ و سێ مانگ و دەڕۆژ.

عومەر دەساڵ و شەش مانگ و هەشت ڕۆژ

عوسمان یانزەساڵ و یانزەمانگ و نۆ ڕۆژ

علی چوارساڵ و نۆ مانگ و حەوت ڕۆژ

حەسەن نزیکەی شەش مانگ و

دەکاتە (٢٧)ساڵ و (٣٥)مانگ و (٣٤)ڕۆژ

کەبەمەش دەکاتە سی ساڵ و چوار پێنج ڕۆژ کە ئەمەش ڕەنگە (تداخل)ی ڕۆژەکان بێت ...

**شانزەیەم /هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەمانەوەی عبداللە ی کوڕی سەلام لەسەر ئیسلامەتی تامردن**

: قەیس کوڕی عباد دەڵێ: لەمزگەوتی مەدینە دانیشتبووم ، پیاوێك هاتە ژوورەوەو نیشانەی خشوع لەسەر دەموچاوی بوو ، خەڵکی وتیان : ئەم پیاوە لەئەهلی بەهەشتە ، پیاوەکە دووڕکات نوێژی سوننەتی کرد بەخێرایی و چووە دەرەوە ، منیش شوێنی کەوتم ، پێم وت : تۆ کە هاتیتە ناو مزگەوتەوە وتیان : ئەم پیاوە لەئەهلی بەهەشتە ، ئەویش وتی : بەخوا نابێ کەسێ شتێ بڵێ کەنەیزانێ ، ئێستا پێت دەڵێم ئەوە لەچی‌یەوە هاتووە ، من خەوێکم دی لەسەردەمی حەزرەتدا (ص)و بۆم گێڕایەوە ، لەخەوما لە باخێکی گەورەو خۆش دابووم ، لە ناوڕاستیا عەموودێکی ئاسن هەبوو کە خوارەوەی لە زەویدا چەقابوو ، سەرەوەشی لەئاسمانا بوو ، لەسەرەوەی قوڵفێکی پێوە بوو پێم وترا پیاسەرکەوە،وتم:ناتوانم،خزمەتکارێك هات و لە پشتەوە جلەکانی بۆ کۆکردمەوە و یارمەتی دام سەرکەوتم و دەستم گرت بەقوڵفەکەیەوە ، دەستم بە قوڵفەکەوە بوو خەبەرم بووەوە . کە ئەمەم بۆ حەزرەت (ص)گێڕایەوە فەرمووی : ئەوباخە ئیسلامەو ئەو عەمودەش عەموودی ئیسلامەو ئەو قوڵفە (عروە)یە (**عروة الوثقى**)یە ، تۆ لەسەر ئیسلام دەبیت تادەمریت.(ئەوپیاوە عبداللە ی کوڕی سەلام)بوو /ئەم فەرموودەیە (صحیح)ەو بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە . .

ئەم هەواڵەش هاتەدی ، عبداللە ی کوڕی سەلام سی وسێ ساڵ دوای حەزرەت (ص)ژیاو بەموسڵمانی لەمەدینە وەفاتی کرد لەساڵی چل و سێ ی کۆچی دا ...

حەڤدەیەم /هەواڵدانی حەزرەت (ص) بەتەمەن درێژی سەعدی کوڕی ئەبی وقاص : سەعد دەڵێ :لەمەککە (پاش فەتح کردنی)نەخۆش کەوتم و حەزرەت (ص)سەری دام ، ئەو حەزی نەدەکرد کە بمرێت لەوشوێنەی کە کۆچی کردووە لێی و فەرمووی :خوا ڕەحم بکات بە (**ابن عفراء**)(کە لە مەککەدا کۆچی دوایی کرد)... وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەوێ ماڵەکەم هەمووی بکەم بەخێر ،فەرمووی : ناوامەکە ، وتم : نیوەی دەکەم بەخێر ، فەرمووی : نابێ ، وتم : یەك لەسەر سێی دەکەم بەخێر ، فەرمووی یەك لەسەرسێ باشەو زۆریشە ، تۆئەگەر منداڵەکەت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی باشترە

لەوەی کە بە هەژاری بەجێیان بهێڵی و دەست لەخەڵك پان بکەنەوە ، جاتۆ هەرچیش بۆ خۆت ومالْ ومناڵیش خەرج بکەی هەرخێرە،تەنانەت ئەو پارەوش کە دەیکەیت بەدەمی هاوسەرەکەتەوە هەربەچاکە بۆت دەنوسرێت ، جاتۆش ڕەنگەخوا بتهێڵیْ و تەمەن درێژت بکات تا کەسانێك سوودمەندبن لێت و کەسانێکیش زیانیان پێبگات.. (صحيح مسلم ).

بەڵیْ ...سەعد دەترسا لەمەککە بمرێت لەو نەخۆشیەداو ، کەچی حەرزەت (ص)نەی هێشت وەسیەت بکاو ماڵەکەی هەمووی ببەخشیْ و فەرمووی کە تۆ دەمێنی ، ئەوەبوو پەنجا ساڵێکی تر ژیاو ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە فتوحاتی ئیسلامیداو کەسانێکی زۆر بەهۆیەوە موسڵمان بوون کە بەمەش سوودمەند بوون ، کەسانێکیش کە بڕوایان نەهێنا و دژایەتیان کرد تیاچوون و زیانمەندبوون ...

**هەژدەیەم / هەواڵدانی حەزرەت ( ص )بەشەهید بوونی ( حسين ):** حەزرەت(ص)ڕۆژیْ بەیەکیْ لەخێزانەکانی فەرموو : (مەلائیکەتێك هاتە لام لەماڵەوە ، کە هەرگیز لەوەوبەر نەهاتووە ، پێی وتم : ئەم کوڕەی تۆ (حسين)شەهید دەبیْ و ، ئەگەر دەتەویْ ئەو گڵەشت پیشان دەدەم کە لە سەری شەهید دەبیْ ، ئنجا گڵێکی سووربای پیشان دام ...(صحيح)ەو ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە، ئەم هەواڵەش لە ساڵی شەست و یەکی کۆچیداهاتەدیو لە کەربەلا شەهید کرا لەگەڵ حەقدەکەس لەئەهلی (بيت). ل ١٢٨نبوءات الرسول ماتحقق منها وما يتحقق.

**نۆزدەیەم /هەواڵ دانی حەزرەت ( ص )بەکوێر بوونی زەیدی کوڕی ئەرقەم :**

ڕۆژێك حەزرەت (ص)سەردانی زەیدی کوڕی ئەرقەمی کرد کە نەخۆش بوو ، پێی فەرموو : ئەم ناساغیەت هیچ نیە ، بەڵام چۆن دەبیْ ئەگەر دوای من تەمەن درێژ بیت و کوێر ببی ، زەید وتی : کەواتە ئارام دەگرم و چاوەڕێی پاداشتی خوا دەکەم ، ئەویش فەرمووی : کەوابیْ بەبیْ حساب دەچیتە بەهەشتەوە .

(حديث حسن)رواه طبراني وأحمد/ ئەم هەواڵەی حەزرەتیش (ص)هاتەدی و زەید بەو نەخۆشی یە هیچی لیْ نەهات و چەندەها ساڵ ژیا دوای حەزرەت و پاشان لەساڵانی دوایی تەمەنیشی دا کوێر بوو ...

**بیستەم/هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەوەی کە ( محمد کوڕی مەسلەمە ) فیتنە کاری تێناکات:**

حوزەیفەی یەمانی (کاتم سڕی)پێغەمبەر بوو (ص)، وتی هەرکەس بگاتە زەمانی فیتنە من دەترسم لێی کەتێوە بگلێ و کاری تێبکات ، تەنها محمدی کوڕی مەسلەمە نەبێت کە گوێم لێ بوو حەزرەت (ص) پێی فەرموو: تۆ فیتنەکارت تێناکات وزیانت پێناگەیەنێت(حاکم ڕیوایەتی کردووەو صحیح)ە.

هەرواش دەرچوو کە حەزرەت (ص)فەرمووی لەزەمانی فیتنەکەدا محمدی کوڕی مەسلەمە لەجیاتی شمشێرەکەی شمشێرێکی تەختەی هەڵگرت و چووە ناوچەی (الربذة)و بەشداری هیچ لەئاژاوە و فیتنەی نەکردو پاشان گەڕایەوە مەدینە و لەساڵی (٤٣)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد ل١٣١ / نبوات الرسول.

**بیست ویەك: هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەشەهید بوونی کۆمەڵێ لەهاوەڵانی**

حەزرەت(ص)لەسەر کێوی( حراء) بوولەمەککە ، لەگەڵ ئەبوبەکرو عمرو عوسمان و علی و تەڵحەو زوبەیر ، کێوەکە لەرزی ، حەزرەت (ص)فەرمووی ئارامبە ئەوەی لەسەرتە یان پێغەمبەرە یان (صدیق)ە یان شەهیدە (موسلیم).

جارێکی تریش لە مەدینە ،حەزرەت (ص)و ئەبوبەکر و عمرو عوسمان لەسەرکێوی ئوحود بوون و شاخەکە لەرزەیەکی کرد حەزرەت (ص)هەمان شتی فەرموو (بخاری ڕیوایەتی کردووە)..ل ١٢٤ نبوات الرسول.

ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە یەکەم هەواڵە بەوەی کە ئەبوبەکر (صدیق) ەوشەهیدنابێ‌وئەوانی تر هەموو شەهید دەبن هەرواش دەرچوو کەحەزرەت(ص) فەرمووی ، ئەوهاوەڵانە هەموویان شەهید بوون

**بیست و دوو : هەواڵدانی حەزرەت ( ص )بەماوەی تەمەنی عبداللە ی کوڕی بسر :**

حەزرەت (ص)بە (عبداللە) ی کوڕی (بسر)ی فەرموو (کەمناڵ بوو): ئەم غولامە(قرن)ێك دەژی.(بالوکەش بەدەموچاویەوە بوو)فەرمووی ناشمرێت هەتائەوبالوکانەی دەموچاوی لائەچێت/حاکم ڕیوایەتی کردووەو(صحیح)ە.ئەم هەواڵەش هاتەدی بەوەی کە عبداللە سەد ساڵ ژیاو ئەوکاتەی مرد ئەو بالوکانەی بەدەموچاوی یەوە بوو نەمان ل ١٢٨ نبوات الرسول

**بیست و سێ: هەواڵدانی حەزرەت(ص)بەئاسایشی نیوەدوورگەی عەرەب :**

عەدی کوڕی حاتەم دەڵێ کاتێ لەلای پێغەمبەر بووم (ص)پیاوێك هات وشەکوای هەژاریکرد،ئنجا یەکێکی تر هات و شەکوای لە دزوجەردەی ڕێگا کرد ، حەزرەت (ص)فەرمووی :ئەی عەدی ئایا حیرەت بینیوە ؟ وتم: نەخێر نەمدیوە بەڵام بۆم باسکراوە ، فەرمووی :ئەگەر بمێنی دەبینی کە ئافرەتێك لە (حیرە)وە دێت و تەوافی کەعبە دەکات و لەخوا نەبێ لەکەس ناترسێت (واتە:کەس ڕێی لێناگرێ و ئاسایش دەبێت )، منیش لەدڵی خۆما وتم ئەی دزوجەردەکانی (طی)کە دنیایان سەرقاڵ کردووە چییان لێ دێت ..(بخاری گێڕاویەتیەوە)...

ئنجا پاش چەندەها ساڵ کە لە سەردەمی خولەفای ڕاشیدین دا هەموو نیوە دوورگە خیرایە ژێر ڕکێفی ئیسلامەوە ، عەدی وتی بەڕاستی ئەوەتا دەبینم کە ئافرەتێك لە (حیرە)وە لەعێراق دێت بۆ تەوافی کەعبەو لەخوا نەبێت لەکەس ناترسێت ... (بخاری)ل١٤٥ نبوات الرسول.

**بیست و چوار : هەواڵدانی حەزرەت (ص)بەفەتحی ئیسلامی:**

حەزرەت (ص)فەرمووی زەمانێك دێت کۆمەڵێکی زۆر لەخەڵکی غەزا دەکەن ، دەوترێت:هاوەڵی پێغەمبەرتان تیایە، دەڵێن :بەڵێ ، بەهۆی ئەوەوە فەتح دەکەن و سەردەکەون ، ئنجا زەمانێك دێت دەوترێت :کەسێکتان تیایە هاوەڵێتی ئەصحابی پێغەمبەری کردبێت ، دەوترێت بەڵێ ، بەهۆی ئەو کەسەوە فەتحیان بۆ دەکرێت ، ئنجا زەمانێك دێت دەوترێت کەسێکتان تیایە هاوەڵێتی هاوەڵانی ئەصحابی پێغەمبەری کردبێت ، دەڵێن بەڵێ ، بەهۆی ئەوەوە فەتحیان بۆ دەکرێت بخاری ومسلم

ئەمەش لەپاش وەفاتی حەزرەت (ص) هاتەدی بەوەی کەجیهادو بڵاوکردنەوەیئیسلام بەردەوام بوو ، ئنجا لەجەنگەکاندا بەهۆی یارانی پێغەمبەر (ص)یان هاوەڵی یارانی پێغەمبەر یان هاوەڵی هاوەڵی یارانی پێغەمبەرەوە (ص)فەتحیان بۆ دەکرا ، بۆنموونە :

کاتێك عەمری کوڕی عاص لەگەڵ (مقوقس)ڕووبەڕوو بووەوە لەمیسر ، زۆر لە موسڵمانان شکان و خۆیان نەگرت ، عەمر لۆمەی کردن و هانی دان لەسەر خۆ ڕاگری ، پیاوێکی یەمەنی پێی وت : ئێمە خۆ لە بەردو ئاسن دروست نەبووین !!

عەمر ڕووی لێوەرگێڕاوئیهمالی کرد ، ئنجا بانگی کردە یارانی پێغەمبەر (ص)، کە کۆبوونەوە پێی وتن :پێشکەون خوا لە سەردەستی ئێوەدا سەرکەوتن دەدات بەموسڵمانان،ئەوانیش پیاوانە جەنگان و خوا سەرکەوتنی دانی". ل١٤٩نبؤات الرسول .

**بیست وپێنج : هەواڵ دان بەفەتحی فارس و ڕۆم و نیوەدورگەی عەرەب ودەجال:** حەزرەت (ص)بەهاوەڵانی فەرموو : غەزای نیوە دوورگەی عەرەب دەکەن و خوا بۆتان فەتح دەکات ، ئنجا غەزای دەجال دەکەن و بەسەر ئەویش دا سەردەکەون و خوا فەتحتان بۆ دەکات .. (مسلم)ل١٥٠الوعود .

دیـارە پـاش چـەندە سـەدەیەك هـەموو ئەوانـە هاتنـەدی و ماوەتـەوە فیتنـەی دەجال،کـە ئیـدیعای خوایـەتی دەکـات.خـەڵکێکیزۆری پێـدە خەڵـەتێ و سـەرەنجام لەسەردەستی موسڵماناندا بەسەرکردایەتی حەزرەتی (عیسا) سەلامی خوای لێبێت دەشکێت و لەناودەچێت ... ئەمەش بێگومـان دێتـەدی ، ئـەوەی بگاتـە ئـەو زەمانـە دەیبینێ ... چونکە ئەوە سیان لە هەواڵـەکانی هاتنـەدی ، چوارەمیش بەهـەمان شێوە دێتە دی.

**بیست و شەش : هەواڵدان بەبلاوبوونەوەی سوو خواردن :** حەزرەت(ص)دەفەرموێ: ( **لیأتین على الناس زمان لایبقى منهم أحد إلا أكل الربا فمن لم یأكل اصابه من غبار**)( **ابن ماجة / حدیث صحیح**)ل٢٥٤ **النبؤات**. واتە:ڕۆژێك دێت کەس نامێنێ سووی نەخواردبێ،ئەوەش کەسووی نەخواردبێ پریشکی بەرکەوتووە (یان تۆزی سووی لێ نیشتووە)...

بەڕاستی ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە،چونکە لە سەردەمی حەزرەتدا سووخواردن هەبووە بەڵام بەهۆی ئەوەیکەئیسلام جەنگێکی گەورەی بەرپاکرد دژی سووخۆری و حەرامی کرد تەواو کەم بۆوە ..

باشە کێ دەڵێ سەرهەڵدەداتەوە ؟؟؟ باشە ئەگەر سەریشی هەڵدایەوە چۆن ئاوا زۆر بلاودەبێتەوە و هەموو کەس دەگرێتەوە ؟؟..

ئەگەر سەیری ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین ڕاستێتی ئەم فەرموودەیە بەچاکی دەبینین ، ئەوەتا هەموو کاروباری بانقەکان لەسەر سووخواردن بەندەو خەڵکانێکی زۆر سڵ لەسوو خواردن ناکەنەوە و زۆر کەسیش ئەگەر ڕاستەوخۆ سوونەخوات پڕیشکی بەردەکەوێت ..

**بیست وحەوت:هەواڵدان بە پەیدابوونی ستەمکارو ئافرەتی داپۆشراوی رووت:**

حەزرەت (ص)دەفەرموێت : ( **صنفان من أهل النار لم أرهما ، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة لايدخلن الجنة ولا يجدن ريحها وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا** )موسليم.

ئەم فەرموودەیە باس لەدووکۆمەڵ دەکات کەپەیدادەبن ، کۆمەڵێکیان ئەوانەن کەستەمکارن وبەقامچی کەهەروەك کلکی مانگایە سزای خەڵك دەدەن، کۆمەڵی دووەمیش ئافرەتانن کە داپۆشراوی ڕووتن ، هەرچەند بەناو جلیان لەبەردایە بەڵام لەبەرتەنکی یان تەسکی یان کورتی وەك هیچیان لەبەردا نەبێت وایە ، کە ئەمڕۆش لە هەمووکات زیاتر ئەم دیاردەیە دەبینین لەو مۆدەی جل و بەرگانەی کە هەر ڕۆژەی جۆرێکەو هەمووشی بۆ جوڵاندنی ئارەزوواتە و بۆ خۆشکردنی ئاگری فەسادە ..

**بیست وهەشت:هەواڵدان بەنەمانی حوکمی ئیسلامی وپاشان نوێژکردن :**

حەزرەت(ص)دەفەرموێت: ( **لينقضن عُرى الاسلام عروة عروة فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها وأولهن نقضاً الحكم وآخرهن الصلاة** ) (**أحمد/ حديث حسن** ) واتە : قوڵفەکانی خێمەی ئیسلامەتی یەك یەك دەپچڕێت ، هەرکاتێك یەکێکیان پچڕا خەڵکی دەست بەوی تریانەوە دەگرێ ، یەکەمیان حوکمە و دواهەمینیان نوێژە.

بەڕاستی هەروادەرچووە،خەلافەتی ئیسلامی ڕووخێنرا و دوژمنان هەر ڕۆژەو بیانوویەك بە ئیسلام دەگرن و خەڵکانێکی زۆریش وازیان لە نوێژ کردن هێناوە و تەنها بەناو موسڵمانن ...

**بیست و نۆ : هەواڵدان بە هێرشی دوژمنان بۆ سەر موسڵمانان :** حەزرەت (ص)دەفەرموێت :( **يوشك الامم أن تداعى عليكم كما تداعى الآكلة إلى قصعتها ، فقال قائل : ومن قلة نحن يومئذ ؟ قال : بل انتم يومئذ كثير ولكنكم غثاء كغثاء السيل ، ولينزعن الله من صدور عدوكم المهابة منكم ، وليقذفن الله في قلوبكم الوهن ، فقال قائل : يارسول الله وما الوهن ، قال : حب الدنيا وكراهية**

الموت)حديث حسن/أبوداود .واته :ڕۆژێك دێت گەلان هێرش دەكەنە سەرتان ، هەروەك چۆن كۆمەڵە وشترێكی برسی هێرش دەبەن بۆ ئالف و خواردنیان ، یەكێ وتی : لەو ڕۆژەدا لەبەركەمیمانە ئاوامان لێدێت ؟ فەرمووی : نەخێر ، بەڵكو ئێوە لەو ڕۆژەدا زۆرن ، بەڵام وەك كەف و پوش و پەڵاشی سەرلافاو وان و ، خوای گەورە ترستان و هەیبەتتان لە دڵی دوژمن دەردەكات و لاوازی (الوهن)دەخاتە دڵتانەوە ! یەكێوتی:ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لاوازی (الوهن)ە چییە ؟ فەرمووی : خۆشەویستی دنیاو حەزنەكردنە لەمردن .

بەڕاستی ئەم فەرموودەیەش وەك ئەوانی تر هاتۆتەدی ، ئەوە حاڵی موسڵمانان كەچۆن دنیا سەرگەرمیان دەكاو حەزناكەن گیان فیدا بن و حەزناكەن بمرن لە ڕێی خوادا ، ئەمەش دیسان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە حەزرەت(ص)داهاتوویئومەتەكەی و قۆناغەكانی ژیانیانی پیشاندراوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە كە زانایە بە (غیب و شهادە)... ئەم ڕێنماییانەی حەزرەتیش (ص)بۆ ئەوە بووە كەموسڵمانان لەخۆیان تێبگەن و شارەزای دەردو نەخۆشی‌یەكان بن و بتوانن چارەسەری بكەن و دوژمنان باشتر بناسن و نەخەڵەتێن بەفاكوفیكی ناحەزان و پڕوپاگەندەی پیاوانی شەیتان .

**سی/هەواڵدان بەشوێن كەوتن و چاولێكردنی گاورو جوولەكە :** حەزرەت (ص)دەفەرموێت : **(لتتبعن سنن من كان قبلكم شبراً بشبر ذراعاً بذراع حتى لو سلكوا جحر ضب لسلكتموه قلنا يارسول الله اليهود والنصارى؟؟ قال فمن.../ بخاري ومسلم/...** .

واتە : بەڕاستی شوێنی ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەكەون بست بەبست و باڵ بەباڵ ،تەنانەت ئەگەر بچنە كونی بزن مژەشەوە دەچن بەدوایاندا ، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ص)مەبەستت جوولەكەو گاورە ؟

فەرمووی :ئەی گوایە كێ ؟!

ئەمە خوێندنەوەیەكی داهاتووە،كەحەزرەت (ص)پێش زیاتر لەچواردە سەدە ئاماژەیپێكردووەوسەددەر سەدیش تەواوە،ئەوەتاجوولەكە و گاور كۆڵنادەن(ولن ترضى عنك اليهود ولاالنصارى حتى تتبع ملتهم)البقرة١٢٠ ، نەگاور نەجوولەكە لێت ناگەڕێن وڕازی نابن تادوایان نەكەوی ، بۆئەم شوێنكەوتنەش بەملیارەها دۆلار سەرف دەكرێ و هەرچی هۆكاریش هەیەخراونەتەكار لە كەناڵە فەزاییەكان و ڕۆژنامەو

گۆڤارەکان  پڕوپاگەندەی ئەڵقەلەگوێکان و کڕێنی خەڵکان (**يصبحُ الرجل مؤمناً وُيمسي كافرا يبيع دينه بعرض من الدنيا** )(بەیانی کابرا موسڵمانە و ئێوارە دەبێتە کافرو ئاینەکەی دەفرۆشێت بەدنیا).

**سی ویەك : هەواڵدان بە پەیدابوونی کەسانێك کەلافی پێغەمبەرایەتی لێئەدەن**

:حەزرەت(ص): ( **لاتقوم الساعة حتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين كلهم يزعم انه رسول الله** ) **بخاری وموسلیم**...

واتە :قیامەت نایەت تاوەکو نزیکەی سی دەجالی درۆزن پەیدا نەبێت کەخۆیان بەپێغەمبەر دەزانن ...

ئەمەش هاتۆتەدی لەزەمانی حەزرەتەوە (ص)تائەمڕۆ کەئەوانەی ناویان هەیەو کاریگەرێکیان بووە نزیکەی سی کەسێك دەبن وەك (اسود العنسى، مسيلمةالكذاب)کەهەرزوو لەزەمانی حەزرەتدا (ص)پەیدا بوون ، لەم سەردەمەی خۆشماندا (بابی و بهائی و قادیانی )سیَ نموونەن لەم بوارەدا و کەسانێك هەن کە تائێستا پێیان خەڵەتاون....

**سی و دوو : هەواڵدان بەبوونی ئەهلی خێر لەهەموو زەمانێکدا :**

حەزرەت (ص)دەفەرموێت: ( **لاتزال طائفة من أمتي ظاهرين حتى يأتيهم أمرالله وهم ظاهرون** ) **بخاري**/ واتە: کۆمەڵیَ لەئومەتم لەسەر ئیمان و ئیسلامەتی دامەزراو دەبن تائەوکاتەی کەخوای گەورە بایەك دەنێریَ و پێش قیامەت هەرچی بڕوادارە دەیباتەوە و ئەهوالی قیامەت بەسەر بیَ بڕواکاندا دێت ..

ئەمەش بەڵگەیە کەخوا نوری ئیسلام درێژە پێدەدات و کۆمەڵێك هەردەبن سەرمەشق بن بۆ ئەوەی هەرچی هەقی بویَ چاویان لیَ بکات ...

**سی وسیَ / هەواڵدان بەتازەبوونەوە و( تجديد ) ی ئیسلام :**

حەزرەت (ص)دەفەرموێت : ( **إنّ الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مائة سنة من يجدد لها دينها** )( **أبو داود /صحيح** ). واتە: خوای گەورە بەڕاستی هەموو سەری سەدساڵێك کەسێك دەنێرێت کە دینی خوا تازە بکاتەوە و موسڵمانان هوشیار بکاتەوەو ببێتە (مجدد)

بۆیان ، ئەمەش بەدرێژایی مێژووی ئیسلامیدەبینین وەك (حسن البصری،عومەر عبدالعزیز ، عبدالقادری گیلانی ، مەودودی ، بەننا).

## (گەشبینی پەروەردەی ئیسلامی )

حەزرەت (ص)هەرچی پێویست بێت بەئوممەتی گەیاندووە، بۆیە دەست گرتن بەقورئان و سوننەتەوە ، مایەی ڕزگاری وسەرفرازی یە لەهەموو کات و شوێنێكدا ... وتمان حەزرەت (ص)باسی فیتنەوئاشوبی بۆموسڵمانان كردووە تابەرچاو ڕوون بن و بزانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكەن ...

ئەم باسی فیتنە و ئاشووبەش بۆ ئەوەنەبووە كە بڕوادار بێ هیوابێت و بڵێ : تازە كارلەكار ترازاوە و چیمان بۆدەكرێت ؟ نەخێر ، بەڵكو بە پێچەوانەوە بۆئەوە بووە كەهەمووی بەیەكەوە سەیر بكرێ و لەهەموو گۆشەكانیەوە بخوێنرێتەوە ، واتە نابێ یەكێ فەرموودەیەك بێنێ لەبارەی فیتنەوەو بێ هیوابێ ... چونكە چەندەها فەرموودەی تریشمان هەیە كەباس لەداهاتوویەكی گەش دەكەن بۆ ئیسلام و باس لەزاڵبوونی موسڵمانان دەكەن بەسەر ئەو كۆسپانەدا ...

ئیبن عباس دەڵێت : (**كان رسول الله (ص)يتفاءل ولا يتطير**)واتە : هەمیشە پێغەمبەر (ص)گەشبین بووەو هەرگیز بێ هیوا نەبووە ...

ئـەوەتا لەگەرمـەی نارەحـەتی وفـشاری دوژمنـان دا گـەش بینـەو بـەنووری پێغەمبەرایەتی دەڕوانێتە دنیاو ڕووداوەكان و دەفەرموێت : (**والـذي نفسي بيده ليفرجن الله عنكم ماترون من الشدة ، وإني لأرجو أن أطوف بالبيت العتيق آمنا، وأن يدفع الله إلي مفاتيح الكعبة . وليهلكن الله كسرى وقيصر ، ولتنفقن كنوزهما في سبيل الله**)بخاری ومسلم ، واتـە : بـەو خوایـەی گیـانی منـی بەدەسـتە بـەدڵنیایی خوائـەم نارەحـەتی وفـشارانەمان لەسـەرهەڵدەگرێت كـەدەیبینن ، وە مـن هیـوادارم كـە بـێ تـرس و بەئـەمینی تـەوافی كەعبەبكەم و خوای گەورە كلیلەكانی كەعبە بداتـە دەستم ، وە هـەروەها خوای گـەورە كیسراو قەیسەر لەناوبەرێت و ماڵ و سامانیان بەخت بكەن لە ڕێی خوادا.

## (مەشخەڵدارانی پەیامی خوا )

مەشخەڵدارانی پـەیامی خـوا دەست بەدەست ئـەم بەرنامەیە دەگەیەنن و خـۆری ئیـسلام ئەگـەر بـۆ ماوەیـەكی كـەم بـشگیرێت ، هـەرگیز ئاوانابێـت تـاوەكو ژیـان لـەم

سەرزەوی یەدا مابێت ... حەزرەت(ص)دەفەرموێت : **( لاتزال طائفة من أمتی قائمة بأمر الله لا یضرهم من خذلهم أو خالفهم حتی یأتي أمر الله وهم ظاهرون علی الناس )**مسلم... واتە : بەردەوام کۆمەڵێ لەئومەتم هەڵدەستن بە گەیاندنیبەرنامەیخواو زیانیان پێناگەیەنێ ئەوانەی کەپشتیان ناگرن یان دژایەتیان دەکەن ، تاوەکو قیامەت دێت و ئەوان لەناو خەڵکا دیارن و ناتوێنەوەو هەمیشە سەر مەشقن .. لە فەرموودەیەکی تریش دا دەفەرموێت : **( لایزال الله یغرس في هذا الذین غرساً یستعملهم في طاعته )**ابن ماجە وأحمد وابن حبان. واتە: بەردەوام خوای پەروەدگار کۆمەڵە کەسانێك دێنێ کە لەخزمەت بەرنامەی خوادابن و کاری بۆ بکەن ..

**( بڵاوبوونەوەی ئیسلام )**

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە بە سەرپەرشتی ئەزهەر کرا دەرکەوت کرداره سەربازی یەکانی پێغەمبەر (ص)نزیکەی هەشتا غەزاو سریە بووە وتەنها لەحەوتیاندا شەڕ ڕووی داوەو ، لەهەموو ئەو شەڕانەش دا لەموسڵمانان سەدو سی و نۆکەس شەهید بوون و لەکافرانیش سەدو دوانزەکەس ، وەهەمووی دەکاتە دووسەدو پەنجاویەك کەس ، کەنزیکەی ژمارەی ئەوکەسانەیە کە لەڕووداوی ئوتومبیلدا لەشارێکی مام ناوەندی دا لەناو دەچن لەساڵێکدا...

بەڵێ ... ئیسلام بەنیوە دوورگەی عەرەبدا بڵاوبۆوە بە ڕێنمایی حەزرەت (ص)کەنابێ ئافرەت و منالْ و پیروپەککەوتە بکوژرێت و دەبێ دەستبپارێزن مەگەر کەسێك کە بەفیعلی ڕووبەڕوویان ببێتەوە ..

دوژمنان پڕوپاگەندە دەکەن کەئیسلام بەزۆر و بەشمشێر بڵاوبۆتەوە کەچی لەراستیدا وانەبووە ...ئەوەتالەسەد ساڵی یەکەمی هیجرەتدا ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە دەرەوەی نیوەدوورگەی عەرەبدا بەم شێوەیە بووە :

لە وڵاتی فارس ڕێژەی موسڵمانان لەسەدا پێنج بووە (٥٪ )..

لە وڵاتی عێراق ڕێژەی موسڵمانان لەسەدا سێ بووە (٣٪) ..

لە وڵاتی سوریا ڕێژەی موسڵمانان لەسەدا دوو بووە (٢٪) ..

لە وڵاتی مصر ڕێژەی موسڵمانان لەسەدا دووبووە (٢٪) ..

لەوڵاتیئەندەلوسیش دا ڕێژەی موسڵمانان کەمتر بووە لەسەدایەك (١٪)

ئیسلام لەو ڕێژە کەمەوە وردەوردە بەکاریگەری بەهێزی لەسەردڵ و دەروون خەڵکانێکی زۆری کێش کرد بەرەو ئیسلام تاوەکو ڕێژەی لەو وڵاتانەدا لەم ساڵانەدا بوو بە لە سەدا بیست و پێنج (٢٥٪)..

لەئێران لەساڵی (١٨٥)ك ..

لەعێراق لەساڵی (٢٢٥)ك ..

لەسوریە لەساڵی(٢٧٥)ك ..

لەمیسر لەساڵی (٢٧٥)ك ..

لەئەندەلوس لەساڵی (٢٩٥)ك ..

پاش هەوڵ وکۆششێکی زۆری تر هەر بەکاریگەری خووڕەوشتی جوان و هەربەموعجیزەی قورئان وفەرموودە ڕێژەی هاتنیخەڵك زیاتر بوو بەرەو ئیسلام تا گەیشتە لەسەدا پەنجا (٥٠٪)لەو وڵاتانەدا بەم شێوەیە :

لەئێران لەساڵی (٢٣٥)ك

لەعێراق لەساڵی (٢٨٠)ك

لەسوریە لەساڵی (٣٣٠)ك

لەمیسر لەساڵی (٣٣٠)ك

لەئەندەلوس لەساڵی (٣٣٥)ك

پاش چەندەها ساڵی تر ڕێژەی ئیسلام گەیشتە (٧٥٪) بەم شێوەیە :

لەئێران لەساڵی (٢٨٠)ك

لەعێراق لەساڵی (٣٢٠)ك

لەسوریە لەساڵی (٣٨٥)ك

لەمصر لەساڵی (٣٨٥)ك

لەئەندەلوس لەساڵی (٤٠٠)ك

کەواتە خەڵکی بەزۆر و بە شمشێر نەبوون بە موسڵمان بەڵکو زۆر بە لەسەرخۆیی بڵاوبۆتەوەوهەرئەوەندەیحکومەت و دەسەڵاتدارە تاغووتەکان نەمان وموسڵمانان ئەوبەربەستەیان شکاندو خەڵکی ئازاد بوون ئیتر خەڵکی هاتن بەرەو ئیسلام ..

ئاشکرایه له ئیسلامدا زۆر کردن نیه ﴿وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾( الكهف:٢٩ ) وه ﴿لا إكراه في الدين قد تبين الرشدُ من الغي فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى لا أنفصام لها والله سميع عليم ﴾( البقرة :٢٥٦)

واتــه: پێیــان بڵــێ هــەق وراســتی لــه پەروەردگارتانەوەیە،هەرکــەس دەیــەوێ باپروابهێنێ و هەرکەس نایەوێ باپروانەهێنێ

(زۆرکردن نیه له وەرگرتنی بیروباوەڕیئیسلامدا،چونکه بەڕاستی ڕێبازی چاك ودروســت ڕوون و ئاشــکرا بووەوجیابۆتــەوه لــه گــومڕایی و سەرکەشــی ، جائــەوەی بـاوەڕی نـەبێت بـه تـاغوت و بـاوەڕی دامـەزراو بێنێـت بـەخوا ، جابێگومـان ئـەو کەسـه دەستی گرتووه به بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوه ، شوێن دامەزراوترین بیروباوەر کەوتووه کەپسانی بۆنیەو هەڵناوەشێ ، خوایش بیسەرو زانایه ).

ڕەنگه یەکێك بڵێ ئەی ئەو جەنگانەی ڕوویان دا لەگەڵ عەرەب و فارس و ڕۆم دا بۆچی بوو ؟!

دەڵــێین ، هەریەکــه لەدەســەڵاتدارانی عــەرەب و دەســەڵاتدارانی فــارس و ڕۆم ڕێگربــوون لەبەر ئیسلامدا کـه خـەڵکی بەئازادی بیبیستن و بەئازادی دوای بکـەون ، واته ئەوانه بەربەست بوون لـه ڕێـی ئازادی فیکری خەڵکدا ئیسلامیش بەفەرمانی خوا ئەو بەربەستانەی لابرد بەڵام هەرگیز گەلانی قڕنەکردوهەرگیز به زۆر خەڵکی نەکردبه موسڵمان،چونکه بڕواهێنـان لـه دڵدایەو کـەس نـاتوانێ بەزۆر فەرزی بکـات و بیــسەپێنێ شــایەتیش بۆئــەم ڕاســتی یــه ، ئــەوەتا کەنیــسەکان و شــوێنی پەرستشەکانی ئاینەکانی تر تائێستا ماون ،ئەوەتا شوێن کەوتەی ئاینەکانی تر له دێر زەمانەوه تائێستا ماون و زۆر بەشیان دان بەو ڕاستیەدا دەنێن کەئیسلام بەزۆر بڵاونەبۆتەوه ، بەپێچەوانەی خەڵکانی ترەوه کەبەئاگرو ئاسن لەگەڵ غەیری خۆیان مامەڵەیان کردووه ، ئەوه جەنگی خاچ پەرستان ، ئەوه (محاكم التفتيش)لەئەندەلوس ، ئــەوه ئیــستعماری ڕۆژئــاوا ، ئــەوه جــەنگی جیهــانی یەکــەم و دووەم کــەزیاتر لــه (٥٠)ملیۆن کەسی تیاکوژرا و بەملیۆنەها ئافرەت و منداڵ بێ کەس مانەوه!

ئاشكراشه كەئەمریكیيەكان چی ئەفریقی داماویان ڕفاندو كردیانن بەكۆیلە لای خۆیان و كڕین وفرۆشتنیان پێوەدەكردن ، كەخاڵێكی ڕەشە بەناوچەوانیانەوە ومێژووش هەمووی لەسەر تۆمار كردوون ..

ئەوە ڕووسیای ڕووسیاش كە نزیكەی (٢٥)ملیۆن موسڵمانیان لەناوبرد لە زیندانەكان ولەسیبریادا كە بەزۆر دەیانویست سەركوتیان بكەن و ئاینەكەیان پێبگۆڕن .

یان قەتڵ و عامی ئەمریكی یەكان لەڤێتنام كە نزیكەی سێ ملیۆن كەس بەخۆڕایی كوژرا ،ئەوەش هێرۆشیماو ناكازاكیو ڕەفتاریان لەوڵاتانی تر خۆتان حەكەم بن ..

بەڕاستی زۆر سەیرو سەمەرەیە ئەوەی دەستی بەخوێن سوورە دەیەوێت ئیسلام تۆمەتبار بكات و دەستە چەورەكەی بەپاكترین و بەڕێزترین بەرنامەدا بسوێت و هەروا بەقاڵەی دەم لێی دەرچێت !

## خۆری شارستانێتی یەكی نوێ وا هەڵدێ !

* بیریار ماكنیل دەڵێت (شارستانیەتی خۆرئاوا لەم دواییانەدا وەكو وەحشێكی لێهاتووە ، كەئەوەندە دڕندەبووە پەلاماری هەموو مەعنەویاتێك دەدات وهەموو بەها بەرزو باڵاكان دەشكێنێ و ئنجا چنگی ئاڵاندۆتە ڕیخۆڵەكانی خۆی و لەوەدایە خۆی لەناوبەرێت)ل ٤٨١المعجزه المتجدده ..

شبلنجر دەڵێت (شارستانێیەكان دەوراتی فەلەكیان هەیە ، لێرە ئاوا دەبێت لە شوێنێكی تر هەڵدێت ، شارستانێتیيەكی نوێ خەریكە هەڵدێت لەجوانترین شێوەدا كە ئەویش شارستانێیەتی ئیسلامەكە گەورەترین توانای جیهانی ڕۆحی پاكی هەیە )ل ٤٨٠المعجزه .

*بیریاری فەرەنسی دیباسكیه دەڵێت : (بەڕاستی ڕۆژئاوا ئیسلامی نەناسیوەو، هەر لەسەرەتاوە ڕۆژئاوا چۆتە بەرەی دژایەتیيەوەو كۆڵی نەداوە لە بوختان كردن بۆی ، ئەمەش بۆ ئەوەی بیانووی بەدەستەوە بێت بجەنگێ لەگەڵیا ، ئەمەش وای كردووە لەعەقڵیەتی ڕۆژئاوادا بیروبۆچوونی ناڕاست بچەسپێ ... بێگومانیش تەنها

یەکخواناسی‌یەکەی ئیسلامە کە جیهانی سەردەم ڕزگار بکات لەسەر گەردانی‌یەکانی ژیاری ماددی سەردەم کەئەگەر بەردەوام ببێت مرۆڤایەتی لەناو دەبات )..

* برنارد شو لە بەریتانیاوە بەهەموو جیهان دەڵێ: (ڕۆژێك دێت کە ڕۆژئاوا ئیسلام وەردەگرێت ، بەڕاستی چەند سەدەیەك ڕابوورد کەڕۆژئاوا تەنها ئەو شتانەی دەخوێندەوە کە دژ بەئیسلام و پێغەمبەرەکەی بوو ، بەڵام ئەمڕۆ قورئان وەرگێڕدراوەوپەڕاوی‌ئیسلامی‌نوسراوە بەزمانەکانی ئەورپاو پیاوانی ڕۆژئاوا تێگەیشتن کەئیسلامی ڕاستەقینە ئەوە نەبووە کە لەپەڕاوو ڕۆژنامەکانی پێشوودا دەیانخوێندەوە) ل ٤٨٢المعجزە .

* نووسەری بەناوبانگ (لیونارد)دەڵێت: (بەڕاستی ئیسلام فەزڵی هەیە بەسەر ئەورپاوەکەپێویستەدانی‌پێدابنێین، لە داهاتوویەکی نزیکدا بێگومان ئەورپا و قارەی مەسیحیەتیش دان دەنێن بەوەدا کەئیسلام وموسڵمانان فەزڵیان هەیە بەسەریانەوە .

*لێکۆڵەری بیانی (نسکس)دەڵێت (بەڕاستی موسڵمانان ڕۆژانە زیاد دەکەن، کەئەمەش بەڵگەی زیندویەتی و پایە بەرزی ئیسلامە)...

* گەورەترین زانای ئەڵمانی دەرمانی نەخۆشی‌یە زایەندی‌یەکان (پرۆفیسۆر یوفولیفل تن)لەزانکۆی بەرلین دەڵێت (هەرگیزا و هەرگیز چارەسەرێك نادۆزینەوە باشتربێت بۆ نەخۆشی یەکانی زایەندی لەم فەرموودەیەی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر (محمد)(ص)لەقورئاندا کەخوا تیایدا دەفەرموێت : ﴿قل للمؤمنين يَغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون ، وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن و يحفظن فروجهن ولا يُبدين زينتهن إلا لبُعُلتهنَّ أو آبا ئهنَّ أو آباء بعولتهنَّ أو أبناء بعولتهنَّ أو إخوانهن أو بني إخوانهنَ أو بني إخوانهَنَ أو بني أخواتهنَ أو نسائهنَ أو ماملكت أيمانهن أو التابعين غير أولي الإربة من الرجالِ أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء ولا يضربن بأرجُلهنَ ليُعْلَمَ مايُخفينَ من زينتهنَّ وتُوبوا الى الله جميعاً أيهاالمؤمنون لعلكم تفلحون﴾( النور: ٣٠-٣١ )

واتە : ئەی پێغەمبەر (ص)بەپیاوانی بڕوادار بڵێ : چاویان بپارێزن لە سەرنجدانی‌ئافرەتانی‌نامەحرەم، داوێنی‌خۆیان بپارێزن لە گوناهو ،جوانی خۆیان دەرنەخەن جگەلەوەی کەدیارە (دەم چاوو دەست)،باسەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر

سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوی بۆهاوسەرەکانیان نەبێت ،یان باوکی خۆیان ، یان باوکی مێردەکانیان ، یان کوڕی خۆیان ،یان کوڕیمێردەکانیان،یان بۆبراکانیخۆیان ، یان برازاکانیان ، یان خوشکەزاکانیان ، یان ئافرەتێك کە پەیوەندیان هەیە پێکەوە ، یان ئەوانەش کەنیزەکانیانن (کەلەبارودۆخی تایبەتدا هەبوون )یان ئەوانەی کە لەماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بەئافرەت نیە(لەبەر پیریونەخۆشی.. هتد)یاخودئەو منداڵانەیکە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتاندا نیەو (ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبووە )، نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن وپێیان بدەن بەزەویدا (تادەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت)و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن ، کەواتە هەمووتان ئەی بڕواداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆئەوەی ڕزگاروسەرفرازبن .

*(مسیو أوجین یوغ)دەڵێت (ئیسلام ئاینێکی ئاسانە بۆ مرۆڤ کەپابەندی ببێت ،لەبەرئەوەشە کەبەهەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوەو چۆتە قوڵایی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەوروپاو ئەمریکا)..ل ٤٨٩.

*زانای ئافرەتیفەڕەنسی (إفا لاماك دیمترا)دەڵێت (دیاردەی هاتن بەرەو ئیسلام لەئێستادا شایانی لەسەر وەستانە ،.. پابەند بوونی لاوانی ڕۆژئاوا بەئیسلامەوە سەرەنجامی ئەو پرسیارانەیە کە لەدڵ و دەروونیاندا هەیەو وەڵامیان دەست ناکەوێت لەئیسلامدا نەبێت... لەڕابردوودا زیاتر زانایان و مامۆستایان و لێکۆڵەرەوان دەهاتن بەرەو ئیسلام بەڵام ئێستا هەموو چین توێژەکان دێن بەرەو ئیسلام ) ل ٤٩٠ المعجزە .

*پرۆفیسۆر (لیونید سیو کیا نینیمن)پسپۆڕ لەیاسادا لەپەیمانگای (الدولە والقانون)لەڕوسیایئیتحادیئەڵێ(ئاسۆیەکیگەش و ڕوون هەیە بۆ سوود وەرگرتن لەشەریعەتیئیسلامیلەدەستووری نوێیڕووسیادا )ل ٤٩٤.

## سویدو نرویج و دانمارك و فنلندە

لە وڵاتانی ئەسکەندنافیا ڕابیتەی ئیسلامی کۆنفرانسێکی بەست لە (٢٣-٢٥)دیسمبری(٢٠٠١)زدا ، کە باس لە ڕووداوی ١١ی سێبتەمبەر و کاریگەریەکانی کرا ،لاوێکیقوتابیزانکۆیسویدیلەوکۆنفرانسەدا موسڵمانبوونیخۆی ڕاگەیاندو بووە

مایەیدڵخۆشیئامادەبووان وپیاوێکیپیری سویدیش ڤێللایەکیکرد بەوەقف کەببێتە بنکەی لەبەرکردنی قورئان .. ل٥٠١ المعجزه .

## هاتن بەرەو ئیسلام بەردەوامە!

**یەکەم/** بەهۆی هەوڵی کۆمەڵێ بانگخوازەوە لەوڵاتی سعودیەدا وەك دکتۆر زەغلول نجار وهاوەڵانی ، توانرا لەپێنج سەد هەزار سەربازو ئەفسەر کەهاتبوونە ناوچەی کەنداو بیست هەزاریان لێموسڵمان بکەن لەپیاوو ئافرەت ، زۆریان چوون بۆ حەج وعومرەوهەندێکیان کە فڕۆکەوان بوون نیوەی مووچەکەیان دەبەخشی بۆ دابینکردنی قورئان وبەخشینەوەی بەسەر هاوەڵانیاندا لە ئەمریکا /ل ٢٣٥ القوانین القرانیة للحضارات.

پیاو باشێك دەڵێت: چووم بۆ قاعیدەی مەلیك عبدالعزیزی ئاسمانی ، تاقسە بکەم لەگەڵ ئەو ئەمریکیانەیموسڵمان بوون ،یەکێك لەو ئەمریکیانەم بینی ، بالاّ بەرز و ڕووگەش و نورانی سەری هەموو سفر کردبوو،سەلامی لێکردم ، نیازم بوو لێی بپرسم بۆچی ئاوا سەری سفر کردووە ، ئەو پێشمکەوت و بەشانازی یەوە وتی : (تازە وا لەمەککە هاتومەتەوەو عەمرەم کردووە !) ..

وتم : ئەی باشە خۆ دەکرا تەنها قژت کورت بکەیتەوە و تۆزێکی لێ ببڕیت ، بۆچی ئاوا سفرت کرد .. ئەوەی سەیر بوو وەڵامەکەی خستمیە گریان ،وتی (هەموو تەمەنم خۆم بۆ ئافرەتان جوان دەکرد کاتی ئەوە هاتووە کەخۆم بۆ خوا جوان بکەم)... ل٥١٤ المعجزه .

(دیارە دەکرێت تەنها قژ کورت بکرێتەوە ، بەڵام خێری گەورەترە بۆپیاو کە هەمووی قژی بتاشێ و سفری بکات لە دوای حەج وعومرە ، ئەمیش بۆ زیاتر دەستکەوتنی پاداشت ئاوا سەری سفرکردووە، هەروەك ئەوەی کە لە نیوەڕۆی ڕەمەزاندا موسڵمان بوو بوو ، ئەو نیوە ڕۆژە یەکسەر بەڕۆژوو بوو نەیخستە سبەینێ و بڵێ قەیدی چییە وامن ئەمڕۆ موسڵمان بووم سبەینێ یەکجاری بەڕۆژو و دەبم!)..

**دووەم/**موسڵمان بوونی قەشەیەك لە تەنزانیا:

قەشەیەك لە تەنزانیا کوڕێکی دوانزە ساڵی دەبێت ، ڕۆژێك لە باوکی دەپرسێت : خوای سپی پێست و ڕەش پێستەکان جیاوازە ؟!

باوکی دەڵێ : بۆچی ئەو پرسیارە دەکەیت ؟!

دەڵێ : دەبینم کە ڕەش پێست بەجیا دەچنە کەنیسەوەو تائەوان نەیەنە دەرەوە سپی پێستەکان ناچن !

ئنجا کوڕە دەستی باوکی گرت تامزگەوتێکیان لێدەرکەوت کەنوێژی هەینی یان دەکردو هەموو ڕەگەزەکان بێ جیاوازی لەمزگەوتدابوون ...

کوڕەکە وتی : ئەوەتا لێرە هەموو یەك خوایان هەیە ، بۆ ئێمەش تەنها ئەو خوایە نەپەرستین ؟ باوکە واقی وڕمابوو ، نەیدەزانی چی بکات !!

دیارە کوڕەکەی پێشتر موسڵمان بوو بوو بەبێ ئەوەی باوکی بزانێت ، ئنجا کوڕەکەی باوکیبەجێهێشت وچووبۆناو مزگەوت بۆ نوێژی هەینی و زۆر پاڕایەوە کەخوا هیدایەتی باوکی بدات،خوای گەورەش نزاو پاڕانەوەکەی لێوەرگرت و باوکیشی موسڵمان بوو ...

***سێ یەم***/منداڵێك بەناوی (جورج میتسلوری)ڕەش پێست بوو لەخواروی ئەفریقیا نەخۆشکەوت و دایکی بردی بۆ نەخۆشخانە ، هەرچی پاڕایەوە ، پزیشکێکی سپی پێستی لێ بوو ڕازی نەبوو فەحسی بکات و چارەسەری بکات و، بەدایکەکەی وت:(چاکتر وایە بمرێت ئێمە نامانەوێ ئێوە لەناوماندا بمێنن )، خوا کردی منداڵ بەبێ داوودەرمان و پزیشك چاك بۆوەوگەورە بوو ، ئیسلامی ناسی لەسەر دەستی شێخ ئەحمەد دیدات و ناوی ئەحمەدو محمد ودیدات ی خۆشویست و ناوی خۆی گۆڕی بۆ (محمد علی دیدات)...

ئەم کوڕە بەردەوام بوو لەسەر خوێندن وحەزی دەکردببێتە پزیشك بەڵام نەبوونی ونەداری کۆسپ بوو لە ڕێی دا ، بۆیە نامەی نارد بۆ (محمد علی کلای)ئەویش کەفالەتیخوێندنی کردو پاش چەند ساڵێك هەوڵ و کۆشش ئاواتی هاتەدی و بووە پزیشك ... بەڵام چۆن پزیشکێك ؟! پزیشکێکی ڕەوشت موسڵمان کەجیاوازی لەنێوان کەسدا نەدەکرد ... ڕۆژێك سپی پێستێك هاتەلای و وای پیشان دا کەزۆر ناساغە و ئاهو ناڵەی بوو ...

هەرچەند فەحسی کرد هیچی وای شك نەبرد ...دواتر سپی پێستەکە کەزۆر سەرسام بوو لەمامەڵەیجوانی پێی وت :برا منیش وەك تۆ پزیشکم ویستم تاقیت بکەمەوە بزانم تۆش ڕەگەزپەرستی یان نا...

لەم ڕووداوەوە بوونە هاوەڵ وسەرەنجام موسڵمان بوو لەسەردەستی دکتۆرمحمد دیدات دا، هەرئەوەندەهەواڵەکەش بڵاوبۆوە خێرا دەسەلاتداران دکتۆرە سپی پێستەکەیان گێڕایەوە بۆ ئەوروپا ، چونکە لەگەڵ مژدەدەرەکاندا هاتبوو بۆ ئەو ناوچەیە ، بۆئەوەی کەسی ترچاوی لێنەکات.. جادکتۆر محمد علی دیدات دەڵێت (بەڕاستی ئیسلام دێت بۆ ئەوەی خۆشەویستی بڵاوبکاتەوە بەجیهاندا بەهۆی ڕێنماییە بەرزو باڵاکانیەوە).. المعجزه ل٥٢٤ .

چوارەم /موسڵمانبوونی زانای نەوتی ئەمریکی (أحمد بریان): زانانی نەوتی ئەمریکی موسڵمان بوو بەهۆی ئەوەی لە هەندێ لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا ژیانی بەسەربردو کاری کرد ، لەبارەی موسڵمان بونیەوە وتی (بەڕاستی ئیسلام ئاینێکی نەرم ونیان وئاسانەودەگونجێلەگەڵ هەموو کات و شوێن و سەردەمێکدا ، ئەوەندەش بەسە کە من دڵنیابووم کەدڵی پاکی بڕوادار دڵی موسڵمانانە)...

**پێنجەم / موسڵمان بوونی لویس ئارندریە گرافیل...**

ناوبراو لەگەڵ دایك وباوکیادەژیا لە واشنتۆن وهەرچیداوا بکردایە بۆی جێبەجێ دەکرا و نازیزۆریان دابوویە ...

ڕۆژێك پۆلیسێکی ئەمریکی بینی ڕەش پێستێکی بەوپەڕی وەحشیەتەوە ڕادەکێشا بەرەو ئۆتۆمبێلی پۆلیس و هەرچیش بەلایانا بڕۆیشتایە ، شتێکی ناشرینی دەکرد بەرامبەر ڕەش پێستەکە ، هی وابوو تفی لێ دەکرد ، هیوا بوو پیادە ماڵی ... هتد ...

لویس لەدایك و باوکی پرسی بۆ وای لێدەکەن ؟ وتیان : ئەوە ڕەش پێستەوئەوخوێنەیلەدەمارەکانیدایە لەو خوێنە نیە کەلەئەمریکی یەکاندایە وئەوانەوێنەی ئەمریکیەکانیان ناشرین کردووەو سەرچاوەی هەموو خراپەو تاوانێکن.. پاش ماوەیەك یەکێ لەو ڕەش پێستانە بووە هاوەڵی لویس و برادەریان

زۆر خۆش بوو ، لويس دەچووە ماڵيان و دايك و باوكی دەبينی كەزۆر بەڕێزن و هيچ زيانيان بۆ كەس نيە ...

لـويس گەورەبووهەميـشە دژی ئـەوەبوو ڕەگەزپەرسـتی هـەبێ و ڕەشـەكان بـچەوسێنرێنەوە ... لـويس هەسـتی دەكـرد كەهەنـدێ ڕۆژ برادەرەكـانی هـيچ نـاخۆن بەبێ ئەوەی نەخۆش بن ، پرسـياری كـرد لێ يـان ، وتيـان : ئێمـه بەڕۆژووين ، ئەويش ويستی هەروەك ئەوان هـيچ نـەخوات ، وتيـان : بۆئـەوەی خێـرت دەسـت كـەوێت دەبێ لەپێـشدا موسـڵمان ببيـت و باسـی ئيـسلاميان بـۆ كـرد ، ئـەو ئيـسلامەی كـەجياوازی لەنێوان كەسدا ناكاو باشترين كەس لای خوا ئەوەيە كەزياتر پارێزكار بێت (**إن اكرمكم عند الله اتقاكم**).. سەرەنجام لويس موسڵمان بوو ناوی خۆی گۆڕی بۆ كريم شريف و ژنی هێنا و چەند منداڵی موسڵمانی خستەوە ، سێ جار چوو بۆحەجی ماڵی خواو بەردەوام بانگەوازی دەكردو زۆرجاريش لەمركزی ئيسلامی واشنتۆن وتاری هەينی دەدا و لەسەر دەستيا خەڵكانێكیزۆر موسڵمان بوون لەئەمريكا و لەبەريتانيادا ... ل ٥٢٨ المعجزه ..

**شەشەم /موسڵمانبوونی مامۆستای ڕۆژنامەگەری لەزانكۆی نيويورك :**

ناوبراو گاور بوو ، لەمغرب بوو بەموراسيلی دەنگی ئەمريكا و كۆمەڵێ ڕۆژنامەی نيويورك ،وەلەبارەی مانەوەی لەمغرب دا دەڵێ :

مانەوەم لە هەشتاكاندا لە مغرب بوو بەخێر و بەرەكەت بۆ خۆم و خاوو خێزانم ، دنيايەكم بينیجياواز لەودنيايەیكە بينيبووم لە نيويورك ، لە نزيكەوە جوانی ڕەوشت و ڕەفتاری بەرزی موسڵمانانم بينی كەڕای كێشام بەرەو شەريعەتی هەق ...

ڕۆژێك لەچاڵێك قاچم هەڵنوتا لەبازاڕی شەعبی شاری (رباط) دا ، يەكسەر كۆمەڵێ مەغريبی هاتن بۆيارمەتيم و زۆر خەميان بوو دەيان پرسی ئاخۆ ئازارم پێگەيشتووە ؟! جارێكيش نەخۆش كەوتم ، دەرودراوسێ و هاوەڵان زۆر بەگەرمی سەردانيان كردم و ئەيانويست خزمەتم بكەن ، بەڕاستی لای ئێمە لەئەمريكا شتی وا نابينی، چونكە هەركەسەو سەرقاڵی خۆيەتی و كەس ناپەرژێتە سەركەس ... جا كە دەپرسم چۆن ئەو هەموو لوتفەيان هەيە بەبێ بەرامبەر؟!دەڵێن: ئەوە ئيسلام فەرزی كردووە لەسەرمان و پێغەمبەرەكەمان (ص)فەرمانی پێداوين ...

دیراسەی قورئانم کردو لەگەڵ زۆر زانادا گفتوگۆم کرد ، عەقیدەی یەکخواناسی دڵ ودەروونی پڕکردم ، ڕۆژێك ئەم ئایەتەم خوێندەوە کە دەفەرموێت :﴿ **لا تُدْرِكُهُ الابصارُ وهو يُدرِكُ الابصارَ وهو اللطيف الخبير ، قد جاءكم بصائر من ربكم فمن أبصر فلنفسه ومن عمى فعليها وما أنا عليكم بحفيظ**﴾(الأنعام:١٠٣)

واتە ( لەدنیادا چاوی ئینسان ناتوانێ خوا ببینێت ، زانیاری ئەو خوایە و بینینی هەموو شتێکی گرتۆتەوە هەرئەوە وردبین و ئاگایە بێگومان بەرچاوڕوونیتان بۆ هاتووە لەخواوە ،جاهەرکەس ڕێی ڕاست ببینێ‌و شوێنی بکەوێ بۆ خۆیەتی و هەرچیش کوێر بێت لەبەرامبەریا ئەوە بۆ خۆیەتی زیانی لێدەکەوێت ، وەمن(واتە پێغەمبەر(ص))چاودێرنیم بەسەرتانەوە

ئیتر خۆم بۆ نەگیراو فرمێسك بەچاوما هاتەخوارێ و دڵنیابووم کەئەمە ئامارەیەکە بۆ من کەخێرا موسڵمان بم ، بۆیە دەست و برد خۆم پێچایەوە و گەڕامەوە بۆ ئەمریکاو خۆم و ژن و کوڕەکەم لەمزگەوتی گەورەی نیویورك دا موسڵمان بوونی خۆمان ڕاگەیاند المعجزە ل٥٣١

**حەوتەم / موسڵمان بوونی (ماركو أنطونيو)ی ئەمریکی**

ئەم لاوە وەك زۆربەی لاوانی ڕۆژئاوا سەرگەرمی ژیانی دوور لەخوایی و نەفامی بوو ، زۆر دڵی بەقژە پڕەکەی خۆش بوو کەخۆی جوان بکاو لەناو ئافرەتاندا خۆی بنوێنێ ...دەڵێت

زۆر پرسیار دەهات بەخەیاڵمدا ، چوومە کەنیسەی **کاثولیکی** و پرسیارم لە قەشە کرد وەڵامێکی وام دەست نەکەوت دڵم ئاو بخواتەوە و هەرچیم دەوت ، دەیووت خوا دەزانێت چۆنە ! لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەر مەرجەعی ئاینی یەکەمان هیچ نەزانێ لەئاین ،ئەبێ منی داماو چی بکەم ؟!

بۆیە بڕیارمدا کە ڕێڕەوی ژیانم بگۆڕم ، شتێکم بیستبوو لەبارەی ئیسلامەوە چووم بۆ مزگەوتێکی نیویورك وقسەم لەگەڵ ئیمامەکەیدا کرد کەناوی شێخ **عبداللطيف** بوو ناوبراو لەگەڵ ئەوەدا کەئیمامەتی دەکرد ئەندازیاریش بوو ،زۆر بەجوانی ئیسلامی بۆ ڕوون کردمەوەو وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەم دەستکەوت کە دەهات بەخەیاڵمدا دوای چوارمانگ بووم بەموسڵمان لەکاتێکدا کەتەمەنم حەڤدە ساڵ بوو

، ئافرەتێکی موسڵمانی بانگخوازم هێنا ، منیش شارەزابووم و کەوتمە بانگەوازکردن لەخزمەکانمەوە دەستم پێکرد ، پاشان چوم بۆ بەڕازیل و هەندێ چالاکیم لە بواری بانگەوازدا نواندو ئنجا چووم بۆ وڵاتی سعودیە بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی وئیسلام.

(**ماركو أنطونيو** ) ناوی خۆی گۆڕی بۆ (**عبدالسلام عبدالله محمد**) و بەردەوام دەبێ لەسەرقسەکانیودەڵێت (سوودی زۆرم بینی لەبوونی سوپای ئەمریکی لەکەنداودا لە گەردەلولی بیاباندا ، هەلێکی باشم بۆ ڕەخسابوو توانیم بانگەوازێکی باش بکەم و ژمارەیەکی زۆر لەسایەی خواوە موسڵمان بوون ، بەڕاستی ئیسلام ئەوەندە ئاسان و ڕوونە هەرچی بیناسێ و بۆی باس بکرێ قەناعەت دەکاو موسڵمان دەبێت)

شایانی باسە کەباوکی بەموسڵمان بوونی زانی ، تفی کردە ناوچاوی و وتی: تۆ بویتە عەرەب،ئەویش وەڵامیدایەوە وتی:نەخێر من بوومەتە موسڵمان کەئەوەش جێ ی شانازی یە بۆ تۆش ! ل٥٢٣ المعجزە .

**هەشتەم /موسڵمان بوونی پێنج هەزار ئەمریکی !**

یەکێ لەبانگخوازەکانی ئەمریکا سەردانی دەزگای (الاعجاز العلمي للقران والسنة)ی کرد لە وڵاتی سعودیە و زانایان زۆر ڕاستیان بۆ ڕوون کردەوە لەسەر موعجیزەکانی قورئان و سوننەت ، ئەویش زۆر دڵخۆش بوو ، هەموو قسەکانی دەنووسی،پاشان کە گەڕایەوە ئەمریکا بانگهێشتی کرد بۆ خەڵکانێکیزۆرونزیکەیشانزەهەزارکەس ئامادەبوون ، ئەو بانگخوازەش باسی ئیعجازی بۆ کردن و فلیمی تایبەت بەئیعجازی پیشاندان و کارتی تایبەتی بەسەردا دابەش کردن ، تاوەکو ئەوەی دەیەوێموسڵمان بێ پەیوەندی پێوە بکات تافێری ئیمان و ئیسلامەتی بکاو شایەتمان بێنێت، سەرەنجام دەرکەوت کەپێنج هەزار کەس حەز بەموسڵمان بوون دەکەن و موسوڵمانبوون . ل٥٦٦ المعجزە.

دکتۆرعبدالعزیزحمادکەبەرنامەی هەیە لەکەناڵی (اقرا)دەڵێ:سەردانێکی ئەمریکام کردو لەگەڵ کۆمەڵێ گاوردا کەوتمە گفتوگۆ لە یەك چارەکە سەعات دا هەشت کەسیان موسڵمان بوون ، تەنانەت هی واهەبوو لە نیوەڕۆ یان عەسردا کەموسڵمان دەبوو چونکە ڕەمەزان بوو یەکسەر نیەتی دەهێنا و بەڕۆژوو دەبوو .

هەروەها د.عبدالعزيز حماد دەڵێ : ئافرەتێکی ئەمریکی لەخەویا بینایەکی بینی کە بە قوماشی ڕەش داپۆشرابوو ، دڵی دەیخواست بچێتە لای ، کەخەبەری بۆوە بۆ باوکی گێڕایەوە کە عەسکەرییەکی خانەنشین بوو وتی : موسڵمانان کەعبەیەکیان هەیە وەك ئەوەیە کە تۆ دیوتە، بۆیە کەوتە دیراسەی ئیسلام وبەهۆی لاوێکی موسڵمانەوە زۆرشارەزابوو دوایش شووی پێکرد. ل ٥٧٨ المعجزە.

**نۆیەم** /دکتۆر أحمد کبیسی لەبەرنامەی (**الكلمة واخواتها** )لەکەناڵی دبی یەوە وتی : کە لەدوای کارەساتی ١١ی سێبتەمبەرەوە (٢٨٠)هەزار کەس لە بریتانیا موسڵمان بوون ...

**دەیەم / موسڵمان بوونی بێژەرێکی ئافرەت لە تەلەفزیۆنی ئەمریکی !**

لیلی ڕەمزی بکالوریۆسی هەیە لە (هندسە الالكترونيات)داوبێژەرە لە تەلەفزیۆنی ئەمریکی ..موسڵمان بوو لەساڵی ١٩٩٩ داو، هەوڵی زۆریش ئەدات بۆ بانگکردنی خەڵکی بەرەو ئیسلام ..

لیلی چوو بۆ قاهیرە بۆئەوەی فێری زمانی عەرەبی ببێت و باشتر لە قورئان تێبگات .. ناوبراو دەڵێت (ئیسلام دەستی کێشا بەسەر هەست و هۆشماو وای لێکردم لەهەقیقەتدا بژیم ، پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە (وەهم)دا دەژیام و دووربووم لە خوا)،( من تەرجەمەی قورئانم دەخوێند ، بەتایبەت هەندێ سوورەتیوجزئی عم تاگەیشتمە سوورەتی الاخلاص ، کەخوێندم شایەتمانم هێناو زۆر ئاسان بوو بەلامەوە )...ل ٥٧٣ المعجزە .

سەرچاوەکان :

١)القوانين القرآنية للحضارات /الدكتور المهندس خالد فائق العبيدى

٢)الوعود القرآنية /د. صلاح الخالدى ، ٣)نبوأت الرسول ماتحقق منها وما يتحقق/محمد ولى الله الندوى ... ٤ )المعجزة المتجددة فى عصرنا الاسلام /صالح اليافعى

ناوەرۆك

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگارو دروودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارویاوەران وشوێنکەوتوان ..

پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت :( **ان الایمان لیَخلَقُ فی جوف احدکم کما یَخلق الثـوب ، فاسـالوا الله ان یُجدد الایمان فی قلوبکم** ) واتە : بەڕاستی بڕوا لـە دڵی یەکێکتانـدا کۆن دەبیٚ و دەڕزێت ، داوا لـە خـوا بکـەن کـەبڕوا لـە دڵتانـدا نـویٚ بکاتـەوە.. هـاوەڵان وتیـان بەچـی بڕوامـان تـازە بکەینەوە ؟؟ فەرمووی : بە وتنی (لااله الا الله ) بڕواتان تازە بکەنەوە.

وتنی( **لااله الا الله** )بەڕاستیوبەتێگەیشتنەوە،مایەی نوێبوونەوەو سەرفرازییە .( **لااله الا الله** )بەنرخـــە ،ســـەنگینە ، ئەگـــەر هـــەموو ئاسمانـــەکان و زەوی بخرێنـــە تـــای تەرازوویەکەوەو ( **لا اله الا الله** ) بخرێتە تاکەی تریـەوە ، ( **لااله الا الله** ) قورسترە .. لـە کـاتی حەشرو حسابدا کە دڵ دەلەرزیٚو مرۆڤ ئاتاجی بە تاقە چاکەیەکە و کـەس ئاوڕ لەکـەس ناداتەوە و، خەڵکی لەیەکتری ڕادەکەن ( **یوم یفر المرء من اخیه وامه وابیـه وصاحبته وبنیـه لکل امریء منهم یومئذ شأن یُغنیه** )ئا لەو کاتـەدا کارتێك کـە (**لااله الا الله** )ی لەسـەر نووسـراوە دێتـە سەر کردەوە چاکەکان و بەمـەش تـای تـەرازووی چاکەکان قورس دەبێـت و خاوەنەکـەی ڕزگاری دەبێت ..

هاوەڵان هەردەم خەمی تازەبوونەوەی بڕوایان بووە ،یەکێکیان دەستی برایەکی دەگرت و دەیووت : وەرە با سەعاتێك ئیمانمان تازە بکەینەوە ، ئیتر پێکەوە دەبوون و باسی ئیمان و ئیسلامەتیان بۆ یەکتری دەکرد و یادی خوایان دەکرد .. ئەمڕۆش لە هەموو کات زیاتر پێویـستمان بـە نوێبوونـەوەو یادخـستنەوە هەیـە ، ژیانـەوەی ئـەم جـارەش بەکۆمـەڵیٚ یادخستنەوەی ئیمانیەوە دێتەوە خزمەت هۆگرانی بەو هیوایەی کە سوودبەخش بێت ( **وذکر فان الذکری تنفع المؤمنین** )..

### یادخستنەوە

١/هەموو ڕێبوارین لەم دنیایەدا ..حەزرەت (ص) دەفەرمویٚ ( **مالی وللدنیا ما انا فی الدنیا الا کراکب استظل بظل شجرة ثم راح وترکها** )وحەزرەت (ص) بە (ابن عمر)ی فەرموو ( **کن فی الدنیا کأنك غریب او عابر سبیل** ) واتە لە دنیادا هەروەك غەریب یان ڕێبوار بە ...

ابن عمر سوودی له ڕێنماییەکه وەرگرت و ئەویش ئامۆژگاری بڕواداران دەکا و دەفەرموێ( ئەگەر ئێوارەت لێهات بەتەمای بەیانی مەبه ، ئەگەر ڕۆژت لێبووەوە بە تەمای ئێوارە مەبه ، کاتی تەندروستی باشت سوود لێوەرگرە بۆکاتی‌نەخۆشیت وژیانت سوود لێوەرگرە بۆ کاتی مردنت )..

٢/ئاخۆ لەم گەشتەماندا نیەتمان بۆ خوایەو ڕاست دەکەین لەگەڵ خوادا ( **فاذا عزم الامر فلو صدقوا الله لكان خيرا لهم** ) ٢١محمد..

حەزرەت (ص) دەفەرموێت ( **وان الرجل ليصدق حتى يكتب عند الله صديقا** ) بخاری ،واته بەڕاستی پیاوێکی دیندار ئەوەندە ڕستگۆ دەبێت تا لای خوا بە (صدیق) ناوی تۆمار دەکرێـــــــــــــــــت .

ئەبوبەکر یەکێکە لەو کەسانە کە تا دواپلە ڕاستگۆ بووە ، ( **والذى جاء بالصدق وصدق به اولئك هم المتقون** ) الزمر ٣٣ واته : پێغەمبەر (ص)کە بەرنامەی هەق و ڕاستی هێنا وئەبوبەکریش کە بڕوای پێکرد وڕاستگۆ بوونەوانەن پارێزکار .. پێشەوا عەلی دەڵێت : (بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ، بەڕاستی خوا ناوی ئەبوبەکری ناوە لە ئاسمانەوە بە (صدیق ) ..

٣ / لەم گەشتەی ژیاندا پێویستمان بە مامۆستاو خاوەن ئەزموونە ، تاوەکو بە سەلامەتی‌وبەزوویی بگەینە مەنزڵ ( **يا ايها الذين امنوا اتقوا الله وكونوا مع الصادقين** ) **التوبة** ١١٩ واته : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن

هەروەها حەزرەت دەفەرموێت (ص) ( **المرء على دين خليله فلينظر احدكم مَن يخالل** ) واته : مرۆڤ وا لەسەر ئاینی هاوەڵەکەی بزانن هاوەڵی کێ دەکەن . .

پێشەوا گەیلانی دەڵێت :( **انما يُؤخذ العلم من افواه الرجال لا من الصحف** ) بەڕاستی عیلم لە دەمی پیاوەوە وەردەگیرێ نەك لە کتێبەوە ، هەر لەبەر ئەوەشە کەخوای پەروەردگار قورئانی بەتەنها نەنارد تاخەڵکی هەرکەس بۆ خۆی دیراسەی بکات ، بەڵکو بە حەزرەتدا (ص) ناردی تا هەردەم سەرمەشق بێت بۆیان ..

٤/لەم گەشتەدا دەبێت لە سروشتی‌ڕێگاکە تێبگەین کەتاقە ڕێگایەو ڕاستەو،مرۆڤ بە هەر لایەکدا لابات تیادەچێت ( **وان هذا صراطى مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السُبُل فتفرق بكم عن سبيله** )١٥٣ **الانعام** واته : ئەمە ڕێبازو ڕێگای ڕاستی منە شوێنی بکەون و شوێن هیچ ڕێبازێکی تر مەکەون تا دوورتان نەخاتەوە لە ڕێبازەکەی ..

حەزرەت (ص) هێڵێکی ڕاستی کێشاو فەرمووی : ئەمە ڕێبازی خوایە، ئنجا چەند هێڵێکی تری بەملاو ئەولادا کێشاو فەرمووی : ئەمانەش ڕێگای ترن و لەسەر هەریەکێکیان شەیتانێك هەیە بانگەدەکات بۆی ..
هەواو ئارەزو دەبێتە مایەی سەرگەردانی زۆر کەس و کۆمەڵ ،حەزرەت (ص)دەفەرمویٚ ( **افترقت اليهود على احدى وسبعين فرقة وافترقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة ، وستتفرق امتى على ثلاث وسبعين فرقة ،كلها فى النار الا واحدة ، ماانا عليه واصحابى ، وليكونن من امتى اقوام تتجارى بهم تلك الاهواء كما يتجارى الكَلَبُ بصاحبه لا يبقى منه عرق ولا مفصل الا دخله** ) **احمد** واتە : جوولەکە بوون بە حەفتاو یەك فیرقەوە و گاورەکان بوون بە حەفتاو دوو فیرقەوە ، ئومەتی منیش دەبن بە حەفتاو سێ فیرقەوە وهەموویان لە ئاگردان تەنها یەکێکیان نەبێت ، ئەوانەی کە لەسەر ڕێبازی من و هاوەڵانمن ، لە ئومەتی من گەلانێك پەیدا دەبن کە هەواو ئارەزوو وەك دەردی هاری چۆن دەچێتە خوێن و دەمارەوە ئاوا بەهەموو گیانیاندا بڵاودەبێتەوە .
٥ /لەم ڕێگایەدا کەلەسەر هەق و ڕاستیت لە تەنهایی و کەمی هاوەڵ و هاودەم مەترسە ، کەسێ خوای بالآدەست دۆست و خۆشەویستی بێت ئەبێ باکی چی بێت ( **وكفى بالله وليا و وكفى بالله نصيرا** ) ٤٥ **النساء** ئەمەش پرسیارێکە و قورئان لە هەموانی دەکات ( **اليس الله بكاف عبده ؟؟؟ ويُخوفونك بالذين من دونه ، ومن يُضلل الله فما له من هاد ومن يهدى الله فما له من مضل ، اليس الله بعزيز ذو انتقام ؟؟** ) الزمر ٣٦ واتە : ئایا خوا بەس نیە هاوکارو سەرخەری عەبدی خۆی بێت ؟؟دەتترسێنن بە غەیری خوا ، هەرکەس خوا سەرگەردانی بکات کەس ناتوانێت هیدایەتی بدات و هەرکەسیش خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێت سەرگەردانی بکات ، ئایا خوا بەتواناو تۆڵەسێن نیە ؟؟. ( **ولئن سالتهم من خلق السماوات والارض ليقولون الله ،قل افرايتم ماتدعون من دون الله ان ارادنى الله بضر هل هُن كاشفات ضره او ارادنى برحمة هل هُن مُمسكات رحمته ؟؟ قل : حسبى الله ، عليه يتوكل المتوكلون** ) الزمر ٣٨واتە :ئەگەر پرسیاریان لێبکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوە ؟؟ دەڵێن :خوا ، پێیان بڵێ : باشە ئەگەر خوا بیەوێت تووشی زیانێکم بکات . ئایا ئەوانەی هاواریان بۆ دەبەن لەغەیری خوا دەتوانن بیگێڕنەوە ، یان ئەگەر خوا تووشی خێرو خۆشیەکم بکات دەتوانن دەست بهێننە ڕێی ؟؟ (دیارە کەس ناتوانێت شتی وابکات ) کەواتە بڵێ :خوام بەسە ، تەنها پشت بەو دەبەستن ئەوانەی کەبیانەوێ بەڕاستی پاڵپشتیان هەبێت ..

٦/لەم ڕێگایەدا تووشی تاقیکردنەوەو بەلاّو موسیبەتی زۆر دەبین کە ئەوەش سوننەتی خوایە لەم دنیایەدا ، تادەرکەوێت کێ ڕاست دەکات لە بڕواکەیداو کێ ڕاست ناکات (**احسب الناس ان يُتركوا ان يقولوا آمنا وهم لايُفتنون ،ولقد فتنا الذين من قبلهم ، فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين** ) **العنكبوت ٢**/کاتێك حەزرەت (ص) لەگەڵ خەدیجەی هاوسەریدا چوون بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەل هەرزوو پێی ڕاگەیاندن کە لەم ڕێیەدا تووشی ئەشکەنجەوئازارو دەربەدەری دەبێت ، حەزرەت لای سەیربوو فەرمووی : **أوَ مُخرجي هُم** ؟؟؟! بۆ دەربەدەریشم دەکەن ؟؟ وەرەقە وتی : بەڵێ ، هەرکەس وەك تۆ پێغەمبەر بووبێت تووشی نارەحەتی و ناخۆشی و دەربەدەری بووە بەدەست گەلەکەیەوە .. لەچیرۆکی ڕاهیب ومنداڵەکەش دا ،کەمناڵەکە چەندقۆناغێکی بڕیڕاهیبەکە پێی وت : ئەمڕۆ تۆلە من باشتری و توانات زیاتر پێیە ، بۆیە توشی بەلاّو تاقیکردنەوە دەبیت لەمەودوا ....

حەزرەت (ص) دەفەرموێ ( **ان الله اذا احب قوم ابتلاهم ،فمن رضى فله الرضا ومن سخط فله السخط** ) واتە : بەڕاستی خوا ئەگەر کۆمەڵێکی خۆشویست تاقیان دەکاتەوە بە بەلاّو موسیبەت ، هەرکەس ڕازی بوو ئەوە خوا لێی ڕازیە وهەرکەسیش ناشکوری کردو ناڕازی بوو ئەوە خوا لێی ناڕازی‌یە ..

٧/ گردۆڵکەی نەفس و ئارەزوو : لە ڕێگای ڕێبوارانی ڕێی‌خوادا گردۆڵکەیەکی سەخت هەیە کە ئەویش نەفسەو دەبێ بەسەریا زاڵ بین وئەو گردۆڵکەیە بگرن ،( **فلا اقتحم العقبة،وماادراك ماالعقبة** ) **البلد١٢** یان وەکو ابی علی دقاق بە قوتابیەکەی کە لە دوورە ولاّتەوە هاتبوودەیویست خاتری بگرێ‌و لەڕیزی پێشەوە داینێ و گرنگی زیاتری پێبدا ، پێی وت:ئەم کارەی ئێمە بەوە نیە لە دوورەوە هاتبی، تەنها یەك هەنگاو لەنەفسی‌خۆت دوور بکەوەرەوە ،ئەوەی دەتەوێ دەستت کەوێ ..

٨/ داوای یارمەتی لەخوا بکە :

خوای گەورە یەکێك لەناوە پیرۆزەکانی (الهادی) یە ، ڕێنمایمان دەکات و دەستمان دەگرێ بەرەو خێرو چاکە وهیدایەتمان دەدا ئەگەر بە دڵ داوای لێبکەین لە فەرموودەی قودسی‌دا هاتووە ( **يا عبادى كلكم ضال الا من هديته فاستهدونى اهدكم** ) یان دەفەرموێ ( **من تقرب منى شبرا تقربت منه ذراعا ، ومن تقرب منى ذراعا تقربت منه باعا ، ومن اتانى يمشى اتيته هرولة** )

**بخاری** /واته :هەرکەس بستێك لەمن نزیك بێتەوە من باڵێك لەو نزیك دەکەومەوە،کێ باڵێك لەمن نزیك بکەوێتەوە من دووباڵ لەونزیك دەبمەوە ، هەرکەسیش بەپێ بێت بۆ لام من بە ڕاکردن دەچم بۆ لای ..

هەروەها دەفەرموێت ( **یاابن ادم ، قم الی امش الیك وامشی الی اهرول الیك** )**احمد** / واتە : ئەی بەنی ئادەم هەستە بۆلام من دێم بۆلات ، وەرە بۆلام من ڕادەکەم بۆ لات

**هەموومان بەندەی خواین و خوای گەورە کەسی بیرناچێت** :

وەفدیکی یەمەن هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ص) ، پیاوێکیان لەگەڵدا بوو ناوی حودەیر بوو ، کاتێك گەڕانەوە حەزرەت هەریەکەو بەپێی توانا دیارییەکی پێشکەشکردن ، تەنها حودەیر نەبێت کەلەوکاتەدا لەو ناوەدا نەبوو ، دوایی ڕووشی نەهات داوا بکا ، کە گەڕانەوە جوبرائیل دابەزییە لای پێغەمبەر (ص) وفەرمووی : (پەروەردگارت سەلامت لێدەکات و حودەیرت یاددەخاتەوە ) ، حەزرەتیش (ص) خێرا سوارێکی نارد کەزوو پێیان بگاتەوەودیارییەك بدات بە حودەیرو سەلامی ئەوی پێبگەیەنێت کە سوارەکە گەیشت پێیان پرسیاری حودەیری کردو کە بینی پێی وت : ( ڕەسولی خوا سەلامت لێدەکات ودەفەرموێت :ئەوتۆی بیر چوو خوای گەورە تۆییادخستەوە ) ، حودەیر دیارییەکەی وەرگرت و وتی:(خوایە وەك چۆن حودەیرت بیرنەچوو، وا لە حودەیر بکە تۆی هەرگیز لە بیر نەچێت )،دوعاکەی ئەوەندە بەکوڵ و دڵ بوو ، خوا دوعاکەی لێوەرگرت و لە هەمووکەس زیاتر یادی خوای دەکرد ..

٩ / بەتەمای دەستکەوت مەبە لە جیهادا؟!

حەزرەت (ص)کەپەیمانی بەست لەگەڵ ئەنصارەکان دا کەئاینی خوا سەربخەن ،وتیان ئەگەر وامان کرد چیمان بۆهەیە ،فەرمووی : بەهەشت . وتیان: **ربح البیع** ، **ربح البیع** ،هەندێ لەهۆزە عەرەبەکان دەیانویست هەر لەسەرەتاوە مەرج دانێن بۆ دەستکەوت و دەسەڵات داری و حەزرەتیش (ص) ڕازی نەبوو ...بۆ نموونە :کاتێ لەگەڵ (بنی عامر بن صعصاع )قسەی کرد کە موسوڵمان ببن ، وتیان :باشە ئەگەر هاوکاریمان کردی و سەرکەوتی ،دەسەڵات بۆ کێ دەبێ دوای خۆت ؟(مەبەستیان بوو ببنە جێگیری و فەرمان ڕەواییان دەستکەوێ)حەزرەتیش ئەو ڕێگایەی لێگرتن و فەرمووی (الامر الی الله یضعه حیث

يشاء )واتە :خوا هەركەسێكی بوێ كارەكەی دەداتە دەست ، جاهەر كەسێ بەمەرجی دەست كەوت موسوڵمان ببێ بە كەڵك نایە،كەسانی تریش هەن ئەگەر لە دەست كەوتدا نەخوێنرانەوە یان كەمیان پێدرا زویر دەبن و واز لەدینداری یان كاری بەكۆمەڵ دەهێنن ، لە كاتێك دا هەق وایە زیاتر سووربن لەسەر دینداری وكاری بەكۆمەڵ چونكە بەوە دەرگا لە شەیتان دادەخەن وپاداشتیان دەست دەكەوێ... دەستكەوت پاداشتێكی دنیایی‌یە و لەفەرموودەدا هاتووە كە لە پاداشتی ئاخیرەت كەم دەكاتەوە ، تەنانەت دوو لەسەر سێی‌دەبا ،هەروەك حەزرەت (ص) دەفەرموێ ( **ما من غازية تغزو فى سبيل الله فيصيبون الغنيمة ، الا تعجلوا ثلثي اجرهم من الاخرة ،ويبقىلهم الثلث ،وان لم يصيبوا غنيمة تم لهم اجرهم** ) **مسلم (الامارة)**

.. هەر لەبەر ئەوەشە هەندێ لەهاوەڵان كەمابوونەوە تادوای فتوحاتی‌ئیسلامی‌دەگریان لە ترسی‌ئەو غەنیمەت و دەستكەوتانەی كە دەستیان كەوتبوودەیانووت : دەترسین ئەمە پاداشتی ئاخیرەتمان بۆ نەهێڵێتەوە وخۆزگەیان بە (مصعب) دەخواست كە هەر زوو شەهید بوو ،كاتێ كەناشتیان كفنێكیان دەست نەكەوت ئاودامانی بێ ، سەریان دادەپۆشی قاچی دەردەكەوت ، ناچار قاچیان بە پووەكێكی بۆن خۆش داپۆشی..حەزرەت هەر زوو هەواڵی دا بە ئەنصارەكان كە بەشخوراو دەبن،بۆیە فەرمانی پێدان كەئارامگربن لەسەر ئەو بەشخوراویەیان تا دەگەنەوە بە پێغەمبەر (ص) لەسەر ئاوی كوپر ..واتە خوا لەقیامەت دا هەقیان بۆدەكاتەوە ..

**١٠/ هەق بۆ كردنەوەو بەسەركردنەوە :**

هەندێ جار سەركردایەتی هەق بۆ هەندێ كەس دەكاتەوە لەبەر هەر هۆیەك بێت ، ئەمەش لەسەردەمی هاوەڵانیشدا پووی داوە .بۆ نموونە : پێغەمبەر (ص) حسابی تایبەتی بۆ ئەو كەسانە دەكرد كە بەتوانا بوون و تواكانیانی دەخستە كارو هاوەڵانی خۆی باش دەناسی هەرچەند تازەش موسوڵمان بوونایە . ئەوەتا لەبارەی عەمری كوپی عاصەوە دەفەرموێ ( **أسلم الناس وآمن عمرو بن العاص** ) أحمد/ واتە: خەڵكی ئیسلام بوون و عەمریش بپوای هێناوە ، لەدوای سوڵحی حودەیبیە خەڵكێكی زۆر موسوڵمان بوون ، بەڵام عەمر بەدڵ و بەپاستی ئیمانی هێنا ..

عەمر دەڵێت : بە خوا پاش ئەوەی موسوڵمان بووین ، حەزرەت (ص) هەر كارێكی گرنگی ببوایە دەیدایە دەست من وخالید و ئێمەی بە كەس نەدەگۆپیەوە.

ڕۆژێك حەزرەت (ص) بانگی کردم و فەرمووی( خۆت کۆبکەرەوەو چەکەکەت بهێنە و وەرە بۆ لام )منیش خۆم کۆکردەوەو هاتم بۆ خزمەتی و فەرمووی ( من ئەمەوێت بتکەم بە سەرکردەی سوپایەك و خوای گەورەش دەتپارێزێ و دەستکەوت و غەنیمەتت دەبێت ، من حەزدەکەم خاوەن سامان و دەوڵەمەند بیت ) منیش وتم : ئەی نێردراوی خوا من بۆ دەستکەوت و ماڵ و سامان موسوڵمان نەبووم ، بە ڵکو لە خۆشی ئیسلام موسوڵمان بووم .. ئەویش فەرمووی : ( نعماً المالُ الصالح للمرءِ الصالح )(احمد)، چەند چاکە پارەوسامانی باش بۆ پیاوی باش ..

لەساڵی فەتحی مەککەش دا حەزرەت معاڎ کوڕی جبل ی نارد بۆ یەمەن و دواتر نامەیەکی بۆ ناردو کە تیایا نووسیبووی ( من دەزانم خەباتت لە پێناوی دیندا ، تا وات لێهات هیچت بە دەستەوە نەماو قەرزاربوویت ، بۆیە حەڵاڵە بۆت دیارییەك کەبۆت دەهێنن ) ، معاڎ بە ئەمیری لەیەمەن مایەوە ویەکەم کەس بوو بە پارەی (بیت المال) ەوە بازرگانی بکات تا ئەو کاتەی حەزرەت(ص) کۆچی دوایی کرد ، لە سەردەمی ئەبوبەکردا ، عومەر هاتە لای ئەبوبەکرو وتی : ئەو پیاوە بانگ بکەو ئەوەندەی پێی بژی بۆی بهێڵەرەوە وباقیەکەی لێبسێنەرەوە، ئەبوبەکریش وتی : حەزرەت ئەوی ناردووە بۆ یەمەن تا هەقی بۆ بکاتەوەو ، من هیچی لێناسێنم مەگەر خۆی شتێك بدات ،عومەر کە زانی ئەبوبەکر بە قسەی ناکات خۆی چوو بۆ لای معاڎ تا قایلی بکات ماڵ و سامانەکەی بدات بە (بیت المال) . ئەویش پێی وت : حەزرەت (ص)منی ناردووە تا هەقم بۆ بکاتەوە و هیچ ناگێڕمەوە ..

پاش ماوەیەك معاڎ هات بۆلای عومەرو وتی بەقسەت دەکەم چونکە لەخەوما خەریك بوو لە ئاوێکدا بخنکێم تۆ ڕزگارت کردم ، ئنجا چوو بۆ لای خەلیفە ئەبوبەکرو هەمان شتی وت ، ئەبوبەکریش وتی : من هیچت لێوەرناگرم و پێشکەش بە خۆتی دەکەمەوە ..بەمەش کە خەلیفە لە دەسەڵاتی خۆیەوە ئەو شتانەی بەخشیەوە بە معاڎ ئینجا عومەر قایل بوو ..( ل ٦٩ شهيد المحراب عمر بن الخطاب - عمرالتلمسانى )

١١/ئامادەبوون بۆمردن :

معاڎ کوری جبل لەسەرەمەرگدا وتی :( مرحبا بالموت مرحبا، زائر مغب وحبيب جاء على فاقة ، لا افلح من ندم )...واتە : سلاو لە مەرگ سلاو ،ئەی ئەو میوانەی کەیەکجار سەردەدەیت و

لەکاتێکدا دێیت کە مرۆڤ زۆر موحتاج و دەستەوسانە ،وەی لەو کەسەی لە سەرەمەرگدا پەشیمانە !!

هەروەها حوزەیفەی کوری یەمان لە سەرەمەرگدا وتی:

(**یاموت غُط غَطّك ،یا موت شُدّ شَدّك ، أبى قلبي الا حبك** ). واتە :ئەی مردن چەند دەتوانی زەبرم لێبکەی بیکە ،ئەی مەرگ شیدەت بنوێنە ، هەرچی بکەی هەر خۆشم دەوێی ..

**ئەگەر شتێك لە ژیان زیاد نەکەیت زیادەیت !**

ئەمە وتەی نوسەری بەناوبانگ (مصطفى صادق الرافعي)یە،بە ڕاستیش چاکی پێکاوە ئەگەر بۆ خەڵکیش نەبێ بە گشتی ، بۆ بانگخوازان و ڕێبوارانی کاروانی بەختەوەری لە سەدا سەد وایە!

مرۆڤ توانای شاراوەی زۆری پێدراوە کە پێویستی بەوەیە کاریان لەسەر بکرێ وبخرێنە گەڕ ، بۆیە هەوڵ وکۆشش وخۆتەواوکردن کارمانە ئەگەر بەڕاستی بانگخوازین ولە ئاینەکەمان تێگەیشتوین ، دیارە بەخششیخواش لەکەس یاساغ نیە و،خوا دەستنانێ بەڕووی ئەوانەی کۆشش دەکەن (**كلاً نمد هولاء وهؤلاء من عطاء ربك وماكان عطاء ربك محظورا** ) **الاسراء** ، بۆچاکتر تێگەیشتن لە تەفسیری ئەم ئایەتە چەند نموونەیەك باس دەکەین :

**یەکەم/** پیاوێك بۆچونێکی لا دروست بوو بۆ بەرەو پێش بردن وچاکترکردنی ئوتومبێل چوو بۆ کۆمپانیای ئوتومبێلی تۆیۆتا وەلامیان نەدایەوە ، بۆیە ئاڵتونی هاوسەرەکەی فرۆشت وکارگەیەکی دانا ، بەهۆی جەنگەوە ڕووخا ،دروستی کردەوە ،جارێکی تر ڕووخا دروستی کردەوە ، ئەمجارەش بە بوومەلەرزە ڕووخا ، دروستی کردەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا وئاوات وخەیاڵەکانی هاتنە دی و بوو بەخاوەنی کۆمپانیای گەورەی (هۆندا ) کە پێشبڕکێ دەکات لەگەڵ گەورەترین کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهاندا!

**دووەم /** (مایکل کاثی) : پیاوێکی بیانی یەو لە بەندیخانەدا بوو ، چواردیواری بەندیخانە وای لێنەکرد تواناکانی نەخاتەکار ، بەردەوام گوێی لە دەنگ وباسی ( بورصە) کان ئەگرت و دیراسەیباری ئابووری دەکردو متابعەی بازاڕی( الاسهم ) ی دەکردو لەگەڵ باوکیشیا تەنسیقی کرد کە بەڕێنمایی ئەم بکەوێتە کڕین و فرۆشتنی ( سهم) و

سەرەنجام کە هاتە دەرەوە لە بەندیخانە توانی ملیۆنەها دۆلار بە دەست بهێنێ و ژیانی خۆی لەسەر بنیات بنێ !

سێیەم/ پیاوێکی ئەمریکی هەژار لە دارستانەکان دەژیا ، لە هەژاریا رووی کردە لانەی بێدەرەتانان و ژنەکەشی چووە لانەیەکی تری بێدەرەتانان .ڕۆژێک چاوەڕێیپاصیدەکرد ، لەبەر ئەوەیتەمومژ بوو پاصەکە نەیبینی و بەجێی هێشت ، بۆیە بیری کردەوە شتێك دابهێنێ کە لە حاڵەتی ئاوەهادا سایەقی پاصەکەهەست بەو کەسە بکات کە لەسەر شەقامەکە چاوەڕێ دەکات ، بۆ ئەمەشگلۆپێکی سووریداهێنا کە بە باتریەك ئیش بکات وبە سویچێك داگیرسێ ، کاتێ تەم و مژ بوو پاص هات ، ئەو کەسەی چاوەڕێ دەکات پەنجە بنێ بە سویچەکەدا و گلۆپەکە دابگیرسێ و بە مەش سایەق پاصەکە نەفەرەکە ببینێ ،ئەم بۆچونە لە هەموو وێستگەکانی پاصدا پەیڕەو کراو دانرا بەمەش ئەو پیاوە دەوڵەمەند بوو .. .

**چوارەم** /پیاوێك لەسوّدان بەناوبانگە بە (ولد الجبل ) بە (کوندە )ئاوی دەفرۆشت ،پاشتر بەگوێدرێژ ئەم کارەی دەکرد ،ئینجا بە ئوتومبێل ئەم کارەی دەکرد ،ئەمەش وای کرد دەرگای رزق و رۆزی لێکرایەوەو دەوڵەمەند بوو ..

**پێنجەم** /پیاوێك لە فەلەستین بەناوی (ماجد اقبالیە )کە خەڵکی (ام فحم )بوو خاوخێزانێکی سیانزە کەسی بەسەردا کەوتبوو ،تەمەنی نۆ ساڵبوو کە باوکی مرد ،بە هەتیوی پێگەیشت بە رۆژ بە کرێکاری بژێوی پەیدا دەکردوو بە شەویش دەیخوێند ،تا قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کرد و گەیشتە خوێندنی بالاّ و ماجستێری لە ئیدارەی ئەعمال دا بە دەست هێنا و پاشان دکتۆرای خوێند لە (نظم المعلومات ) دا و بووە یەکەم لێکۆڵەری جیهانی لە (نظم المعلومات ) دا لەساڵی (١٩٩٧) ەوە تاساڵی (٢٠٠٢) کەوەفاتی کرد بەنەخۆشی شێر پەنجە لە تەمەنی (٤٤)ساڵیدا لە ئەمریکا .

**شەشەم** /سەدان ساڵ لە مەوبەر (محمد کوڕی ابی عامر )لەگەڵ دوو برادەری دا لە (قورطبة ) دەژیا لە گەڕەکێکی هەژاردا و خەریکی ئاو فرۆشتن بوون ،ڕۆژێ بە هاوەڵەکانی ووت :ئەگەر بووم بە فەرمانڕەوای ئەندەلوس چیتان دەوێ بۆتان بکەم ، یەکێکیان ووتی : من دەمەوێ باخ و بێستانێکم بدەیتێ و بژێویم بۆ پەیدا بکەی .. ئەوەی تریان وتی : شەرت بێت ئەگەر بووی بە کاربەدەست پشتاو پشت سواری گوێدرێژێکم بکەو بە شاردا

بمگێڕە وبڵێ ئەمە دەجال و پیاوخراپە و هەرچی توخنی بکەوێ دەیخەینە بەندیخانەوە .
ناوبراو خوێندیو بوو بە سەرباز و پلە پلە سەرکەوت تا پاش سیسالْ بوو بە بەڕێوەبەری فیرقەی قورتوبە و ئینجا کە خەلیفە مرد کوڕەکەی دانرا کە تەمەنی نۆ ساڵ بوو ،برای خەلیفەکە وەزیری دارایی بوو ، لەگەڵ ئەمدا بوون بەسەرپەرشتیار و ڕاوێژکار بۆکارەکانی خەلیفە ..
پاشان ناوبراو کچی مامی خەلیفەی هێنا و سەرەنجام بوو بە دەسەلاْتداری هەموو ئەندەلوس و فتوحاتی زۆری کرد ...
ڕۆژێك بیری دوو برادەرەکەی کەوتەوە و پیاوەکانی نارد تا ئەو دوانەیان دۆزیەوە وهێنایانن ...بە یەکەمیانی وت : تۆبیرتە کاتی خۆی داوای چیت کرد ؟ وتی : بەڵێ من داوای باخ وبێستان ودابین کردنی بژێویم کرد ، وتی :چی دەوێ بۆی بکەن ...ئینجا ڕووی کردە ئەوی ترو وتی :تۆ داوای چیت کرد ؟وتی :قوربان بم بوورە من هەروا لەخۆمەوە هەرچیم وت وتم ، وتی :ئەمەوێ بزانم چیت وت ؟ وتی :داوام کرد سواری گوێدرێژێکم بکەیت پشتاوپشت و بە شاردا بمگێڕی و بڵێی : ئەمە دەجال و پیاو خراپە و هەرچی توخنی بکەوێ دەیخەینە بەندیخانەوە وتی :باشە بۆی جێبەجێبکەن.
**حەوتەم** :دیفید هارتمان پیاوێکی کوێر بوو ، کەم ئەندامییەکەی نەبووە ڕێگرو توانی بە هیممەتی بەرزەوە بخوێنێو دکتۆرا بهێنێت لە (**طب**) دا .
**هەشتەم** :ئیروین جاسکولسکی پیرەمێردێکی بیانی تەمەن سەد ساڵ بوو ، لە پێشبڕکێی ڕاکردنی سەد مەتریو دووسەد مەترییدا ، بەشداری کردو بووە خێراترین پیر لە جیهانداو دەڵێت :( پیری حاڵەتێکی دەروونییەو هیچی تر ).
**نۆیەم** : هیروتادا ئوتوتاکی پیاوێکی یابانییەو دەست و قاچی نەبوو، پەڕاوێکی نووسی چوار ملیۆن دانەی لێ فرۆشرا ( بەرنامەی **هندسة التاثیر** /د. علی حمادی )..
خوێنەری بەڕێز ، ئەگەر بوار بێت بەهەزاران نموونە هەیە لەم جۆرە،کە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەو ڕاستیەی کە پرۆفیسۆر (زەغلول نەجار )دەڵێ: کەم ئەندام ئەوەیە کە لە ناخیدا کەم ئەندام بێت .....
باشترین بەڵگەش شێخ احمد یاسینی شەهیدە کە لەتەمەنی (١٦)ساڵیەوە ئیفلیج بوو ،کۆڵی نەدا و توانی ببێتە (حوجە )بەسەر هەموو ئەوانەی کە لەشیان ساغەو

دەستەوسانن !!...شێخی شەهید برادەرێکی کوێری هەبوو بەناوی (کامل بلتاجی ) ، هەروەك شێخ هیممەت بەرز بوو ، حەزی دەکرد هەرچۆنێك بێت خزمەتێك پێشکەش بکات ، بۆیە شێخی دەکردە کۆڵی و شێخیش ڕێنمایی دەکرد ، بەو جۆرە ئەچوون بۆ هەر کوێیەك بیانویستایە بۆ بانگەواز کردن .

ئاشکرایە ژیان بەگشتی و بانگەوازیش بەتایبەتی بەو کەسانە بەرەو پێش دەچێ کە کۆڵ نادەن و شەوو ڕۆژ لە خەمی ئەوەدان کە جێدەستێ بەجێبهێڵن لەم ژیانە کورت وکەمەدا ،کە کەسمان نازانین چەندمان ماوە !. بە خۆداچونەوە و خۆتەواوکردن و ڕازی نەبوون بەو باروحاڵەی کە تیاین و چاکترکردنی مایەی بەرەو پێش بردنی ژیانەو، هەزاران ڕەحمەت لە پێشەوا عەلی بێت کە دەفەرموێ (ئەگەر هەموان رازی بن بەوەی کە هەیانەو بەو بارو وەزعەی کە تیایدا دەژین دنیا کاول و خاپور دەبێ).

## کارکردن بۆ بەهەشت

حەزرەت (ص) دەفەرموێ (بڕوا کۆن دەبێ و دەڕزێ لەدڵدا هەروەك چۆن جلێك لەبەردا کۆن دەبێ و دەڕزێ ، بۆیە بڕواتان نوێ بکەنەوە بە لا اله الا الله ).

بڕوادار تووشی (ئیزدواجیەت )دەبێت ، بەوەی ڕاستە بڕوادارە بەڵام کەموکورتی و ناتەواوی ئەوەندە زۆرە کە نابووت و موفلیسی کردووە ،حەزرەت ڕۆژێ‌لە هاوەڵانی پرسی :دەزانن کێ موفلیسە ؟ وتیان :لەلای ئێمە موفلیس ئەوەیە کەپارەی نەبێ ، ئەویش فەرمووی :موفلیس لە ئومەتم ئەوەیە کە لە قیامەتدا ئەگەر چاکەشی هەبێ،ئەوەندە ناهەقی کردووە وقسەی بەم و بەو وتوە کە چاکەکانی ناهێڵن ..

ئێمە بۆتازە کردنەوەی بڕوامان هەق وایە ناوبەناو چەند ڕاستیەك هەیە یادی خۆمانی بێنینەوە وبپرسین :ئێمە خەریکی چین ؟!ئەم دینداریەی ئێمە مانای چیە؟!

قورئان دەفەرموێ ﴿**یا ایها الذین امنوا هل ادلکم علی تجارة تنجیکم من عذاب الیم ،تؤمنون بالله ورسوله وتجاهدون فی سبیل الله بأموالکم وانفسکم ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون ،یغفر لکم ذنوبکم ویُدخلکم جنات تجری من تحتها الانهار ومساکن طیبة فی جنات عدن ذلك الفوز العظیم**﴾**الصف**. کەواتە ئەوەی ئێمە خەریکین بازرگانیە ،کە بریتیە لە بڕواهێنان بەخواوبە پێغەمبەرەکەی و هەوڵ وتێکۆشان لە ڕێی خوادا بەسەرو ماڵ ...

زۆر جار لەم بازرگانیە غافڵ دەبین بۆیە هەقە بپرسین :

کەسێك بازرگان بێت نابێ بزانێ چی دەکڕێ وچی دەفرۆشێ ؟کەسێك بازرگان بێت نابێ زۆرترین کات لە شوێنی پێویست دا ئامادە بێ و بەجوانی مامەڵە لەگەڵ کڕیارەکاندا بکا ،یابانیەکان دەڵێن :ئەگەر کەسێك نەیتوانی ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین بێ لەگەڵ خەڵکیدا با دووکان دانەنێ ..

حەزرەت (ص) کاتێ پەیمانی بەست لەگەڵ خەڵکی مەدینەدا کەهاتبوون بۆمەککە بۆحەج ،باسی ئیمان و ئیسلامەتی وئەرکی سەرشانیانی بۆکردن ،ئەوانیش وتیان : ئەگەر ئەوانەمان کرد چیمان بۆ هەیە؟! فەرموی :بەهەشت ...

وتیان (ربح البیع )...بەڕاستی کڕین و فرۆشتن و بازرگانیەکی خێردارەهاوەڵان چاك لەسەر ئەم مەسەلەیە پەروەردە بوون ئەوە :

یەکەم/سوهەیبی ڕۆمی خەڵکی مەککە نەبوو ،لەمەککە کار و کاسبی دەکرد و شتێك ماڵ وسامانی پێکەوەنا ،کاتێك موسوڵمان بوو ویستی کۆچ بکا بۆمەدینە باری پانزە حوشتر و کەل و پەل و ماڵ و سامانی پێبوو، کافران ڕێیان لێگرت و وتیان :ناهێڵین بڕۆیت هەتا هەرچیت پێیە بە جێی نەهێڵی بۆمان ،ئەویش ناچار هەموی دانێ ، پاشان ئەو عەبایەی دابووی بەسەر شانیدا ئەویشیان لێسەند ... کاتێك بێ سەروەت و سامان وڕەنجی چەند ساڵەی گەیشتە مەدینە ،حەزرەت (ص) پێی فەرموو :ربح البیع ...ربح البیع ...بە ڕاستی کڕین و فرۆشتنەکەت و بازرگانیەکەت لەگەڵ خوادا خێردار و پڕ بەرەکەت بوو..

دووەم/کاتێ (حیرام کوڕی ملحان ) پەیامی حەزرەتی (ص)گەیاندە پادشایەکی یەمەن ،لەو کاتەدا کە لە بەردەم پادشادا قسەی دەکرد لە پشتەوە ڕمێکیان کرد بە پشتیدا ،ئەویش هاواری کرد ووتی : فزت ورب الکعبە !بەڕاستی ئەوان هەموو ساتێ لە خەیاڵی سەرفرازی و بەهەشتا بوون بۆیە ئاوا دەڵێ ...

ئەو کەسەش کە شەهیدی کرد ،ئەو قسەیە کاری تێکرد و پرسیاری کرد :باشە کابرا وا لەخوێنی خۆیدا دەگەوزێ ودوور لەکەس وکاری و بەغەریبی سەردەنێتەوە ،ئیتر کامەیە (فوز ) ؟؟کامەیە سەرفرازی و ڕزگار بوون و سەرکەوتن ؟!وتیان :ئەوە مەبەستی دەستکەوتنی بەهەشتە و ئەوە شەهید بووە !ئەمەش وای کرد کابرا موسوڵمان بێت ....

**سێیەم**/حەزرەت (ص) بە هاوەڵانی دەفەرموو :**الا مُشمر للجنة** ؟کەس هەیە قوڵی هەڵ بکا وتێبکۆشێ بۆبەهەشت ؟! هاوەڵانیش وتیان: **نحن المشمرون یا رسول الله** !ئێمەین کەقوڵمان لێ هەڵماڵیوە و تێدەکۆشین بۆبەهەشت ..

حەزرەتیش (ص) فەرموی :بڵێن (انشاء الله )

کاتێك لەحەسەنی بەصریان پرسی کەی بڕوادار پشووی تەواو دەدات ،وتی :کاتێ پێ دەخاتە بەهەشتەوە ! بەڵێ..بەهەشت خۆ گورج کردنەوەو قوڵ هەڵماڵینی دەوێ ،بەرچاو ڕوونی ودڵفراوانی دەوێ ،چاو قایمی و دڵدامەزراوی دەوێ ...ئەوانەی کە لەگەڵ شێخ احمد یاسین بوون ، کەلە نوێژی بەیانی هاتنە دەرەوە،وتیان :یا شێخ دەنگی تەیارە دێت ، وتی :بادەنگی بێت منیش چاوەڕێی ئەوان دەکەم ... بەڕاستی ئەوە هیممەت و عەزیمەتە تا دواپلە ،خوای گەورەش ویستی ڕێزی لێبنێ بە شەهیدبوون ،ئەگینا ڕۆژێپێشتر لەخەستەخانە ئەوەندە نەخۆش بوو بەتەمای نەبوون ..لەوە هەستایەوە تا لەو کات و ساتەدا شەهیدبێ و ، ببێت بە (حوجە ) بەسەر ئەوانەی کە بۆبەهەشت خۆیان ناڕەنجێنن و خەم ساردن !!

## ڕیشەکێشکردنی فیتنە

لە فەرموودە دا هاتووە کە خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە لەگڵ و، هەروەك چۆن گڵەکان جیاوازیان هەیە لە سیفات و ڕەنگدا ئاواش مرۆڤەکان جیاوازن ،هەیە زوو توڕە دەبێ وهەشە بەئارامە و(حلیم) ە، هەیەدوای گومان دەکەوێ﴿**ان یتبعون الا الظن** ﴾ **النجم٢٣**،هەشە بەئاسانی باوەڕ بە هەموو شتێك ناکا وباش ئەم دیواو ئەودیوی دەکا وعەقڵی لەپێش دڵیەوەیەتی و شوێن هەست وسۆز ناکەوێ ..

مرۆڤی واش هەیە پەلەیەتی﴿**خُلق الانسان من عَجَل سأریکم آیاتی فلا تستعجلون** ﴾**٣٧ الانبیاء**.. بە پێچەوانەشەوە کەسانی لەسەرخۆ هەن کەئەو پەلەپەلەیان لەخۆیان دا چارەسەر کردووە .... دیارە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەوڵدەدات بۆ چارەسەرکردنی هەموو لایەنە(سلبی ) ەکانی مرۆڤ وجەخت دەکاتە سەر لایەنە(ئیجابیەکان ) .

بەڵام ئەمەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ و کەم تازۆر لێرەو لەوێ فیتنەو ئاشوب وقسە وقسەڵۆك سەرهەڵدەدا ...

هەر لە زەمانی حەزرەت دا (ص) ولەدوای غەزای بەدر کەسانێکی ناحەزو لاواز دەیان وت (محمد ) (ص):غەنیمەتی بۆخۆی لاداوە ،ئەمەش ڕەنگی دایەوە لەسەر هەندێ لە موسوڵمانانی سەر (شاخی ئوحود ) کەخێرا بێنە خوارێ وغەنیمەت کۆبکەنەوە نەك بەشیان نەمێنێ و دوایی لێی لابدرێ ، قسەو قسەلۆك ئەوەندە زۆر بوو کە قورئان لەسەری هاتە جواب و فەرمووی :

﴿وما كان لنبي ان يغل ، ومن يغلل يأت بما غل يوم القيامة ، ثم توفى كل نفس ماكسبت وهم لايظلمون ، افمن اتبع رضوان الله كمن باء بسخط من الله وماواه جهنم وبئس المصير ، هم درجات عندالله والله بصير بما يعملون ، لقد منّ الله على المؤمن اذ بعث فيهم رسولا من انفسهم يتلو عليهم اياته ويزكيهم ويعلمهم الكتاب والحكمة وان كانوا من قبل لفي ضلال مبين ﴾ ال عمران ١٦٤ واتە :بێگومان بۆهیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە نادادی و خیانەت بکات و غەنیمەت بۆخۆی لا بدات ،هەرکەس کاری وا بکا لە ڕۆژی قیامەت دا ئەوەی لای داوە و ئەو ناهەقیەی کردویەتی بە کۆڵیەوەیەتی ،لەوەو دوا پاداشتی هەرکەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ ،ئایا ئەو کەسەی شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبێت وەکو ئەو کەسە وایە کە بەهۆی گوناە و تاوانەوە شایستەی خەشم وقینی خوا بێت ؟ بێگومان شوێنی ئەو جۆرە کەسانە دۆزەخە کە سەرەنجامێکی ناخۆشە.

هەریەك لەو دوو دەستەیە پلەوپایەی خۆی هەیەلای خوا ( لە بەهەشت یان لە دۆزەخدا )بەڕاستی خوا بینایە بۆ ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن ، سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێ پێغەمبەری بۆڕەوانە کردوون لەخۆیان ، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە ودڵ ودەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە ، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکا، بە ڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچووبوون ....

جا ئەگەر کەسانێك ئاوا گومانیان بردبێ بەسەرداری پێغەمبەران (ص)، ئەو پێغەمبەرەی کە دەفەرموێ ( لايعرف قدري عند ربي الا ربي ) کەس نازانێ قەدری من چەندە لای پەروەردگارم مەگەر پەروەردگارم ، ئەوە ئیتر ئاساییە کە هەریەکەو کەم تازۆر قسەمان بەرکەوێ ....

ئاشکرایە لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا دووڕوو هەبوون ، قورئان هەوڵی چارەسەری دەدا و ، ئەسڵ لەناویاندا پەردەپۆش کردن بوو ،حەزرەت (ص)کەخوا ناوی دووڕووەکانی بەوەحی پێڕاگەیاندبوو تەنها لای (کاتم سر )حوزەیفەی کوڕی یەمان باسی کرد بۆئەوەی فیتنەی زیاتری لێ نەکەوێتەوە .

دووڕووەکان ئازاری زۆری پێغەمبەر (ص) و موسوڵمانانیان دا ، تەنانەت بوختانی ناموسیان بۆ خاتوو عائیشە کرد ، ڕووداوەکە ئەوەندە کاریگەر بوو، قورئانی لەسەر دابەزی و موسوڵمانانی تەمێ کرد کە جارێکی تر بەقسەی ئەم وئەو بڕوا نەکەن و،ئەو جۆرەشتانە بە کەم نەزانن چونکە دەم وەردان لە ناموس و شەرەفی خەڵکی لای خوا گرانە﴿ **اذ تَلَقَّونه بالسنتكم وتقولون بافواهكم ما ليس لكم به علم وتحسبونه هينا وهو عند الله عظيم ، ولولا اذ سمعتموه قلتم ما يكون لنا ان نتكلم بهذا سبحانك هذا بهتان عظيم، يعظكم الله ان تعودوا لمثله ابدا ان كنتم مؤمنون** ﴾النور ، واتە:ئەوە بۆهەردەماو دەم قسە لە زمانی یەکتر وەردەگرن بێلێکدانەوە ،کاتێك بەزارتان شتێك دەڵێن کە هیچ ئاگاداری نین ،ئێوە وادەزانن ئەو بوختانە شتێکی ئاسانە ؟لە کاتێك دا ئەوە لای خوا زۆر گەورەو ناقولایە ،دەبوایە کاتێ گوێتان لەو بوختانە بوو ، بتانووتایە : ئێمە بۆمان نییە قسەی وا بکەین،پاکی وبێگەردی بۆخوایە،ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەیە ،خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە هەرگیز شتی وا دووبارە نەکەنەوە ئەگەر ئێوە بڕوادارن ...

بەڵێ...لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا کەسانێك هەبوون کە ئاگری فیتنەیان دادەگیرسان و لەهەل دەگەڕان قورئان لە بارەیانەوە دەفەرموێ ﴿**لو خرجوا فيكم ما زادكم الا خبالا ولأوضعوا خلالكم يبغونكم الفتنة وفيكم سماعون لهم والله عليم بالظالمين** ﴾ **التوبة** ٤٧ ئەگەر دووڕووەکان دەرچونایە بۆغەزاو لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لەسستی نەبێودەستیان دەکرد بە چرپە چرپ لەناوتانداو دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێ لەنێوانتاندا بەئاواتیهەڵگیرسانیفیتنەوئاشوب، کەسانێکیش هەن لەناو ئێوەدا گوێیان بۆدەگرن ،خوای گەورەش ئاگادارە بە کار و کردەوەی ستەمکاران ..

فیتنەو قسەوقسەلۆك لەکاتی دابەشکردنی هەندێ دەستکەوتدا زیاتر سەر هەڵدەدا،حەزرەت (ص)دەستکەوتەکانی غەزای حونەینی دابەش کرد بەسەر تازە موسوڵمان وسەرۆك خێڵەکان دا و هیچ بەر ئەنسارەکان نەکەوت ،بۆیە لە دڵیاندا شت

دروست بوو ، دەنگەدەنگ پەیدا بوو ، تەنانەت کەسێ جورئەتی کردو وتی : بەخوا ئەوەتا پێغەمبەر(ص) بەکەس و کارەکەی خۆی گەیشتووە و ئیتر لا بەلای ئێمەدا ناکاتەوە ،سەعدی کوڕی عەبادە چوە خزمەتی وعەرزی کرد :پێغەمبەری خوا ئەنسارەکان لەبەردڵیان گرانە کە تۆ لەو دەستکەوتانە تەنها بەشیخزمانی خۆتت داو بەخششێکی زۆرت دا بە خێڵە عەرەبەکان و لەوە هیچ بەر ئەنصارەکان نەکەوت .. حەزرەتیش(ص) فەرمووی :ئەی سەعد ئەوە تۆ قسەی وەها دەکەیت ؟سەعد وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ص)منیش مرۆڤێکم و یەکێکم لەخێڵەکەم . فەرمووی :ئادەی خزم و خێڵەکەتم بۆ کۆبکەرەوە لە شوێنێکدا ...

سەعد ڕۆیشت و هەموویانی کۆکردەوە ،حەزرەت (ص)هاتەلایان و سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی ( ئەی کۆمەڵی ئەنصار ، شتێکم لە بارەی ئێوەوە پێگەیشتووە ، کە ئێوە بەرامبەر من شتێك لە دڵتانا دروست بووە ، وانیە ؟ئایا کەمن هاتم ئێوە سەر لێشێواو نەبوون و خواهیدایەتی دان ؟هەژار نەبوون و خوا دەوڵەمەندی کردن ؟دوژمنی یەك نەبوون ،خوا هەمووتانی کردە براو دۆستی یەکتر؟وتیان: بەڵێ،خوا وپێغەمبەرەکەی خاوەن فەزڵی زیاتر وچاکترن .

پاشان فەرمووی :ئەرێ خەڵکی ئەنصار وەڵامم نادەنەوە ؟وتیان بەچی وەڵامت بدەینەوە ؟منەت و ڕێز بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی . فەرمووی :وەڵاهیئەگەر بتانەوێ دەڵێن وڕاستیش دەکەن ، تۆکە هاتیت دوور خرابویتەوە ئێمە متمانەمان پێدایت و باوەڕمان پێهێنایت ، لاواز وزەبوون بویت ، ئێمە سەرمان خستیت ، پەراگەندە بوویت ، ئێمە جێگامان کردیتەوە، هەژار بووی ئێمە دڵمان دایتەوە ..

ئەی خەڵکی ئەنصار ئێوە لە دڵتانداخەفەت بۆ ماڵی دونیا دروست بووە ،ماڵێ کەخەڵکی بەدوایدا ڕادەکەن ، ئەی خەڵکی ئەنصار ئایا ڕازی دەبن کە ئەوان بە ووشترو ماڵاتەوە بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە وئێوەش بە پێغەمبەرەوە بڕۆنەوە بۆ ماڵ وحاڵی خۆتان ؟ سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە،ئەگەر هیجرەت نەبوایە حەزم دەکرد یەکێك بم لە ئەنصارەکان ، ئەگەرهەموو خەڵك ڕوو لەشوێنێك بکەن و ئەنصاریش ڕوو لە شوێنێکی تر بکات ،سوێندبێت کەرێگاکەیئەنصارم هەڵدەبژارد ، خوا ڕەحم بکە بە ئەنصارەکان ، بە ڕۆڵەکانیان ، بە ڕۆڵەی ڕۆڵەکانیان ) بەبیستنی ئەم وتە شیرینانە هەموویان دەستیان کرد بە گریان تا فرمێسك ڕیشی تەڕکردن و وتیان:ئێمە پشکیپێغەمبەرمان دەوێت ، ئیتر

پێغەمبەریخوا (ص) هەستاو ئەوانیش بلاوەیان لێکرد .
کەواتە قسەوقسەلۆك دروست دەبێت و فیتنە وئاشووب سەرهەڵدەدات بەلاّم گرنگ ئەوەیە ئەوەندە هوشیاربین تەشەنە نەکات و سەرقافڵەی کاروانیش بە حەکیمانە چارەسەری بکات .

## بەشداری نەکردن لە فیتنەو ئاشووبدا

حەزرەت(ص) ناوبەناو ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد وئاگاداری‌دەکردن کە فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدا( **الا ستکون فتن** )، وتیان:وما **المخرج منها یا رسول الله** ؟ئەی پێغەمبەری خوا (ص)بەچی لێی دەرچین وپارێزراو بین ،فەرمووی :**کتاب الله** ... دەست بگرن بەبەرنامەی خواوەوپەیڕەوی قورئان بکەن..... هەروەها لەفەرمودەدا هاتووە ،کەعومەرو عوسمان وعەلی وحوسەین شەهید دەبن وئاشوب دەکەوێتە نێوان دوو کۆمەڵەی گەورەی موسوڵمانانەوە و عەممماریش کۆمەڵی (باغی)(ئەوانەی کەبەئیجتهادیان لەفەرمانی ئیمام دەردەچن )دەکوژرێت ..

زۆرجار بێویژدانی و داواکردنی (مثالیە ت ) وادەکات ئەو قسەو باسە بێتە کایەوە کەسێك خۆی تواناکانی سنوردراوە و هیچی لەباردا نیە یان کەمی لەباردایە،کەچی داوای ئەوپەڕی تواناو هەوڵ دەکات لە بەرامبەرەکەی ئەمەش وایکرد یەکێ لە خەلیفەکان بە ڕاشکاوی بەخەڵکانیدەوروبەری بڵێ: ( ئەی ڕەعیەت ویژدانتان بێ ،ئێوە دەتانەوێ ئێمە وەك ئەبوبەکرو عومەر ڕەفتارتان لەگەڵ دا بکەین کەچی ئێوە وەك ڕەعیەتەکەی ئەوان نابن لەگەڵمان ).

برایەك خەریکیکاروکاسبیوژیانی خۆیەتی و،هیچ خۆی نارەنجێنێ و بە هەزار حاڵ ئەگەر کاتی زیادەی خۆی بدات بەدەعوە ،ئینجاچاوەڕێی موعجیزەیە لەسەرکردەو هاوکارانی ، ئاخر ئەوەی ئەمیرێکی وەك ئەبوبەکری بوێ دەبێ خۆشی وەك سەعد و خالید بێ.

ئنجا با بشزانین ئەبوبەکر هەرزوو بە موسوڵمانانیفەرموو: ( خەڵکینە بەڕاستی حەزم دەکرد یەکێکی تر شانی بدایەتە بەر ئەم بەرپرسیارێتییە و لەکۆڵ منی بکردایەتەوە ،جا ئەگەر بەتەمابن وەك پێغەمبەر (ص) بم وهەمووسوننەت جێبەجێ بکەم ، ئەوە بەرگەی

ناگرم چونکه حەزرەت (ص) بۆ خۆی معصوم بوو لە شەیتان و بەردەوام وەحی بۆ دەهات لە ئاسمانەوە ).

بەراستی پێویستە خەریکی خۆمان بین بە چارەسەرکردنی کەموکوڕیەکانمان و هەوڵبدەین سەرقاڵی خەڵکی نەبین ، سری سقگی بەغدادی خۆلاسەی ئەزموونی خۆی بۆ بانگخوازان تۆماردەکات و لەسەدان ساڵ لەمەوبەرەوە دەڵێ: ( هیچ شتێکم نەدیوە بەتاڵکەرەوەی ئیش و تێکدەری دڵ و خێرا بێت بۆ لەناوبردنی عەبدو درێژەپێدەری خەم بێت و نزیکەرەوەی خەشمی خوا بێت ، وەمایەی ڕیابازی و حەزکردن کردن بێت بە کوێخایەتی بە هێندەی ئەوەی کەسێك خۆی نەناسێت و خەریکی گەران بێت بەدوای کەم و کوری خەڵکدا ) . هەروەها عەون کوری عبداللە کوری عوتبەی کوری‌مەسعود کە تابعی‌یە دەڵێت : ( وانازانم کەسێك دەست بەتاڵ بێت بۆگەران بەدوای عەیبی‌خەڵکیدا مەگەر لەغافڵ بوونیەوە نەبێ لە نەفسی‌خۆی ).

زین العابدین کوری حسین کوری‌علی‌دەڵێت(ئەگەر کەسێك دڵسۆزو ساغ بێت بۆ خوا بەنهێنی،خوا ئاگاداری دەکات لە کەموکوری‌یەکانی ونایپەرژێتە سەرخەڵکی ) ئەمەش مانای وانیە قسە نەکرێت لەسەر کەم وکوری‌و ناتەواوی‌یەکان ، بەڵێ قسە دەکرێت بەلام لای ئەو کەسەی کە دەتوانێت چارەسەری بکات .

گرنگ ئەوەیە چارەسەر بکرێ‌و خراپەی گەورەتری لێنەکەوێتەوە ، هەندێ کەس داوایان لە ئوسامەی کوری زەید کرد کە گلەیی بکات لەمەسەلەیەکدا لە ئەمیرەکانیان،ئەویش وتی : ئێوە وادەزانن قسەیان لەگەڵ ناکەم و پێیان ناڵێم ؟من بە نهێنی و لەلاوە قسەیان لەگەڵ دەکەم و دەرگایەك ناکەمەوە کەیەکەم کەس بم بیکەمەوە ، (کە ئەویش دەرگای فیتنەیە ).

عبداللە ی کوری عکیم لەناو ئەڵقەیەکی قوتابیەکانیدا وتی( جارێکی تر هەرگیز هاوکاری ناکەم لەرشتنی خوێنی خەلیفەدا دوای حەزرەتی عوسمان )...

قوتابیەکانی ئەبڵق بوون و وتیان : بۆچی تۆ دەستت هەبووە لە ڕشتنی خوێنی حەزرەتی عوسماندا ؟؟ عبداللە وتی :(من وا دەبینم باسکردنی کەم و کوری کەسێك لەناوخەڵکیدا وەك خوێن ڕشتنی وایە )!.

بەڵێ، عبداللە سمانی خۆش دەویست و هەروا لە نیەتی خێرەوە باسی هەندێ شتی

کـرد کـه بـەلای ئـەوەوە کـەموکوڕی بـوون ،ناحـەزان ئـەو قـسانەیان قۆسـتەوە و فیتنەوئاشووب هەڵگیرساو بە ناهەق عوسمان شەهیدکرا .

ئەوەی جێی داخە هەندێ لەوانەی کە لەو فیتنەیەدا بەشداری دەکەن وادەزانن بۆ خوای دەکەن ، عەمری کوڕی حومق کە نۆ خەنجەری دابوو لە سەرسنگی عوسمان وتی: سێ خەنجەرم لەبەر خوا لێداوە وشەشیشیان لەبەر ئەو ڕقەی کە لە دڵما بوو.

بەڕاستی خەڵکی زۆربەی گێرەوەی زمانن، بۆیە وشیاری پێویستەو ئەبێ باش بزانین جاری واهەیە تاقە وشەیەك کەخوا پێیخۆش نیەوقسەکەر گوێی پێنادات دەبێتە مایەی بەتاڵ بوونەوەی کاری ئەو کەسە .

## نەغەیبەت بکەو نەگوێشی بۆ بگرە

بۆ ئەوەی فیتنەو ئاشووب سەرهەڵنەداو برایەتی لەبەر خوا لە ناوماندا بەرقەرار بێت ، پێویستە خۆمان ڕابهێنین کە غەیبەت نەکەین و گوێشی بۆ نەگرین ، قورئان دەفەرموێت **( ولايغتب بعضكم بعضا ، ايحب احدكم إن يأكل لحم اخيه ميتا فكرهتموه، واتقوا الله ان الله تواب رحيم )** **الحجرات** ١٢ واتە : لەپاش ملە باسی یەکتری مەکەن ، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات ؟؟ دیارە کاری واتان زۆر پێسەخت و ناخۆشە ، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پارێزکاربن ، بەڕاستی خوا پەشیمانی خەڵکی وەردەگرێت ومیهرەبانە بۆیان .

**فضیل کوڕی عیاض** دەڵێت ( **اذا ظهرت الغيبة ، ارتفعت الاخوة فى الله** )**العوائق**٤٢ ڕۆژێك حەزرەت (ص) بە هاوەڵانی فەرموو ( دەزانن غەیبەت چی یە ؟؟وتیان : خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن ، فەرمووی : غەیبەت ئەوەیە کەباسی براکەت بکەی بەجۆرێك کەپێی ناخۆش بێت.. وترا : ئەی ئەگەرئەوەی دەیڵێم لە براکەما هەبوو ؟ ! فەرمووی : ئەگەر ئەو قسەیەی کە تۆ دەیکەی و ئەو پێی ناخۆشە تیایا هەبوو، ئەوە غەیبەتە ، خۆ ئەگەر تیایا نەبوونەوە بوختانە ( کە لە غەیبەت خراپترە ) (مسلم ) ..

ڕۆژێك خاتوو عائیشە لە لای حەزرەت (ص) تانەو تەشەری دا لە خاتوو (صفیە) گوایە بالای بەرز نیە ، حەزرەتیش (ص) پێی فەرموو:ئەو غەیبەتەی کردت ئەوەندە گوناهێکی گەورەیە ئەگەر تێکەڵ بە ئاوی دەریا بکرێت هەمووی لیخن و بۆگەن دەکات ! (ئەبو داودو ترمذی ) .. گوێ نەگرتن لە غەیبەت و بەرگری کردن لە موسوڵمانان مایەی

ڕەزامەندی خواو سەرفرازی قیامەتە، حەزرەت ( ص) دەفەرموێ ( **من رد عن عرض اخيه رد الله عن وجهه النار يوم القيامة** ) ترمذي .. واتە هەرکەسێ لەسەر براکەی هەڵبداتێ نەیەڵێ غەیبەت بکرێ ئەوە خوای گەورە ڕووی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ .

**نموونەیەکی خۆپاراستن لە غەیبەت :**

زانای خواناسی بانگخواز شێخ ئەمجەد زەهاوی نموونەیەکی بەرزە لەم بوارەدا ، ئەم پایە بەرزە کوردەو لە ساڵی (١٨٨٣) لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٦٨) ز دا کۆچیدوایی کردووە.

ئەم خواناسە بە ڕەوشت و خووی جوان و هەوڵ و کۆششی بەردەوامی توانی خزمەتێکیگەورە بە ئیسلام بکات لە عێراق و لە جیهانیئیسلامی دا ، شێخ ئەمجەد لە سەر ڕێبازی حەزرەت(ص) و یاران بوو ، بۆ خوا سوڵحان بەڕەنگ و ڕوویەوە دیار بوو ، ئەمەش وای لە پێشەوا بەننا کرد کە بڵێت : (ئەگەر دەتەوێ ڕووی گەشی یەکێ لە هاوەڵانی حەزرەت (ص) ببینی سەیری ڕووی شێخ ئەمجەد زەهاوی بکە )..

شێخ ئەمجەد زۆر بیرتیژو وریاو بلیمەت بووە ، ڕۆژێك شێخ (قاسم القيسي) موفتی عێراق لە گەڵیا باسی بەلاغەت و زمانی عەرەبی دەکات ، کە زانایی شێخ ئەمجەدی بۆ دەردەکەوێ لەو بوارەشدا دەڵێت : ( ئەی شێخ ئەمجەد من فیقهو ئوسوڵی فیقهم بۆ تۆ واز لێ هێنا بوو کە مامۆستاو ڕابەر بیت ، هەرگیز بۆ ئەوە نە دەچووم کە لە زمانی عەرەبی و بەلاغەتیشدا ئاوا بیت و موناقەشەم بکەی ، لە کاتێکیشدا من عەرەبم و تۆش کوردیت ، بۆیە ناچارم ئەم بوارەش بۆتۆ بە جێ بهێڵم ، بە ڕاستی ئەمجەد ئەفەندی تۆ شێخی من و شێخی هەموو عێراقی یە کانی لە (منقول) و ( معقول) و هەموزانستەکاندا ولە مەودواش موجادەلەت لە گەڵ ناکەم و تەنها داوای فەتوات لێ دەکەم ).

شێخ ئەمجەد ئەوەندە شارەزا بوو لە فیقهی ئەبو حەنیفەدا ، ( سید محسن الحکیم ) ی پێشەوا ی شیعە لە بارەیەوە وتویەتی ( ئەگەر فیقهی ئیمام ئەبوحەنیفە لە جیهاندا نەمێنێ، شێخ ئەمجەد دەتوانێت لەبەر هەمووی بڵێتەوە و بنوسرێتەوە )..

جالەگەڵ ئەم هەموو بلیمەتی و زیرەکی‌یەدا هەردەم ناوی خەڵکی زۆر نزیکی ، تەنانەت ناوی منداڵەکانی خۆشی بیردەچوو!! ( تەها جابر علوانی )دەڵێت :ڕۆژێك شێخ ئەمجەد ویستی ڕاسپاردەیەکی دەمی بۆبگەیەنمە شێخ محمد الصواف کە زۆر دۆست بوون و زۆر

کات بەیەکەوە بوون ، وتی : بڵێ شێخی خاوەن عەمامە، باڵا بەرز ، یەکسەر زانیم مەبەستی شیخ صوافە ..قسەم نەکرد وتم بزانم ناوەکەی بیردەکەوێتەوە ، کەچی بیری نەکەوتەوە ،لێم پرسی بۆچیئاوازوو ناوت بیر نامێنی؟؟ وتی : ( ئەفەندی ، لەسەرەتای لاویمەوە پاش ئەوەی بینیم لە قورئان و سوننەتدا چەند باسی مەترسی غەیبەت کراوە و زانیم چەند گوناهبار دەبێت ئەوەی بیکات ، لە خوا پاڕامەوە کە یارمەتیم بدات نەتوانم هەرگیز غەیبەت بکەم ، بۆیە ئەبینی هەرئەوەندەی لێرە بڕۆیتە دەرەوە ناوەکەتم لەبیردەچێت و ناتوانم ناوت بهێنم و غەیبەتت بکەم ) ( ل ٢٠ الامام المجد الزهاوی / کاظم المشایخی)

فضیل کوڕی عیاض دەڵێت:(هەرکەس دەیەوێت سەلامەت بێت لەغەیبەت با دەرگای گومان بردن لە خۆیداخات، چونکە کێلە گومان ڕزگاری بێت لە سیخوڕی و کەوتنە دوای کەموکوڕیخەڵکیش ڕزگاری دەبێت ،کێ لەمەش ڕزگاری بێت غەیبەت ناکات) العوائق /٤٢..

## حەزونارەزوویەکی شاراوە

حەزکردنی مرۆڤ بەدنیاومالْ و سامان پالْی پێوەدەنێت بۆ حەزکردن لە کورسی و پلەوپایەوچوونەپێشەوە، پەروەردەی ئیسلامیش گرنگی داوە بە چارەسەرکردنی . لە سەردەمیهاوەڵانیشدا هی وایان هەبووکە حەزی بەکاربەدەستێتیوچوونەپێش دەکرد، پێغەمبەر (ص)پێی فەرموون ( **انکم ستحرصون علی الامارة وستکون ندامة یوم القیامة** ) واتە:ئێوە هەڵپەدەکەن بۆ کاربەدەستی،کە ئەوەش مایەی پەشیمانییە لە قیامەتدا (بخاری).

هەروەهادەفەرموێت (**انا والله لا نُوَلي علی هذا العمل احدا سأله او احدا حرص علیه** ) بخاری ، واتە بەخوا ئێمە کار نادەینە دەست کەسێك داوای بکات یان هەڵپەی بۆ بکات و سووربێت لەسەری .

ڕۆژێك ئامۆژگاری عەبدولرەحمانی کوڕی سەمورەی کردو فەرمووی (داوای کاربەدەستی و ئەمارەت مەکە ، چونکە ئەگەر لەسەر داوای خۆت پێت درا و کرایتە کاربەدەست ، ئەوا خوای پەروەردگار دەتداتە دەست کارەکە،بەلاّم ئەگەر بەبێداوای خۆت درا بە سەرتا ئەوا خوای گەورە هاوکاریت دەکات و بۆت ئاسان دەکات).

پێشەوا ( ثوری)دەڵێ:( **لم أر الزهد فی شیء اقل منه فی الرئاسة** )واتە:هیچ شتێکم نەدیوە هێندەی کورسی و پلەوپایە بەکەمی زوهدی تیا بکرێت .

فضیل کوڕی عیاض دەڵێت ( هەرکەس حەزی لە کوێخایەتی و خۆ بردنە پێشەوە بوو ، ئەوە حەزدەکات باسی کەم و کوڕی خەڵکی بکات تابوترێ خۆی تەواوەو، حەزیش ناکات باسی کەسی لابکرێت بە چاکە ، جا هەرکەس شەیدای کورسیو پلەو پایە بوو ئەوە دەست لە چاکیەکەی بشۆ) .

بانگخوازانیش هەمیشە یەکتریان ئگادار کردۆتەوە لەم حەزوئارەزووە شاراوەیە ، ئەوە ( ثوری ) نامە بۆ (عباد کوری عباد ) ی هاوەڵی دەنێرێ و ئامۆژگاریی دەکات و دەڵێت :(نەکەیت حەز لە پلەوپایە وکورسی بکەیت ،پیاوی وا هەیە لەئاڵتون وزیو زیاتر حەزی لێیەتیو ئەوەش هەموو کەس لەخۆیدا دەرکی پێناکات ،مەگەر یەکێك زاناو هۆشیار بێت، وریابە خۆت نەدوڕێنی و بە نیەتەوە ئیش بکە ) ل٨٧ العوائق.   ئەم حاڵەتە نەخۆشیەو تووشیدڵیبڕواداردەبێت ،کاتێك بەخۆیدەزانێت هاوسەنگی ناهێڵێ و کارەکانیلێدەشێوێت .پێشەوا (ئیبن تەیمیە ) دەڵێت:( ئەو کەسانە حەزی چونە پێش و بوون بە کەواسووری بەرلەشکر وایان لێدەکات ببنە دۆستی کەسێك کەبەشان وباڵیاندا هەڵبدات ئەگەر ڕاستیش نەبێت و،ببنە دوژمنیکەسێك کە لۆمەیان بکات و ئامۆژگاریان بکات ئەگەر هەق و ڕاستیش بێت ).ل٢٢٠ العوائق.

بانگخواز ڕاستە حەز دەکات نموونەو پێشەنگ بێت وبەباشترین شێوە بەرنامەکەی بگەیەنێو, هەروەك (حەزرەتی ئیبراهیم ) دوعا دەکات:( **واجعلنا للمتقین اماما** )، بەلام ئەم بوون بەپێشەوایە هەروا ئاسان نییە ، پەروەردە و پێگەیاندنی دەوێت ،تەنانەت بۆ پێغەمبەرانیش  هەروا بووە ،ئەوە حەزرەت (د.خ)دەفەرموێت: ( **ادبنی ربی فأحسن تأدیبی** ) ئینجا لە تەمەنی چل ساڵیدا خوا کردی بە پێغەمبەر ، چونکە تەمەنیش بۆ خۆی مەسەلەیەکە.

بانگخوازیش  پێویستی بەپەروەردەی چاك هەیە وئینجا (الجندیة طریق القیادة) ئەگەر شاگردێکیباش، یان سەربازێکی باش نەبێ ، ناگاتە ئەوەی کە بتوانی ڕۆڵی خۆی ببینێ لە ڕیزەکانی پێشەوەدا.

پلەوپایەو کورسی فیتنەیەو زۆر کەس لە خشتە دەبات ، کاتێك(عومەری کوڕی عبدالعزیز)سەرکەوتە سەر مینبەر پاش ئەوەی بوو بە خەلیفە (عوبەیدوللا)کە برازای ( عەبدوللای کوڕی مەسعود )و مامۆستای عومەر بوو ، دڵی دەلەرزی ..ئاخۆ لەم تاقیکردنەوە قورسەدا دەرچێ ؟ عومەر لەسەر مینبەر وتی :(**الا انی لست بخيركم ولكنی رجل منكم ، غير ان الله جعلنی اثقلكم حملا**)ل٨٤ (العوائق )واتە :ئاگاداربن من لە ئێوە باشتر نیم و یەکێکم لە ئێوە ،تەنها ئەگەر جیاوازییەکیشمان هەبێ ،لەوەدایە کە خوا باری منی لە هەمووتان قورستر کردووە .پاش ئەم قسانە مامۆستای عومەر دڵی ئارام بوو، عومەریش کە خوا ناس و بۆ خوا سوڵحاو بوو، وە کۆمەڵە کەسێکی خواناسیش لەدەوری بون وهاوکارییان کرد، توانی لە دوو ساڵێکدا ڕۆڵی گرنگی خۆی ببینێ ولە مێژووشدا بە پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدین دادەنرێ.

جەماعەتی تەبلیغ لە ولاتی هیند و پاکستان ، کە دەچن بۆ بانگەواز کردن و یەکێکیان دەچێتە سەر مینبەر بۆ قسە کردن هەر هەموویان دەست بە دوعان کە بتوانێ چاکترین قسە بکات و زۆرترین خەڵك بێنێت بەرەو ئیسلام ،کە بە ڕاستی ئەوەیە ئیخلاص .

ئێمە دەمانەوێت پرۆژەی ئیسلامی بەرەو پێش بچێت ، هەر کەس بیکاو شان بداتە بەری خوا خێری بۆ بنوسێ و دەبێ پێمان خۆش بێت ، نەك لەبەر ئەوەی بە من نەکراوە ولەسەر دەستی منذا نەبوە حەز بەوە بکەم بکەوێتامن بچمەجێگەکەی . هەموو پێویستمان بەئیخلاصە ،پێویستمان بەوەیە کەڕاست بکەین لەگەڵ خوادا ، ئەگینا کارەکانمان لێوەرناگیرێ و ڕەنج بە خەساری دنیاو ئاخیرەت دەبین(**وقدمنا الی ماعملوا من عمل فجعلناه هباء منثورا**) ٢٣ **الفرقان** .

( نورەدین زەنکی ) نمونەیەکی بالاوگەشە لەم بوارەدا،بۆیە بە شەشەم خەلیفەی ڕاشیدین دادەنرێ، ڕۆژێك لەمەجلیسی عیلما دەبێت وزانایەك فەرموودەیان بۆ باس دەکات بابەتێك دێتە پێش کە زەردەخەنەیخستە سەر لێوی هەمووان،تەنهانورەدین نەبێت ،لێیان پرسی :بۆ وا مات وپەستی ؟! وتی :(شەرم دەکەم لە خوا پێ بکەنم و موسڵمانانیش لە ئەسکەندەریە لە میسر خاچ پەرستان ئابلۆقەیان داون ).

ئەو شەوە زاناکە خەودەبینێ بەحەزرەتەوە (ص)کەلە خەوەکەداپێیدەفەرموێ: مژدە بدە بە نورەدین کەخوا ئابلۆقەکەی لەسەر موسڵمانان هەڵگرتووەوڕزگار بوون ،

زاناکەش دەڵێت:ئەی پێغەمبەری‌خوا ناونیشانێکم بدەرێ تابڕوام پێبکاحەزرەتیش فەرمووی :پێی بڵێ بە ناونیشانی ئەو سوجدەیەی لەسەر شاخی (تل حارم ) بردی. بۆ بەیانی کە زاناکە دەچێت بۆ نوێژی بەیانی لەڕێی مزگەوت نوورەدین دەبینێ کە ئەویش بەسواری ئەسپەکەیەوە دەچوو بۆ نوێژ، زاناکە ڕای‌دەگرێت وپێی‌دەڵێت : قوربان ئەمشەو خەوم بە حەزرەتەوە (ص) بینی ، فەرمووی مژدەت بەمێ کەخوا ئابلۆقەکەی لەسەر موسڵمانان هەڵگرتووە و، منیش داوای ناونیشانێکم لێکرد بۆت تابڕوام پێ بکەی‌فەرمووی:بەناونیشانی‌ئەوسوجدەیەی کاتی خۆی لەسەر(تل حارم ) بردوتە .یەکسەر نورەدین لەسەر ئەسپەکەی دابەزی وچووە سوجدەوە و زۆر گریاو وتی: ( **اللهم انصر دينك ولا تنصرنورالدين الكلب ،وما نورالدين الكلب حتى تنصره** ) واتە:خوایە ئاینەکەی خۆت سەر بخە و نورەدینی‌سەگ سەر مەخە ، نورەدینی سەگ چییە تۆ سەری بخەی؟.

## بۆپێناگەین؟!

زۆر جار دەڵێم ئەگەر دارو درەخت بوینایە ، باخەوانەکەمان هەر زوو دەیبڕینەوە لەبەر بێ کەڵکی و بێ بەریمان !خەڵکی دەڵێن : ئەمساڵ ساڵی ترێ یان هەنجیر نەبووە کاتێك ئەو ساڵە بەروبووم باش نەبێت ، نازانم لەوەدەچێت ئێمە ومانان هیچ ساڵێك ساڵمان نەبێت ، بەرهەمێکمان نیە کە دڵی باخەوان خۆش بکاو دوژمنانیش دڵیان شەق ببات ، لە کاتێکدا ( **ومثلهم في الانجيل كزرع اخرج شطأه فآزره فاستغلظ فاستوى على سوقه يُعجب الزُراع ليغيظ بهم الكفار** )**الفتح** ٢٩ . واتە (نموونەی بڕواداران وەك ڕووەکێك وایە کە لە سەرەتاوە چەکەرە بکات،جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت ، پاشان ئەستووربێت و ڕاوەستێت لەسەر قەدەکەی ، ئەوەندە زوو پێبگات کشتیارەکان سەرسام بکات وپێیان سەیربێت چۆن وا پێگەیی ؟؟!چۆن ئاوا خۆی گرت ؟؟! دیارە ئەمەش داخ دەکات بە دڵی کافراندا )

هەندێ لە بڕواداران سست بوون و پێنەدەگەیشتن ، خوای گەورە لە قورئاندا سەرزەنشتی کردن تا وشیاربینەوە (**الم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكرالله ومانزل من الحق ولايكونوا كالذين أوتوا الكتاب فطال عليهم الامد فقست قلوبهم وكثير منهم فاسقون** ) **الحديد**١٦.. واتە :ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، دڵەکانیان بۆ یادی خواو بۆ قورئان مل کەچ بکات و ، وەکو ئەو کەسانە نەبن کە پەڕاوی ئاسمانیان بۆ ڕەوانەکراو

، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دووروودرێژ دڵیان ڕەق بوو، زۆربەشیان یاخیبووسەرکەش و نالەباردەرچوون .

ئەگەر سەیری مێژووی شکۆداری ئیسلام بکەین ، ئەوە (سعد کوڕی معاژ ) هەموو تەمەنی ئیسلامەتییەکەی تەنها حەوت ساڵ بوو، کاتێك لەغەزای خەندەق دا برینداربوو حەزرەت (ص) لە مزگەوتدا خێمەی بۆ هەڵدا تا تیماری برینەکەی بکرێت ، سەعد دوعای کرد : خوایە ئەگەر پێغەمبەرەکەت (ص) جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی ماوە لەگەڵ جوولەکەکاندا بمهێڵەرەوە بۆ گیانیان ، خۆت دەزانی لە بەر تۆچەند ڕقم لێیانە و ، ئەگەر نەشماوە گیانم بکێشە و دەمەویَ بگەڕێمەوە بۆلای تۆ ، خوای گەورەش دوعاکەی گیرا کردو برینەکەی تووشی خوێن بەربوون بوو بە شەهیدی سەری نایەوە ..

حەزرەت (ص) بە هاوەڵانی فەرموو : بزانن ئەوە کێیە وەفاتی کردوە ، عەرشی خوای بۆ هاتۆتە لەرزە ؟؟ سەیریان کرد سەعد کۆچی دوایی کردووەو کاتێك ناشتیشیان بە هەزارەها مەلائیکە تەرمەکەیان بەڕێ کرد .. باشە دەبێت ئەم پیاوە بەرزە چی کردبێت ئاوا زوو پێگەیشت و گەیشتە ئەو پلەوپایە بەرزە !!.

ئەوە ( عبدالله کوڕی ئوم مکتوم ) چۆن ئاوا عاشقی شەهیدی بوو ، چۆن ئاوا پێگەیشتبوو و پەروەردەکرابوو ؟؟ کە کوێری نەبێتە ڕێگر لە بەردەمیاو بە هیمەتی بەرزەوە لە قادسیەدا ئاڵای موسوڵمانی هەڵگرت و لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی جەنگدا وەستا ، تابە وەستانەکەی ببێتە هاندەرو دڵقایمی بۆ موسوڵمانە چاو ساغەکان و ئینجا بە شەهیدبوونیشی بووە حوجە بەسەر ئەوانەوە کە لە بیانوو دەگەڕێن بۆ ئەوەی خۆیان لە هەوڵو تێکۆشان بدزنەوە .

لەناو هاوەڵاندا چەند کەسێك ئەوەندە کاری مەزنیان ئەنجامدا ، حەزرەت هەر لە دنیاوە مژدەی بە هەشتی پێدان وەك چوار خەلیفەکە وخەدیجەو ..هتد .

ڕۆژێك خاتوو عائیشە لە دەرەوەی ماڵ بوو کە گەڕایەوە ، لەناو مزگەوتدا گوێی لە کەسێك بوو ئەوەندە قورئانی بەخۆشی دەخوێند پێی نەبوو بچێتەوە ماڵەوە ، دوای ماوەیەکی زۆر کە هاتە ژوورەوە بۆ حەزرەتی گێڕایەوەو ئەویش چووە ناو مزگەوت و سەیری کرد سالم مولی حوزەیفەیە ، حەزرەت (ص) فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە ئومەتەکەمدا پیاوی وەك سالمی دروست کردووە . شایانی باسە سالم لە جەنگی یەمامەدا کفنی پۆشیبوو پاش جەنگانێکی قورس شەهید بوو..

هاوەڵان هەرچەند زۆربەیان لاو بوون ، زوو پێگەیشتن و بوونە جێی متمانەیحەزرەت (ص) وکارەکانیان بۆ رادەپەڕاند. (زەیدی کوڕی سابیت) لاوێك بوو ،حەزرەت (ص) داوای لێ کرد کە فێری زمانی عیبری ببێ ،لە پانزە ڕۆژدا فێر بوو .

(ئوسامەی کوڕی زەید ) کە تەمەنی لە شانزە ساڵ کەمتر بوو ، لە نۆ (سریە )دا جارێك ئەم سەرکردە دەبوو ، جارێکیش (ابو بکر )،کە بەشانزە ساڵیش حەزرەت (ص) کردی بە سەرکردەی ئەو سوپایەی دەچووە سەر ڕۆم ، هەندێ ووتیان :خۆزگە یەکێکیبەتەمەنتری دابنایە ، حەزرەت (ص) فەرمووی :(بەخوا ئەو سەرکردایەتی لێ دێت و باوکی زۆر خۆشەویستم بووە وخۆشی هەروا لە خۆشەویستانمە ).

ئەوەش( سوڵتان محمدفاتح) بیست ساڵێك دەبوو کە (سوڵتان موراد)ی باوکی دەسەڵات و حوکمی بۆ بەجێهێشت ، سوڵتان محمدفاتح دەیویست فەتحی قوستەنتینیە بکات ،سوپای پێکەوەناو نامەیەکی نارد بۆ باوکی وپێیوت :من یادت دەخەمەوە کە دەبێ بەقسەی وەلی ئەمر بکرێت ، تۆ پێویستە کەبێیت بۆ (ئەدرنە)و حوکمی وڵات بکەیتەوە.

(سوڵتان مراد) نامەکەی خوێندەوەو گریاو زانیکوڕەکەی پێگەیشتوەو دەیەوێ خزمەتی ئیسلام بکات . بۆیە هاتە (ئەدرنە) و حوکمی گرتەوە دەست . لاوی خوا ناسی نەبەردیش (محمد فاتیح ) دەوری قوستەنتینیەی گرت، پێش هێرش بردنە سەری ،ترسێك هەبوو لە دڵیموسوڵمانان‌دا لە قایمیقەڵاو لەوسەربازانەی کە لەسەر قەڵاکەوە هەرچینزیك بوایەتەوە ئاوی گەرم وڕۆنیقرچاوی گەرمیان دەکرد بەسەر یاندا . لێرەش لاوێکی خوا ناسی پێگەیشتوو کە عەقڵی لە تەمەنی گەورەتر بوو ، هاتە مەیدان و وتی: ئێمە هاتووین لەپێناوی خوادا گیانمان بەخت بکەین ،چۆن لە ڕۆنی قرچاو دەترسین .

بەڵێ.. ئەم لاوە کە ناوی ( حەسەن ئولوبادلی) بوو ، سیگەنجی تێکۆشەری لەدەور کۆبوەوە ، کەپەیمانیان دا نە گەڕێنە دواوە ، ئینجا موسوڵمانان قەڵاکەیان دایە بەر مەنجەنیق و ئەو سی کەسە هێرشیان برد یەك لەدوای یەك شەهید بوون و سەرەنجام (حەسەن )یەکەم کەس بوو پێی نایە ناو قەڵاکەوە و دەرگای کردەوەو بەدوایا موسوڵمانانیش ڕژانە ناو قەڵاکەوە ، بەمەش سەرکەوتنێکی بێ وێنەیان بۆئیسلام تۆمار کرد.

بەڵێ.. هەوڵدان بۆ خۆ تەواو کردن و خۆ پێگەیاندن زۆر پێویستە ، لەوەدا کە بۆ خوا سوڵحاو بین و نموونە بین لە خواپەرستی ورەوشتی بەرزو تێکۆشان و کۆڵنەداندا.

(حەزرەتی موسا )ئامادە بوو بۆ بینینی (خضر)سەد ساڵێك (واتە :هەموو تەمەنی ) بڕوات وبگەڕێت ، هەروەك فەرمووی :(لا ابرح حتى ابلُغ مجمع البحرين او امضيَ حُقَبا ) (الكهف). ( حُقُب ) نزیکەی سەدسڵێکە . دیارە ئەو پێغەمبەرێکی(اولو العزم ) بوو ،ئەی ئاخۆ ئێمە بانگخوازێکی خاوەن عەزم و هیممەتین ،یان نا ؟ئەگەر (نا)یە ، هەتا کەی وابین ، خۆ هاکا ئە ستێرەی تەمەنمان ئاوا بوو ، یان لە گردۆڵکەی ژیان پێچمان کردەوەو لە چاو ون بووین ، هەروەك مەولەوییەکەی خۆمان دەڵێ :

کاتێکمان زانا دەوریَ وەردەوە ئێمەش چوون یاران پێچمان کەردەوە

## بەرەو ئیمان

خوای گەورە دوو پەڕاوی بۆ ناردوین کە بەهۆیەوە بگەینە ئیمان ،ئەویش قورئانی پیرۆزە کە دەیخوێنینەوە وپەڕاوی بونەوەرە کە هەرچەند لێی وردبینەوە باشتر لە دەسەلآت و گەورەیی پەروەردگار تێدەگەین ...

قورئانی پیرۆز کە خۆی مایەی هیدایەتە سەرنجمان رادەکێشێ بۆ پەڕاوی بینراوی بوونەوەر تا بەهۆیەوە بچین بەرەو ئیمان هەروەك دەفەرموێ :﴿**قل انظروا ماذا في السماوات والارض**﴾١٠١ یونس /پێیان بڵێ سەیرکەن چی هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا ،جا ئەوانەی لە بونەوەر ورد دەبنەوەو عەقڵیان دەخەنە کار ئەوانە دەچن بەرەو ئیمان قورئان دەفەرموێ ﴿**ويُريكم اياته لعلكم تعقلون**﴾٧٣ **البقرة**

ئەوانەش کەسود لە ئایەتەکانی پەڕاوی بوونەوەر وەرناگرن و دڵنادەن بە پەڕاوی قورئان ئەوانەعەقڵ و ژیریان لەدەست داوە ﴿**ومثل الذين كفروا كمثل الذي ينعق بما لايسمع الا دعاء ونداء صُم بُكم عُمي فهم لايعقلون** ﴾١٧١ البقره واتە : نمونەی ئەوانەی ئیمان ناهێنن و لەبەڵگە و نیشانەکان تێناگەن ،وەکو ئەو شوانە وایە ،کە هاوار دەکات بەسەر ئاژەڵەکەیدا ،بەڵام تێناگەن ،تەنها ئەوە نەبێ کە گوێیان لەهات و هاوارێکە ،ئەوانە کەرو لاڵ و کوێرن و عەقڵیان لەدەست داوە ونەفامن ..

لە قیامەتیش دا کەکافرەکان راستی دەبینن ،دان ئەنێن بەوەدا کە ئەگەر گوێیان بگرتایە بۆهەق و عەقڵیان هەبوایە دووچاری سزای دۆزەخ نەدەبون ﴿**وقالوا:لو كنا نسمع**

اونعقل ما كنا فى اصحاب السعير ،فاعترفوا بذنبهم فسحقا لاصحاب السعير﴾الملك. جا ئەوانەی بیر لەم بوونەوەرە فراوانە دەکەنەوە و ئازادانە بەویژدانەوە ڕای خۆیان دەردەبڕن ئەوانە دان دەنێن بەگەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگاردا کە بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرەیە ..

## ئەزموونی ئەنیشتاین

ئەلبەرت ئەنیشتاین سەرەتا جولەکە بوو ،پاشان بووە مولحید ،دواتر پاش لێکۆڵینەوەوقوڵبونەوەی زۆر لە ئاسمان و بوونەوەر ،بڕوای هێنا بەخواو پەڕاوێکی نوسی بەناوی (**من ايامي الاخيرة**) تیایا وتی: (گەورەترین خەیاڵ کە بێ بەدڵ و مێشك ونەفسی بەشەردا ،ئەو خەیاڵەیە کە لەو وروژاندن وئینفعالەوە دروست دەبێ کاتێ مرۆڤ لەم بوونەوەرە فراوانە ورد دەبێتەوە . مرۆڤ دەتوانێ بەهەستی سنورداری ، بەتواناکانی عەقڵی کەهەرچەند ئەویش سنووردارە بگاتە ئەوەی کەوا بەردەوام لە تاریکایەکی گەورەدایە ولەپشت تاریکایەکەشەوە جوانیەك هەیە کەلەو جوانتر نیە و کەمال و تەواوی وبالادەستیەك هەیە کەلەو تەواوتر نیە وئیعجازێك هەیە کە لەو ئیعجاز تر نیە .. ئەو هەڵوێستەو ئەو هەستەش کە دروست دەبێ لە ئەنجامی بیرکردنەوە لە بوونەوەر لەلای‌من بریتیەلەخواناسی‌وعیبادەت،بەڕاستی مرۆڤێك بژی لەم دنیایەدا وتەنها بۆیەکجاریش بێت ئەوهەڵوێستەی نەبێ وئەو هەستە نەکا ئەوە کەسێکی‌بەناو زیندووەولە ڕاستی‌دا مردووە !)هەروەهادەڵێت: (بەڕاستی ئیمان گەورەترین وبەڕێزترین سەرەنجامە کە لێکۆڵینەوەی زانستی دەیگاتێ ).

ڕۆژنامەنوسی‌بەناوی (فلیمنج)لۆمەی کرد لەسەرئەم هەڵوێستە ئیمانیەو پێی‌وت : سەرم دەسوڕمێ لە زانایەکی‌وەك تۆ کە(وزە)ت بەستەوەوداتنا لە هاوکێشەیەکدا لە خوا بترسێ ! ،ئەنیشتاین پێی‌وت: فلیمنج دەمت داخە ،من مولحیدو بێ‌باوەڕ نیم ،من ئیمانم هەیە بەخوا ..

بەڵێ‌زانستی‌فەلەك و وردبونەوە لە ئەستێرەوهەسارەکان مرۆڤ کەمەندکێش دەکا بەرەو ئیمان ،هەروەك زانایەکی ئافرەتی ئەمریکیش لەپەڕاوێکیدا لەسەر زانستی (فەلەك)دەڵێ:ئەم زانستی فەلەکە ئەگەر مرۆڤێك تیا قوڵ بێتەوە یان سوجدە دەبات بۆ بەدیهێنەرەکەی‌یان شێت دەبێ )..

## ئەزموونی فرید هۆیل

ناوبراو لە گەورەترین زانایانی فەلەکە وخاوەنی بیردۆزی تایبەتە کە بەناویەوە تۆمار کراوە ، ئەم زانایە بەدرێژای تەمەنیدژایەتی خوای دەکرد وئیلحادی بلاو دەکردەوەو دەیوت :ئەم بونەوەرەهەر بووەو هەردەبێ وکەس دروستی نەکردووە بەلام پاش ئەوەی چووە تەمەنەوە وئەزمونەکانی زیاتر و باشتر بوون پەراوێکی نوسیبەناوی (الکون الذکی )کەتیایدا دەڵێ:ئێمە ئینکاریبوونیخوای بەدیهێنەرمان دەکرد ،لەکاتیکدا خوای گەورە لەهەموو لایەکەوە جەخت لەسەر بوونیخۆیدەکا... هەسارەکان لەیەك دووردەکەونەوەو بۆشاییەك دروست دەبێوبەردەوام مادەیەك دروست دەبێئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوە کە نازانین لەکوێوە دێکە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو خوایەیەی ئەم بونەوەرەی داهێناوە ،هەر ئەوە کە ئەو ماددەیەش درووست دەکا وئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوە )..

جا ئەو پەراوە ئیمانیاتی زۆری تیایە کە لە ئەنجامی ئەزمونی زۆرەوەیە و بە دڵنیایەوە ئەگەر ئەو زانایە ئیسلامی پێبگەیەنرێ موسوڵمان دەبێ.

## عەقیدەیەکی ڕوون و ئاشکرا

ئاینی پیرۆزی ئیسلام عەقیدەیەکی ڕوون وئاشکرای هێناوە کەزۆر بەئاسانی گەورەو بچوك ،خوێندەوار و نەخوێندەوار ،لەهەموو کات و شوێن وسەردەمێکدا بەئاسانی تێی دەگات ...ئەم ڕاستیەش یەکێ لەوبرا ئەمریکیانەی کەموسوڵمان بوون ،ئاماژەی پێکرد وتی: بەڕاستی بەلای ئەمریکیەکانەوە مەسیحیەت عەقیدە نیە تەنانەت ئاینیش نیە ، بەڵکو تەنها شتێکە لە(ئینتیما )،جاکاتێ یەهودیەت و نەسرانیەتی شێوێندراو نەیات توانی قەناعەت بە کەسانی ژیرو عاقڵ بکەن لە خەڵکی ، بیریارەکان ڕۆیشتن بەرەو نەتەوایەتی وەك هۆکاریك بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی ، بەڕاستی تەنها ئیسلامە کە توانیوێتی سەربکەوێ لەکێش کردنی دڵی خەڵکیدا بەرەو لای خۆی.

(گاری میلر) لە گەڵ ئەوەدا کە قەشە بوو ، لە زانکۆی مەلیك فەهد بۆ پیترۆڵ و معادن مامۆستای بیرکاری بوو ، ناو براو کەنەدیە و ،خوا هیدایەتی داوموسوڵمان بوو ، لە وتارێکدا وتی : ئەی موسوڵمانان ، ئەگەر هەست بکەن بە فەزڵ و گەورەیی ئەوەی لای ئێوەیە لە چاو ئەوەی لای خەڵکی دایە ،ئەواهەمیشە سوپاسی خواتان دەکرد کە لە دایك

و باوکێکیموسوڵمان لە دایك بوون و لە باوەشیموسوڵماناندا گەورە بوون و لەسەر ئەم ئاینە مەزنە پێگەیشتوون ، بەڕاستی مانای ( پێغەمبەرایەتی ، خوایەتی ، وەحی ، ڕیسالەت ، زیندووبونەوە ، لێپرسینەوە ) هەموو ئەو مانایانە کە لەلای ئێوەیە لەگەڵ ئەوەی لای خەڵکدایە جیاوازیان بە هێندەی دووری نێوان ئاسمانەکان و زەویە.. بەڕاستی ڕوونی و ئاسانی عەقیدەی ئیسلام هێنامی بەرەو ئەم ئاینە ، کە لە هیچ بیروباوەڕێکی تردا دەست ناکەوێت ..

## یاساکانی پەروەردگار

مامۆستایەکی پسپۆڕ لە بواری یاسادا کە لە زانکۆیەکی ئەمریکی دا کاردەکات ، دەڵێ: لە دانوستانێکدا لە بارەی یاساوە ،مامۆستایەکییاسای جولەکەمان لەگەڵدا بوو ، کەوتە تانەو تەشەردان لە ئیسلام و موسوڵمانان منیش بۆ ئەوەی دەم کوتی بکەم ، لێم پرسی ، ئایا دەزانی قەبارەی یاساکانی میرات لە دەستوری ئەمریکیدا چەندە؟ وتی: بەڵێ، زیاترە لە هەشت موجەڵەد ، منیش پێم وت : ئەگەر یاسایەکی میراتت بۆ بهێنم کە لە دە دێڕ زیاتر نەبێت ، ئەوسا بڕوا دەکەی کەئیسلام ئاینێکی ڕاستەو حەقە ؟ ووتی: هەرگیز شتی وا نابێت ، منیش ئایەتەکانی میراتم لە قورئان بۆ دەرهێناو دامێ ، پاش چەند ڕۆژێ هات بۆلام و وتی : هەرگیز عەقڵی مرۆڤ ناتوانێ حساب بۆ میراتی هەموو خزمان بکات بەو گشتگیریەو کەسی لەبیر نەچێ و ، ئینجا بەشی هەریەکە لەو کەس وکارە بدات لە میرات بەو عەدالەتەو بە بێ ئەوەی ستەم لە کەس بکات .. پاشان موسوڵمان بوو.

بەڕاستی ئەمەیە گەورەییو موعجیزەی ئیسلام ، تەنها ئایەتەکانی میرات بەس بوو کەمامۆستایەکی بواری یاسای جوولەکەیپێ موسوڵمان بێت.

## ئیمان لەدەرگای دڵ ئەدات

پرۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێت : لاوێکی بەریتانیم بینی کە لەزانکۆی شا فەهد کاری دەکرد پێی وتم : سیانزە ساڵ لە بارەی ئیسلامەوەشتم خوێندەوە ، لەگەڵ ئەوەدا توانام نەبوو بڕیاری موسوڵمان بوون بدەم و شایەتمان بێنم وبەئاشکرا بڵێم : **أشهد أن لااله الا الله وأشهد أن محمدا رسول الله** ،لە ترسی فشاری کۆمەڵایەتی و کێشەکانی ژیان لە سەرم .

تا ڕۆژێك خۆم شت و چوومە سەر جێگەکەم و پاڕامەوە و داوام لە پەروەردگار کردکە ڕێنمایم بکات و ڕێی ڕاستم پیشان بدات، کە خەوم لێکەوت لەخەوما یەکێك پێی وتم ( ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ، بڕوا بهێنن بەو تەنها خوایەی کە دروستی کردون و ئەم بوونەوەرەو هەرچی تیایە بەدیهێناوە ) .. هەستام لە خەوو گریام ، زانیم کە ئەوە نیشانەیەکە بۆم لە خواوە ، زانیم کە ئیسلام ڕێبازی هەق و ڕاستییە ، بۆیە یەکسەر پەیوەندیم کرد بە بنکەی ئیسلامی ئۆکسفۆردو موسوڵمان بووم ..

## موسوڵمان بوونی ڕۆبرت کۆنتین

ناوبراو ڕاوێژکاری سەرۆکی ئەمریکی ( نیکسۆن ) بوو ، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بوو لە دیراسەی **حضارات** دا و یەکێکە لە کەسایەتیە دیارەکانی ئەمریکاو بۆ ماوەی سێ ساڵ کاری کرد لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاو کۆشکی سپیدا .

نیکسۆن ویستی پەڕاوێك بنوسێت بۆ ئەمە داوای لە دەزگای مخابراتی ئەمریکی کرد مەلەفێکی تەواوی بدەنێ لەسەر ئوسوڵیەتی ئیسلامی ، ئەوانیش مەلەفێکی گەورەیان خستە بەردەستی ، وەلەبەر ئەوەی ماوەی نەبوو دیراسەی بکات دایە دەست ڕۆبرت کۆنتین کە بۆی دیراسە بکات و خۆلاسەکەی بداتێ ، کاتێك ڕۆبرت دیراسەی کرد کاری زۆری تێکردو موسوڵمان بوو ، ئێستا ناوبراو لە گرنگترین بڵاوکراوەکانی ڕۆژئاوادا وتاردەنووسێ و بانگی خوا ئەدات بە گوێی خەڵکیدا .

## موعجیزەی قورئان وسوننەت

دەرکەوتنی موعجیزەکان بەردەوامە ( **سنريهم آياتنا في الافاق وفي انفسهم حتى يتبين لهم انه الحق ، اولم يكف بربك انه على كل شيء شهيد** )٥٣ فصلت واتە : ئایەت و بەڵگەو نیشانەکانمانیان پیشان دەدەین لە بوونەوەرو نەفسی خۆیاندا تابۆیان دەربکەوێت کەئەم قورئانە هەقە ، ئایا ئەوەندە بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە ئاگاداری هەموو شتێکە . حەزرەتیش دەفەرموێت لە بارەی قورئانەوە ( **ولاتنقضي عجائبه** )واتە : قورئان شتی سەرسوڕهێنەری لێنابڕێت کەببێتە مایەی هیدایەتی خەڵکی،ئەوەتە دەبینین بەردەوام زانایان لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات ڕاستیەکانی ئیسلام دەسەلمێنن ، بۆنموونە:

## ١/ حەرام کردنی ئاڵتوون لە پیاوان

کۆمەڵەی مەلەکی بەریتانی بلاَویان کردەوە کە لە زانکۆی ( ساوپ هامبتن ) لە بەرواری ١٩٩٨/٨/١٦ تا ١٩٩٩/١١/٢٥ لێکۆڵینەوە کراوە لە سەر ئاڵتون وبەم ئەنجامە گەیشتون :ئاڵتون ئەو تیشکانەی کۆی دەکاتەوە ،کاریگەریان دەبیّ لەسەر خانە زیندووەکان وخرۆکە سپیەکان وخرۆکە سورەکان و هۆرمۆنیٚرینە لە پیاودا ،وکارناکاتە سەر ئافرەت ، هەروەها ئەگەر بەکار بهێنریّبۆ قاپ و قاچاخ و شتی تیا بخوریّ یان بکریّ بە کەوچك و شتی پیّ بخوریّ لەگەڵ ئەوخواردنەدا کارلێکدەکات و زیان دەگەیەنیّ بە لەشی مرۆڤ

لێرەوە حیکمەتی ئیسلام تێدەگەین کە ئاڵتوونی لە پیاوان حەرام کردووە و بۆ ئافرەتانیحەڵاڵ کردووە ، پێغەمبەر (ص ) دەفەرمویّ: (**أحل الذهب والحرير للاناث من امتي وحرم علي ذكورها** ) **نسائي**( ٥٠٥ ) و ( ئەحمەد١٨٦٨٢ )واتە:ئاڵتون و ئاوریشم بۆ ئافرەتانی ئوممەتم حەڵاڵ کراوە و لە سەر پیاوانیشی حەرام کراوە

لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە ( پێغەمبەر (ص) موستیلەیەکی زێری لە دەستی پیاوێکدا بینی ، خێرا لە دەستی داکەندو فڕێی دا ، ئینجا فەرموی هەر یەکێك لە ئێوە ئەم ئاڵتونە بەکار بهێنێت وەکو ئەوە وایە کە پشکۆیەکی ئاگرینی لەسەر دەستی دانابێت ).. دیارە کە ئاڵتون نابیّ بەکار بهێنریّ بۆ قاپ و قاچاخ و کەوچك و ، کە ئەمانەش هەمووی حیکمەتی گەورەی تیایە کەپاش زیاتر لە چواردە سەدە زانستی سەردەم سەری ڕێز دادەنەوێنیّ لە ئاستیا (ڕاستییەکانی زانستی سەردەم )ل ٥٧ عبدالرحمان العصافي/ و. اديب قرداغي.

## (٢) شوێنەواری کەشتیەکەی نوح :

ئینجیل باسیکەشتییەکەی نوح دەکات کە لەسەر شاخیئارارات گیرساوەتەوە ، قورئانیش باسی کەشتییەکە دەکات کە لەسەر شاخی جودی نیشتۆتەوە هەروەك دەفەرموێت ( **وقيل ياارض ابلعي ماءك ويا سماء اقلعي وغيض الماء وقضي الامر واستوت علىالجودى وقيل بعدا للقوم الظالمين** ) ٤٤ هود/ واتە: فەرمان درا بەزەوی :ئاوەکەت بابچۆڕێت بەناختدا ، ئەی ئاسمان تۆش بابەس بێت و باران مەبارێنە ، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو ، فەرمانیش

بەرێکی و تەواوی ئەنجام درا ،کەشتییەکەش لەسەر کێوی جودی وەستاو لەنگەریگرت و وترا : دەك دووری لە بەزەیی‌خواو تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران .

زانایـان کەوتنـە هـەوڵ وکۆشـش و گـەڕان بـە دوای دۆزینـەوەی شـوێنەواری ئـەو کەشتییەدا ، بۆ ئەمەش لە ساڵانی ڕابردوودا مانگی دەستکردی تایبەتیان بۆ داناو زانایـان لێکۆڵینـەوەی زۆریـان کـردو شـوێنەواری کەشتیەکەیان دۆزییـەوە لەسـەر شـاخی جودی لە تورکیا .

یەکێ لەزاناکان پرسی‌ئەو قورئانە چییە کە ئاوا باسـی شـوێنەکەی بەوردی دیـاری کـردووە بـە مـەرجێ ئـەو ڕووداوە چـەند هـەزار سـاڵ لەمەوبـەر ڕوویـداوە ،یـەکێك وەڵامـی دایەوەو ووتی : ئەوە پەڕاوێکە ، کابرایەك نوسیویەتی ئیدیعای پێغەمبەرایەتی کردوە لە نیـوە دورگـەی عـەرەب و لـە ئینجیلیـشی وەرگرتـووە ؟ زاناکـە بـە عـەقڵیا نەچـوو ، باشـە ئینجیل دەڵـێ لەسـەر شـاخی ئارارات گیرساوەتەوە و قورئانیش دەڵێت (جـودی ) ، دەی چـۆن دەگـونجێ لـە ئینجیلـی وەرگرتبـێ!؟؟ (ژمـارە ١٠٢ / ڕۆژنامـەی دار الـسلام ٢٠٠٥/٦/٢)

(ئاشکرایە ئینجیل دەستکاری کراوە و هەڵـەی زۆری تێدایـە و تەنانـەت پاپـا لەبـەر چاوی ملیۆنەها مەسیحیدا دانی نا بەوەدا )،شایانی باسە قورئـان ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە خـوای گـەورە وەك ئایـەتێك ئـەو ئاسـەوارە دەهێڵێتـەوە تـا بەڵگـە بێـت بـۆ دەسـەڵاتی پەروەردگاروسزادانی گەلانی ڕابردوو ، هەروەك دەفەرموێت ( **ولقد ترکناها اية فهل من مُدكر** )**القمر** ١٥ واتە :بەڕاستی‌ئێمە ئـەم بەسـەرهاتەمان هێشتەوە بـە بەڵگـە بـۆ هـەموو نـەوەکان ، ئایا کەسێك هەیە پەند و ئامۆژگاری لێوەرگرێت؟!

لـە کـۆنگرەی هەشـتەمی پزیـشکی ئیعجـازی زانـستی قورئـان و سـوننەت کـە لـە وڵاتی‌سعودیە بەسترا ، یەکێك لە گەورە زانایانی‌زانستی کۆرپەلەزانی(مارشاڵ جۆنسۆن ) لـەدوای گـوێگرتن لـە ڕاستییەکانی قورئـان و سـوننەت ووتـی : ئەگـەر ئەوڕاسـتیانەی بـۆ ئێمەتان باس کرد لە پەڕتووك و بەرنامەی ئێمەدا هەبوایە ، ئـەوا دنیامـان پـێ دەخرۆشـان ، چۆن ئەم بەڵگانەتان لایە لەسەر ڕاستی قورئان وپێغەمبەرەکەتان و ئینجا بێدەنگیشن ؟.

لـە پـەیمانگای ئەلبـەرت ئەنیشتاین زانایـەکی جوولەکە وتـی : محمـد چـی زانیـوە لـە کاری ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ ( فسیۆلۆجی ) ، دکتـۆر **عبدالباسط محمد السید** کـە زانایـەکی

گەورەی میسرییە ئەڵێ :لە سەر تەلەفزیۆنی کەنەدی وەڵامم دایەوەو ئەم فەرموودەیەم بە نموونە هێنایەوە کە دەفەرموێت (**مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى** )**مسلم** . وتم : ئایا پێش هەزارو چوارسەد ساڵ ئــاوا باســی کــاری ئەندامــەکانی لــەش بکــات مــوعجیزە نییــە ؟ زانا جوولەکەکە وتی : بەڵێ ئەوە بنەمای زانستی فسیۆلۆجییە ،ئنجا وتی :ئەو فەرموودەیە لەکوێدایە ؟؟ وتم :برۆ سەیریئەو دەستخەتەی فەرموودەکانی حەزرەت بکە کە لە ولاتی سویدە وناوی (الصحيفه الصادقه ) یە کە لەسەرەتای ئیسلامەوە نوسراوەتەوە و تەرجومەش کراوە ، تاڕاستیەکانت بۆ دەرکەوێت ...

## کۆنگرەی ئیعجاز لە مۆسکۆ

پرۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێت: بانگکرام بۆ کۆنگرەی ئیعجازی قورئان و سوننەت لە( مۆسکۆ) لە سەرەتادا حەزم نەکرد بچم ، چونکە(موسکۆ) پایتەختی کوفر بوو بۆ زیاتر لە حەفتاساڵ ، لە دڵی خۆمدا ووتم : ئەو خەڵکە چی لەبارەی خواوە دەزانن ،تا بانگیان بکەین بۆ ئەوەی کە قورئان بانگی بۆ دەکات ؟؟

پێیان وتم : هەردەبێ بچی چونکە داوەتنامەکە لەلایەن ئەکادیمیەی گبیڕووسی یەوە یە ، کاتێ‌چووین بۆ مۆسکۆلە کۆنگرەکەدا کۆمەڵێ ئایەت باس کران کە لە بارەی بوونەوەرەوە بوون ، بە تایبەت ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ :( **يُدبر الامر من السماء الى الارض ثم يعرج اليه في يوم كان مقداره الف سنة مما تعُدون** ) **السجدة** /٥ واتە :ئەو خوایە لە ژوور ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێکدەخات وسەرپەرشتی دەکات لەوەودوا ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان وکاروکردەوەی بەندەکان دەگەڕێتەوە بۆ لای لە ڕۆژێکدا کە بەرامبەر هەزار ساڵە بەو حسابەی ئێوە دەیکەن .

یەکێ لە زانا موسوڵمانەکان هەستاو وتی : ئەگەر ئەو ڕۆژە هەزار ساڵ بێ، ئەو ساڵەش مەبەست ساڵی( قمری)یە چونکە ئەو کاتە عەرەب بە ساڵی (قمر) ی کاریان دەکرد ،و لەبەر ئەوەی ساڵێك دوانزە مانگە و مانگی (قمر ) یش بریتیە لە خولانەوەی مانگ بەدەوری زەوی دا کە بە دیقەت حساب کراوە کە (٤،٢ ) بلیۆن کیلۆمەترە ، کەواتە ﴿٢,٤ بلیۆن کم × ١٢ مانگ ×١٠٠٠ ساڵ﴾ ئینجا ئەنجامەکە دابەش بکە بەسەر بیست و چوار سەعات دائینجا دابەشی بکە بەسەر شەست خولەك دا ئینجا دابەشی بکە بەسەر

شەست چرکەدا ، ئەنجامەکە دەبێتە خێراییەك کەزیاترە لە خێرایی ڕووناکی    پاش ئەم باسە مامۆستایەکی ناوداری فیزیای ڕوسی کەئەندامی ئەکادیمییەی ڕوسییەو  پسپۆڕە لە( ڕووناکی) دا وتی   پێش ئەم کۆنگرەیە من وام دەزانی کە شارەزایی تەواوم هەیە لەبواری فیزیاو ڕووناکی دا ، کەچی ئێستا دەبینم زانستێك هەیە زۆر لەوەی من زیاترە کە دەیزانم ،نازانم چۆن داوای لێبوردن بکەم لەوەی کەچۆن ئەوەم نەزانیوە، مەگەر بەوەی کە لەبەردەمی هەمووتاندا بڵێم :(**اشهد ان لااله الا الله وان محمدا رسول الله** ). ئینجا بەدوای موسوڵمان بوونی ئەودا چوار کەس لە( وەرگێڕەکان )موسوڵمان بوون کە عەرەبیان دەکرد بە ڕووسی و هەروەها بە پێچەوانەشەوە

پاش ئەوەی تەلەفیزیۆنی ڕووسی ڕووداوەکانی کۆنگرەکەی بلاوکردەوە ، دوایی هەواڵمان زانی کەزیاتر لە سیوحەوت زانای بەناوبانگیڕووسیموسوڵمان بوون ، تەنها بەبینینی ئەو بابەتە ئیعجازیانە

هەر لەو کۆنگرەیەش دا (**کیث مور** ) زانای بەناوبانگی کۆرپەلە ناسیمان لە گەڵدابوو کە زۆربەی پزیشکەکان دەیناناسی لەبەر ئەوەی پەڕاوەکەی لەزۆربەی کۆلێژەکانی پزیشکی دەخوێنرا وپەڕاوەکەی بۆ زیاتر لە بیست وپێنج زمان وەرگێڕدرا بوو ئەم زانایە لە کۆنگرەکەدا باسیئیعجازی قورئان وسوننەتی کرد بەوەی کە وتی:( بەڕاستی تەعبیرە قورئانی یەکان لەبارەی قۆناغەکانی کۆرپەلە وە ئەوەندە ووردەو ئەوەندە تەواوە کە تائێستا زانستی سەردەم ئاوا پێی نەگەیشتووە ، کە ئەمە ش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە لەلایەن خواوەیەو (محمد) نێردراوی خوایە

لێیان پرسی :تۆ موسوڵمانی ؟! وتی نەخێر ، بەڵام شایەتی دەدەم کە ئەم قورئانە کەلامی خوایە و محمد پێغەمبەری خوایە    وتیان کەواتە تۆ موسوڵمانی ، وتی من جارێ لە ژێر فشارێکی زۆردام کە ناتوانم موسوڵمان بوونم ڕابگەیەنم ، بەڵام لاتان سەیر نەبێت ئەگەر ڕۆژێك بیستتان (کیث مور )موسوڵمان بووە ..شایانی باسە پاش ماوەیەك ناوبراو موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند

## ئیسلام و ئاینەکانی تر

پرۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێت(لەسەرەتای پەنجا کاندا، کە هێشتا لاو بووم و لە بەریتانیا بووم بۆ خوێندن، بانگ کرام بۆ وتاردان لەبارەی (ئیسلام و ئاینەکانی سەردەم)

، کەلەبنکەی یەکێتی قوتابیانی ئەویٚ بوو، کە هەموو شەوی‌هەینی‌یەك کۆدەبوونەوە بۆ دانوستانێکی کراوە لە بارەی مەسەلەیەکەوە ، جا لەبەر ئەوەی بیستبویان کەلاوێکی مویوڵمان لە زانکۆیە و هەوڵی بەدەست هێنانی دکتۆرا دەدات بانگیان کردم بۆ بۆ ئەو وتاردانە ، جا پاش ئەوەی باسی پەیوەندی ئیسلامم کرد بە ئاینەکانی ترەوە ئافرەتێك کە سەرۆکی ئەو (یەکێتی) یە بوو ووتی گەورەم لەوە دەچیٚ تۆ زانیاریت لەو بارەیەوە لە هەموومان زیاتر بێت ، بۆیە پێم باشە دانوستان لەسەر ئەو مەسەلەیە هەڵگرین بۆ هەفتەی داهاتوو ، چونکە ئێمەناتوانین لەسەر ئەو مەسەلەیە قسە بکەین وگفت وگۆ بکەین ، تا ئێمەش بتوانین یەکێك لە قەشەکانی **کاثولیك** بانگ بکەین کە چەندەها ساڵ لە ڕۆژ هەلاّت کاری کردووە و عەرەبییەکی باش دەزانێت ، تا دانوستانەکەش باشتر بەرهەمی هەبیٚ ، لەهەفتەی داهاتوودا ئەو قەشەیە هات کەتەمەنی لە شەست ساڵ زیاتر بوو ، وە ماوەیەکی زۆریش لەمیسر و عێراق و لیبیا وزۆر وڵاتی تری عەرەبی دا کاری کردبوو..

سەعات ونیوێك گفتوگۆمان کرد و پاشان ئافرەتەکە پێی وت گەورەم لەوە دەچیٚ ئەم لاوە زیاتر شارەزا بیٚ لەمەسەلەی ئایندا ، بۆیە جارێکی تر من داواکارم کە ئەم باس وخواسە بمێنیٚ بۆ هەفتەی داهاتوو تا سەرۆکی کەنیسەی شارەکەی نزیك خۆمان بانگ بکەم ، لە هەفتەی داهاتوودا ئەو قەشەیەش کەناوی (البیشوب)بوو هات و ، شار هەمووی ئاهەنگی گێڕا بەبۆنەی هاتنی‌ناوبراو بۆ شارەکەیان و پیاوانێکی زۆری ڕاگەیاندن ، لەڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان هاتن ، پاش دانوستانەکەمان کەزیاتر لە سەعاتێکی خایاند ، ئافرەتەکە هەستاو وتی: من زیاتر لە بیست وپێنج ساڵە گاورم و(کاثولیکم )، بەلاّم لە بەردەم هەموتاندا دان ئەنێم بەو ڕاستییەدا کە هیچ ڕۆژێك بە هێندەی ئەم لاوە تیٚنەگەیشتوم و نەترساوم لە پەروەردگارم ،ئیتر لە هۆڵەکە چووە دەرەوە ودواتر بیستمەوە کە موسوڵمانبووە وڕۆڵێکی باشی‌دەبینیٚ‌لە بانگەوازکردندا بۆئیسلام لە بەریتانیادا...

## دڵسۆزی لە بانگەوازدا

بانگەواز بۆخوا چەکێکە لە گەورەترین ئەوچەکانەی کەمایەی سەرکەوتنە لە ژیاندا ،ڕاستە ئێمە زۆرچەکی‌ماددی لە دەستماندا نیەو کەسانی‌تر پێشمانکەوتوون ، بەلاّم ئەو

چەکەش کە بانگەواز و خوا ناسییە لە دەستماندایە ودەتوانین هەق و ڕاستی بگەیەنینە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا .

پرۆفیسۆر زەغلول دەڵێ: لە سەردانێکدا بۆئەمریکا لە زانکۆی( تکساس ) دوو وتارم دا یەکەمیان بەناوی(ئیسلام ومەسیحییەت، جیاوازی نێوانیان و لێکچونیان ) وە دووەمیشیان بە ناوی (چەند وانەیەك لەهەرەس هێنانی شیوعییەت دا )، ئامادەبووان گاورو جولەکەو عیلمانی وشیوعی تیابوو،کەچی وتارەکان کاریگەرێکی زۆری هەبوو لەسەریان ، بۆیە هەق وایە دەستەوسان نەبین و هەروا بێکار دانەنیشین وشەووڕۆژ بدەینە دەم یەك بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی، کە چارەسەریان تەنها لە بەرنامەکەی خوادایە ..

## موسڵمان بوونی سەربازە ئەمریکی یەکان

بە هۆی جەنگی کەنداوەوە بە هەزاران سەربازی ئەمریکی وئەورووپی ڕوویان کردە ناوچەی کەنداو کە زۆربەیان گاوربوون و بە هیوا بوون گاورێتی بڵاوبکەنەوە ، دیارە هەموو توانایەکی ماددیان پێ بوو، تازەترین وپێشکەوتوترین چەکیشیان بە دەستەوە بوو ،..جا کاتێك چەند بانگخوازێکی خواناس بە ئیخلاسەوە کەوتنە بانگەواز کردن لە ناویاندا ، دەیان هەزاریان موسوڵمان بوون لە سایەی خواوە ..یەکێ لەو ئەمریکیانەی موسوڵمان بوون ، ئافرەتێك بوو بە پلەی (رائد )، کاتێك زیاتر شارەزا بوو لە ئیسلام و زانی کە ناتوانێ بژی لەگەڵ مێردەکەیدا کە موسوڵمان نیە ، پێی وتین : باشە من مێردم هەیەو منالم هەیەو زۆر خەمی خێزانەکەمە ،چی بکەم ؟ !برادەران پێیان وت کە پەیوەندی بکات بە مێردەکەیەوەو پەڕاوو شریتی ئیسلامی بۆ بنێرێت .. ئەویش پاش ئەوەیئەوانەی بۆنارد هاتەوەو وتی : مێردەکەم موسوڵمان نەبووە ، برادەران وتیان باشە بە تەلەفوون پەیوەندی بکە بە مێردەکەتەوەوموناقەشەی لەگەڵدا بکە وئێمەش لە گەڵتائەبین وچ پرسیارێکی هەبوو هاوکاریت دەکەین تا بتوانی وەڵامی بدەیتەوە . ئەویش تەلەفونی بۆ کردو کەوتە گفتوگۆ لە گەڵیدا ،چی پرسیاری هەبوو وەڵاممان دایەوەو ئەویش بە مێردەکەی وت ، سەرەنجام هەر لەسەر تەلەفونەکە مێردەکەی موسوڵمان بوو شایەتمانی هێنا ..پاش ئەوەی ئەو ژنە گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی ،نامەیەکی بۆ ناردین و تیایا نوسیبووی کە مێردەکەی بۆتە پیاوێکی نموونەییو زۆر ڕەوشت وخوومامەڵەکردنی گۆڕدراوە بەرەو چاکی وهەزار ئەوەندەی جاران سوورە لەسەر

خزمەتكردنی خێزانەكەی .. جاچیرۆك و دەنگوباس لەم جۆرە زۆرن ، بۆیە بە ڕاستی ئەركی سەر شانمانە كاتێك ئەهلی باگل دەجولێن و دەكەونە كار بۆ باگلەكەیان ئێمەش بجولێین و بكەوینە كار بۆ ئەوهەق وڕاستییەی كە بە دەستمانەوەیە كە ئاینی پیرۆزی ئیسلامە .

ئەمەش وای لە زانای ئەمریكی موسڵمان (تی .بی .ئێرڤنگ) كرد كەبڵێ :{ئەی موسڵمانان تازە ئێوە ناتوانن بە ئاسانی پێش بكەون لەلایەنی ئابووری و سیاسی و سەربازی و زانستی دا ، بەڵام دەتوانن وا بكەن لەڕۆژئاوای لەخۆبایی لووت بەرز كە چۆك دابدات لە بەردەمتاندا بەهۆی ئەو ئیسلامەی كە لای ئێوە هەیە ..تەنها چل گەنجی موسڵمانم بدەنێ كە چاك لە ئیسلام شارەزا بووبن وبە چاكی پەیڕەوی بكەن و ،چاكیش بتوانن بانگەوازی بۆ بكەن بە زمانی سەردەم ،من پەیمانتان دەدەمێ كە هەردوو ئەمریكاكەیان پێ فەتح دەكەم ....

جا بەو خوایەی كەهەر خۆی خوایە راست دەكات ،ئێمە گەورەترین وچاكترین چەكی مەعنەویمان پێیە كە دەتوانین بەهۆیەوە فەتحی‌دونیابكەین ،مەگەر ئیسلام ئاینێكی‌جیهانی نی‌یە وبۆ هەموو بەشەریەت نەهاتووە﴿الذین هدی الله /د.زغلول النجار﴾.

## موسڵمان بوونی جەنراڵێكی ئەمریكی

پرۆفیسۆر زەغلول النجار دەڵێت (ئەمیر محمد بن الراشد)ناردی بەدوامدا لە دوبەی بۆ گفت وگۆكردن لەگەڵ دوانزە بازرگانی ئەمریكی كەمیوانی ناوبراو بوون ،كەوتینە قسەوباس و زۆر بەخراپی هێرشیان دەكردە سەر موسوڵمانان كە دواكەوتوون و دیكتاتۆرن و گوایە خەتاكەش لە ئیسلامەوەیە ، دیاربوو كاریگەرێكی گەورەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایان لەسەر بوو كە زۆربەیان دژایەتی ئیسلام دەكەن .دووسەعاتێك گفتوگۆمان كرد و باسی ئیعجازی قورئانم بۆكردن ، خوا ئاگادارە بیروبۆچوونیان گۆڕدراو داوای زانیاری زیاتریان كرد لە بارەی ئیسلامەوەو منیش چەند نامیلكەیەكم پێشكەش كردن .

باسەكەشم دەربارەی ئەو ئایەتەیە كەپێش چواردە سەدە باس لەوەدەكات كە ئاسن لەسمانەوەهاتۆتەسەر زەوی ، كە لەسوورەتی حدید ئایەتی ٢٥ دا دەفەرموێت :( **لقد ارسلنا رُسُلنا بالبینات وانزلنا معهم الكتاب والحكمة وانزلنا الحدید فیه باس شدید ومنافع للناس ولیعلم**

**اللهُ مَن يَنصُرُه ورُسُلَه بالغيب ان الله قوى عزيز** ) لەم سەدەیەی دوایدا ئەم ڕاستییە زیاتر بۆ زانایان ئاشكرا بوو ، وەچەندەها حاڵەتیان تۆماركرد كە بەردی نەیزەك هاتۆتە سەر زەوی ، بۆ نموونە لە ساڵی ١٨٦٨ ز دا لە پۆڵەندا سەد هەزار پارچە بەرد لە ئاسمانەوە كە زۆریان ئاسنیان تیایە كەوتە خوارەوە ، وە لە ساڵی ١٩١٢ ز دا لە هولبرك لە ئەریزونا دە هەزار پارچە بەرد كەوتە خوارەوە ولە ساڵی ١٩٤٧یشدا هەمان شت لە ڕووسیا ڕوویداوە ..دیارە بەهەمان شێوەش ئەو تەنانەی كەئاسنیان تیایە لە سەرەتای دروست بوونی زەوییەوە لە ئاسمانەوە داباریونەتە سەر زەوی و بەهۆی گەرمی ئەو كاتەی زەوییەوە چونەتە چینەكانی زەوییەوە ...

جارێكی تریش لە ماڵی بازرگانێكی سعودی چاوم كەوت بە كۆمەڵێك جەنڕاڵی ئەمریكی ، دیاربوو حەزیان دەكرد شتێك لە بارەی ئیسلامەوە بزانن ، یەكێكیان سەرنجی دابوو كە كەسێك دەهات و دەناسێنرا ، دەوترا ئەمە باوكی فلاّنە و ئەوە برای فلاّنە ، یان برازای فلاّنە .ئەو كەسە زۆر سەرسام بوو لە پەیوەندی خێزانی لای موسوڵمانان و لە ڕێزی دایك و باوك لای منالّ و، باسی خۆی بۆ كردین و وتی : من چیم هەبوو لە كوڕو كچەكەمدا سەرفم كرد تاگەورەم كردن وخوێندنیان تەواوكرد ، كەچی هەركەس چووە بەلای ژیانی خۆیەوەو لێم ناپرسنەوەو ئەگەر لەسەری ساڵدا كارتێكی چەژنەپیرۆزە بنێرن ئیتر وادەزانن هیچیان نەهێشتۆتەوە ،ئەمە بێجگە لەوە ی كە ناوم دەبەن بە پیرەمێردو هەرگیز ناڵێن ( بابە )..ئەمەش وای لە جەنڕاڵەكە كرد كە موسوڵمان ببێت( گۆڤاری الایمان ژ٢١ -٢٢ساڵی٢٠٠٥ ).

لە كۆتاییدا پاش هەموو ئەودەنگوباسە ئەبێ بزانین كە ئێمە ئەركێكی گەورەمان لەسەر شانە لەو ئەركانەش :

١/وردبونەوە لە ئایەتەكانی خوا لە بونەوەرداكەئەوەش فەرمانی خوایەُ ﴿**قل انظروا ماذا فی السماوات والارض وما تُغنی الایات والنذر عن قوم لا یؤمنون**﴾١٠١یونس.

كاتێك ورديش بوینەوە بەچاكی دەچینە ڕیزی (اولوالاباب )ەوە ،قورئان دەفەرموێ:

﴿ **ان فی خلق السماوات والارض واختلاف اللیل والنهار لایات لاولی الاباب ،الذین یذكرون الله قیاما وقعودا وعلی جنوبهم ویتفكرون فی خلق السماوات والارض ربنا ما خلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار** ﴾ ال عمران١٩٠

٢/پێویسته لەسەرمان بەچاکی دیراسەتیٚ ئیسلام بکەین وبە چاکی تێی بگەین و بە چاکیش پەیڕەوی بکەین و پابەندی بین لەماڵ و خێزان وکۆمەڵدا ...
٣/ئینجا ئەبیٚ باش بزانین کە بەرپرسیاریٚتیٚیەکی گەورە لەسەر شانمانە ،کەئەویش بەرپرسیاریٚتی بانگەواز کردنە بۆ لای خوا ،کە ئەویش مایەی دابەزینی ڕەحمەت وبەرەکەتی خوایە بۆ سەرمان و چی لە بونەوەریشدایە دوعامان بۆدەکەن وپاداشتی گەورەشمان دەست دەکەویٚکەپڕ بەم دنیایە دەبیٚهەروەك حەزرەت(ص)دەفەرمویٚ : ﴿إن الله وملائكته واهل السماوات واهل الارض حتىالنملة فى جُحرها وحتى الحيتان ليُصلون على معلمي الناس الخير﴾ ﴿لئن يهدى الله بك رجلا واحدا خير لك من حمر النعم﴾.

## تیاچوونی گەلان

قورئانی پیرۆز لە چەندەهائایەتدا سەرنجمان ڕادەکیٚشیٚ بۆتیاچوونی گەلان لە ئەنجامی خراپەکاریان و تۆڵەی خواوە بۆیان و ، داواشمان لیٚدەکات کە بگەڕیٚن بە زەویدا تاوەکو سەرەنجامی ئەو گەلانەو پاشماوەکانیان ببینین ، تا ببێتە پەندو وانەو هوشیاری دڵ و دوورکەوتنەوە لە گوناهو تاوان ..هەروەك دەفەرمویٚت :
١-( اولم يسيروا فى الارض فينظرو كيف كان عاقبة الذين من قبلهم كانو اشد منهم قوة و اثارو الارض وعمروها اكثرمما عمروهاوجاء تهم رُسُلهم بالبينات ، فما كان الله ليظلمهم ولكن كانوا انفسهم يظلمون، ثم كان عاقبة الذين اساؤا السوأى ان كذبوا بايات الله وكانوا بها يستهزئون )الروم ١٠..
واتە:ئایا بە زەویدا نەگەڕاون تا تەماشابکەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پیٚش ئەماندا هیٚناوە ، لەمان زۆر بەهیٚزترو بە دەسەڵاتتربوون ، زەویان دەکیٚڵاو ژیٚرەو ژووریان دەکرد و ئاوەدانیان کردبۆوە زیاتر لەمان ،پیٚغەمبەرەکانیشیان کاتیٚخۆی بەڵگەی زۆرو ئاشکرایان بۆ هیٚنان ؟ بەڵام بیٚ سوود بوو ، زۆربەیان بڕوایان نەکرد،
جاوەنەبیٚخوا ستەمی لیٚ کردبن ، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد .پاشان ئەو تیاچوونە سەرئەنجامی ئەوانە بوو کە تاوان و گوناهیان کرد ،چونکە ئەوانە بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی خوا نەهیٚناو گاڵتەیان پیٚکرد.
٢-( افلم يسيروا فى الارض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم ، دمر الله عليهم و للكافرين امثالها )محمد١٠/واتە : ئایە ئەوە نە گەڕاون بە زەویدا و سەرنج بدەن تا بزانن سەرەنجامی ئەو خەڵکە نالەبارەی پیٚشیان چۆن بووە ؟؟ خوای بە دەسەڵات ماڵ و حاڵیانی بەسەردا

ڕووخاندن ، جا بۆ هەموو بیٚ باوەڕان سزای ئاوا شتێكی چاوەڕوان كراوە و،درەنگ بیٚ یان زوو دوو چاریان دەبێت .

٣- قل سيروا فى الارض فا نظروا كيف كان عاقبة المكذبين (الانعام١١) (قل سيروا في الارض فانظروا كيف كان عاقبة المجرمين) (النمل ٦٩) واتە/پێیان بڵێ:بگەڕێن بە زەویدا و سەیربكەن سەرەنجامیتاوان باران و ئەوانەی باوەڕیان بە بەرنامەیخوا نەكردووە چۆن بووە .

٤-(ولما جاءت رُسلنا ابراهيم بالبُشرى قالوا :انا مُهلكوا اهل هذه القرية ان اهلها كانوا ظالمين ،قال ان فيها لوطا ، قالوا :نحن اعلم بمن فيها ، لننجينه و اهله الا امراته كانت من الغابرين ، ولما ان جاءت رسلنا لوطا سئ بهم و ضاق بهم ذرعا وقالوا لا تخف ولا تحزن انا مُنَجُوك و أهلك الا امراتك كانت من الغابرين انا منزلون على اهل هذه القرية رجزا من السماء بما كانوا يفسقون ، ولقد تركنا منها آية بينة لقوم يعقلون )العنكبوت٣٥

واتە :جا كاتێك كە فریشتەكانمان گەیشتنە لای ابراهیم و مژدەی هاتنە دنیای ئیسحاقیان پێبەخشی ، وتیان : بە ڕاستی ئێمە لە ناو بەری خەڵكی ئەم شارەین ، چونكە بێگومان خەڵكەكەی زۆر ستەمكار بوون . ئیبراهیم وتی : ئاخر لوط لەوێیە ،فریشتەكان وتیان :ئێمە چاكتر دەزانین كێی لێیەو كێیلێنیە ،دڵنیابە كە ئەوو خاوو خێزانی ڕزگار دەكەین جگە لە هاوسەرەكەی كە لە تیاچوان دەبن ..

جا كاتێك فریشتەكان گەیشتنە لای لوط ،بە هاتنیان زۆر دڵتەنگ بوو ،نەیدەزانی كە فریشتەن و سەری دنیای لیٚهاتەوە یەك ،( وتیان :مەترسەو بیٚ خەم بە ، ئەوانە ناتوانن دەست درێژی بكەنە سەر ئێمە ،ئێمە فریشتەین )،بێگومان ئێمە ڕزگاركەری تۆو خاووخێزانتین جگە لە هاوسەرەكەت كە لە تیاچوانە .
بەڕاستی ئێمە دابەزێنەری سزاو بەڵای ئاسمانین بەسەر خەڵكی ئەم شارەدا بە هۆی دەرچون لەفەرمانیخوا ،سوێند بە خوا بەڕاستی سەرەنجام ئاسەوارێكی ئاشكرامان لە شاری كاول و وێران بەجێهێشت بۆ كەسانێك كە ژیرو هۆشمەند بن.

﴿والى مدين اخاهم شعيبا فقال يا قوم اعبدوا الله وارجوا اليوم الاخر ولا تعثوافى الارض مفسدين ،فكذبوه فاخذتهم الرجفة فاصبحوا فى دارهم جاثمين وعادا وثمودا ولقد تبين لكم من مساكينهم وزين لهم الشيطان اعمالهم فصدهم عن السبيل وكانوا مُستبصرين ﴾العنكبوت ٣٨ واتە:هەروەها شوعەیبمان ڕەوانە كرد بۆلای براكانی لە شاری مەدیەن ،پێی وتن: ئەی گەل و هۆزم تەنها خوا بپەرستن ،بە

هیـوای قیامـەت و ئایـنـدە بـژین وترسـی تەنگانـەی ئـەو ڕۆژەتـان هـەبێ ، گوناهوتـاوان و خراپـە لەسـەر زەوی‌دا ئـەنجام مـەدەن (چـونکە زەوی بێ‌خـاوەن نیـیە وژیانتـان تـا سـەر نیـیە)، لـە ئاکامـدا خەڵکەکـە بڕوایـان پێنـەکرد ، ئـیتر بومەلەرزەیـەك دووچـاریان بوو،هەرهەموویان لە ماڵەکانیاندا بەچۆکدا هاتن ومردن و بوون بەژێرخاك وخۆڵەوە..

هـەروەها (عـاد)گـەلی حـەزرەتی هـودو (ثمـود) گـەلی حـەزرەتی صـاڵحمان لـەناوبرد کـە ئاشـکرابوو بۆتـان تیاچـوونیان لـە شـوێنەواری کاولیانـەوە ، شـەیتانیش کـردەوەی خراپیانی بۆ ڕازاندبوونەوە ، لەڕێگەو ڕێبازی ڕاست ودروست وێڵی کردبوون لـە کاتێکدا ئەوان خاوەنی عەقڵ و بیرو هۆشیش بوون ..

**( وقارون وفرعون وهامان ولقد جاءهم موسى بالبينات فاستكبروا فـى الارض وماكانواسـابقين ) ٣٩ العنكبـوت**

/واتە :قارون وفیرعـەون و هامانیـشمان لـەناوبرد ،سوێند بـەخوا بێگومـان موسا بەڵگـەی زۆری بۆ هێنان ، کەچی‌خۆیان زۆر بەگەورە داناله زەویدا ،سەرەنجام نەیانتوانی لـە سزاو تۆڵەی خوا خۆیان ڕزگار بکەن ..

**﴿فكلاً اخذنا بذنبه ،فمنهم من ارسلنا عليه حاصبا،ومنهم من اخذتـه الصيحة ومـنهم مَن خـسفنا بـه الارض ومـنهم مَـن اغرقنا،ومـا كـان الله لـيَظلمَهم ولكـن كـانوا انفـسَهُم يظلمـون﴾ العنكبـوت/٤٠** واتـە /ئێمـە هەریـەکێك یـان هەردەسـتەیەك لەوانـەمان بـە سـزای تـاوانی خـۆی گەیانـد ، جاهـەیانبوو بەردبارانمان کرد ،هەیانبوودەنگ وسەدای بەهێز لـەناوی برد،هـەیانبوو بـەناخی زەویـدا بردمانـە خـوارەوە ،هەشـیان بـوو نـوقمی زەویمـان کرد،جـا وەنـەبێ خـوا ستەمی لێ کـردبن ،بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد..

**٥/ ( افامن الذين مكروا السيئات ان يَخسف الله بهم الارض او ياتيهم العذاب من حيث لا يـشعرون او يأخُـذهم فى تقلبهم فمـا هـم بمعجـزين ،او يأخُـذهم علـى تخـوف فـان ربكـم لـرؤوف رحيم )النحل ٤٧** واتـە:ئایـا ئەوانەی چەندەها نەخشەوپیلانی‌خراپیان کێشاوە دڵنیان لەوەی کە خودا نایان با بـەناخی زەوی‌دا ،یـا خـود لەلایەکـەوە سـزاو تۆڵـەیان بۆبێـت کـە هەرهەسـتی پێنەکـەن ؟! یـاخود لەکاتی‌هاتووچـۆو سـەرگەرم بونیـان بـە کاروبـارەوە لـەناویان ببـات ،ئـەوانیش دەسەوسانکەری خـوانین ؟! یـا خودپـەروەرگار بەتواناپـە لـەکاتی تـرس وناخۆشی‌وبیمدا ،بیانگرێت و لەناویان بەرێ،بەڵام مۆڵەت دەدات بەڵکو ڕووبکەنـە ئیمـان ،چونکە بەڕاسـتی پەروەردگارتان بەسۆزو میهرەبانە ...

٦/افامن اهل القرى ان يأتيهم بأسنا بياتا وهم نائمون ،اوأمن أهل القرى أن يأتيهم بأسنا ضُحى وهم يلعبون ،افأموا مكرَ الله فلا يأمن مكرَ الله الا القوم الخاسرون/ الاعراف٩٩ ،واته :ئايا خەڵكى شارەكان لەوە دڵنيان و ناترسن كە تۆڵەى ئێمە بێت بۆيان لەشەودا لە كاتێكدا ئەوان نوستوون ؟! ئايا خەڵكى شارەكان دڵنيان وناترسن لەوەى كە تۆڵەى ئێمە بێت بۆيان لە چێشتەنگاودا لە كاتێكدا ئەوان سەرگەرمى يارى و گەمەن...

ئايا دڵنيا وبێباك بوون لەنەخشەو پلانى خوا ،جا كەس بىٚ باك نابىٚ لەنەخشەو پلانى خوا جگە لە گەلى خەسارەتمەندان نەبىٚ...

٧/﴿قل ارايتم ان اتاكم عذابه بياتا او نهارا ماذا يستعجلُ منه المجرمون ،اثُمَ اذاما وقع آمنتم به آلآن وقد كنتم به تستعجلون ﴾يونس/٥١.. واته :پێيان بڵىٚ :هەواڵم بدەنىٚ، باشە ئەگەر سزاوتۆڵەى خوا لەشەو يان لە ڕۆژدا بەرۆكى گرتن ،تاوانباران بەتاماى چين ؟ئاخۆ بۆچى پەلە دەكەن ؟!دواى ئەوە ئايا كە قيامەت ڕوويدا وبەرپابوو باوەڕى پىٚ دەهێنن ؟!ئەوسا پێيان دەوترىٚ ! ئا ئێستا بڕواىپێدەكەن ؟!خۆ بەڕاستى كاتىخۆى گاڵتەتان پێدەهات وپەلەتان بوو بۆىو دەتان وت :كوا بۆنايەت ..

٨/ ﴿ولله غيب السماوات والارض،وما امرُ الساعة الا كلمحِ البصر اوهو اقرب ان الله على كل شىء قدير ﴾نحل/٧٧ واته :هەرچى نهێنىوشاراوە هەيە لە ئاسمانەكان وزەويدا هەر بۆخوايەو، بەرپابوونى قيامەت پێش نايەت وەك چاو تروكاندنێك نەبىٚ يان لەوەش كەمتر ، بەڕاستى خوا دەسەلأتى بەسەر هەموو شتێكدا هەيە..

لە وتارێكىگۆڤارى نويزويكىئەمريكىدا كە باسى زانست و قيامەت دەكات هاتووە كە دەڵێت:زانستى وشكى فيزياو فەلەك و جيۆلۆجى هەرئەوە نيە خەفەتمان بەنىٚ بە لْكو ئەوەندە پێشكەوتوون بە بەڵگەوە تەحەدامان دەكەن كە هيچ شتێك بە قەدەر قيامەت نزيك نيە . ل١١٢ آيات الله المبصرة

**بەردە ئاسمانيەكان :**

زاناى فەلەكى (كلارك چابمن) كە لێكۆڵەرەوەيە لە هەيئەى عالەمىبۆ تەتبيقاتى عيلمىلە شارى تويكسون لە ئەريزۆنا دەڵێت ( هەڕەشەو مەترسى گەورە هەيە لە سەر عالەمەكەمان لە ناوچەى دوورەوە ، لە دواى ئەستێرەى بلۆتۆوە هەورى (اوتر) هەيە

کەپێك هاتووە لە بەردی گەورە گەورەو غازی بەستووخۆڵ ، کە لە سەد ساڵێکدا جارێك بەرەو زەوی دێن بەهۆی جازبیەتەوە ، گەرمیخۆر غازە بەستووەکەی دەکات بە هەڵم و کلکی بۆ دروست دەبێت و رووەکەشی دەتەقێتەوە بە دەرچوونی غازو غوبار لێوەی ، کە ئەوانیش ۲۰۰ دانە دەبن ...بەڕاستی مەترسی گەورە ڕوودەکاتە جیهانەکەمان کە ئێمە نایبینین و ڕەنگە هەستیشی پێ نەکەین تا تەواو دێتە سەر سەرمان ) . کلك داری هالی کە هەر (٧٦) ساڵێك جارێك دەیبینینەوە ئەگەر بەر زەوی بکەوێ لە یەك چرکەدا کاولی دەکات و پاش سەعاتێکیش لە ئاسمانەوە ئاگر دەبارێ ل١١٦ آيات الله المبصرة .

لە ساڵی ١٩٠٨دا لە سیبریا بەردێکی کەونی کە نزیکەی( ٣٠٠ )پێ بوو کەوتە خوارەوە بە هێزێکی تەقینەوە کە(١٠) میگاتەن دەبوو ،(٧٠٠)میلی زەوی تەخت کرد و لە بازنەیەکی (٧٠کم)یدا هەرچی هەبوو سووتاندی و ڕوناکیەکەی کیشوەری ئەوروپای ڕوناك کردەوە تەنانەت لە دووری (٦٠) میل جلی لە بەردا دەسوتاند ...

وەکالەی ناسای ئەمریکی ئاشکرای کرد کە هەزار تا چوار هەزار بەردو و شهوب هەیە بەرەو زەوی دێن کە تیرەکەیان لە نیو میل زیاترە ، کە ئەمەیش مرۆڤایەتی و زەوی دەپێچێتەوە ، تەنها( ١٥٠)دانە شیان ناسراون تائێستا ، ئەوبەردانەش کەلە ( ٣٠٠ ) پێ زیاترن ژمارەیان دەگاتە سێسەدهەزار بەرد کە بەرەو ڕێرەوی زەوی دێن و هیچیان لە بارەوە نازانین..

ئەمەش قورئان لەبارەیەوە دەفەرموێ ﴿ءامنتم مَن فیالسماء ان یَخسفَ بکمُ الارض فاذا هی تمور ، ام امنتم مَن فی السماء ان یُرسِل علیکم حاصبا (واتە بەرد ) فستعلمون کیف نذیر و لقد کذب الذین من قبلهم فکیف کان نکیر ﴾الملك

زانای فەلەکی (دۆناڵد یومانز )لە وەکالەی ناسا ( لەمعملی تحلیلی کونی / لە باسادینا/کالیفۆرنیا)دەڵێت :(لە ڕۆژی 23ی مارسی ١٩٨٩بەردێکی ئاسمانی (ئەسترۆیدس )تەنها (٧٠٠)هەزار میلی مابوو بەر زەوی بکەوێ، ئەگەر تەنها شەش سەعات دوا بکەوتایە لە هاتندا ئەوا بەر زەوی دەکەوت ودنیای کاول دەکرد بەسەر یەکدا ،بە ڕاستی زەوی لەسەر خولگەی خۆی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە کە لە دەوروبەری

بەردی کەونی زۆر هەیە ، ئێستا بێت یان لە داهاتوودا بەردێکی هەر بەردەکەوێ ئەمە ئەگەر شتی تر پێشتر ڕوونەدات ) ( گۆڤاریئنویزویکی ئەمریکی) .

زانای فەلەکی ئافرەت (کارۆلین شوماکر)یش کە ئێستا لە ژیاندایە و زۆرترین ژمارەی ئەستێرەی کلکداری دۆزیوەتەوە کە (٣٢)دانەیە دەڵێت : ( هول بوب ) ئەستێرەیەکیکلکدارە کە بەخێرایی ٤٣هەزار میل لەسەعاتێکدا دەڕوا لەم سەدەیەی خۆمان دا خولگەی زەوی بڕی وباش بوو بەری نەکەوت ...

کلکداری( سویفت –تاتل)لەساڵی ١٨٦٢جارێك بینراوە ولەچەندساڵێك لەمەوبەردا جارێکی تر بینراوە ، زانای فەلەکی (برایان مارسدن)لە بنکەی **هارفاردسمثونیان** بۆ فیزیای فەلەکی حیسابێکی کردووە کەلە ١٤اغسطس لەساڵی٢١٢٦ز دا جارێکی تر دەبینرێتەوە و بەهۆی تەقینەوەکانی سەر ڕووەکەیەوە لە ڕێرەوە نەگۆڕەکەی خۆی لایداوە وڕەنگە بەر زەوی بکەوێ کەڕۆژی قیامەت دێ و ڕەنگە نەوەی منالەکانی ئەمڕۆ ئەو ڕۆژە ساماناکە ببینن (نیوزویك ئەمریکی)لا١٢٤هەمان سەرچاوە ..

قورئان دەفەرموێت﴿**افبعذابنا يستعجلون ،فاذا نزل بساحتهم فساء صباح المُنذَرين**﴾ الصافات ١٧٧ واتە:ئایا پەلەیانە بۆ سزاکەمان ،کاتێ سزاو تۆڵەی ئێمە دابەزیە سەریان ئای کەبەرەبەیانیەکی ساماناکە ئەوانە تووشیان دەبێ .....

﴿**وربك الغفور ذوالرحمة لو يؤاخهم بما كسبوا العجل لهم العذاب بل لهم مؤعد لن يجدوا من دونه موئلا ،وتلك القرى اهلكناهم لما ظلموا وجعلنا لمهلكهم موعدا**﴾ الكهف /٥٩ واتە:پەروەردگاری تۆ لێخۆش بووی میهرەبانە ، ئەگەر بە کردەوەی ئەو خەڵکە بکات بە خێرایی لە ناویان دەبات ، بەڵام کاتی دیاری کراو هەیە بۆیان کە بێجگە لە خوا کەس نیە پەنایان بدات،ئەوەتە شاروشارۆچکەکانمان لەناو برد بە ستەمکاریان و بۆ لەناوبردنیشیان کاتمان دیاری کردبوو .. ( آيات الله المبصرة /أ .د . توفيق علوان )...

**چەند نموونەیەك لەسەر تیاچوونی گەلان:**

١/تیاچوونی گەلێ لەخوارووی ئیتالیا بە بورکانی (فیزۆف)لە نزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا،کە تادوا پلە خەریکی فاحیشە بوون ، ئەوانە بورکانەکە لاشەیانی داپۆشی ولەم سەدانەی دواییدا دوای نزیکەی دووهەزارساڵ دۆزرانەوە ، تابێت بە پەندو عیبرەت بۆ هەرکەسێك کە بیبینێت .

٢/لەم دوایانەدا لە دوورگەی (ئوکیناوا )ی یابانی شارێکیگەورە دۆزرایەوە لەژێر دەریادا کە بە هەموو خانوو پەرستگاو کۆشك و تەلاری نوقمی ژێر دەریا بوون ،کە خاوەنی شارستانییەکی زۆر پێشکەوتووبوون لەوزەمانەداو زانایان دەیگێڕنەوە بۆ نزیکەی دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ،جا یا بەهۆی کارەساتێکی سروشتییەوە تیاچوون ،یان بەهۆی زیادبوونی ئاستی ئاوی دەریاوە نوقوم بوون لەکۆتایی چاخە سەهۆڵینەکانی دواییدا .... یەکێ لەو زانایانەی بەشداری کردووە لە دۆزینەوەو لێکۆڵینەوەکاندا دەڵێت (ئەم دۆزینەوانە ئاماژەن بۆ ئێمەی خاوەن شارستانیەتی نوێ وهۆشیارمان دەکاتەوە تا لەخۆمان بایینەبین وسەرەڕۆیی نەکەین ، ئەگینا هەمان چارەنووسمان دەبێ)...

٣/لەم ساڵانەی دوایش دا شارستانیەتی (**اطلانطا**) دۆزرایەوە ... فەیلەسووفەکانی (**اغریق**) ،وەك **افلاطون و ارسطو** باسی شارستانیەتێکیگەورە دەکەن کە سەرمەشق بووە بۆ شارستانیەتی (اغریق)کە زۆر پێشکەوتوو بوون و چیرۆك ودەنگ وباسیزۆرهەیە لەبارەیانەوە لەپەراوە کۆنەکانی شارستانیەتیە دێرینەکاندا ... ئەوان کاریگەریان هەبووە لەسەر ناوچەکانی دەریای ناوڕاست وبازرگانی زۆر وهونەرو زانستیان جێی سەرسوڕمان بووە ولەپڕیش دیار نەماون و دەنگ و باسیان نەماوە...لەبەر ئەوەی تا ئەم زووانە هیچیان لەسەر نەدۆزرابوە وە هەندێك دەیان وت:ڕەنگە هەر بەخەیاڵ دروست کرابن وسەرگوزەشتەو داستانی دوور لە ڕاستی بن ، لە دەریای (ئیجە)ودەوروبەری کۆمەڵێ وێنەو **ئاثار** دۆزرایەوە کە دەنگی دایەوەو شێوەی ژیانی ئەوگەلەی دەرخست هەروەك ئیغریقیەکان باسیان کردووە کە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هەزار ساڵ پێش زایین ،ئیغریقیەکان دەڵێن لە دەوروبەری ساڵی ١٦٨٠ ی پێش زایین دا بورکانێکی گەورە تەقیەوە کە چەند ڕۆژێکی خایاندو هەوری ڕەش ئاسمانی بە جۆرێك گرت کە خەڵکی ناوچەکە شەووڕۆژیان بۆ جیا نەدەکرایەوە و بوومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا کە بووە مایەی دروستبوونی هەرەسهێنان و درزی زۆر لە زەویدا .هەمان باسیش لەنووسینەکانی فیرعەونیەکاندا هاتووە کە ئەوان دوورتریش بوون ..پاش لێکۆڵینەوەودیراساتی زۆر دەرکەوت کە لەو ساڵەدا لە ئەنجامی بورکان و بوومەلەرزەیەکی گەورەوە ناوچەی دەریای ئیجەی ئێستا زەویەکەی چاڵ بووەو ئاوی دەریای ناوەڕاستیش پڕی کردۆتەوەوبەوەش دەریایئیجە دروست بووە ، پاش ئەوەی کە تەنها زمانەیەکی بچکۆلەیدەریای

ناوەڕاست بووە وبەمەش دوورگەی ئەتلانتا وشارستانیەکەی لەناو چوون(القوانين القرآنية للحضارات /د.المهندس خالد العبيدي).

## خۆشەویستی خوا

شێخ ئەحمەد قگان کە بانگخوازێکی کوەیتیە دەڵێت:پیاوێك کە لە ساڵانی پەنجاکانداحەجی کردبوو بۆی گێڕامەوەو وتی : کاتێك چووم بۆ حەج لە کوەیتەوە، جێگا نەمابوو ، زۆریش تامەزرۆی حەج بووم ، بۆیە ناچار لەدوای لۆرییەکی بچووکدا لەگەڵ کەلوپەلی حاجیەکاندا سەرکەوتم ،لم وتۆزوخۆڵ و گەرمای زۆر پیاوی دەویست خۆی بۆ بگرێت ، بەڵام چونکە بۆ حەج بوو کە ئاواتی تەمەنەوبۆخوایە گوێم نەدایە،چیبکەم ناچارم دان بەخۆمدا بگرم ...

جارجار تایەی سەیارەکە لە لمدا دەچەقی وپەنتەڕناشیدەکرد ومنیش دادەبەزیم وبە هەمووهێزم پاڵم پێوە دەناو،کاتیلەلمەکە دەردەچووسەردەکەوتمەوە، لە دابەزینێکدا کە پاڵم نا سەیارەکە تۆزو خۆڵی زۆری دروست کرد وسەیارەکە هەستایەوەو ڕۆیشت ومنیش نەعلەکانم چەقی لەلمەکەدا چەند هەنگاوێك گەڕامەوەو گەڕام بەدوای‌نەعلەکەمدا ،سایەقەکە وەیزانی سەرکەوتوومەتەوە ، بۆیە ڕۆیشت ومنیش بەجێمام ،وە بەهۆی تۆزو خۆڵەوە منی نەبینی لە ئاوێنەکەوە... سەرسام بووم ونەمدەزانی چی بکەم ،نەعلەکانم بدۆزمەوە یان بە جێی بهێڵم وڕاکەم بەدوای سەیارەکەدا بەڵکو بیانگرمەوە ،بڕیارم دا بەهەمووهێزمەوە ڕاکەم بەدوای سەیارەکەدا ،بەڵام بەداخەوە ئەوان زۆر خێرا بوون ونەم توانی بیانگرمەوە وبەجێیان هێشتم .....ئینجا دڵی خۆم بەوە خۆش کرد هەر کە لایاندا بۆ نان خواردن وپشوودان منیان بیردەکەوێتەوە ودێنەوە بەدواما ، گەڕامەوە بۆشوێنەکەی یەکەم جارم و زۆر گەڕام بەدوای نەعلەکانم دا تا دۆزیمەوە.

دڵم پەلەپەلی دەکرد وهەناسەم سوار بووبوو ، بە شوێنی تایەکاندا دەڕۆیشتم بەو هیوایەی کە ڕێڕەوی ئەوانم لێ ون نەبێ وکە گەڕانەوە پێیان بگەمەوە. لە دڵی خۆمدا وتم:کەنزیك عەصر وەستان بۆنان خواردنی‌نیوەڕۆ وکۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەصر هەست دەکەن کە من بەجێ ماوم ..

کات نیوەڕۆیەو هەتاو لە تەوقەسەرم دەدا ، هیچ سێبەرێنیە مەگەر لە بنی‌پێمدا ، گەرمایەکە پێستی دەم وچاومی شەقار شەقار کردو ڕەشەبای گەرمی لمیش دێ و دەیدا

بە دەم وچاوما بۆیە ناچار ئەو پارچە قوماشەی داومە بەسەرمدا ئەیدەم بەسەردەم وچاوما.

ناوچەکە لمی ورد بوو نەمدەویرا بوەستم لەترسی ئەوەی کە لم دامپۆشێ، لە ڕۆیشتنیش دا قاچم دەچەقیە ئەو لمە گەرمەوەو زۆر بەنارەحەت هەنگاوم دەنا ، هەردەتووت بەناو ئاگردا دەڕۆم ...نازانم چۆن باسی هەستی خۆم بکەم لەو کاتەدا ، پێیەکم هەڵدەگرت وپێیەکم دادەنا جاری وابوودەکەوتم ولەسەر دەست و ئەژنۆ دەڕۆیشتم وهەروەك مناڵ گاگۆڵکێم دەکرد. لە تاو گەرما جارجار پارچە قوماشەکەم دەخستە ژێر قاچم وژێر دەستم، لەتاو سەریشم ناوبەناویش دەمخستەوە سەرسەرم.

تف لەقوڕگما وشك بوو ،چاوم سووربوەوە وخوێنی تێزا وباش نەم ئەبینی وڕێشکەوپێشکەی دەکرد ، زمانم بوە پەلآس و لێوەکانم قلێشان ، لە سەرەتاوە ئارەقم کردەوە ، دواتر ئارەقیش نەماو یەك پارچە لەشم بووە ئاگر!!بەردەوام بووم لە ڕۆیشتندا ، چاوم ورد دەکردەوە بەڕێگاکەدا وناوبەناو بەهەزار حاڵ جێ تایەکانم دەبینی ، چونکە ڕەشەبای لم دایدەپۆشی ، هەرجارێك چاوم بەجێی تایەکان بکەوتایە وەمزانی دنیا هێمنەو هیوام بۆ دروست دەبۆوە .. تینویەتی زۆری بۆ هێنام و لە هیلاکیا دەکەوتم و هەڵدەسامەوە و دنیا لەبەر چاوم دەخولایەوە.

خۆر ناوڕاستی ئاسمانی بەجێهێشت وتۆزێ لاربۆوە ، ئنجا لە دوورەوە درەخت وسەوزایی‌وئاوم دەدی ، زانیم ئەوانە سەرابن ودێنە بەرچاوم ،هەروەك قورئان دەفەرموێت : ( **والذين كفروا أعمالهم كسراب بقيعة يحسبها الظمآن ماء حتى اذا جاءه لم يجده شيئا ووجد الله عنده فوفاه حسابه والله سريع الحساب** ) **النور ٣٩** . گویێم بەسەراب نەداو تەنها خەمی جێ تایەکانم بوو ، هەموو سەرو قژوچاوو گوێ‌وناودەم و لووتم لم بوو ، بەلآم هەر هیوام بەخوا بوو فریام بکەوێت،مەگەر من ڕێبواری ڕێی ئەونیم ؟ مەگەر من بەتەمای حەجی ماڵی ئەو نیم ؟؟ئالەم حاڵەدا ئەم ئایەتەم بیر کەوتەوە : ( **ولنبلونكم بشيء من الخوف والجوع ونقص في الاموال والانفس والثمرات وبشر الصابرين، الذين اذا اصابتهم مصيبة قالوا انا لله وانا اليه راجعون ، اولئك عليهم صلوات من ربهم و رحمة واولئك هم المهتدون** ) **البقرة ١٥٥** / بەم ئایەتانە هەستم کرد میهرەبانی‌خوا لێم نزیکەو ، بەزۆر خۆم کێش کرد ، لەپڕ لە دوورەوە شتێکی مەیلەو سەوزم بینی ، تۆبڵێی گیابێت ؟؟ خۆزگە گیا بوایەو سەرم بخستایەتە سەری و لە

سایەیدا گیانم دەرچوایە . بەهەر حاڵێ بوو لێی نزیك بوومەوە، هەستم کردخوا وەڵامی دوعاکانی داومەتەوە، بینیم کاڵەکێکە ولە سەیارەی حاجییەکان کەوتۆتە خوارەوەو پێیان نەزانیوە ،خۆم بۆخشاند وخۆم دا بەسەریا ، بەپەلە شکانم و نام بەدەم و چاوی هەڵقرچاومەوە تا تۆزێك فێنك بێتەوە ، ئەوەندە بەلامەوە سارد بوو بۆم نەدەخورا ، دەتووت سەهۆڵەو لە ئازاردا هاوارم کرد ، هەرئەوەندەی چووە ناودەممەوە دەتووت ئاوەو کراوە بە سەر ئاسنێکی سوورەوەکراودا .زمانم تۆزێك تەربوو ، لێوم نەرم بوو، وردەوردە ئازارم نەما و گەیشتە ناو گەدەم وبوژامەوە ،پاشان ئاوەکەی ناویشیم خواردەوە ..

سوپاس بۆ خوا ، بوو بە خواردن و خواردنەوە بۆم﴿ **ذهب الظمأ وابتلت العروق وثبت الاجر ان شاء الله** ﴾ ، ئنجا توێکڵەکەیم خستە سەرسەرم ، ئەوە نیوەی و نیوەکەی تریشیم گرتە باوەشم کە لەو کاتە هەموو دنیا بوو بۆ من

ئالێرەدا تێگەیشتم خۆشەویستی خوا ئەبێت چۆن بێت ، بەوانەیەکی عەمەلی مانای ئەم فەرموودەیە تێگەیشتم کە دوعاکەی حەزرەتی داوودە سەلامیخوای لێبێت وحەزرەت (ص)بۆمان دەگێڕێتەوە تاببێبەدەرس بۆمان﴿ **اللهم انى أسألك حبك وحب من يحبك ، والعمل الذى يبلغنى حبك ، اللهم اجعل حبك احب الىمن نفسى واهلى ومن الماء البارد على الظمأ** ﴾ ئێستادەزانم مانایچییە خۆشەویستیەك کەزیاتر بێت لە خۆشەویستی ئاوی سارد لەسەر تینوێتی !!

کەوتمەوە ڕۆیشتن وخۆریش بەرەو ئاوابوون دەچوو ، کاتێکم زانی لە دوورەوە سەیارەکەمان دەرکەوت ، کەگەیشتنە لام وتیان : ئەوە ماوی ؟؟! وتم : بەڵێ .. وتیان :چۆن ؟؟! وتم :ئەوخوایەی ( حی قیوم ) ە ئەگەر بیەوێ ژیان دەبەخشێتەوە بەوەی کە لەسەر لێواری مەرگە ، ئنجا سەرگوزەشتەی خۆمم بۆ گێڕانەوە ..

بەڕاستی نیعمەتەکانی خوا زۆرن و مرۆڤ ڕادێت لەسەریان و هەستیان پێناکات ، مەگەر خواناسان ، ئەوە عبداللەی کوری موبارەك کەویستی ڕۆژووەکەی بشکێنێو پەرداخێك ئاوی بەدەستەوە بوو گریا ، لێیان پرسی بۆ دەگریت؟؟ وتی :ئەو ڕۆژەم بیر کەوتەوە لەقیامەتدا کە نایەڵن خراپەکاران دەمی بۆ بەرن ( **وحيل بينهم وبين مايشتهون** )السبأ ٥٤ ..خواطر داعية / أحمد القطان ..

ئاشکرایە کە لە وڵاتانی ڕۆژ ئاوا بودجەی زۆریان داناوە بۆ دیراسە و لێکۆڵینەوە وتاقیکردنەوە لەگشت بوارەکاندا، کەئەمەش بۆتەمایەیپێشکەوتنیان

## ئیسلام وزانستی سەردە م

لەلایەنی ماددیدا، ڕۆژئاواییەکان لە بواری نەفسی مرۆڤیشدا زۆرتاقیکردنەوە ولێکۆڵینەوەیان کردووە و گەیشتونەتە ئەنجامی باش کە هەمووکەس دەتوانێت سوودی لێوەرگرێت ، بەڵام ئەوەی سەیرە و گەورەیی ئەم ئیسلامە دەسەلمێنێت ئەوەیە کە ئەوشتانەی ئەوان لەم سەردەمەدا وپاش خەرج کردنی پارەوپولێکی زۆر ئەیدۆزنەوەو ڕێیان لێ دەکەوێت هەزاروچوار سەد ساڵە ئیسلام فەرمانی پێداوەو جەختی کردۆتە سەر بۆ نموونە:

یەکەم :ئاینیپیرۆزی ئیسلام باس لەوە دەکات کەژیانیدنیا تاقیکردنەوەیەو هەرکەسەو بەپێی خۆی تووشی بەشێك لە بەڵاوموسیبەت وناڕەحەتیدێت ،هەروەك دە فەرموێت **( ولنبلونكم بشيء من الخوف والجوع ونقص من الاموال والانفس والثمرات وبشر الصابرين ، الذين اذا اصابتهم مصيبة قالوا انالله وانا اليه راجعون ، اولئك عليهم صلوات من ربهم ورحمة واولئك هم المهتدون ) ١٥٧البقرة**

واتە: سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە کەمیك لەترس وبرسێتیوکەم بوونی ماڵ وسامان ومردنی کەس و کارو تیاچوونی بەروبوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگروئارامگرن . ئەوانەی هەرکاتێك تووشی بەڵاو ناخۆشییەك دەبن دەڵێن: ئێمە موڵکی خواین و هەرچی هەمانە بەخششیخوایە،سەرەنجامیش تەنها هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان، ئائەوانە چەندەها ستایش ورەحمەت ومیهرەبانی دەبارێت بە سەریاندا لە پەروەردگاریانەوە وئەوانە ڕێبازیهیدایەتیان گرتووە.

دیارە ئەم تاقیکردنەوەیەش حیکمەتی تیایە وخوای گەورە دەیەوێت کە هەمیشە بەندەکانی هۆشیار بکاتەوە ونیعمەت وبەخششەکانیان بیربخاتەوە ئەگەر نەخۆشی نەبێ کەس قەدری لەش ساغی نازانێ وهەستی پێناکرێت..

ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر گرنگی ئەدات بە ئارامگرتن بە تایبەت لە سەرەتای بەڵاکەدا وهەوڵ دەدات مرۆڤ هاوسەنگی خۆی لەدەست نەدات ، تەنانەت حەزرەت (ص) دەفەرموێت (لەئێمە نیە کەسێك لەموسیبەتێکدا بکێشێ بە ڕوومەتیاویەخەی خۆی دا بدڕێ وقسەی نەفامیوناشکوری بکات)...

ڕۆژێك حەزرەت(ص) بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی کە زۆر شپرز بووبۆ نزیکێکی کە مردبوو ، ئامۆژگاری کرد کە ئارام بگرێت،دیارە ئەویش نەیزانی ئەوە پێغەمبەری خوایە ، بۆیە لە شپرزیدا وتی:تۆ نازانی چیم بەسەرهاتووەو تووشی چی بووم.

حەزرەت (ص)بە جێی هێشت ، دواتر کە ژنەکە سارد بۆوە و، زانی ئەوە پێغەمبەر بووە، چوو بو لای و داوای لێبوردنی لێکرد و وتی: ئەوکاتە زۆر دڵم گەرم بووە ، حەزرەتیش (ص) فەرمووی(سەبر ئەو سەبرەیە کە لە گەرمەی ڕووداوەکەداو لە سەرەتاوە بگیرێت ) ( **انما الصبر عند الصدمة الاولى**). ئارامگرتن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت و هی وا هەیە باشتر خۆی دەگونجێنێ،یەکێك لە هاوەڵانی حەزرەت(ص) هە واڵیان دایە کە کوڕەکەت مرد ، وتی:پێشتر دەمزانی کە ئەمرێت ! وتیان: چۆن ؟ وتی:ئەیخوا بە پێغەمبەر (ص) نافەرموێ ( **انك ميت و انهم ميتون** ) تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن. ئەمە باس وخواسی بەلاو موسیبەت و ئارامگرتنە لە ئیسلامدا با بزانین زانایان پاش چواردە سەدە بە لێکۆڵینەوە گە یشتونەتە چی؟!.

دکتور یوسف البدر لە بەرنامەی(لغة الحياة) دا لە کەناڵی( سمارت)دەڵێ: زانایان پاش تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زۆر بۆیان دەرکەوتووە کاتێك کەسێك تووشی بەڵایەك دەبێت و (صدمە)یەك ڕووی تێدەکات ،ئەگەرئارام نەگرێت،پچڕانێك دروست دەبێت لە بواری(کهرومو‌گناتیسی) مێشکی ودەبێتە مایەی نەخۆشی وەك شێرپەنجەو قورحەو .. هتد.........

لە ئەوروپا دیراسە کراوە لە سەر هەشت هەزار ئافرەت کە کێشەیان هەبووە لە گەڵ منداڵە کانیاندا و ئارامیان نەگرتووە توشی شێرپەنجە بوون .

لە قورئانی پیرۆزیشدا ئەگەر جوان لێی وردبینەوە تیشك خراوەتە سەر ئەم ڕاستییە ئەوەحەزرەتی ئەیوب(سەلامیخوای لەسەر بێ) توشی بەڵاو موسیبەتێك بوو،ماڵ و سامان و منداڵەکانی تیاچوون، ئەمەش زۆر کاریگەری هەبوو لە سەردڵ دەروونیو بووە مایەی ئازار ونەخۆشی هەروەك (قرطبي)دەفەرموێت:حەزرەتی ئەیوب سەلامی خوای لێبێت توشی بەلاوموسیبەتەکە بوو بە هۆی ئەوەشەوە تووشی نەخۆشی بوو.. قورئان دەفەرموێت ( **واذكرعبدنا ايوب اذنادى ربه انى مسنى الشيطان بنصب وعذاب، اركض برجلك هذا مغتسل بارد وشراب و وهبنا له اهله ومثله معهم رحمةمنا وذكرى لاولي الالباب**)٤٢ ص . واتە: ئەی

پێغەمبەر(ص) سەرگوزەشتەی بەندەی ئێمە ئەیوبیان بۆباس بکە ، کاتێك بانگی‌لە پەروەردگاری کردو وتی : بێگومان شەیتان تووشی نەخۆشی و ئازاری کردووم ، ئێمەیش دوعاکەیمان گیرا کرد و وتمان : هەستە، بەپێی خۆت ڕابکە ئەوە ئاوێکی سارد بۆ خۆشتن و خواردنەوە .ئەوسا کەسوکار وئەهلەکەیمان پێبەخشی وئەوەندەی تریش ، ئەوە ڕەحمەت ومیهرەبانی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەو، یادەوەریشە بۆ هەمووخاوەن بیروهۆشەکان،ئالێرەوە گرنگی ئیمان وبڕوا تێدەگەین بە تایبەت بڕوا بوون بە قەزا وقەدەری خوا، کە دەبیتە مایەی دڵدانەوەی مرۆڤ وئارامگرتنی ، هەروەك قورئان بە ئاشکرا ئاماژە بەم ڕاستی‌یە دەکات ودەفەرموێت: ( **ماأصاب من مصيبة فى الارض ولا فى انفسكم الا فى كتاب من قبل ان نبراها ان ذلك على الله يسير ، لكيلا تأسوا على ما فاتكم ولا تفرحوا بما اتاكم والله لايُحب كل مُختال فخور** ) حديد٢٣ واتە : هیچ بەڵاو ڕووداوێك لە زەویدا، بۆتان پێش نەهاتووە کە لە – لوح المحفوظ– دا تۆمارمان نەکردبێت ، پێش ئەوەی ڕووداوەکە پێش بێت، ئەوکارەش بۆخوا زۆر ئاسانە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە خەفەت نەخۆن بۆ ئەوی لە کیستان چووە بەوەش دڵخۆش غەڕرا نەبن کە پێمان بەخشیون، چونکە خوا کەسانی خۆ بەگەورە زان ولە خۆ بایی خوش ناوێت . حەزرەت(ص) دەفەرموێ( **عجباً لأمر المؤمن، ان امره كله خير، ان اصابه ضراء صبر فله خير، ان اصابه سراء شكر فله خير** )

## دینداری ڕاست وتەواو

لە دنیای ئەمڕۆماندا دەرمان شتێکە زۆر بەکاردێت و ڕۆژانە خەڵکی بەرەو نەخۆشخانەکان وعیادەی دکتۆرەکان عەودالی چارەسەری نەخۆشی‌یەکانیان و بەتەمای شیفاوچاك بوونەوەن،ئیتر هەر کەسەو بەمەزەنەی عەقڵی خۆی‌و بڕی پارەی گیرفانی دەچێتە لای ئەو دکتۆرەی کە بە چاکی دەزانێت .ئینجا هەموو دەرمانێکیش کە بۆی دەنووسرێ لە سەری نووسراوە کە لە بەردەستی منالدا دانەنرێ وبە بێ ڕێنمایی دکتۆرو صیدەلانی نەخورێت.. لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش دا هەروایە..

قورئان باسی دوو جۆر شیفا دەکات :

<u>یەکەم</u>: هەنگوینە کە دەفەرموێت ( **فيه شفاء للناس** ) **النحل ٦٩** <u>دووەم</u> :قورئانە کەشیفایە بۆنەخۆشی‌یەکانی‌دڵ ودەروون وتەنانەت بۆنەخۆشیەکانی تریش ... هەروەك

دەفەرمویت( **وننزل من القران ما هو شفاء ورحمة المؤمنين** )٨٢ الا سراء هەروەها دەفەرمویت ( **قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور** ) **يونس ٥٧**

جائەم قورئانەش بە هەمان شێوە کەسی پسپۆڕوشارەزای دەوێت،بە تایبەت لە فەتوادان و ئیجتهادکردن دا، تەنانەت لەم زەمانەدا پێویستدەکات کەدەزگای تایبەت فەتوای جەماعی دەربکەن،کە کۆمەڵێ پسپۆڕ لە هەموو بوارێکدا کار بکەن تیایدا....

هی وا هەیە چوار لاپەڕە دەخوێنێتەوە و شەیتان فوودەکات بە لووتیاو خۆی لێدەبێت بەموفتی و لەمەسەلە گەورەکاندا فەتوا دەدات، بە تایبەت کافر کردنیخەڵکو قەتڵ و عام کردنیموسڵمانان و ..هتد

بۆیە بەڕاستی دەبێت چۆن دەگەڕێین بە دوای دکتۆری ناودارو چاك وشارەزادا بۆئەوەی چارەسەری نەخۆشیەکانمان بە چاکی بکریێ .. هەروایش بگەڕێین بە دوای زانای خوا ناس وشارەزادا وهەروا کوێرانە دوای فتوای ئەم و ئەو نەکەوین، چونکە ئەگەر خوا نەخواستە فەتوای سەقەت و هەڵەمان وەرگرت ، نەك هەر دنیا بەڵکو ئاخیرەتیشمان دەڕوات .

خوای گەورە بۆ قورئانیوەك کتێبێك نەناردە سەر زەوی تاخەڵکیبۆخۆیان بیخوێننەوە و چی تێگەیشتن پەیڕەوی بکەن؟

بۆ بەگەورەترین ولێهاتووترین مامۆستادا ناردی ؟؟ دیارە بۆ ئەوەی هەر شتە بخاتە جێی خۆی و فێرمان بکات چۆن بە کاری بهێنین ....

جا هەروەك ئیمامی ئەوزاعی دەڵێت ( هەر فەرمانێك کە خوا کردبێتی شەیتان هەوڵ دەدات بە دوو ئەقاردا بیبات ، وا بکات کە زیادەڕەوی تیا بکرێت، یان کەم تەرخەمی تیا بکرێت)..(ل١٨ الا عتدال في التدين)د. وهبه الزحيلي..

دیارە نەفسی مرۆڤیش حەزی بەوەیە، کە زیادەڕەوی یان کەمتەرخەمی بکات و هەمیشە کەسانێك هەن خراپ بیردەکەنەوە و بە کەیفی خۆیان شوێن بەرنامەی خوا دەکەون و دەیانەوێت کە بەرنامەی خوا بە ئارەزووی ئەوان بێت، نەك ئارەزوویان شوێن کەوتەی بەرنامەی خوا بێت ... کە ئەمیش ئاشکرایە نابێت و حەزرەت (ص) هەر زوو فەرموویەتی ( **لا يؤمن احدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به** ) (حديث حسن صحيح- ابو نعيم والطبراني)..

هەروەها دەفەرموێت (**بئس العبد عبد هوى يضله**) واتەچەند خراپە عەبدێك كە بەندەی هەواو ئارەزوویەك بێت كە سەری لیّ بشێوێنێو سەرگەردانی بكات ... (ترمذی)و(ئەحمەد) یان دەفەرموێت (**ان مما اخشى عليكم شهوات الغي فى بطونكم وفروجكم ومضلات الهوى**) ئەحمەد واتە:بە ڕاستی ئەوەی زۆر دەترسم تووشتان ببێت هەواوئارەزووی سەرگەردانكەری ورگ و عەورەتتانە، لە گەڵ هەواو ئارەزووی سەر لێشێوێنەر ... ئینجا هەر شتێك كەسێك بیهێنێ و فەرمانی خواو پێغەمبەری لە سەر نەبێت بیدعەیە و دەدرێتەوە بە سەر ساحێبەكەیدا (**من احدث فى امرنا هذا ما ليس منه فهو رد**) **بخاری و مسلم**..

وتمان مرۆڤی وا هەیە شت لە سەر خۆی قورس دەكات وحەزی لە زیادەڕەویە بۆ نموونە: هەر لە زەمانی پێغەمبەردا(ص) كەسانی وا هەبوون كە دەیانویست تەركی دنیا بكەن و ژن نەهێنن و هەمیشە بە ڕۆژو بن،حەزرەتیش(ص)جڵەوگیری كردن وزۆر بە توندی سەرزەنشتی كردن و ئەو دەرگایەی لیّ داخستن.

بوخاری دەگێڕێتەوە كە (چەند كەسێك هاتنە ماڵی حەزرەت (ص) و پرسیاریان كرد لە بارەی عیبادەت و خوا پەرستیییەكەیەوە ، كە وەڵامیان درایەوە ، بەكەمیان زانیو وتیان ئێمە لە كوێو پێغەمبەری خوا لە كوێ ؟ئەو خوا لە گوناهی بەرودوای خۆش بووە ،یەكێكیان وتی :!هەموو شەو شەو نوێژ دەكەم، یەكێكی تریان وتی : هەموو رۆژیّ بە ڕۆژوو دەبم و هەرگیز نایشكێنم ، سێیەمیان وتی:منیش هەرگیز ژن ناهێنم ! كە حەزرەت هاتەوە وبۆیان گێڕایەوە ، ناردی بە دوایاندا وپێی فەرموون : ئێوە بوون ئاواو ئاواتان وت؟! بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم وپارێزكارم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڕۆژووش دەبم و دەشی شكێنم ،شەو نوێژ دەكەم و دەشخەوم ،ژنیش دێنم ، جا هەركەس لە سوننەتیمن لابدات لە من نییە)..

نموونەیەكی تریش ، ( عبدالله‌ی كوڕی عەمری كوڕی عاص)ە كەسەر گوزەشتەی خۆی لەم بارەیەوە باس دەكات و دەڵێت: هەواڵیان دا بە پێغەمبەر (ص) كە من وتومە: بەردەوام بە ڕۆژوو دەبم و بەردەوام شەو نوێژ دەكەم .. پێی فەرمووم :تۆ شتی وات وتووە؟منیش وتم:بەڵێ وتوومە دایك و باوكم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی :(ئەوە گرانە و ناتوانی ، بە ڕۆژوو بەو بیشكێنە، بنوو وە شەو نوێژیش بكە ،

مانگی سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ببە وهەر چاکەیەکیش بە دەقاتە ،ئەمەش وەك ئەوەیە بەردەوام بەڕۆژوو ببی)...

وتم : من لەوە زیاتردەتوانم ،فەرمووی :باشە ڕۆژ نا ڕۆژێ بەڕۆژوو ببە کە ئەوەش ڕۆژووی حەزرەتی داوودە(سەلامی خوای لێبێت)و باشترین ڕۆژووە..

وتم:مـــن چـــاکتر لـــەوە دەتـــوانم ،فـــەرمووی :لـــەوە چـــاکتر نیـــە ! لە ڕیوایەتێکی تریشدا پێی دەفەرمووێ (ناوبەناو بە ڕۆژوو ببە وبخەوەو شەونوێژ بکە ،چونکە بە ڕاستی لاشەت هەقی لە سەرتە و چاوەکانت هەقیان لە سەرتەو مالْ و منالْت هەقیان لە سەرتەو میوانەکانت هەقیان لە سەرتە،ئەوەندەش بەسە کە مانگی سێ ڕۆژ بـەڕۆژوو ببیـت چـونکە چـاکە بـە دەقاتـە وەك ئەوەیـە هەمیـشە بـەڕۆژووببیت. نموونەیکی تریش (کاتێك پێغەمبەر (ص)وتاری ئەدا پیاوێك بە پێوە لە بەر هەتاو وەستا بوو،حەزەرت (ص) پرسیاری کرد؟وتیان :ناوی (ابو اسرائیل )ەو نەزری کردووە بە پێوە بێو دانەنیشێو ، نەچێتە بەر سێبەرو قسە نەکات و تەنها زیکری خوا نەبێو بەڕۆژووش بێت ، حەزرەت (ص)فەرمووی (پێی بلێن :قسە بکات و ، بچێتە بەر سێبەرو ، دانیشێو قەیناکە ڕۆژووەکەی تەواو بکات )بخاری. حەزرەت لە چەند فەرموودەیتریش دا جەختی کردوتەوە سەر ئەو مەسەلەیە و دەفەرموێت (هلك المتنطعون)، واتە : تیاچوون ئەوانەی کە توندڕەوی دەکەن لە شوێنێکدا کە پێوست بە توندی ناکات ، سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە...

دیارە لە ئیسلامدا ڕوخسەی زۆر دراوە ، هی وا هەیە بە دینداری دەزانێت کە ئەو ڕوخسانە وەر نەگرێت ، بۆیە حەزرەت(ص)دەفەرموێت(**من لم يقبل رخصة الله عز وجل كان عليه من الاثم مثل جبال عرفه** ) واتە: هەرچی ڕوخسەتیخوا وەرنەگرێت بەهێندەی شاخی عەرەفە گوناهبار دەبێت...

لە فەرموودەیەکی تریش دا دەفەرموێت (**يا ايها الناس، اياكم والغلو في الدين ، فانه اهلك من كان قبلكم الغلو فيالدين** ) ئەحمەد ونسائی

واتـە: خەلْکینـە ئاگـادار بـن زیـادەڕەوی مەکـەن لەدینـدا، بەڕاسـتی گـەلانی پـێش ێـوە زیادەڕەوی لە دیندا لە ناوی بردن ...

**نموونەیەك لە زیادەڕەوی گەلانی پێشوو:**

گاورەکان دوای سەردەمی حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێبێت بەنیازی زیاتر نزیك بوونەوە لە خوا ڕەهبانیەتیان داهێنا،کە ژن نەهێنن و تەرکی دنیا بکەن ، ئەمەش بە چەند قۆناغێکدا ڕۆیشت و سەرەنجام سەری لە سەرگەردانی و سەر لێشێواویەوە دەرچوو، قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

**( ولقد ارسلنا نوحا وابراهيم وجعلنا فى ذريتهما النبوة والكتاب ، فمنهم مهتد وكثير منهم فاسقون ، وقفينا بعيسى ابن مريم واتيناه الانجيل و جعلنا فى قلوب الذين اتبعوه رافة ورحمة و رهبانية ابتدعوها ما كتبناها عليهم الا ابتغاء رضوان الله فما رعوها حق رعايتها فاتينا الذين امنوا منهم اجرهم وكثير منهم فاسقون ) الحديد ٢٧**... واتە :بێگومان ئێمە نوح وئیبراهیممان ڕەوانە کردووە، لە نەوەکانیشیاندا پێغەمبەرایەتی وکتێبی ئاسمانیمان دابەزاندووە ، جا لە نەوەکانیاندا کەسانێکهەبوون کە ڕێگەی هیدایەتی گرتۆتەبەرو زۆربەشیان خوانەناس و لاربوون .

لەوەودوا بە شوێن پێغەمبەراندا پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کرد ، کۆتایی زنجیرەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیممان هێنا بە عیسای کوڕی مەریەم ،ئینجیلیشمان پێبەخشی ، سۆزو میهرەبانیمان لەدڵی ئەوانەدا کەشوێنی کەوتبوون دابین کرد ، بەڵام ئەوان ڕەهبانیەت و دوورە پەرێزیان لە دنیا کردە پیشەیان ، وەنەبێت ئێمە ئەو حاڵەتەمان لەسەرفەرز کردبن ،بەڵکو تەنها بەدەستهێنانی ڕەزامەندیخوامان لێ داواکردبوون،کەچیئەوان ڕەهبانیەتیان بەچاکیپەیڕەو نەکرد،ئێمەش پاداشتی ئەوانەمان دایەوە کە باوەڕی ڕاست و دروستیان هەبوو، هەرچەندە زۆربەیان لارولەوێر بوون ..

**کە نارگیری مایەی ناساغیە!**

ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگیزۆری داوەبەخێزان وپەیوەندی نێوان ئەندامەکانی، تامناڵ بە دڵ ودەروونێکیگەشەوە لەوکومەڵگا بچکۆلەیەدا پەروەردە ببێت ودوور بێت لەکەنارگیری (ئینعزالیەت)وخۆخۆیی‌و نەخۆشیە دەروونیەکانی تر، دیارە تەمەنی منالی لە مرۆڤدا کە نزیکەی(٩)ساڵێکەو زیاترە لە تەمەنیمناڵی هەموو گیانلەبەرەکانیتر، ئەمەش لەبەر ئەو ڕۆڵە گرنگەیە کە دەیبینێلە داهاتوودا کە پێویست بەوە دەکات ماوەیەکی تەواو (کافی)هەبێت بۆ

پـەروەردەکردن لـە هـەموو بوارێکـدا ، بەتایبـەت چۆنیەتی هـەڵس وکـەوت ومامەڵـەکردن لەگـەڵ بەرامبەردا ...

لـە ئاینی ئیسلامدا گرنگـی دراوە بـەوەی کـەمرۆڤ هـاوەڵی چاك بۆخـۆی بگرێـت و هەوڵبـدات سوودی لێوەرگرێت ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تێکەڵ بێت بەخەڵکی و دانەبڕێت لێیـان ،جا ئەگـەر هەندێ نارەحەتی تووش هات لە کەسانێکەوە کە ناتەواو ولارولەوێر بوون ئارام بگـرێ چونکە بـەو ئـارام گرتنـەخێری گەورەیدەسـت دەکـەوێت پێغەمبـەر (ص) دەفـەرمۆیت :(المـؤمن الـذی یخـالط الناس ویصبر علی اذاهم خیر من المـؤمن الـذیلایخالط النـاس ولایصبر علـی اذاهـم ) واتـە : ئـەو بڕوادارەی کە تێکەڵ بە خەڵکی دەبێت وئارام دەگرێت لە سـەر ئـەو ئەزیـەت وئـازارەی کـە لێیانـەوە تووشی دەبێت باشترە لەو بڕوادارەی کە تێکەڵ بەخەڵکی نابێ و ئارام ناگرێت..

زانـستی سـەردەمیش پـاش چـواردە سـەدە راسـتی ئـەم مەسـەلەیەی سـەلماند،زانای دەروونناسیئەمریکی(لیون ئەیسین بیرگ) لێکۆڵینـەوەی زۆریکـرد لەسـەر کاریگـەری هـاوڕێگرتن و تێکەڵاویخـەڵکی لەسـەر تەندروسـتی ، دکتـور(لیـون) تاقیکردنـەوە و لێکۆڵینـەوەی کـرد لەسەر(٤٧٢٥)کەس لە ویلایەتی کالیفۆرنیا لە ماوەی نۆ ساڵدا، گەیشتە ئەو ئەنجامـەی کـە ڕێـژەی مردن زۆرترە لەو کەسانەدا کە هاوەڵیان نیە و تێکـەڵ بـە خـەڵکی نـابن وگۆشەگیرن، هـەروەها بـۆی دەرکـەوت کـە ئەوکەسـانە زیـاتر تووشـی نەخۆشـیەکانی دڵ و شـێرپەنجەو دوودڵـی وخـەمۆکی دەبن..

بۆیـە لـە ئـەنجامی لێکۆڵینەوەکانیـیەوە ئامۆژگـاری دەکـات کـەمرۆڤ دانـەبڕێ لـە کۆمـەڵگا و گۆشـەگیر نـەبێت، تـاوەکو بتـوانێ ژیـانێکی خـۆش و دوور لـە نەخۆشـی بـە سـەربەرێت .. بەڵێ خوایەك کە خۆی مرۆڤی بە دیهێناوە ولە نەبوونەوهێناویەتیە بوون بۆ خۆی باش دەزانـێ کەچی لە بەرژەوەندی ئەم ئادەمیزادەیە (الا یعلم من خلق وهو اللطیف الخبیر)الملك ..

لە زانکۆی میشیگان لـە ئەمریکا زانـای ئـەمریکی (جیمس هـاوس) لێکۆڵینـەوەی کـرد لەسـەر (١٧٠٠)کـەس وبـۆی دەرکـەوت ئەوانـەی تێکـەڵ نـابن وپەیوەندیـە کۆمەڵایەتیـەکانیان بـاش نیـە

بەرێژەی لە سەدا دووسەد وپەنجا زیاتر دەمرن لەچاو ئەوانەی کەباری کۆمەڵایەتیان دامەزراوە و لە پەیوەندیانا ئاسوودەن.

لە دیراسەیەکی تردا کە نۆ ساڵیخایاندزانای ئافرەتیئەمریکیدکتۆرە (لیزا بیرکمان) لە زانکۆی کالیفۆرنیا لەسەرحەوت هەزار کەسکردی لە سەر دێیەکی سەر بە کالیفۆرنیا بۆیدەرکەوت کەرێژەی مردنی ئەوکەسانەیخێزانیان نیەو گۆشەگیرن لەسەدا دووسەدە لەچاو ئەوانەی کە باری خێزانیان باشە وتێکەڵ بە خەڵکیدەبن.

بەڵێ تێکەڵ بوون بە کۆمەڵگاوهاوکاریکردنیخەڵکیوخێروچاکەکردن ئەمانە هەمووی مایەی تەندروستی باش ودڵخۆشیو تەنانەت زوو چاك بوونەوەیە ئەگەر کەسێك نەخۆش بێت، بۆیە دەبینین لە ئیسلامدا گرنگی زۆر دراوە بە سەردانی نەخۆش، تا لەکۆمەڵگا دانەبڕێت و زووچاك ببێتەوە، لە فەرموودەدا هاتووە کە پەروەردگار بەندەی خۆی ڕادەگرێ لە قیامەتداو پێی دەفەرموێ داوای ئاوم لێکردی نەتدامێ ؟! ئەویش دەڵێ: خوای گەورە کەی تۆ پێویستت بە ئاو بووە تامن بتدەمێ؟! پەروەردگاریش دەفەرموێت: فلآنە بەندەم داوای ئاوی لێکردی نەتدایە، ئەگەر بتدایەتێ لە لای من وەرت دەگرتەوە ...ئینجا دەفەرموێ: داوای خواردنم لێکردی نەتدامێ ، ئەویش دەڵێ ئەی پەروەردگار تۆ کەی پێویستت بە خواردنە تامن بتدەمێ؟! ئەویش دەفەرموێ ! فلآنە عەبدم داوایخواردنی لێکردیو نەتدایە ، ئەگەر بتدایەتێلایمن وەرتدەگرتەوە ئەیعەبدەکەم نەخۆش کەوتم نەهاتی بۆلام .. ئەویش دەڵێ:ئەیپەروەردگار تۆکەی نەخۆش دەکەوی تا من بێم بۆ لات؟!

خواش دەفەرموێ فلآنە عەبدم نەخۆشکەوت ئەگەر سەردانت بکردایە ئەوامنی لەلابووم،وەك بۆلای من بهاتیتایە وابوو.کێ گوێی لەمەبێ کەمتەرخەمیدەکات لەو بوارانەدا ؟دیارە ئەمە بۆ هەر دوولایەی خێرو بەرەکەتە نەخۆشەکەش وئەوەش کە سەری ئەدات. زانایان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە گەیشتنە ئەو ڕاستیە کە ئەوەی کاری خێروچاکەدەکات کاردەکاتە سەرجیهازیمەناعەیوبەرگری زیاتر دەبێت لە بەرامبەر نەخۆشیدا،هەروەهائەو چاکەکەروخێرخوازە لەئەنجامیئارامیدەروونی و خۆشی خێرکردنەکەوە سپڵیماددەی تەفتەسین

دەردەدات کـە بـەرگری میکرۆبـات دەکـات و دەیپـارێزێ لـە نەخۆشـی، لـە ئـەنجامی ئـەم لێکۆڵینەوانـەوە ، زانایانیڕۆژئاوا وابەچاك دەزانـن کـە نـەخۆش خێـر بکـات ویارمەتیکەسانیتر بـدات کەبەمـەش دەزگـای بـەرگری لەشیان بـەهێز دەبـێ وزووتـر چاك دەبنـەوە .. ئـەم ڕاستیەش دکتــۆر (دیــن اورنیــسن) جــەخت دەکاتــە ســەریوجارێك دوونــەخۆش کەدژایەتییــەکتریان دەکرد،داوایلێکردن کە هەریەکیان جلیئەوی تریان بشواو هاوکاری یەکتری بکەن تـا زووتـر چاك ببنەوە. لێرەوە گەورەیی ئەو فەرموودەیەی حەزرەت(ص) تێدەگەین کـە دەفەرموێ: (داوومرضـاکم بالصدقات)واتە: نەخۆشەکانتان بە خێرو سەدەقە کردن چارەسەر بکەن.. یـان دەفـەرمۆی(سیلەی رەحم وسەردانی خزم وکەس وچاکە کـردن دەبیتـە مایـەی تەمـەن دریـژی )... پـەڕاوی(پبـت علمیـا/ محمد کامل عبدالصمد ) و(الشخصیةالمغناطیسیة/المهندس علی غانم الطویل)ل ١٢٣ )....

## رووخۆشی وزەردەخەنە مایەی لەش ساغیە

لـە ئیسلامدا گرنگـی دراوە بـە ڕووخۆشیو زەردەخەنـە و هـانی موسڵمانان دراوە کـە هەمیشە ڕووگەش و ڕووکراوە بن بە ڕووی خە ڵکیدا ، کە ئەمەش بە چاکە و خێر بۆیـان حساب دەکرێت ،پێغەمبـەر(ص) دەفـەرموێت( تبـسمك فـی وجـة اخیـك صـدقة ) هـەروەها حـەزرەت (ص)هەمیـشە زەردەخەنــەی لەســەر لێــو بــووە وهــەرگیز ڕووگــرژ و مــۆن وبــێ هیــوا نــەبووە.. دیـارە هەرچـی ئیسلام فـەرمانی پێبـدات مایـەی خێـر وخۆشییە بـۆ مـرۆڤ لـە دنیـاو لـە قیامەتـدا ،ئەوەتا کۆمەڵێك زانای دەروونی وکۆمەڵایەتی ئەمریکی لێکۆڵینەوەیان کـرد لـە سـەر ڕووخوشـی و ڕووگەشی و زەردەخەنـە و ڕایانگەیانـد کـە دەبێتـە مایـەی پاراستنیتەندروستیمرۆڤ لـە بەرامبـەر نەخۆشـــــــیەکانی ســــــــــەردەمدا.

هەروەهازانایدەروونناسـیئەمریکیدکتور(جـیمس ئەریکـسۆن)پـاش تاقیکردنـەوەی زۆر لەسـەر (٣٥٠٠)کەس کەلە چین وتوێژە جیاکانی کۆمەڵ بوون وکردبوونی بـە سـێ گروپـەوە ( ئەوانـەی کە زەردەخەنـەیان نیـە ، ئەوانەی کـە لـە هەنـدێ کاتـدا زەردەخەنـەیان هەیـە، ئەوانـەی کـە هەمیشە زەردەخەنە لە سەر لێویانە)ڕایگەیاند کە کۆمەڵی سێیەم زۆر گورج و گۆڵ و تەندروستیان باشـە و

بڕوایان بە خۆیان زۆرە ، وە ڕایگەیاند کە ئەو کەسانە زیاتر کاردەکەنە سەر خەڵکی بەرامبەرو دەتوانن قەناعەتیان پێبکەن.ل١٢٠هەمان سەرچاوە..

ئەو کەسانەی دەم بە زەردەخەنە و ڕووگەشن ئەوانە دوورن لە نەخۆشی فشاری خوێن و مێشکیان باشـــتر ســـوود لـــە ئۆکـــسجین وەردەگرێـــت ودڵ وجگەریـــشیان باشـــتر کاردەکـــەن.....
ل ١٢٠ هەمان سەرچاوە

## ناوەرۆك



یانزەی سێبتێمبەر ئەو ڕۆژە بوو کەبەگوێرەی زۆرێك لەلێکۆڵەرەوان مێژووی ئەم سەردەمەی کرد بە دووبەشەوە .. هێندە ڕووداوێکی کاریگەر بوو .. هەندێ وای بۆ دەچوون کە ئەم کارەساتە کۆتایی بە بڵاوبوونەوەی ئیسلام بهێنێت لە جیهاندا .. بەڵام موسڵمان بوونی بەلێشاوی خەڵکانێکی زۆر لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوئەوروپا پێچەوانەی ئەو رایە ئەسەلمێنێت .. موسڵمانبوونی یوسف ئەستێس نموونەیەکی زیندووی ئەم بوارەیە .



قەشەی ئەمریکی یوسف ئەستێس لە مەسیحیەتەوە بەرەو ئیسلام .





وێنەیەك واقیعی جێی کەوتنەخوارەوەی بەردێکی ئاسمانی نومایش دەکات لە ساڵی 1908دا بەرسیبریا کەوت کە ڕووبەری 700میل دووجای خاپوور کرد



پوشکە بەقنگەیەکی بەبەرد بوو کەدەگەڕێتەوە بۆ 250ملیۆن ساڵ لەمەوبەر کە لەڕووی پێکهاتەوە وەك ئێستایە کەلەتەنیشتیەوە دانراوە .





مێروولەیەکی بەبەردبوو کەتەمەنی 100ملیۆن ساڵە و هەروەکو مێروولەی ئێستایە .

دیزاین : عادل شاسواری

لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی 354 ساڵی 2005 دراوەتێ .